زنجیرەی هزری هاوچەرخی ئیسلامی
47



دکتور فوزی کمال ادهم

# بەڕێوەبردنی ئیسلامی

## تێخوێندنەوەیەکی بەراوردکاریی نێوان

## سیستمی ئیسلامی و دانراوی نوێ یە

وەرگێڕانی
کۆسرەت محمد ئەبابەکر

بسم الله الرحمن الرحيم

# بەڕێوەبردنی ئیسلامی

## تێخوێندنەوەیەکی بەراوردکاریی نێوان سیستمی ئسلامی و دانراویی نوێیە

## مەبەست لە زنجیرەی هزری هاوچەرخی ئیسلامی

- دەوڵەمەندکردنی کتێبخانەی کوردییە بە گرنگترین و کاریگەرترین دەقی ئەو کتێبانەی کە مەشخەڵی سەرڕێی هزری هاوچەرخی ئیسلامین .
- ئاشناکردنی خوێنەرو لاوی موسڵمانی کوردە بە دەقی ئەو کتێبانەی کە سەرچاوەن بۆ ڕۆشنبیری ئیسلامی و سازێنەری ڕابوونی ئیسلامین .
- شارەزاکردنی ڕاستەوخۆی لاوی کورد بەم سەرچاوانە ، ئازادکردنیان لە گشت کۆت و بەندو بۆچوونی تەسکی حزبایەتی و تاکڕەوی و ڕەوتگەرایی .
- بناغەیەک بێ بۆ بنیادنانی کەسایەتییەکی ئیسلامی بەهێز بۆ هەرتاکێکی موسڵمانی کورد ، تا توانای ئەنجامدانی ئەو گۆڕانکارییانە هەبێ ، کە خوای پەروەردگار پێی سپاردووە .

دەگەڵ ڕێزو تەقدیرمان بۆ بیروڕای نووسەرانی ئەم زنجیرەیە ، مەرجیش نییە ئێمە پابەندی هەموو بیروبۆچوونەکانیان بین .

با دەستوورێشمان لە وەرگرتن فەرمایشتەکەی خوای پەروەردگار بێت ،

ٱلَّذِينَ يَسْتَمِعُونَ ٱلْقَوْلَ فَيَتَّبِعُونَ أَحْسَنَهُۥٓ ۚ أُو۟لَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ
هَدَىٰهُمُ ٱللَّهُ ۖ وَأُو۟لَٰٓئِكَ هُمْ أُو۟لُوا۟ ٱلْأَلْبَٰبِ ﴿١٨﴾ سورة الزمر

التفسير

# بەڕێوەبردنی ئیسلامی

## تێخوێندنەوەیەکی بەراوردکاریی نێوان
## سیستمی ئسلامی و دانراویی نوێیە


نووسینی

دکتور فەوزی کەمال ئەدهەم

وەرگێڕانی

کۆسرەت موحەمەد ئەبابەکر

پێداچونەوەی

لقمان بەهائەدین

مامۆستا لە پەیمانگای تەکنیکی سۆران

ناوی کتێب بە عارەبی: الإدارة الإسلامية
ناوی نوسەر: دکتور فەوزی کەمال ئەدهەم
ناوی کتێب بەکوردی: بەڕێوەبردنی ئیسلامیی
ناوی وەرگێڕ: کۆسرەت موحەممەد ئەبابەکر
پێداچوونەوەی : لقمان بەهائەدین
چاپ و بلاوکردنەوەی: نوسینگەی تەفسیر/ هەولێر
خەت: نەوزاد کۆیی
نەخشەسازی: جمعە صدیق کاکە
بەرگ : ئەمین مخلص
نۆرە و ساڵی چاپ: یەکەم ١٤٣١ک – ٢٠١٠ز
تیراژ: ١٥٠٠ دانە

لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتیەکان ژمارەی سپاردنی ( ٧٨٦ ) ی ساڵی ٢٠٠٩ دراوەتێ

تەفسیر
بۆ بلاوکردنەوە و راگەیاندن
هەولێر- شەقامی دلدگا - ژێر ئوتێلی شیرین پالاس
ت : ٢٢٢١٦٩٥ - ٢٢٣٠٩٠٨- ٢٥١٨١٢٨
مۆبایل : ٠٧٥٠ ٤٦٠ ٥١ ٣٢ - ٠٧٧٠ ١٢٨ ٧٢ ٩١
tafseeroffice@yahoo.com
tafseeroffice@maktoob.com
altafseer@hotmail.com

# پێشەکی

ئەم توێژینەوەیە هەوڵێکی سادەیە، بۆ دەرخستنی هزری بەڕێوەبردنی ئیسلامی و ئەوەی لێی پێك دێت، لە پێڕۆیەکی گشتگر و تەواوکار، بۆ بەڕێوەبردنی کۆمەڵگەی ئیسلامی. ئەو فاکتەرانەشی، هانی کۆڵ نەدانمان لە تێخوێندنەوەی هزری ئیسلامی دەدات، لە سەرجەم بوارەکانی سیاسی، ئابووری و، کۆمەڵایەتی، دەستپێکی ئەو بزوتنەوەی بەئاگاتنەوەی هزری ئیسلامییە نوێیەیە، کە لە توانای دایە لەگەڵ هەل و مەرجی ئێستای ئیسلامی، بەشێوەیەکی زانستیی خوێندنەوە بۆ کراو دا مامەڵە بکات، هەروەك ئامانج لەم هەوڵە ئاشکرا کردنی چاکییەکانی هزری ئیسلامی و بلاّوکردنەوەیەتی بەشێوەیەکی نوێ، وەك هزرێکی گشتگر بۆ هەنگاو نان بەرەو چاکسازیی مرۆڤایەتی لە تەواوی کاروبارەکانی دا.

هەندێك لە نووسەران، کە لە بوارە جیاجیاکان لەگەڵ هزری ئیسلامی دا هاوسۆزن، نووسینەکانیان وەك کاردانەوەیەکی هزری هاوچەرخی لە جیهانی ڕۆژاوا هاتوو، کە دەوری ئیسلامی گرتویە، دەرکردوە و، بۆ بەرگری کردن لە ئیسلام تێدەکۆشن و، بۆ دوورخستنەوەی ئەو تۆمەتە هەڵبەستراو و بوختانانە کۆشش دەکەن، کە گوایە کۆنە و لە سەردەمی ئێستا دا بۆ پیادە کردن ناگونجێت.

ئێمەش پۆزشت بۆ ئەمان دەهێنینەوە، کە ئیتر هزری ئیسلامی لە وەستان و بەستانی بەسەر دا تێپەڕی، کە بوە هۆی داپۆشینی مەشخەڵ و بەهاکانی و، توانای ڕێ کردنی سەردەمەکان و، بوە هۆی هاتنە دیی گومان لە لای موسوڵمانان لە پێڕۆی ئیسلامی و توانای ڕوویەڕوو بوونەوەی هۆکارە کاتی و شوێنییەکان[1].

هەڵبەت ولاّتە ئیسلامییەکان لە تەواوی بوارەکان دا، بە هزر گەلێکی ڕۆژهەلاّتی و ڕۆژاوایی هێرشی کراوەتە سەر و بە بنەما و ڕێبازی نوێ خزانە ناو

---

[1] أحمد إبراهيم أبو سن: الإدارة في الإسلام، مكتبة وهبة، القاهرة ١٤٠٤ه/ ١٩٨٤م طبعة ثالثة،ص١.

هزرمان، جا ئەگەر ئەم ڕێبازانە بۆ ژینگە ڕەسەنەكان گونجاویش بن، ئەوا لەسەر ئێمەیە، كە بە بیرێكی چاك بۆ ئیسلام پێشوازی نەكەین، بەڵام تاكی موسوڵمان، پەسەندی دەكات، بەوەی پێی وایە هزر گەلێكی نوێن، چونكە پاشخانێكی لە بارەی ئیسلام و هزری ئیسلامی نییە، بۆ ئەوەی بتوانێت پێیەوە پێشوازیی هەر بیرێكی هاتوو بكات و، شارەزاییەكی تەواوی لە بارەی ئیسلام و ئاینەكەی نییە، ئەگەر نا پێویستی نەدەكرد، كە ڕوو لە هزرێكی نوێ بكات و بیكات بە پێشەنگی خۆی و باوەڕی پێ بكات[٢]

هیچ سوودێكمان پێ ناگات، گەر ئیسلام و هزری ئیسلامی لە تەك هزری هاوچەرخ دابنێین، بۆ ڕەنج دانی مرۆڤ بۆ بەراورد پێ كردنیان، لەبەر ئەوەی دانانی هزری مرۆڤ، لە تەك ئیسلام بۆ بەراورد كردن لە نێوانیان دا، مانای بەرزكردنەوەی هزری مرۆڤە، بۆ ڕیزی پەروەردگار، هەروەها هیچ سەركەوتنێك یا بەختەوەرییەك لەم بەراورد كردنە دا نابینین بەوەی ئیسلام لە هزری مرۆیی دەباتەوە، چونكە بردنەوەی لە هزری مرۆڤ، جیاوكییەكی پێ نابەخشێت، كە پێشتر نەیبوو بێت.

بەڵام هەل و مەرجی ئەو ژیانەی تێی دا دەژین و، ئەو ڕژێمانەی فەرمانڕەوایەتیمان دەكەن و ئەو باوەڕە ڕۆژاواییانەی، كە هێرشیان كردۆتە سەرمان و، ئامرازەكانی ڕاگەیاندن و پروپاگەندە و بڵاوكراوەكانی، تەیار كراون لە لایەك و، بەتاڵیی زەین و دەروونی موسوڵمانان لە زانیاری ڕاستەقینەی هزری ئیسلامی لە لایەكی تر، ناچاری بەراورد پێ كردنمان دەدەن، لە نێوان ئیسلام و هزری هاوچەرخ دا، پاشان هەندێك تایبەتمەندی بە ئیسلام دەدەین، كە لە ڕاستی دا لە ناخی خۆیەتی، بەڵام دەیدەینە پاڵ هزرە هاوچەرخەكان، بەنموونە دەڵێین ئیسلام ئابوورییەكی هاوبەشییە، یا ئیسلام فەرمانڕەواییەكی دیموكراتییە، یا كارگێڕی لە ئیسلام دا لە بزاوتی پەیوەندییە مرۆییەكان نزیكترە لە بزاوتی بەڕێوەبردنی زانستی.

---

[٢] محمد بن عبدالله البرعي: مبادئ الإدارة والقيادة في الإسلام- إصدار نادي منطقة الشرقية الأدبي- طبعة أولى- صفحة ١٨و ١٩

ئەگەر سەرنجێکی وردی هزری ئیسلامی بدەین، لە هەر بوارێـك لـە بوارەکـانی دا، ئەوا پێڕۆیەکی تەواوکارمان بۆ ژیان دەسـت دەکـەوێت، هـەموو ئـەو باشـی و چاکییانەی تیّ دایە، کە لە تیۆرە هاوچەرخەکان دا هاتوە، ڕەنگە زیاتریش بێت.

لەم ڕووەوە ئێمە مەبەستمان ئەوە نییە هزری هاوچەرخ لەو مافەی، کە هەیـەتی بـێ بـەش بکـەین، لــە دەرکردنــی ڕای ئابووریییــەکی راســت، یــا بیرۆکــەی فەرمانڕەواییەکی گونجاو و پێشـهاتەکانی، بـەڵام ئەگـەر ئـەوەی بەدەسـت هـات، ئابوورییەکی تایبەتمەند یا کارگێڕییەکی تایبەتمەند یا کۆمەڵگەیەکی تایبەتمەند بوو بۆ کۆمەلگەی ئیسلام، لەبەر چی نەڵێین "ئا ئەوەیە ئیسلام".

کەواتە لەسەرمانە، کە لە هەر هزرێك لە هزرە هاوچەرخەکان دا، بۆ ئیسلام و، ئەو پیاوە پسپۆڕانە بگەڕێینەوە، کە خوای گەورە لەبارەیانـەوە فەرمویـەتی: ﴿وَلَـوْ رَدُّوهُ إِلَى الرَّسُولِ وَإِلَى أُوْلِي الأَمْرِ مِنْهُمْ لَعَلِمَهُ الَّذِينَ يَسْتَنبِطُونَهُ مِنْهُمْ﴾[٣]. واتـا:" ئەگەر (کێشە و کاروبارەکانیان) بۆ پەیامبەر و کاربەدەستەکانیان(کە لە خۆیـانن) بگەڕێننـەوە، ئـەوا دەزانــن هــەڵێنجانی بـۆ بکـەن (و هەڵوێسـتی لـە بـارەوە وەردەگرن)" کەواتە لەسەر زانایانی موسولمانە، کە لـە تـەواوی بـوارە زانسـتی و هزرییەکان دا، تێخوێندنەوەی ئیسلام بکەن و بـۆ خـەڵکی بخەنـەڕوو، بـەوجۆرەش ئامانجی سەرخستنی دۆزی ئیسلامان کۆتایی پیّ دێت[٤] مەبەست لەم توێژینەوەیـە ئەوەیە، کە تیۆرێکی تەواوکار بۆ بەڕێوەبردنی ئیسلامی، پشت بەستوو بە ڕێبـازی ئیسلام دابڕێژین، کە لەم بوارە دا شان لە شانی هەموو هزرە هاوچەرخەکان بدات.

بیرۆکەی بەڕێوەبردن و ئەو بنەمایانەی ڕێکی دەخەن و، ئەو گرفتانەشـی پـەکی دەکەوێنن، لەوەتەی مێژوو پێشکەوتنی بەخۆیـەوە بینیـوە ناسـراون، لەسـەردەمە سەرەتاییەکان دا، کۆمەڵە سەرەتاییەکان ئاشنای جۆرێك لە بـەڕێوەبردن بوونـەوە، ئەمەش لە کاتێـك دا هەریـەك لـە کۆمەڵـەکان هەسـتیان کـردوە، بـە پێویسـتی هاریکاری بۆ بەدەست هێنانی بەرژەوەندییە هاوبەشەکان، لە نێـوان تاکـەکانی دا،

---

[٣] سورة النساء: ٨٣.

[٤] إبراهيم أبو سن: الإدارة في الإسلام، ص٣. أحمد

ئەمەش خۆی لە خۆی دا وای کرد کەسێك لە نێویان دا تەرخان بکرێت لە شێوەی سەرکردەیەك، کە هەڵسوڕاندنی کارەکانیان بگرێتە ئەستۆ و، کاروبارەکانیان ڕێك بخات و، هەڵبستێت بە هەماهەنگی و سازاندن لە نێو بەرژەوەندی و ئارەزووەکانیان دا، ئەمەش بە سروشتی خۆی دەسەڵاتی بۆ سەرکردە دەچەسپاند لە فەرمان و ڕێ گری لە سەرجەم تاکەکانی کۆمەڵەکەدا بکات، کە پێیەوە وابەستەن و، مافی نوێنەرایەتیشی لەگەڵ کۆمەڵە هاوشێوەکانی و مافی کۆتایی پێ هێنانی ئەو گرفتانەشی دەبوو، کە لە نێوانیان دا دروست دەبوو[٥]

لەم سەردەمە نوییەدا هەندێك گوزارشت دەرکەوتون، وەك گوزارشتی: "چاکسازیی کارگێڕی" و "گەشەپێدانی کارگێڕی" و "شۆڕشی کارگێڕی" و هی تریش، کە بە بەدەرکەوتنی ئاراستەی زێدە بوون لە لایەن وڵاتانی گرنگیدەر بە تێخوێندنەوەی گرفتە کارگێڕییەکان لکان، ئەوەش لە ئەنجامی تووشهاتنی ئەو دەستگایانەی، کە بە کردەی کارگێڕی هەڵدەستن، بە لادان و ئاڵۆزیی ڕاپەڕاندنی فرمانەکانی، لەمەش دا جیاوازی لە نێوان وڵاتە تازە پێگەیشتوو و وڵاتە پێشکەوتوەکان و، وڵاتە سەرمایەداری و سۆسیالیستییەکان دا نییە[٦]

هەر تەنها بەوە نەوەستا، بە هەوڵ دان بۆ وێنا کردنی پێناو گەلێك بۆ چاکسازیی دەستگەی کارگێڕی و، کار کردن بۆ بەرز کردنەوەی ئاستی بەرهەمدارێتی و گەشە پێ دانیان لە ڕووی خۆش گوزەرانی، کە وڵاتەکان هەوڵی بۆ دەدەن، بەڵکو لەوەش زیاتر تێپەڕی، کە بوو بە پێویستییەکی هەنووکەیی لە پێداویستییەکانی سەردەم، بۆ ڕووبەڕوو بوونەوەی تەنگەژە پەهاوێشتوەکانی ئەم سەردەمە، کە لە دەستگا کارگێڕییەکان سەریان هەڵ داوە و، ڕۆژ دوای ڕۆژیش زیاد دەکات.

ئەمرۆش شاراوە نییە کە چاك یا خراپ هەڵسانی دەستگەی کارگێڕی بەو ڕۆڵەی پێی سپێردراوە و، بەدەست هێنان یا بەدەست نەهێنانی ئامانجە دیاری

---

[٥] إبراهيم عبدالعزيز شيحا: الإدارة العامة، الدار الجامعية، بيروت ١٩٨٣م، ص٦.

[٦] إبراهيم عبدالعزيز شيحا: الإدارة العامة، الدار الجامعية، بيروت ١٩٨٣م، ص٥.

کراوەکانی، کە لەڕاستی دا بەربەستەکانی کەلکی گشتی مەلاس دەدا، کاریگەریی بەسەر سیستمی بالادەستی ولات دا هەیە، جا گومان چییە لەوەی، کە ئاراستەی دەستگەیە کارگێڕییەکان لە ڕاستی دا ڕووی بۆ سیستمی سیاسیی بەرانبەر هاولاتییان و، ئەو ئاوێنەیەی، کە خەڵکی سروشتی فەرمانداری و سیستمەکەی تێ دا دەبینن، دەگەڕێتەوە[٧]

کاتێك جەماوەر یا هاولاتی هەرەشە لە بەرژەوەندییە تایبەتییەکانی دەکرێت، جا بەهای ئەم بەرژەوەندییانە هەرچەندێکیش بێت، یا کاتێك هەست بە بەربەست و ستەم لە لایەن ئەو دەستگەیە دەکات، کە مامەڵەی لەگەڵ دا دەکات، لە ئەنجامی لادان یا خراپ بوون یا گەندەڵی یا ئاڵۆز بوونی، ئەو کاتە سیستمی ئەم ولاتە بە تەواو گەندەڵ ناو دەبات، کە دەبێتە هۆی شلۆق بوونی متمانە لای هاولاتییان بە ولات بە گشتی نەك بە دەستگەی کارگێڕی بە تەنها[٨]. بۆیە بە شێوەیەکی گشتگر و بە ڕێگەیەکی خێرا و یەکلاکەرەوە، ولات ڕێگەچارەیەکی نابێت بۆ ڕووبەڕوو بوونەوەی گرفتە کارگێڕییەکان.

بەم بۆنەیەوەش دەبێت ئاگاداری دوو شت بین:

<u>یەکەم:</u> ئیسلام لە کاروباری کارگێڕی دا بە تەوای بنەما گشتییەکانی هاتوە، بەلام لە ڕووی پیادە کردن و وردەکارییەوە، بۆ ڕۆڵەکانی جێ هێڵدراوە، کە تێکۆشانی بۆ بکەن و، بەوجۆرەی لەسەری ڕێك دەکەون و لەگەڵ بەرژەوەندییە گشتییەکان دا دەگونجێت، کە سروشتییە و خۆی لە خۆی دا، بە گوێرەی کات و شوێن دەگۆڕێت، لەم بارەوەش مەرجە و دەبێت تێکۆشانەکە لە چوار چێوەی ئەم بنەمایە گشتی و هەموەکییانەدا بێت.

<u>دووەم:</u> هەر کۆششێك بەشێکە لەو ئایینەی ئیسلام، کە بەردەوام لە فراوان بوون دایە، لەگەڵ گونجانی بۆ هەموو کاروبارێکی موسوڵمانان لە دونیا و ڕۆژی

---

[٧] السيد عباس نور الدين: إدارة العمل الإسلامي، مركز بقية الله الأعظم للدراسات والنشر، طبعة ثانية، ١٩٩٩ بيروت، ص١٤

[٨] إبراهيم عبدالعزيز شيحا: الإدارة العامة، ص٦.

دوایی دا. بێگومان عومەری کوڕی خەتاب خوا لێی ڕازی بێت، کاتێك دیوانی دامەزراند تێکۆشەر بوو، هەروەك بەگواستنەوەی لە ولاتانی فارس و ڕۆم، دایمەزراند.[٩]

ئێمە داوامان لێکراوە کاری چاکتر بکەین و هەمیشە بەهێز بین و فەرمانبەری داوا کردنی زانستین، بە فراوانترین مانای ناوەڕۆکیی زانست، لەم ڕووەوە هیچ کۆتێك نییە جگە لەوەی، کە بەناوی خواوە وەری بگرین و، لەو سنوورانەوە بێت، کە خوای گەورە دیاری کردوون، بۆ نموونە ئێمە فەرمانمان پێ کراوە بە دادگەری، جا ئەگەر هاتوو یاسای کارگێڕی پیادە کراو لە فەرەنسا، ئەو یاسا و دەستوورە بێت، کە دادگەری بەدەست دەهێنێت، ئەوا ئەو یاسایە دەگوازینەوە بۆ ڕێبازی خۆمان، نالێین هیچ نەنگییەکی تێ دا نییە، بەلکو دەلێین، ئێمە ئەگەر ئەو کارە نەکەین- مادەم دەتوانین- ئەوا تووشی چەرمەسەری دەبین، جا چۆن چەرمەسەرییەك. هەروەها لە کاتی وەرگرتن لە کەسانی ترەوە، پێویستە بەوجۆرە بەکاری بهێنین، کە لەگەڵ ڕێبازەکەمان بگونجێت و، بەو شێوەیەش دای بڕێژین، کە خۆمان دەمانەوێت. بۆ ئەوەی ڕوونیش بێت، ئێمە پێویستمان بەو گواستنەوەیە نابێت، مەگەر لە فەرهەنگی زانستیی خۆمان پێویستی کرد[١٠]

ئیسلام هانی گرتنەبەری سەرجەم ئامرازەکان و نوێترینیانمان دەدات، مادەم پیس نییە و، مادامیش خاوەنەکەی مافی خوا و بەندایەتیی تێی دا دەزانێت، ئەمە لە دەروازەی یەکەمیشی دا کارگێڕیی گشتی دەگرێتەوە، لەبەر ئەوەی بەرژەوەندیی گشتی مافی کۆمەڵگەی پێوە بەندە و، مافی خواش زیاتر لەگەڵ ئەوە دایە، کە بەرژەوەندیی گشتیی لە سەرەوەی بەرژەوەندیی تایبەتە.

سامانی تایبەت بەشێکە لە سامانی گشتی، گریمان پڕۆژە تایبەتەکان پێداویستی لە دانەوێڵە و گۆشت بۆ ولات دەڕەخسێنن، ئەمەش مانای نەمانی پێداویستیی ولاتە بە هاوردنی ئەم پێویستییانە لە ولاتێکی ترەوە، کاریگەریی

---

٩ الماوردي الأحكام السلطانية، ص١٩٩ وما يليها.

١٠ القطب محمد طبلية: الإسلام والإدارة والاقتصاد، دار الفكر العربي ١٩٧٨م، ص١٣.

ئەمەش لەسەر سەنگی بازرگانیی دەرەکی و ئابووریی نەتەوەیی و سەربەخۆیی سیاسییەوە دیارە، کە سەربەخۆیی سیاسی بێ دەستبەریی ئابووری نابێت.

دارایی لە ئیسلام دا دارایی خوایە، کە بە جێنشین لەسەری داینـاوین، بەکارهێنانمان لەم داراییە دا، مەرجدارە بەو مەرجەی خاوەنی ڕاستەقینەی داراییەکە داینـاوە، کە خوایە، لەم مەرجانەش گەنج نەکردنیەتی، بەڵکو دەرکردنیەتی بۆ وەبەرهێنانی حەلالی و دەست کەوتی ڕەوا، هەروەها دارایی هی موسوڵمان نییە تەنها ئەوەندەی بۆ خزم و کەسە نزیکەکانی( کە خەرجیان لەسەریەتی) بەس بێت بە چاکی، هەرچەندە داراییەکە زۆریش بێت[١١]

ئامانجی سەرەکی ئەم توێژینەوەیە گێڕانەوەی بنەماکانی بەڕێوەبردنە بۆ ڕەچەڵەکە ئیسلامییەکەی، کە بریتییە لە قورئان و سوننەت، لە سەرەتای سەردەمی پەیامبەر ﷺ و جێنشینەکانی ڕاشیدین خوا لێیان ڕازی بێت.

سرووشتی ئەم توێژینەوەیەش وامان لێ دەکات، کە پشت بەم پلانەی خوارەوە ببەستین:

**بەندی بەرایی: پێناسەی بەڕێوەبردن.**

**بەندی یەکەم: پلان دانان.**

**بەندی دوەم: ڕێکخستن.**

**بەندی سێیەم: سەرکردایەتی.**

**بەندی چارەم: هەماهەنگی و پەیوەندیکاری.**

**بەندی پێنجەم: چاودێری.**

**بەندی شەشەم: نموونەی پیادە کراو: لێپێچینەوە**

---

[١١] أبو بكر ابن العربي: العواصم و من القواصم، تحقيق محب الدين الخطيب، طبعة رابعة، ص٧٥.

# پێشەکی

سوپاس و ستایش بۆ خوای گەورە و درووود و سەلام لە پەیامبەری خوا و ڕەزای خوا لە تەواوی هاوەڵان و شوێنکەوتوانی تا ڕۆژی دوایی.

زانستی بەڕێوەبردن یەکێکە لەو بوارانەی، کە لەگەڵ پێشکەوتنی مرۆڤ لە بواری تەکنەلۆژیا و زانستەکانی تر دا، پەرەسەندنێکی زۆری بەخۆیەوە بینیوە و، بوەتە بوارێکی زۆر گرنگ و پێویست بۆ هەر کۆمەڵگە و شارستانییەتێك، کە مەبەستی بێت لە کاروانی پێشکەوتن و گەشەسەندن دا دوانەکەوێت.

ئەم زانستە (کە لە هەمان کات هونەریشە) لقی زۆری لێ بوەتەوە و هەر یەکەی بوەتە زانستێکی سەربەخۆ و توێژینەوە و تێخوێندنەوەی زۆریان لەسەر کراوە و کۆلێژ و پەیمانگەی تایبەتی بۆ دامەزراوە و دەستگە و فەرمانگە و هاوبەشگە و تەنانەت تاکەکانیش، بنەما و ڕێساکانیان خستوەتە پڕۆگرامی کارەکانیان، بۆ ئاراستە کردن و بەرەوپێش بردنی کارەکانیان.

هزری ئیسلامیش لەم زانست و بنەمایانە دا بێ بەش نییە، بەڵکو زۆر لە پێشەوەی سیستەمەکانی ئەم سەردەمە دایە، بەڵام پێویستی بە توێژینەوە و تێخوێندنەوە هەیە، بۆ دەرخستنی بنەما و ڕێساکانی، بە مەبەستی داڕشتنی تیۆریایەکی بەرفراوان لە بەڕێوەبردن و کارگێڕیی ئیسلامی دا.

بەڕێوەبردنی ئیسلامی وەکو زانستەکانی تر، سەرچاوەکەی بۆ قورئان و فەرمایشتەکانی پەیامبەری خوا ﷺ، کە بەشێوەیەکی پیادەکراو لە ژیانی پەیامبەری خوا ﷺ بەرجەستە دەبێت، دواتریش لە بەڕێوەبردنی وڵات و دەستگەکانی لە سەردەمی جێنشینەکانی دا، کە پێشکەوتووترین سیستمی کارگێڕییان تێ دا پیادە کراوە، دەگەڕێتەوە، تا ئێستاش سیستمە کارگێڕییەکانی سەردەم نەگەیشتوونەتە ئەم ئاستە.

هەموو بنەماکانی بەڕێوەبردنی سیستمی دانراوی لە سەردەمی پەیامبەری خوا ﷺ و جێنشینەکانی ڕاشدین و تایبەت لە سەردەمی عومەری کوڕی خەتاب دا بـە زیادەوەش پیادە کراون، لە پلان دانان و بڕیـار دان و ڕێکخسـتن و سـەرکردایەتی و هەماهـەنگی و پەیوەنـدیکاری و چـاودێری، وێـڕای پیـادە کردنـی سیسـتمی لێپێچینەوە(حسبة)، کە تایبەتمەندییەکی سیستمی ئیسلامییە، کۆمەڵگـە و وڵات ئاراستە دەکات بۆ کردەوە و بەرهەمی چاك و بە پێز و دوورکەوتنەوە لە کرداری نا شیاو و تێکدەر.

ئەم پەرتووکە، کە تێخوێندنەوەیەکی بەراوردکاریی نێـوان هـەردوو سیسـتمی ئیسلامی و دانراوییە، دەریدەخات، کە هزری ئیسـلامی هزرێکی گشتگرە و توانای بەدەست هێنانی بەرژەوەندییەکانی مرۆڤایەتیی هەیە لە گشت بوارەکانی ژیان دا.

هەروەها ئەم توێژینەوەیە ئەو ڕاستییە دەسەلمێنێت، کە سیستمی کارگێڕی لـە ئیسلام دا لە هزری ئیسلامی دا لە پێش سیستمەکانی ئەم سەردەمە دایە، هەردوو سیستمی دانراوی و ئیسلامی. بەڵگەشە لەسەر شیاویی سیستمەکانی ئیسلامی بۆ گشت سەردەمێك و شوێنێك و بارێك.

وەرگێڕ بە شارەزایی و پسپۆڕیی خۆی لە بـواری بـەڕێوەبردن و شـارەزایی لـە زمانی کوردی و داڕشتنی و ئاگاداریی بە زمانی عەرەبی لەو بوارەدا، توانیویـەتی ناوەڕۆك و ئامانجی پەرتووکەکە بە خوێنەری کورد بگەیەنێت.

وەرگێڕانـی ئـەم پەرتووکـە کـەلێنێکی گـەورەی پەرتووکخانـەی کـوردی پـڕ دەکاتەوە و هەنگاوێکی گرنگە بۆ ئەوەی پسپۆڕانی ئەم بوارە زیاتر توێژینـەوە لـەم بوارە گرنگە دا بکەن، کە کۆمەڵگەی ئێمە پێویستی زۆری پێ هەیە.

**م. لقمان بەهائەدین**
**هەولێر/ تەموزی ٢٠٠٩**

# پێشەکیی وەرگێڕ

ستایش بۆ خوا، دروود لەسەر سەروەرمان موحەمەدﷺ

بەڕێوەبردن لە ڕووی تیۆرییەوە وەکو زانستێکی نوێی ئەم سەردەمە سەری هەڵداوە و، بایەخێکی گەورەی لە لای پسپۆڕانی سیاسی و پیاوانی کار و شارەزایان درووست کردوە، هەر بەم زوانەش خۆی خزاندوەتە ناو خوێندنی زانکۆ و پەیمانگەکان و بوەتە جێی مشتومڕی زانایان، بەلاّم لە ڕووی پیادە کردنەوە سەرەتای سەرهەڵدانی بە دیاری کراوی دیار نییە، بەڵکو هەر کۆمەڵە شارەزا و زانایەك لەم بوارە دا بۆ سەردەمێکی دەگەڕێننەوە، بەلاّم ئەگەر بە وردی بەدواداچوونی بۆ بکرێت و سەیرێکی مێژووی ئیمپراتۆریا و شانشینەکان بکرێت، ئەوا لە هەر سەردەمێك دا کۆمەڵە زانیارییەك و بنەمایەك بۆ ئەم زانستە دەستەبەر دەبێت، بە جیاوازیی ئیمپراتۆریا و شانشین و سەردەمەکانیان.

سەرەتای دەرکەوتنی بەڕێوەبردن وەك زانستێکی تیۆری بۆ سەدەکانی نۆزدە و بیست دەگەڕێتەوە، کە چەند زانایەك یا ڕابەڕێکی بواری بەڕێوەبردن وەکو "فردریك تایلەر، هنری فایۆڵ" بە تایبەت سەرەتای بنەماکانیان ئاماژە پێداوە.

شارەزایان لە تیۆریای بەڕێوەبردن و فرمانی کارگێڕی دا پێناسە و ڕوونکردنەوە گەلێکی جیاجیایان بۆ هەریەکەیان کردوە، بە گشتی بەڕێوەبردن وا ڕوون دەکەنەوە، کە "کۆمەڵێك ڕێسا و یاسا یا بنەمای زانستین، کە کارگێڕ و/ یا بەڕێوەبەر بەهۆیانەوە توانا و کارامەییە هونەرییەکانی بۆ وەرگرتنی بڕیار – پلان دانان – ڕێکخستن – هەماهەنگی ئاراستە و/ یا سەرکردایەتی کردن – چاودێری و هەڵسەنگاندنی بەجێهێنان، دەخاتەگەڕ

هەنووکە و دوای هەڵسانەوە و بە ئاگاهاتنی شارەزایانی بواری زانستە ئیسلامییەکان لە گشت بوارەکان دا، چەندین تیۆریا لە بوار گەلێکی جیاجیا دا دانراون، لەم جۆرەها تیۆریایانە دا، تیۆریای بەڕێوەبردنی ئیسلامیش سەری هەڵداوە، بەڕێوەبردنی ئیسلامی بە پشت بەستن بە چەندین ئایەتی قورئانی پیرۆز و فەرمایشتی پەیامبەری خوا ﷺ داڕێژراوە و بە پشت بەستن بە سەردەمی عومەری کوڕی خەتاب خوا لێی ڕازی بێت بنەماکانی بۆ دانراوە.

یەکێك لەو ئایەتانەی قورئانی پیرۆز لە دەرخستنی پێویستیی بوونی کەسانێك لە فەرمانڕەویی و بڕیار دان دا، ئەوەیە، کە خوای گەورە دەفەرموێت: "ئەوانەی(کەشایەنی یارمەتی دانن) لە زەوی دا توانامان پێداون نوێژ ئەنجام دەدەن و زەکات دەدەن و فەرمان بە چاکە دەکەن و بەر لە خراپە دەگرن ئاکامیش هەر بۆ لای خوایە"[١٢] ئەم ئایەتە پیرۆزە ئاماژەیەکی کراوەیە بۆ گشت دەسەڵاتدار و فەرمانڕەوایەکی موسوڵمان لە هەر وڵاتێکی ئیسلامی دا بۆ سۆزدارییی بە کار کردن بەو چاکانەی خوای گەورە لە پەرتووکی پیرۆزی و لە ڕێگەی پەیامبەی سەروەرەوە پێمانی گەیاندوە، بۆ لە هەمان کات دا دوورکەوتنەوە و ڕێگری کردن لەو خراپانەی ئاماژەیان بۆ کردوە.

هەروەها لە چەند ئایەتێکی تری قورئانی پیرۆز دا، ئاماژەی پێویستیی بوونی فەرمانڕەوایەتییەکی دادگەرانەمان بەرچاو دەکەوێت، هەروەك ئایەتەکانی "ئەگەر(کاتێك)یش فەرمانڕەواییتان لە نێو خەڵکی دا کرد، ئەوا بە دادگەری بیکەن"[١٣]، "هەر کەسێکیش بەوەی خوا دایبەزاندوە فەرمان نەکات، ئەوا هەڵبەتە بێ بڕوان"[١٤]، "هەر کەسێکیش بەوەی خوا دایبەزاندوە فەرمان نەکات، ئەوا هەڵبەتە ستەمکارن"[١٥] و، "هەر کەسێکیش بەوەی خوا دایبەزاندوە فەرمان

---

[١٢] الَّذِينَ إِن مَّكَّنَّاهُمْ فِي الْأَرْضِ أَقَامُوا الصَّلَاةَ وَآتَوُا الزَّكَاةَ وَأَمَرُوا بِالْمَعْرُوفِ وَنَهَوْا عَنِ الْمُنكَرِ وَلِلَّهِ عَاقِبَةُ الْأُمُورِ/ سوورەتی هەج: ئایەتی ٤١، وەرگێڕ

[١٣] وَإِذَا حَكَمْتُم بَيْنَ النَّاسِ أَن تَحْكُمُواْ بِالْعَدْلِ/ سوورەتی نسا ئایەتی ٥٨، وەرگێڕ

[١٤] وَمَن لَّمْ يَحْكُم بِمَا أَنزَلَ اللّهُ فَأُولَئِكَ هُمُ الْكَافِرُونَ/ سوورەتی مائیدە ئایەتی ٤٤، وەرگێڕ

[١٥] وَمَن لَّمْ يَحْكُم بِمَا أَنزَلَ اللّهُ فَأُولَئِكَ هُمُ الظَّالِمُونَ/سەرچاوەی پێشوو: ئایەتی ٤٥، وەرگێڕ

نەکات، ئەوا هەڵبەتە لەڕێ دەرچوون"[١٦] ، ئەم ئایەتانە روونی دەکەنەوە، بێگومـان خوای گەورە رێسا و یاسا گەلێکی ناردوون بەو جۆرەی پێویست بێت موسـوڵمان و هی تریش کاری پێ بکەن و بیکەن بە پێڕەوی ژیان و هەڵسوڕاندنی کاری رۆژانـەی بەڕێوەبردنی وڵات.

هەڵبەت ئەگەر چاوێکیش بە سەربردەی سەروەرمان موحەمەد دا بخشێنین، ئەوا لە تەواوی نیارە کارگێڕی، سیاسی، ئابووری ، کۆمەڵایەتی و،... تـد بـە ئاشـکرا پێـڕۆ و پیادەکاریـیـەکانی دەبیـنین، کـە بـە هۆیانـەوە دەتـوانین بیانخەینـە نێـو چارچێوەیەکی نووسراو بۆ پیادە کردنی لە هەر کات و شوێنێك و چەرخەیەك دا.

نموونـە پیادەکاریـیـەکانی وەك نـاردنی نامـە بـۆ کەلانتـەر و فـەرمانڕەوا و ئیپراتۆرەکانی ناوچەکە، نموونەیەکی بەرچاوی کردنەوەی پەیوەندیی سیاسـین، کـە تیایان دا داوای موسوڵمان بوونی هاوڵاتییان و واڵا کردنی سنوورەکانیان و تەنانەت موسوڵمان بوونی خودی خۆیشـیان دەکـات، لـەم جـۆرە داوایانـە دا سـەراتایەکی کردنـەوەی پەیوەنـدیی کۆمەڵایـەتی و ئـابووری دروسـت دەبێـت، پەیوەندییـە کۆمەڵایەتی و ئابوورییەکان تەنها لەمانـە دا کـورت نەبوەتـەوە، بـەڵکو لـە داوا گەلێکی تر دا، داوای موسوڵمان بوون یا دانی سەرانەیان لێ دەکات، هەڵبەتە ئـەم داوایەیان کردنەوەی پەیوەندیی کۆمەڵایەتییە لە ڕێگـەی پەیوەندییـەکی سیاسـیی ئابووری، کە تەنانەت قورئانی پیرۆز ئاماژە بۆ پاداشت و دانی کرێی ئەو کەسانەش دەکات، کە کاروباری زەکات هەڵدەسوڕێنن، بێگومان ئەمە ئاماژەیەکە بۆ بـوونی کارگێڕییەك.

وەکو دەبینین زانستی بەڕێوەبردن گەیشـتوەتە ئاسـتێکی بـەرز و لـە لوتکـەی پەرەسەندنی دایە، بەڵام پەرتووکخانەی کوردی لەم بوار و پسپۆڕییە گرنگـە دا زۆر بێ بەشە و پێویستیی بە کۆشش گـەلێکی ڕاسـتەقینە و توێژینـەوە گـەلێکی زۆر هەیە، بـۆ ئـەوەی هەرچـی زوە خوێنـەری کـوردی بـەم زانسـتە ئاشـنا بکرێـت و

[١٦] وَمَن لَّمْ يَحْكُم بِمَا أَنْزَلَ اللهُ فَأُولَئِكَ هُمُ الفَسِقُونَ/ سەرچاوەی پێشوو: ئایە ٤٧، وەرگێڕ

کەسانێکی بە توانا بتوانن قۆڵی خۆیانی لێ هەڵبکەن چ خەریکی وەرگێڕان بن چ لەمە چاکتر خەریکی داهێنانی پەرتووک گەلێك بن لەم بوارە دا

هەڵبەتە ئەم پەرتووکە ئەنجامی هەوڵ و ماندوو بوونی دانەرەکەیەتی، وەکو وەرگێڕیش وەك خزمەتێك و خۆشەویستییەك بۆ زمان و بابەتەکە لە هەردوو ڕووەوە، خۆمان لە بەرپرسیارییەکی گەورە دا بینیەوە و قۆڵمان لێ هەلکرد، بە پشتیوانیی خوای زانا و دانا بەم ڕۆژە گەیشتین، داواکارین لە خوای گەورە لە پاداشتی بێ بەشمان نەکات و داوای ڕەزا بوونی لێ دەکەین، بە ویستی خوا خوێنەریش بتوانێت سوودێکی گرنگی لی وەربگرێت

جێی تێبینییە، لەم وەرگێڕانە دا تا کراوە وشەی پەتی بەکار هاتوە، هەندێك وشە ڕەنگە تا ئێستا تەنها لە فەرهەنگەکان دا ئاماژەیان بۆ کراوە.

لە کۆتاییش دا بە پێویستی دەزانم زۆر سوپاسی مامۆستای بەڕێز (لقمان بەهائەدین) بکەم بۆ هەوڵ و ماندوو بوونی و پێداچوونەوەی ئەم پەرتووکە دوای وەرگێڕان، لەگەڵ گشت ئەو بەڕێزانەی داوای هاریکاریم لێ کردوون بەدەنگمەوە هاتوون خوا پاداشتیان بداتەوە.

وەرگێڕ

کۆسرەت موحەمەد ئەبابەکر

هاوینی ٢٠٠٩

# بەندی بەرایی

## بەشی یەکەم

## جیاکارییەکانی بەڕێوەبردن و پێناسە و، کرۆکەکەی

بۆ ئاشنابوون بە کرۆکی بەڕێوەبردن، دەبێت ئەم بەڕێوەبردنە دیاری بکەین و، پێناسەی بکەین وجیاکاری و سروشتەکەی هەژمار بکەین، ئەمەش ئەوەیە، کە لە بەشی یەکەم دا دەیخەینە ئەستۆ.

هەروەك دەبێت پەیوەندیی بەڕێوەبردن بە زانستە کۆمەڵایەتییەکانی تر دیاری بکەین، ئەمەش لە بەشی دوەم دەخەینە ڕوو.

بەشی سێیەمیش تەرخان دەکەین بۆ تاوتوێ کردنی ئەو بابەتانەی، کە بەڕێوەبردن دەیانگرێتەوە و، ڕێگەکانی توێژینەوەی ئەم بابەتانەش دیاری دەکەین.

بەر لە دەستکردنمان بە توێژینەوەکە وا باشە ، کە لە بەشی یەکەم دا، کورتە سەرنجێکی مێژوویی بەڕێوەبردن بخەینە ڕوو.

### ـ کورتە سەرنجێکی مێژوویی:

بەڕێوەبردن دیاردەیەکە یاوەریی بوونی کۆمەڵگە سیاسییەکان دەکات، کەواتە ئەگەر کۆمەڵگەیەکی سیاسیی ڕێکخراو بوونی هەبێت، بەڕێوەبردنیش بوونی دەبێت.

هەندێك پێیان وایە، کە بەڕێوەبردن لە چین دەستی پێ کردوە، چونکە چینییەکان یەکەم کەس بوون، کە مەرجی تاقی کردنەوەیەکی دیار کراویان، سەبارەت بە پاڵێوراوان بۆ چوونە ناو فرمانەکانی حکومەت دانـاوە تاوەکو دایان

بەزرێنن، واتە ئەوان یەکەم کەس بوون، کە سیستمی لێوەشاوەییان بۆ دامەزراندن لە فرمانە گشتییەکان دا گرتوەتەبەر[١٧]

هەندێکی تر پێیان وایە، کە میسرییە کۆنەکان گەیشتوونەتە پلەیەکی بەرزی پێشکەوتن، لە ڕێکخستن و لێهاتوویی

هەندێکی تریش پێیان وایە، کە گریکەکان کارگێڕییەکی پێشکەوتویان هەبوە[١٨]

هەروەها هەندێکیشیان پێیان وایە، کە ڕۆمەکان زۆرێك لە بنەمای بەڕێوەبردنیان، لە ڕێکخستن و بەڕێوەبردنی سوپا و کارگێڕییە شارستانییە جیاجیاکان دا، پیادە کردوە، لە تەواوی ئیمپراتۆریەتی فراوانی ڕۆم، هەروەها دەستگەی کارگێڕیی ولاتی ڕۆمانی بە قەبەترین دەستگەی کارگێڕیی بیرۆکراتی ناسراوە لە مێژوو دا[١٩]

واشی دەبینین، کە لەم سەرنجە مێژویە کورتە دا، نموونەیەکی مێژویی دیاری بەڕێوەبردن نیشانبدەین، کە نموونەی کارگێڕییە لە میسری کۆن دا.

هەڵبەت میسرییە کۆنەکان سیستمێکی کارگێڕییان دامەزراندوە، کە بەم تایبەتمەندییانەی خوارەوە جیا دەکرێتەوە:

## یەکەم: پشت بەستن بە پلان دانان

هەڵبەت میسرییە کۆنەکان لە ماوەی سەردەمی فیرعەونەکان دا، بۆ خەملاندنی دەستکەوتی ساڵانەی دانەوێڵەی کشتوکاڵی پشتیان بە پلان دانان بەستوە و، هەڵستاون بە پێوانە کردنی جێگیریی ئاو و هەواو زریان لە هەموو

---

[١٧] عبد الغني بسيوني عبدالله: أصول علم الإدارة العامة، الدار الجامعية للطباعة والنشر، بيروت ١٩٨٣، ص٤١.

[١٨] عبد الغني بسيوني عبد الله: أصول علم الإدارة، ص٤٢.

[١٩] علي شريف: أصول الإدارة العامة، دار المطبوعات الجامعية، ص١٥.

سـالێك دا، توانیویانـە بگەنـە ئـەوەی پێشـبینی بكـەن، كـە ئایـا سـالێكی خۆشەگوزەرانییە، یا سالێكی كەم دەستكەوت دەبێت[٢٠]

## دوەم: بەكارهێنانی ئامار

میسرییە كۆنەكان ئامارییان بـەكارهێناوە، بـۆ زانینـی ژمـارەی دانیشـتوان و خەملاندنی سامانەكان، بە مەبەستی خەملاندنی باج لەسەر داهات[٢١]

## سێیەم: پیادە كردنی سیستمێكی پەرەسەندوو بۆ فرمانە گشتییەكان

میسرییە كۆنەكان بۆ دەستنیشان كردنـی فرمانبـەران، گـورجیی كارگێڕییـان لەبارچاو گرتوە و، سیستمی مەشق پیێ كردنی فرمانبەرانیان بەسەر كارەكانیان دا، پیادە كردوە[٢٢]

## چارەم: پێك چوون لە هەندێك تایبەتمەندیی نوێ دا

هەڵبـەت دەسـتگەی كـارگێڕی لـە سـەردەمی فیرعـەون بـە هەنـدێك لـەو تایبەتمەندییانە جیا دەكرێتەوە، كە دەستگەی كارگێڕیی نوێی پیێ جیا دەكرێتـەوە، وەك لـەخۆگرتنی كـارگێڕیی جیاجیـا و زۆر، بـە گـوێرەی ئـەو كردەیـەی پێـی سپێردراوە، وەك لەخۆگرتنی سیستمێك بۆ تۆمار و بەڵگەنامە و نووسینی ڕاپـۆرت و سیستمی كرێ و مووچەش[٢٣]

---

[٢٠] عبد الكريم درويش وليلى تكلا: أصول الإدارة العامّة، مكتبة الأنكلو مصرية، القاهرة ١٩٧٦م، ص٧٩.

[٢١] عمر ممدوح مصطفى: أصول تاريخ القانون، دار المعارف، القاهرة، ص١٤٩.

[٢٢] عبد الغني بسيوني عبد الله: أصول الإدارة العامة، ص٢٧.

[٢٣] بكر القباني: الإدارة العامة، دار النهضة العربية، القاهرة ١٩٦٨م، جزء أول، ص٤٤٠.

# توێژبەندی یەکەم

## جیاکارییەکانی بەڕێوەبردن

لەبەر ئەوەی ئێمە تاوتوێی بەریوەبردنی گشتی دەکەین، دەبێت هەڵستین بە ڕوون کردنەوەی مەبەستی زاراوەی بەڕێوبردنی گشتی و تایبەتمەندییەکانی ئەم بەڕێوەبردنە، بۆ ئەوەی پاش ئەمە هەڵستین بە تاوتوێ کردنی پێناسەکانی بەڕێوەبردنی گشتی.

چەمکی وشەی بەڕێوەبردن (Administration) جەخت لەسەر مانای زمانەوانی ئەم وشەیە دەکاتەوە، کە ئەم وشەیە چاوگی کارگێڕ/ هەڵسوڕێنەر(Administrer)ی بە ڕەسەن لاتینییە، ئەم گوزارشتەش پێکهاتەی وشەی لاتینیی (Administrate)ە، ماناکەشی خزمەتکردنی کەسانی ترە، یا پێشکەس کردنی یارمەتییە بە کەسانی تر[٢٤]

لە زمانی فەرەنسیش دا دەبینین، کە دوو مانا بۆ کاری(Administrer) هەیە، مانای یەکەم بۆ کارگێڕیی تایبەت ڕێ دەکات، وەك هەلستانی هاوسەر بە بەڕێوەبردنی دارایيە هاوبەشەکانی لەگەل خێزانەکەی، مانای دوەمیش بۆ کارگێڕیی گشتی دەگەڕێتەوە، وەك هەڵستانی پارێزگاری شار بە کارگێڕییەکەی[٢٥]

لەمەی پێشوو دا ڕوون کرایەوە، بۆمان ڕوون دەبێتەوە، کە مانای فراوانی بەڕێوەبردن بۆ ئاراستە کردنی هەوڵی مرۆیی ڕێ دەکات، بە مەبەستی بەدەست هێنانی ئامانجێکی دیار کراو، جا کارگێڕیی گشتی بێت یا کارگێڕیی تایبەت، سەرباری جیاوازیی زۆریش لەنێوانیان دا.

---

[24] Larousse classique, Paris, 1947, p.12.

[25] Petit Rpbert, Paris, p.23.

لە ڕاستیش دا چالاکیی مرۆڤ لە شێوە جیاجیاکانی دا پێداویستی بە کارگێڕی هەیە، کە دەبێت هاریکاری و هەماهەنگی لەنێو هەوڵەکان دا دەستەبەر بکرێت، بۆ گەیشتن بە ئامانجی دیاری کراو، ئەم مانایە لەسەر هەموو ڕێکخستنە کارگێڕییەکانیش دا پیادە دەبێت، جا ئایا گشتی بێت، وەك وەزارەت و دەستە و دەستگاکانی حکومەت، یا تایبەت بێت وەك هاوبەشگە بازرگانی و پیشەسازی و کۆبەندە خێرخوازییەکان[٢٦]

لە خوارەوەش دا گرنگترین جیاکارییەکانی بەڕێوەبردن دەخەینە ڕوو:

کارگێڕی بەوە جیا دەکرێتەوە، کە مرۆیی و پێویستە، ڕوەو ئامانجێکی دیار کراو کۆشش دەکات.

## جیاکاریی یەکەم: مرۆییەتیی کارگێڕیی

کارگێڕی چالاکییەکە پەیوەستە بە هەوڵی مرۆڤ و، جەخت لەسەر پەیوەندییە مرۆییەکان و هاریکاریی کۆمەڵەیی دەکاتەوە، ئەمەش بە مۆرکێکی مرۆیی جیا دەکرێتەوە، لەبەر ئەمەش سەرکەوتنی کارگێڕی دەوەستێتە سەر ئەو ڕەگەزە مرۆییەی تیای دایە[٢٧]

لێرەدا پەیامبەر ﷺ والی و کارگەرانی بە گوێرەی لێهاتوویی و، بەگوێرەی سروشتی ئەو کارەی، کە هەریەکێکیان دەیان گرتە ئەستۆ، دەستنیشان دەکرد و، مووچەی هەر یەکێکیانی بەهێندەی کارەکەی و بە پێی پێداویستییان، بۆی دەخەملاند و، بە ڕاسپاردەی بەردەوام بارێزی دەکردن و بەردەوام چاودێریی بەسەریان دا دەکرد[٢٨]

---

[٢٦] عبد الغني بسيوني عبد الله: أصول علم الإدارة العامة، صفحة ١٨ وما يليها.

[٢٧] إبراهيم عبد العزيز شيحا: الإدارة العامة، ص٣٧.

[٢٨] علي علي منصور: نظم الحكم والإدارة في الشريعة الإسلامية والقوانين الوضعية، دار الفتح للطباعة والنشر، بيروت، طبعة ثانية، ١٣٩١ه- ١٩٧١م، ص٢٣٠-٢٣١.

پشت بەستنی مرۆڤ لە کارە کارگێڕییەکەی دا بە ئامێرە ئەلیکترۆنییە نوێیەکان و، ژمێرەی ئەلیکترۆنی، ناتوانن لە سروشتی مرۆییەتیی کارگێڕی بگۆڕن، لەبەرئەوەی هەر مرۆڤە، کە بەڕێوەبردنی ئامێرەکان دەگرێتە ئەستۆ و، هەر ئەویشە بۆ مەبەستەکانی خۆی هەڵدەستێت بە بەکارخستنیان، هەر ئەویشە ئەم ئامێرەی داهێناوە، لەبەرئەمەش سەرکەوتنی هەر کارگێڕییەك لە پێگەی یەکەم دا، پشت بەو هەولانەی، کە تاکەکانی دەیدەن و ڕادەی دڵسۆزی و خۆ یەکلا کردنەوەیان لە کارکردن دا، دەبەستێت[29]

ئیسلام بە سپاردە گوزارشت لەبەرژەوەندییەکانی خەڵکی دەکات، کەسێکیش ناپاکییان تێ دا بکات، ئەوا لە دونیا و ڕۆژی دوایی دا لێپێچینەوەی لەگەڵ دا دەکرێت و، لەسەر هەر کارکەرێکە بە پارێزکاری و دڵسۆزانە مافی فرمانەکەی بدات[30]

لە باشترینی ئەو کەسانەشی، کە پەیامبەر درود و سەلامی خوای لەسەر بێت کۆ کردنەوەی دارایی خستە ئەستۆی، عەبدوڵلای کوڕی ڕەواحە بوو، کە بۆ خەیبەری نارد، بۆ ئەوەی دارخوورماکانیان بۆ بخەملێنێت، ئەوانیش هاتن بەرتیلی پێ بدەن و، خشلی ئافرەتەکانیان بۆ هێنا، عەبدوڵلای کوڕی رواحەش پێی گوتن:"لە لایەن خۆشەویسترین کەسم بۆ لاتان هاتووم و، ئێوەش کینەدارترینی بەدی هێنراوانی خوان لام و، خۆشەویستیم بۆ ئەو و کینەم هانی ستەم لێ کردنتانم نادات، ئەوەی بۆتان هێناوم بەرتیلە ئەویش یاساخە و نایخۆین"، ئەوانیش گوتیان: "ئاسمان و زەوی بەم دادگەرییە دامەزراوە"[31]

هەڵبەت بایەخی گەشە پێدانی پەیوەندییە مرۆییەکان لە ناوەوەی ڕێکخراوە کارگێڕییەکان و لە نێوان کارکەران و، پیادە کردنی سیستمی پاڵنەری کەرەستەیی و واتایی، تا ڕادەیەکی باش زەق بوەتەوە، ئەمەش لە سەردەمی نوێ دا، لە

---

[29] عبد الغني بسيوني عبدالله: أصول علم الإدارة العامة، ص١٩-٢٠.

[30] علي علي منصور: نظم الحكم والإدارة في الشريعة الإسلامية والقوانين الوضعية، ص٢٣٢.

[31] علي علي منصور: نظم الحكم والإدارة في الشريعة الإسلامية والقوانين الوضعية، ص٢٣٠.

ڕۆژگاری پەیامبەریش درود و سەلامی خوای لەسەر بێت مووچە بۆ کارکەر هەبوە، هەروەك بۆ والیی مەکە عیتابی کوڕی ئەسەدی ڕۆژانە درهەمێکی دیاری کردبـوو، جگە لەمەش بۆ هەندێك والی و کارکەری تر لە بڕی ئەمە، ئەوەی دەیان خوارد لـە بژێویی ڕۆژانەیانی پێ دەدان و، مووچەش بەگوێرەی گۆڕانی ڕەوشەکان دەگۆڕا، لەم بارەوە پەیامبەر درود و سەلامی خوای لەسەر بێت فەرمویەتی: (من ولي لنا ولاية ولم يكن له بيت، فليتخذ بيتاً، أو لم تكن له زوجة ليتخذ زوجة، أو لم تكن لـه دابـة، فليتخذ دابة) واتا: (هەر کەسێك والیی ویلایەتێکمان بێت و، خانوی نەبوو، ئەوا با خانویك بکات بۆ خۆی، یا ژنی نەبوو با ژنێك بۆ خۆی بێنێت، یا سواری نەبوو بـا سوارییەك ببات بۆ خۆی)[٣٢]

پەیوەندییە مرۆییەکان بریتین لە دیمەنێکی کۆمەڵایەتی لە جیاکاریی مرۆییەتیی کارگێڕیی، چونکە ڕێکخستنی کـارگێڕی لـە چـالاکیی کۆمەڵایـەتی و گەیانـدنی پەیوەندییـە مرۆییـەکان لـە بنچـینە بـەهێزەکان دەبینـدرێت، کـە بوارێکـە بـۆ بڵاوکردنـەوەی گیـانی هاریکـاری و پەرۆشـی لـە نێـوان تاکـەکانی ڕێکخـراوەی کارگێڕی.

هەڵبەت ئیسلام لە هەر شـتێك، کـە ڕێکـی دەخـات و دایدەڕێـژێت ئامـانجی مرۆڤە، کە هەموو شتێکی بۆ ڕێکخستوە، تەنانەت خواردن و خواردنەوە و پۆشاك و، سەرجەم کاروبارەکانی لـە ژیـانی تایبـەتی دا بـۆ داڕێشـتوە، لـە ژن هێنـان و جیابوونەوە و خزمایەتی و میرات دا، هەروەها ژیانی گشتی لە مامەڵەی دارایی و کارگێڕی و سیاسی بۆ ڕێکخستوە، هەموو ئەمانـەش ڕێـز گرتنـە لـە مرۆییـەتیی مرۆڤ، خوای شـکۆمەند لـە قورئـانی پـیرۆز دا دەفـەرموێت: ﴿وَلَقَدْ كَرَّمْنَا بَنِي آدَمَ﴾[٣٣]. واتە: "هەڵبەت ڕێزمان لە ئادەمیزاد ناوە".

---

[٣٢] علي علي منصور: نظم الحكم والإدارة في الشريعة الإسلامية والقوانين الوضعية، ص٢٣١وراجع تخريج هذا الحديث في مشكاة المصابيح رقم ٣٧٥١ وتذكرة ابن حمدون صفحة ٦٨.

[٣٣] سورة الإسراء: الآية ٧٠.

کاریش لە ئیسلام دا پێوەری چاکی و خراپیی مرۆڤە، خوای شکۆمەند لە قورئانی پیرۆز دا دەفەرموێت: ﴿فَمَن يَعْمَلْ مِثْقَالَ ذَرَّةٍ خَيْراً يَرَهُ (٧) وَمَن يَعْمَلْ مِثْقَالَ ذَرَّةٍ شَرّاً يَرَهُ﴾[٣٤]. واتا: "هەرکەسێك ئەوەندەی قورسایی گەردیلەیەك(کە بە ورد بینیش نابینرێن) کردەوەی چاکە بکات چاکەکەی دەبینێتەوە( پاداشتی وەردەگرێتەوە) {٧} هەرکەسێکیش ئەوەندەی قورسایی گەردیلەیەك گوناهێك(یا خراپەیەك) بکات کردەوە خراپەکەی خۆی (لە قیامەت دا) دەبینێتەوە"

لە ئیسلام دا پابەند بوون لە نێوان دونیا و دین دا کاریگەریی لەسەر ڕاپەڕاندنی کاری مرۆڤ دا هەیە، هەروەك مووسوڵمان کاتێك کار دەکات، کارەکانی بە ناوی خوا دەست پێ دەکات و، هەستیش دەکات، کە خوای شکۆمەند دەیبینێت، ئەویش هیوای ڕەزامەندی و پاداشتی لە کارەکەی لێ دەخوازێت.

ئیسلام زۆری لە مرۆڤ ناکات، کە لە دەرەوەی وزەی خۆی دا بێت، بەڵکو زۆری لێ کردنەکە لە چارچێوەی وزەکەیەتی، ئەمەش بۆ ئەوەی کارەکان لە پلەیەکی بەرزی وردی و پارێزکارانە دا بێت، خوای شکۆمەند لە قورئانی پیرۆز دا دەفەرموێت: ﴿لاَ يُكَلِّفُ اللّهُ نَفْساً إِلاَّ وُسْعَهَا لَهَا مَا كَسَبَتْ وَعَلَيْهَا مَا اكْتَسَبَتْ﴾[٣٥]. واتا: "خوا زۆری لە کەس ناکات لە توانای دا نەبێت، ئەوەشی داینەوە تەنها لە قەدەر توانای خۆیەتی، ئەوەی بەدەستی دێنێت(لە چاکە) بۆ خۆیەتی و ئەوەشی بەدەستی دێنێت (لە خراپە)لەسەر خۆیەتی"

لە بەرانبەر کاری پارێزکارانەش دا پاداشت و پاڵنەر هەیە، هەروەها کرێی دادگەرانە هەیە و، پاڵنەری کەرەستەیی و واتایی هەیە، کە ژیانێکی سەربەرزانە بۆ کارکەر دەستەبەر بکات، بۆ ئەوەی تەرخانگیری بۆ کارەکەی بکات و، کارەکەی بە گرنگ و پەرۆشەوە وەر بگرێت، بۆ ئەوەی بەرهەم بێنێ و داهێنان بکات[٣٦]

---

[٣٤] .سورة الزلزلة: الآيتان٧ و٨

[٣٥] سورة البقرة: الآية ٢٨٦.

[٣٦] عبد الغني بسيوني عبدالله: أصول علم الإدارة العامة، ص٦٩.

نموونەیەکی مرۆییەتیی کارگێڕیی ئیسلامی دێنینەوە، کە لە نووسراوێکی پێشەوا عەلی خوا لێی ڕازی بێت دا هاتوە بۆ ئەشتەری نەخەعی کاتێك بە والیی میسری دامەزراند، هەروەك لە نووسراوەکە دا هاتوە: "وا هەست بکە، کە دڵت میهر و خۆشەویستی و ڕێزگرتنە بۆ ژێر دەستەکەت و، مەبە دڕندەیەکی هار، کە خواردنیان بە دەستکەوت ببەیت، لە خوا بترسە و ویژدانت بێ لە ڕاست خەلکی بۆ خۆت و کەسە نزیکەکانت و، هەر کەسێك لە ژێر دەستەکانت، کە مەیلت بۆی دەچێت، ئەگەر وا نەکەیت ئەوا ستەم دەکەیت، هەرکەسێکیش ستەم لە بەندەکانی خوا بکات، خوا لە دژی دەوەستێت بەدەر لە بەندایەتی، هەوڵ بدە خۆشەویسترین کارت ناوەندەکەی بێت لە حەق و، لە دادگەری دا بیگشتێنە و، سەرجەمی بۆ ڕەزامەندی ژێردەستە بێت، تووڕەبوونی گشتی دەبێتە سڕێنەری ڕەزامەندی تایبەت، بەڵام تووڕەبوونی تایبەت، لەگەڵ ڕەزامەندی گشتی دا دەبێت"[٣٧]

ئەم لایەنە مرۆییەتییەی کارگێڕی گوزارشتە لە نوێترین ئاراستە زانستییەکانی هاوچەرخ، هەروەك شکستی ئەو بنەما زانستییە ڕووتانەی سەلماند، کە لە بەڕێوەبردن دا لایەنی مرۆیی فەرامۆش دەکات، بۆیەش زۆرینەی تیۆرە زانستییە نوێیەکان ڕویان کردۆتە بایەخ دان بە هەموو کاروبارەکانی کارکەران لە ڕێکخستنی کارگێری[٣٨]، لە کاتێك دا نموونەی لەم جۆرە بە وەرگیراوە بەڵگەنەویستەکانی ڕێکخستنی کارگێریی ئیسلامی گوزارشت دەکرێت، ئەوەتا سەرکردەی کارگێری مەزن عومەر خوا لێی ڕازی بێت نووسراوی ویلایەتی یەکێك لەو پاڵێوراوانەی دڕاند، کاتێك زانی، کە لە ڕاست منداڵەکانی دا دڵنەرم نییە، جا وتە بەناوبانگەکەی گوت:" ئەو بەزەیی بە منداڵەکانی دا نایەت، چۆن بەزەیی بە ژێردەستەکەی دا دێت"[٣٩]

---

[٣٧] الإمام محمد عبده: نهج البلاغة، مؤسسة الأعلمي للمطبوعات، بيروت، الجزء الثالث، ص٨٢ وما يليها.

[٣٨] عبد الغني بسيوني عبدالله: أصول علم الإدارة العامة، ص٦٩.

[٣٩] سليمان الطماوي: عمر بن الخطاب وأصول السياسة والإدارة الحديثة- دار الفكر العربي، القاهرة، طبعة ثانية ١٩٧٦، ص٢٧٤.

## جیاکاریی دووەم: پێویستییەتی کارگێڕی

بۆ هەموو چالاکییەکی مرۆیی ئامانجێکی دیاری کراو هەیە، کە کۆشش دەکرێت بۆ گەیشتن پێی و، دەبێت هەوڵەکانی ئاراستەی بەدەست هێنانی ئەم ئامانجانە بکرێت و، ئاوەز نییە ئەم کارە بۆ هەر ئەندامێکی کۆمەڵە جێ بهێڵدرێت، کە بەو شێوەیەی خۆی پێی شیاوە هەڵسوکەوت بکات، چونکە گەر نموونەی لەم جۆرە گریمانە ڕوو بدات، ئەنجام دەبێتە هۆی شکستی ئەو هەوڵانەی دراون بۆ گەیشتن بە ئامانج، بە ڕوانینە ئەو ڕا جیایی و دووبەرەکییانەی، کە لە نێوان ئەندامانی ئەم کۆمەڵە دا ڕوو دەدات، کە ئاشووب و پشێوی لێ دەکەوێتەوە[٤٠]

بۆ پیادە کردنی ئەمەش دیارە، کە عومەری کوڕی خەتاب خوا لێی ڕازی بێت بەنیشان کردنی باشی والییەکان قایل نەدەبوو، بەڵکو شێوازی کار و، ئەو ڕێسایانەشی بۆ دیاری دەکردن، کە لەسەری دەڕۆیشتن، بۆ ئەوەی لە دوایی دا ببێتە بنچینەی لێپێچینەوەیان، ئەم بنچینەیانەش یا ئەوەتا لە شێوەی تایبەت دیاری دەکران، ئەمەش لەسەردەمی ویلایەت، یا ئەوەتا لە شێوەی گشتی، ئەمەش لەو کۆنگرانەی، کە عومەر خوا لێی ڕازی بێت دەیبەست، کە بەناوباگترینیان کۆنگرەی حەج بوو[٤١]

سەبارەت بە مەرجە تایبەتەکانیش، ئەوا عومەر خوا لێی ڕازی بێت نووسراوێکی بۆ والییەکانی دادەنا، ئەمە بۆ ئەوە بوو، کە ئەگەر پیاوێکی بەکار بخست بوایە، ئەوا نووسراوێکی بۆ دەنووسی و، دەستەیەکیش لە کۆچکەر و پشتیوانان گەواهیان دەدا لەسەری، بۆ ئەوەی ستەم نە لە جەستە و نە لە دارایی هیچ کەس نەکات و، پایەکەیشی بۆ سوود یا بەرژەوەندییەکانی خۆی، یا بۆ ئەوانەی پشتگیریی دەکەن نەقۆزێتەوە و، دەسەڵاتیشی بۆ کارکەران دیاری دەکرد.

---

[٤٠] إبراهيم عبد العزيز شيحا: الإدارة العامة، ص٣٨- ٣٩.

[٤١] سليمان الطماوي: عمر بن الخطاب وأصول السياسة والإدارة الحديثة- دار الفكر العربي، القاهرة، طبعة ثانية ١٩٧٦، ص٢٧٥.

عومەری کوڕی خەتاب خوا لێی ڕازی بێت بەسەر والییەکانی سەپاند بوو، کە بە زانیارییەکانیان ئاگاداریی بکەنەوە، یەکەم لە یەکەم، بەڵکو ڕۆژ بە ڕۆژ و، هەلس و کەوت نەکەن مەگەر دوای گەیشتنی فەرمان و ئاراستەکانی، عومەر خوا لێی ڕازی بێت ئاسانکاریی لە سەرپێچیی فەرمان و ڕێنماییەکانی دا نەدەکرد، بەڵکو بە دڵ ڕەقی و بە زەبر لێ پرسینەوەی لەگەڵ دا دەکردن، ئەوەتا عومەر خوا لێی ڕازی بێت قەدەغەی سەرکردەکانی کرد بوو، کە مووسوڵمانان لە دەریادا بگوازنەوە لەبەر ناشارەزاییان، بەڵام میری بەحرەین "عەلائی کوڕی حەزرەمی" سەرپێچیی ئەم فەرمانەی کرد و بە سەربازەوە بە کەنداوی فارس دا تێپەڕی بۆ هێرش کردنە سەر ناوچەی بەرانبەر لە زەوی فارس و، بەسەربازەوە دابەزی و لە ئەستەخری پایتەخت نزیك بووەوە، پاشان فارسەکان ڕێگای گەڕانەوە بەرەو کەشتییەکانیانی لێ گرتن، کە دەوریان دان و گیر بوون، عومەر خوا لێی ڕازی بێت فەرمانی بە پارێزەرەکانی دا لە بەسرە و کووفە، ڕزگاریان کردن، بەڵام عومەر خوا لێی ڕازی بێت لەسەر سەرپێچییەکەی سزای دا بەوەی لە سەرکردایەتیی خستی[٤٢]

لەبەر ئەمە دەبێت دەستەیەکی تایبەت هەبێت، کە بە ئاراستە کردن و هەماهەنگی هەوڵەکانی تاکەکان ڕووەو ئامانجە ویستراوەکان، هەڵبستێت، ئەم دەستەیەش بەگوێرەی زاراوەی زانستیی بەڕێوەبردنی نوێ، بەناوی ئەنجوومەنی کارگێری دەناسرێت.

سروشتی ئەم ئەنجوومەنە لە ژمارەیەکی دیاری کراو لە کەسانی لێهاتوو و خودان توانست گەلێکی زۆر پێك دێت، کە پسپۆڕی و چالاکییە جیاجیاکانی ڕێکخراوەی کارگێری دەنوێنن، ئەم ئەنجوومەنەش بە سەرۆکایەتیی سەرۆکێك بەڕێوەدەبردرێت، بە نوێنەرایەتیی ئەم ڕێکخراوە، لە مامەڵەی لەگەڵ ڕێکخراوەی تر لەبەردەم دادگە و، لە سەرپەرشتی کردنی ئەنجام دانی سیاسەتی ڕێکخراوە و

---

[٤٢] سليمان الطماوي: عمر بن الخطاب وأصول السياسة والإدارة الحديثة- دار الفكر العربي، القاهرة، طبعة ثانية ١٩٧٦، ص٢٩٣- ٢٩٤.

ئاراستە کردنی چالاکییەکانی و بەدواداچوونی بڕیارەکانی ئەنجوومەنی کارگێڕی، ڕادەسپێردرێت[٤٣]

بەمەش پێویستییەتیی کارگێڕیمان بۆ ڕوون دەبێتەوە، جا لە چالاکیی تایبەت بێت، وەك بەڕێوەبردنی ئەو هاوبەشگە و دەستە و کۆبەندانەی، کە چالاکییەکان لە ڕووی بازرگانی یا کشتوکاڵی یا پیشەسازییەوە بەکار دەخەن، هەروەها لەسەر ئاستی چالاکیی حکومەت لە بەڕێوەبردنی سووپا یا پۆلیس یا دەستگە گشتییەکان، جگە لە فەرمانگەکانی تری حکومەت.

## جیاکاریی سێیەم: بەڕێوەبردن ئامرازێکە بۆ بەدەست هێنانی ئامانجەکان.

بۆ هەر کارگێڕییەك ئامانجێك یا چەند ئامانجێك هەیە، کە بۆ بەدەست هێنانیان دامەزراوە، دەشێت ئەم جیاکارییە خۆی لە خۆی دا جیاکەرەوەی نێوان کارگێڕیی گشتی و کارگێڕیی تایبەتمان بۆ ڕوون بکاتەوە.

سروشتییە، کە کارگێڕیی تایبەت بۆ بەدەست هێنانی قازانج کۆشش دەکات، لە ڕێگەی بەکارخستنێکی نموونەیی، لە کات و ڕەنج و دارایی، بەڵام کارگێڕیی گشتی، پێویستە لە بنەڕەت دا ئامانجی بەدەست هێنانی بەرژەوەندیی گشتی بێت، لە ڕێگای پڕکردنەوەی پێداویستیی گشتی[٤٤].

بەڵام ئەمە لە کۆمەڵگەیەکەیەوە بۆ یەکێکی تر ، بەگوێرەی فەلسەفە و سیستمی هەر کۆمەڵگەیەك، جیاوازە.

لە بنەڕەت دا کارگێڕیی تایبەت، لە سیستمی سەرمایەداری دا بۆ بەرژەوەندییە تایبەتەکانی کۆشش دەکات و، قازانجی دارایی هاندەریەتی.

---

[٤٣] عبد الغني بسيوني عبدالله: أصول علم الإدارة العامة، ص٢٠- ٢١.

[٤٤] بكر القباني: الإدارة العامة، ١٩٧٠، ص٦٣.

کەچی لە سیستمی هاوبەشی دەبێت مەبەستی کارگێڕیی تایبەت بەدەست هێنانی بەرژەوەندیی گشتی بێت، واتا پڕ کردنەوەی پێداویستیی کۆمەڵگە بێ قۆستنەوە، سەرباری بەشداری کردنیش لە جێبەجێ کردنی پلانی گەشە پێدانی نەتەوەیی دا[٤٥].

چونکە ناکرێت لایەنێك بەتەواوی چاوپۆشی لە بیرۆکەی قازانج دا بکات، یا بەلانی کەم هاوسەنگی لە نێوان مەزاختن و خەرجییەکانی دا بکات، سەبارەت بە کەرتی گشتی پیشەسازی و بازرگانی، وەك کەرتی کارەبا و گازی سروشتی و گەیاندن، چونکە چالاکیی ئەم کەرتانە چالاکیی تایبەتن، لەگەڵ ئەوەش دا بیرۆکەی بەخۆڕاییەتیی کەرتە گشتییەکان لە زۆربەی وڵاتانی جیهان دا پیادە دەکرێت، لەگەڵ بوونی جیاوازی لە بوارەکانی پیادە کردن و چۆنایەتییەکەی دا، ئەمەش بە شێوەیەکی تایبەت لە کەرتە گشتییەکانی کارگێڕی دا ڕوو دەدات، وەك کەرتی فێرکردن و تەندروستی و پۆلیس[٤٦].

لە ئیسلام دا کارگێڕیی گشتی و تایبەت بۆ بەرژەوەندیی گشتی کۆشش دەکەن، لە هەمان کاتیش دا کارگێڕیی تایبەت بۆ قازانجی دارایییش کۆشش دەکات.

**پوختەی قسە:** ڕێسای گشتیی بەڕێوەبردن، لە کۆششی کارگێڕیی گشتی بۆ پڕ کردنەوەی پێداویستیی گشتی بە مەبەستی بەرژەوەندیی گشتی، دەردەکەوێت، لە کاتێك دا کارگێڕیی تایبەت لە بنەڕەت دا، بۆ بەدەست هێنانی بەرژەوەندییە تایبەتییەکانی دانراوە، کە بریتییە لە قازانج، لەگەڵ ڕەچاو کردنی تێڕوانینی هەریەك لە سیستمەکانی سەرمایەداری وهاوبەشی و ئیسلامی.

---

[٤٥] إبراهيم عبدالعزيز شيحا: الإدارة العامة، ص٤٧.

[٤٦] عبد الغني بسيوني عبدالله: أصول علم الإدارة العامة، ص٢١.

# توێژبەندی دووەم

# پێناسەی بەڕێوەبردن

هەڵبەت پێناسە گەلێکی زۆر بۆ بەڕێوەبردن دانراون، لەمەو دوا یەك دوای یەك دەیانخەینە ڕوو:

## یەکەم: پێناسەی بەڕێوەبردن لە وڵاتە یرکگرتوەکانی ئەمەریکا

پرۆفیسۆر "لیۆنارد وایت"، زانای ئەمەریکی لە بواری بەڕێوەبردنی گشتی دا، کارگێڕیی گشتی پێناسە دەکات بەوەی: "لە سەرجەم ئەو کردارانە پێك دێت، کە ئامانجیان جێبەجێ کردنی سیاسەتی گشتییە"[٤٧]

مارشال دیمۆکیش دەڵێت: "کارگێڕی تایبەتە بە چی و چۆنیی حکومەت" هەروەك "چی" بابەتەکەیە، ئەویش زانیاریی هونەرییە لە بوارێك دا، کە وا لە کارگێر بکات کارەکانی ڕاپەڕێنێت ، (چۆن)یش ڕێگە هونەرییەکانە لە کارگێڕی دا، ئەمانیش ئەو بنەمایانەن، کە بەرنامەی هاریکاری و بەدەست هێنانی سەرکەوتنی بە دوا دا دێت، هیچیان دەستی لێ بەرنادرێت و، هەردووکیان پێکەوە ئەوە پێك دەهێنن، کە کارگێڕیی پێ دەگوترێت[٤٨].

---

[٤٧] ليونارد وايت: مدخل لدراسة الإدارة العامة، (شركة مكملان، ١٩٥٥)، ص١.

[٤٨] مارشال إدوارديوك وآخرون: الإدارة العامة، ترجمة إبراهيم علي البراسي، مؤسسة الحلبي (القاهرة: ١٩٧٦)- ص١٣.

## دوەم: پێناسەی بەڕێوەبردن لە بەریتانیا

زۆرینەی پێناسەکان لە ئینگلتەڕا دا لە دەوری مانایەك دا دەخولێنەوە، کە پێناسەی کارگێڕی دەکەن بەوەی: "هەموو جۆرەکانی ئەو چالاکییانە لە خۆ دەگرێت، کە سەرۆکە کارگێرەکان پێیان هەڵدەستن، لەو کارگێڕییە گشتییەی، کە چالاکییە کارگێڕییەکانی حکومەت لەخۆدەگرێت[٤٩].

## سێیەم: پێناسەی بەڕێوەبردنی گشتی لە فەڕەنسا

زۆرینەی شارەزایان لە فەڕەنسا کارگێڕیی گشتی لەمیانەی دیاری کردنی کردەکانی دا پێناسە دەکەن، لەم سۆنگەیەوە ئاماژە بە پێناسە نموونەییەکەی (چارلز دیباش Charles Debbaah) دەکەین، کە فرمانەکانی کارگێڕیی گشتی بەش بەش کردوە و، بۆ چار کردەی سەرەکی دابەشیان دەکات وەك لە خوارەوە دا:[٥٠]

١ **کردە سیاسییەکان**: یا فرمانە سیاسییەکان، ئەمیش سێ جۆر لەخۆ دەگرێت:

- کردە سیاسییە دەرەکییەکان: وەك بەرگری و ئاسایشی نەتەوەیی.
- کردە سیاسییە ناوخۆییەکان: وەك پۆلیس و ئاسایشی ناوخۆ و دادوەری.
- کردە سیاسییە ڕووتەکان: وەك بەڕێوەبردنی دەستگە سیاسییەکان، وەك ئەنجام دانی هەڵبژاردنەکانی ئەنجوومی نوێنەران و ئاگاداریی ڕای گشتی بە ئامانجە سیاسییەکان.

٢. **کردە ئابوورییەکان**: وەك هەڵستانی ولآت بە دەرکردنی دراو و، ڕۆڵی ولآت لە کەرتە جیاجیاکانی ژیانی ئابووری و، هەماهەنگیی گشتیی سیاسەتی ئابووری و دارایی و هی تریش.

---

[٤٩] غلادن: مدخل للإدارة العامة ١٩٦٦، ص١٢.

[٥٠] شارل دیباش: العلوم الإداریة، داللوز،( باریس ١٩٧١)، ص ٢٣٠ وما یلیها.

٣. **کردە کۆمەڵایەتییەکان:** کارەکان لە مەیدانی تەندروستی و نیشتەجێ کردن و بەرگری لە ماف و بەرژەوەندییەکانی چینی کۆمەلایەتیی پیشەوەر و، دابەش کردنی داهات لە بەرژەوەندیی بێ توانایان لە ڕووی کۆمەڵایەتی و، چاکسازیی خێزانی و بەدەست هێنانی خۆشگوزەرانیی کۆمەڵایەتی، لە خۆ دەگرێت[٥١]

٤. **کردە فێرکاری و سەندیکاییەکان:** ئەمەش توێژینەوەی زانستی، فێر کردنی منداڵان و لاوان و، ڕێکخستنی کاتە بەتاڵەکان و، چالاکیی ڕووناکبیری و ئاراستە کراوەکان بۆ پێگەیشتوان و، پەرە پێدانی چالاکییە هونەرییەکان، وەك پاراستنی سامانی هونەری و مێژوویی و هاندان بۆ داهێنانی هونەری، دەگرێتەوە[٥٢]

## چارەم: پێناسەی بەڕێوەبردن لە میسر

هەڵبەت زانایانی بەڕێوەبردن لە میسر، کاریگەریی پێناسەکانی ئەمەریکایان پێوە دیارە، لەم بارەوەش بە هێنانەوەی پێناسەی پرۆفیسۆرێکی میسری کۆتایی پێدەهێنین، ئەویش "دکتۆر موحەمەد ڕەفعەت عەبدول وەهاب"ە، کە کارگێڕیی گشتی پێناسە دەکات بەوەی:"ئەو لقەی زانستە کۆمەڵایەتییەکانە، کە گرنگی بە ناساندن و پێك هێنان و چالاکییەکانی ئەو ڕێکخراوە کارگێڕییانە دەدەن، کە کار بۆ بەدەست هێنانی ئامانجە بەرزەکانی دەسەڵاتی سیاسی دەکەن، دەدات"[٥٣]

---

[٥١] عبد الغني بسيوني عبدالله: أصول علم الإدارة العامة، ص٢٦.

[٥٢] : مدخل إلى علم الإدارة، باريس: ١٩٦٦مكتبة أرمان شخولان، ص١٧وما يليها. Bernard Gournay برنارد غورني

[٥٣] محمد رفعت عبدالوهاب: الإدارة العامة، الدار المصرية الحديثة، ١٩٨١، ص٢٨.

## پێنجەم: پێناسەی بەڕێوەبردن لە ئیسلام دا

لە خوارەوە دا هەوڵ دەدەین، کە هەڵستین بە خستنە ڕووی گرنگترین پایەکانی کارگێڕی لە ئیسلام دا، بە گەیشتن بە دانانی پێناسەیەك بۆ ئەم کارگێڕییە، لەبەر ئەوەی لەم جۆرە پێناسەیە تا ئیستا دانەڕێژراوە.

جێی باسە، کە ولاتی ئیسلامی لەو پلەدارییە باوە دەرچوە سەبارەت بە ولاتە نوێیەکان. هەڵبەت ئەم ولاتە یەکەم جار و لە یەکەم کاروباری دا لەسەر بنەمای دەسەلات دامەزرا، پاشان وردە وردە دەستی کرد بە گۆڕان بۆ ولاتێکی خزمەتگوزاری یا خۆشگوزەرانی.

هەڵبەت ولاتی ئیسلامی بۆ شەوخوونی کردن بۆ ژیانی هەموو هاولاتییان و، ئەوپەڕی ئەوەی ولاتانی هاوبەشی و سەرمایەداری لە سەردەمی ئیستا دا پێی گەیشتوون لەو دڵنیاییەی هاولاتیان، کە بە زۆری لە دژی نەخۆشی و پیری و بێ کاری، دامەزراوە.

ئەوەتا ولاتی ئیسلامی و، بەتایبەت لە سەردەمی عومەری کوڕی خەتاب خوا لێی ڕازی بێت، بۆ هەر منداڵێك، کە لەدایك دەبوو بەش هەبوو لە خانەی دارایی لەهەرکوێیەك بونایەو، دروشمی ئەم سەرکردە کارگێڕییە مەزنەی ئیسلام ئەوەبوو: "ئەگەر ئاژەڵێك لە بیابانی شام بکەوێت، لە عومەر دەپرسرێت بۆچی ئەم ڕێگایەت چاك نەکردوەتەوە". بەڕێوەبردنی ولاتی لەم جۆرەش پێویستی بە توانستێکی لە ڕادەبەدەر و لێهاتوییەکی بەرز هەیە، نەخاسما فراوانیش بوویێت لە ڕۆژهەلات و ڕۆژاوا و باکوور و باشوور لەگەڵ ئاستەنگیی گەیاندن و پشت بەستنی بە ئامرازە سەرەتاییەکان[٥٤]

سەرکردایەتیی گشتی لە ئیسلام دا کارێکی کەسەکی بوو، پشت بەستنی بنەڕەتی تێی دا لەسەر توانستی خۆیەتی دامەزرا بوو، مانای ئەمەش ئەوەیە، کە کارگێڕی لە ئیسلام دا، هەر لە سەرەتای دا، وابەستەی هونەر بوە، دروستە، کە

---

[٥٤] سليمان الطماوي: عمر بن الخطاب وأصول السياسة والإدارة الحديثة، ص٢١- ٢٢.

هونەری ڕەسەن لە بنەڕەت دا پەی بە بنەما زانستییەکان دەبات، بەڵام پەی بردنی زیاتر پشت دەبەستێت، بە زیرەکی و هەست ناسکیی نەبڕاوە، لە بنەما زانستییە پێشووتر ناسراوەکان[٥٥]

هەڵبەت ئیسلام بنەمای ڕاوێژی داناوە، لەسەر ئەم بنەمایەش دەبینین، کە عومەری کوڕی خەتاب خوا لێی ڕازی بێت، بە خوارسك، پەی بە هەموو مانایەکانی بەڕێوەبردنی گشتیی نوێ بردوە، بەڵکو گەیشتۆتە دوورترینی ئەوەی وڵاتە نوێیەکان پێی گەیشتوون و شانازی بە تیۆرە کارگێڕییەکانیان دەکەن، جیاوازیی نێوان ئەوەی عومەر خوا لێی ڕازی بێت لەسەری ڕۆیشتوە، ئەوەشی وڵاتە نوییەکان لەسەری دەڕۆن لە داڕشتنەکەی دەردەکەوێت نەك لە ناوەڕۆکی.

مانای بەڕێوەبردنی ئیسلامیش لەم شێوانەی خوارەوە دا دەردەکەوێت:

١. هاریکاری لە گەیشتن بە بڕیاری ڕەوا.
٢. هەوڵی ئاشکرا کردنی هەڵە پەیوەندیدارەکان بە کارگێڕی.
٣. گەیشتن بە چارەسەرییەکی باش بۆ کار و شتە نوێیەکان.

بەر لە ئەمەش قورئانی پیرۆز بنەماکانی کارگێڕیی گشتیی داناوە، بە فەرمایشتی پیرۆزی لە پەرتووکە پیرۆزەکەی: ﴿يُوسُفُ أَيُّهَا الصِّدِّيقُ أَفْتِنَا فِي سَبْعِ بَقَرَاتٍ سِمَانٍ يَأْكُلُهُنَّ سَبْعٌ عِجَافٌ وَسَبْعِ سُنبُلاَتٍ خُضْرٍ وَأُخَرَ يَابِسَاتٍ لَّعَلِّي أَرْجِعُ إِلَى النَّاسِ لَعَلَّهُمْ يَعْلَمُونَ (٤٦) قَالَ تَزْرَعُونَ سَبْعَ سِنِينَ دَأَبًا فَمَا حَصَدتُّمْ فَذَرُوهُ فِي سُنبُلِهِ إِلاَّ قَلِيلاً مِّمَّا تَأْكُلُونَ (٤٧) ثُمَّ يَأْتِي مِن بَعْدِ ذَلِكَ سَبْعٌ شِدَادٌ يَأْكُلْنَ مَا قَدَّمْتُمْ لَهُنَّ إِلاَّ قَلِيلاً مِّمَّا تُحْصِنُون (٤٨) ثُمَّ يَأْتِي مِن بَعْدِ ذَلِكَ عَامٌ فِيهِ يُغَاثُ النَّاسُ وَفِيهِ يَعْصِرُونَ﴾[٥٦] واتا: "یوسف ی ڕاستگۆ مەبەست چییە، (لەخەوی پادشا دا) هەفت چێڵی قەلەو هەفت چێڵی لاواز بیانخۆن و... هەفت گوڵە گەنمی سەوز و هەفت گولە گەنمی وشکەوەبوو، بۆ ئەوەی بگەڕێمەوە لایان ماناکەیان پێ بڵێم بەڵکو بزانن {٤٦} گوتی هەفت ساڵ لەسەریەك بە باشی کشتوکاڵ دەکەن،

---

[٥٥] .سليمان الطماوي: عمر بن الخطاب وأصول السياسة والإدارة الحديثة، ص٢٢

[٥٦] سورة يوسف: الآيات: ٤٦- ٤٩.

کە دەیدوورنەوە هەر لەناو گوڵەکەی خۆی دا هەڵی بگرن، تەنها کەمێکی نەبێت، ئەویش بەشی ئەوەندەی، کە خۆتان دەیخۆن {٤٧} پاشان دوای ئەم هەفت ساڵە هەفت ساڵی نەهات و وشکە ساڵی دەبێت، ئەوەی لە هەفت ساڵە هاتەکە دا کۆی دەکەنەوە لەو هەفت ساڵە وشکە دا دەیخۆن، تەنها کەمێکی نەبێت، کە بۆ چاندنەوە و تۆ کردن هەڵی دەگرن {٤٨} پاشان دوای هەفت ساڵە ناخۆش و نەهاتەکە ساڵێك(ی هات و خۆشی دێت)، خەڵکی کشتوکاڵ دەکەن و لێیانەوە شەربەت دروست دەکەن"

هەڵبەت مووسوڵمانە سەرەتاییەکانیش پەییان بردوە بە گرنگیی بەڕێوەبردنی گشتی، ئەوەتا هەندێك لە هاوەڵان ئاماژەیان بە سەروەرمان عومەری کوڕی خەتاب خوا لێی ڕازی بێت، داوە، کاتێك مالاّتی شوێنە ڕزگارکراوەکان زۆر زیادی کردوە، دیوانی ڕێکخستوە بۆ چەسپاندنی ناوی مووسوڵمانان و سەربازان و، بۆ هەر تاکێك بەرکەوتی لە دارایی ماڵی دارایی موسوڵمانان داناوە.

تەنها ئەوەندەش نا، بەڵکو سەروەرمان عومەری کوڕی خەتاب خوا لێی ڕازی بێت، دوای ئەمە زۆرێك لە دیوانی دامەزراند، لەنێویان دیوانی سەربازکردن و، دیوانی سەرانە و ماڵی دارایی و، مووچەی خۆراکی بۆ مووسوڵمان لەسەر بنەمای ماڵ و پێشینەییان لە چوونە ناو ئیسلام دا بڕیوەتەوە، بەمەش عومەر خوا لێی ڕازی بێت یەکەم کەس بوە، کە گرنگیی بە بەڕێوەبردن داوە و، کاری کردوە بۆ پیادە کردنی لە دەستگەکانی ولاّتی ئیسلامی دا[٥٧]

لە هەموو ئەمانەش دا پێناسەی کارگێڕیی گشتی لە ئیسلام لە میانەی هەڵ و مەرجی ولاّتی ئیسلامی دا پوخت دەکەینەوە، بە تایبەت لە سەردەمی عومەری کوڕی خەتاب خوا لێی ڕازی بێت و ئەم پێناسەی، کە پێشنیاری دەکەین لە ژێر ڕۆشنایی ئەو باسەی پێشکەشمان کرد داڕێژراوە، کە ئەمەیە:" بەڕێوەبردنی گشتی لە ئیسلام دا ڕێکخستن و بەڕێوەبردنی هێزی مرۆییە بۆ بەدەست هێنانی ئامانجەکانی ولاّتی ئیسلامی، لە چارچێوەی بڕیارە ڕەواکان دا"

---

[٥٧] عبدالقادر مدني علاقي: الإدارة، الناشر تهامة، جدة، طبعة أولى، ١٤٠١ه/ ١٩٨٠م، ص٥٠.

# توێژبەندی سێیەم

# سروشت و کرۆکی کارگێڕی

لەو بابەتە دووبارانەی، کە بەسەرچوونە لە زانستی بەڕێوەبردنی گشتی دا، پرسیار کردنە لە سروشت و کرۆکی کارگێڕیی گشتی، ئایا زانستە یا هونەرە؟

بۆ ئەمە سێ ئاراستە هەیە: ئاراستەیەك دەڵێت، کارگێڕیی گشتی بە سروشتەکەی هونەرییە، ئاراستەیەکیش دەڵێت کارگێڕیی گشتی مۆرکێکی زانستیی پێوە دیارە، ئاراستەیەکیش دەڵێت سروشتێکی تێکەڵە، واتا کارگێڕی پێکەوە هونەرە و زانستیشە.

بۆیە هەڵدەستین بە تێخوێندنەوەی ئەم ئاراستانە، پاشانیش هەڵدەستین بە شی کردنەوە و دیاری کردنیان لەژێر ڕۆشنایی نموونەیەکی ئیسلامی:

## خواستی یەکەم: کارگێڕی هونەرە

وشەی هونەر(Art) مانای گەیشتنە بە ئەنجامەکان، لە میانەی بەکارهێنانی کارامەییەکان[٥٨]

ئەم کارامەییانەش لە هەموو کەسێك، کە پیادەی کاری کارگێڕی دەکات، نارەخسێت، بە مانایەکی تر هاندانی کەسانی تر بۆ بەدەست هێنانی ئامانجەکان، کردارێکە لە کارامەیی، چونکە ئەمە تەنانەت بۆ کارگێڕانی خاوەن زۆرترین شارەزایی و زانیاری لە لایەنی زانستی لە بەڕێوەبردن دا نارەخسێت.

ئەگەر هاتوو بەڕێوەبەر لە مامەڵەی لەگەل ڕەگەزە نا مرۆییەکان لە ڕێکخستنی

---

[٥٨] عبدالقادر مدني علاقي: الإدارة، ص٦٨.

کارگێری دا لە ڕووی زانستییەوە بە توانستر بێت، ئەوا بەدەست هێنانی ئەو ئامانجانەی، کە نیازی بەدەست هێنانیانی هەیە، وێرای لەیەنی زانستیش، دەوەستێتە سەر کارامەیی لە مامەڵە کردن لەگەڵ ڕەگەزە مرۆییەکان لەم ڕێکخستنە دا.

کارامەیی لە مامەڵە کردن و، هاندانی تاکەکان و قایل کردنیان لە کارکردن، لایەنی هونەریی کارگێڕییە.

بە سەرنج دانە ئەو ڕۆڵە سەرەکییەشی، کە کارگێر لە ئاراستە کردن و سەرکردایەتیی ڕێکخستنی کارگێری دا، دەیگێڕێت، ڕووەو بەدەست هێنانی ئەو ئامانجانەی، کە لە پێناوی دا دامەزراوە، ئەوا بەشێك لە شارەزایان وا بڕیار دەدەن، کە کارگێڕیی گشتی هونەرە نەك زانست، بۆیەش "گلادن"ی کارگێری ئینگلیز دەڵێت: "کارگێر لەدایك دەبێت و دروست نابێت"[٥٩] (The administer is born, and not made).

بەڕێوەبردنیش لە تێڕوانینی پشتیوانانی ئەم ئاراستەیە، بەهرە و ئامادەباشیی کەسێتییە، کە لەگەڵ مرۆڤ لەدایك دەبێت، دەست ناکەوێت.

پشتیوانانی ئەم ئاراستەیە، بەڵگەی سروشتی هونەرێتیی کارگێڕیی گشتی بەو سەرکەوتنە دێننەوە، کە لە شارستانییەتە زۆرەکانی ڕابردوو بەدەست هات، لەسەروشیانەوە شارستانییەتیی ئیسلامی[٦٠]

هەڵبەت بنەما گەلێکی زانستیی کارگێڕی لە پلان دانان و ڕێکخستن و هەماهەنگی و ئاراستە کردن و چاودێری بە ڕادەی جیاواز، بە پشت بەستن بە بەهرە تاکی و توانستە کەسێتییەکان، پیادە کراون، ئەمەش بوە هۆی ئەنجام گەلێکی سەرکەوتوو، باشترین بەڵگەش لەسەر ئەمە کارگێڕیی عومەری کوڕی خەتابە خوا لێی ڕازی بێت[٦١]

---

[٥٩] غلادن: مدخل إلى الإدارة العامة، ص١٢.

[٦٠] عبد الغني بسيوني عبدالله: اصول علم الإدارة العامة، ص٣٢.

[٦١] سليمان الطماوي: عمر بن الخطاب وأصول السياسة والإدارة الحديثة، ص٢٢.

## خواستی دوەم: کارگێڕی زانستە

زانست بەوە پێناسە دەکرێت، کە کۆمەڵێك زانینگەرایی کەڵەکە بوو و ژیرانەی دیاردەیەکن، کە لە میانەی پیادە کردنی ڕێگای زانستی لە توێژینەوە دا، توانراوە بە ڕاستییەکەی بگەین[٦٢]، بۆیەش زانستە سروشتییەکان و کیمیا و ئەندازە و ئەتۆمی و زیندەوەر و، بیرکاری بە زانست ناودەبرێن، چونکە ئەم زانستانە هەڵستاون بە تێخوێندنەوەی هەندێك دیاردە و، بە هەندێك ئەنجامی دروست گەیشتوون، کە جێی مشت و مڕ نین[٦٣]

بەڕێوەبردنیش وەك زانست دەتوانرێت لە گۆشەی زانینگەرایی دا سەیر بکرێت، چونکە ئەمڕۆ بەڕێوەبردن جێگەیەکی فراوان لە زانینگەرایی لەخۆدەگرێت، ئەم زانینگەراییانەش لە لایەن هەر کارگێڕێك و لە هەر شوێنێك و لەهەر ئاستێکی ڕێکخستن، بەکاردەخرێن.

بۆیە بوونی زانیاریی کارگێڕی و، بەکارخستنی لە لایەن کارگێران، وێڕای گرتنە ئەستۆی زیادەکراوەکان لە میانەی تاقی کردنەوە و توێژینەوەکان دا، دەتوانرێت لایەنی زانستیی بەڕێوەبردن دووپاتی بکرێتەوە، بەلاّم لەم ڕوەشەوە ناکرێت خۆیەدەستەوە بدرێت بەوەی بەڕێوەبردن وەك زانست بە زانستێکی ورد و گشتگر گوزارشت بکەین، پاشان ناشکرێت لەم ئاستە دا، بە زانستە پیادەکارییەکان بەراوردی بکەین، بەڵکو دەکرێت بە کۆمەڵێك زانستی کۆمەلاّیەتییەوەی بنووسێنین[٦٤]

ئاستەنگی لە نووساندنی بەڕێوەبردن بە زانستە پیادەکارییەکان، لە ڕاستیی ئەستەمی لە پیادە کردنی شێوازی ڕێگای زانستی لە توێژینەوە، لە هەر

---

[٦٢] عبدالقادر مدني علاقي: الإدارة، ص٦٦.
[٦٣] عبدالقادر مدني علاقي: الإدارة، ص٦٧.
[٦٤] عبدالقادر مدني علاقي: الإدارة، ص٦٧.

بەشەکییەکی کردارییی کارگێری و، ڕەگەزەکانی لە کەرەستە و کەلوپەل و کارگێری گەلێك و بەش و تاك و ڕەفتار و کارلێك کردن و چالاکییەکان، هەڵدەقولێت[٦٥]

داکۆکی کردن لە بەڕێوەبردن بەوەی، کە خۆی لە خۆی دا زانستێکە پەنای بۆ دەبردرێت بۆ بەکارهێنانی تێکڕا بیرکارییەکان و، شێوازە ئامارییەکان و ئامرازەکانی شی کردنەوەی توێژینەوە زانستییەکان، ناکرێت بە کردەنی وای لێبکەین، کە زانستێکی سەربەخۆیە وەك زانستەکانی تر، چونکە زۆرێك لە زانستە مرۆڤایەتی و کۆمەڵایەتییەکان لە یەکێکەوە بۆ یەکی تر، ئامرازە بیرکاری و شیکارییەکان بەکاردەخەن، بۆ گەیشتن بە چارەسەریی هەندێك لە گرفتەکان و، ئەوەی دەکرێت لەم بوارەوە بە کردەنی بخەملێنین، کە لایەنێکی زانستیی بەڕێوەبردن هەیە، ئەم لایەنەش پشت بەستنە بە زانیاریی کارگێری و، ئامرەزە شیکارییەکانی بیرکاری و بەکارخستنیان وەك بەشێك لە ئامادەباشییە بنەڕەتییەکانی کاری کارگێری.

چونکە بەڕێوەبردن لەو پێگە دا نییە، کە وەك زانستێك لە زانستە پیادەییەکان دەربکەوێت، لەبەر ئەم هۆکارانەی خوارەوە[٦٦]:

١. توێژینەوە ڕەخساوەکان لە بابەتی بەڕێوەبردن دا هێشتا تا ئەمڕۆش لە قۆناغێکی تازەی دایە.

٢. پیادە کردنی بەڕێوەبردن هێشتا زۆرجار بە شێوازی نا زانستی دەگێردرێتەبەر، وەك هەڵێنان و خەملاندن لە وەرگرتنی بڕیارەکان.

٣. هێشتا هەندێك ئاستەنگی لە هەندێك لە ئەزموونەکان دا بوونیان هەیە لە خستنە ژێر ڕکێف و ملکەچ پێکردنیان بۆ چاودێرییەکی گشتگر.

٤. هەروەها ئاستەنگییەکی بێ پایان لە هەواڵداری یا خستنە ژێر ڕکێف، یا لە چاودێریی ڕەفتاری تاکەکان لە سایەی دۆخێك دا هەیە[٦٧]

---

[٦٥] إبراهيم عبدالعزيز شيحا: الإدارة العامة، ص٦١ وما يليها.

[٦٦] عبدالقادر مدني علاقي: الإدارة، ص٦٨.

بەڵام ئاراستە گەلێك هەن وای دەبینن، کە بەڕێوەبردنی گشتیی نوێ هەندێك ئەدگار و تایبەتمەندیی زانستیی ڕاستەقینەی لێ دەرکەوتوە، کە لە هەندێك بابەت پێك هاتوە هەڵدەستێت بە تێخوێندنەوەیان، بە شێواز و پێڕۆی زانستی، لە هەڵێنجانی ئەو بنەما و ڕێسا زانستییانەی، کە ڕکێفی چالاکییەکانی ڕێکخراوە کارگێڕییەکان دەکەن، بۆ دانانی ئەم ڕێساو ئەو بنەچانە لە چارچێوەیەکی زانستیی ڕێك و پشت پێ بەستنیان، لە پەرە پێدان و ڕێبەری کردنی سیستمە کارگێڕییە جیاجیاکان دا[٦٨]

هەڵبەت مۆرکی زانستیی بەڕێوەبردنی گشتی، لەوەتەی، کە داهێنراوەکانی ئەندازیاری ئەمەریکی "فرێدرێك تایلەر" و " ئەندازیاری فەڕەنسی "هنری فایۆل"، کە لە سەرەتاکانی سەدەی بیستەم دا بڵاو بوونەتەوە، دووپات کراوەتەوە[٦٩]

بۆیە بەشێك لە نووسەرانی بەڕێوەبردنی گشتی وای دەبینن، کە بەڕێوەبردنی گشتی بەتەواوی مانای وشەکەیەوە زانستە، نەك هونەرێك لە هونەرەکان، چونکە کارگێڕیی گشتیی نوێ، لە سەرجەم ئەو کردارە کارگێڕییانەی، کە لێی پێك دێت لە ڕێکخستن و پلان دانان و هەماهەنگی و چاودێری دا، پشت بە بنەما گەلێکی زانستی دەبەستێت.

پشتیوانانی ئەم ئاراستەیە ڕەخنەیان لەم ڕایە گرتوە، کە ئاراستەی یەکەم دووپات دەکاتەوە، بەوەی بەڕێوەبردن هونەرە، هەروەك ئەو هۆکارانەی، کە بۆچوونی پشتیوانانی ئاراستەی یەکەم لەسەری بنیات نراوە، شی دەکەنەوە و پێیان وایە، کە دەگەڕێتەوە بۆ دواکەوتنی دەرکەوتنی بەڕێوەبردنی گشتی، وەك سیستمێکی خوێندنی و پێشینەی دەرکەوتنی وەك چالاکییەکی کرداری لە ژیان دا،

---

[٦٧] عبدالقادر مدني علاقي: الإدارة، ص٦٨.

[٦٨] إبراهيم عبدالعزيز شيحا: الإدارة العامة، ص٦٤ و، ما يليها.

[٦٩] عبد الغني بسيوني عبدالله: أصول علم الإدارة العامة، ص٣٣.

کە بوەتە هۆی ئەوەی، جەخت لەسەر لایەنی پیادەکاریی چالاکییەکانی کارگێڕی بکرێت، وەك کردارێکی پیادەیی بڕوانرێتە کرداری کارگێڕی[٧٠]

هەروەها پشتیوانانی ئەم ئاراستەیە دەڵێن هەڵە لەنێوان ڕەفتاری مرۆیی لە کارگێڕیی گشتی و لە نێوان کەسێتیی تاك ڕووی داوە و، پشتیونانی ئاراستەی یەکەم بەوە کاریگەر بوونە، کە کرداری کارگێری لە دانایی و سەرکردایەتی لە قۆناغە جیاجیاکانی دا لە خۆی دەگرێت[٧١]

هەندێکیش لە شارەزایان لە زانستی بەڕێوەبردنی گشتی ئەوە زیاد دەکەن، کە کاریگەریی کارامەیی کەسێتیی کارگێر لە باش ڕێ کردنی کارگێڕی، لە ڕاستی دا مانای نەبوونی بنەما زانستییەکانی بەڕێوەبردنی گشتی نییە، یا لە گرنگییەکەی کەم بکاتەوە، بەڵکو ڕادەی سەرکەوتن لە پیادە کردنی هەمان بنەما بەگوێرەی گورجیی هەڵسەر بە پیادە کردن جیاوازە، بۆیە ئەم گورجییە یا ئەم کارامەییە دەرکەوتوانە، لە ڕاستی دا شتێك نین، مەگەر وردی لە پیادە کردنی بنەمای زانستی[٧٢]

لە کۆتایش دا بەشێك لە پشتیوانانی زانستییەتیی بەڕێوەبردن وای دەبینن، کە پشتیوانانی ئاراستەی یەکەم توێژینەوە و پیادە کردنیان تێکەڵ کردوە، هەروەك بەڕێوەبردنی گشتی وەك زانستەکانی تر بنەما و ڕەچەڵەکی خۆی هەیە و، شێوازی تایبەتیشی هەیە لە توێژینەوە و تێخوێندنەوە، بەلام پیادە کردن هونەرێکە بنچینەکەی کارامەیی کەسەکی و توانستی خودیی ئەو کەسەیە، کە کارگێڕی دەگرێتە دەست، گوتنی پێچەوانەی ئەمەش، دەبێتە هۆی گوزارشت کردنی تێخوێندنەوەکانی تر، وەك پزیشکی و ماف و ئابووری، بە کۆ بوونەوەی نێوانی زانست و هونەر، بەمەش لە هیچیان کەم ناکات[٧٣]

---

[٧٠] عبد الغني بسيوني عبدالله: أصول علم الإدارة العامة، ص٣٣

[٧١] إبراهيم درويش: الإدارة العامة في النظرية والممارسة، القاهرة: ١٩٧٥، ص٢٩.

[٧٢] ماجد الحلو: علم الإدارة العام

[٧٣] فؤاد العطار: مبادئ علم الإدارة العامة، دار النهضة العربية، القاهرة ١٩٧٤، ص١٥.

## خواستی سێیەم: بەڕێوەبردن زانستە و هونەریشە

زۆرینەی شارەزایانی بەڕێوەبردنی گشتی لەسەر زیاد کردنی ئەدگاری تێکەڵێتیی کارگێڕیی گشتی کۆ دەنگن، بە مانای ئەوەی بەڕێوەبردنی گشتی نێوانی ئەدگاری هونەری و جیاکاریی زانستی کۆ دەکاتەوە، چونکە کردارە کارگێڕییەکان لەکاتی ئێستا دا، جەخت لەسەر بنەما و بنەچە گەلێکی زانستی و بابەتی دەکەنەوە، کە پیاوانی کارگێڕی، بۆ چارەسەر کردنی ئەو گرفتە کارگێرییانەی، کە ڕێ کردنی چالاکیی ڕێکخراوەی کارگێڕی دووچاری دەبێتەوە، پیادەی دەکەن، لە کۆشش کردنیان ڕووەو بەدەست هێنانی ئامانجەکانیان[٧٤]

زانستی بەڕێوەبردنی گشتی چارەسەریی گرفت و ئاستەنگییە جیاجیاکانی کارگێڕی دەکات و، هۆکارەکانیان دیاری دەکات و چارەسەریی شیاویان بۆ دادەنێت، لەسەر بنەمای ئەو ئەنجامانەی، کە توێژینەوەکە پێیان دەگات، بەم جۆرە لەسەر بنەمایەکی زانستیی دروست بە بنەما و ڕێسا گەلێکی کارگێڕی دەگات. پشتیوانانی سروشتی دووڕایی لە کارگێڕیی گشتی کۆ دەنگن لەسەر ئەوەی، کە جیاوازی لە نێوان چەسپاویی ئەدگاری زانستیی کارگێڕی و نێوانی زانستە سروشتییەکان و زانستی بیرکاری دا هەیە، چونکە ئەدگاری زانستیی بێگەرد بۆ ئەو زانستە سروشتییانە نەچەسپاوە، کە بنەماکانیان بە چەسپاوی و وردی بناسرێت، بە پێچەوانەی ئەو زانستە کۆمەڵایەتییانەی، کە بەڕێوەبردنی گشتی وابەستەیانە، وەك ئابووری و سیاسە و دەروونناسی جگە لەو زانستانەشی، کە ئەم ئەدگارە زانستییە بێگەردانەیان نییە[٧٥]، ئەمەش بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە، کە ئەم دەستەیەی دواییان نەگەیشتۆتە ئاستی وردی و ڕێکی و بەردەوامیی زانستە سورشتییەکان، چونکە ئەو بنەما و ڕێسایانەی، کە زانستە کۆمەڵایەتییەکان لە خۆی دەگرێت، ئەدگارێکی ڕێژەییان هەیە و، هۆی ڕێژەیی زانستە

---

[٧٤] عبد الغني بسيوني عبدالله: أصول علم الإدارة العامة، ص٣٤.

[٧٥] .عبد الغني بسيوني عبدالله: أصول علم الإدارة العامة، ص٣٥

کۆمەڵایەتییەکانیش ئەوەیە، کە ڕەگەزی مرۆیی بنچینەی تێخوێندنەوە و توێژینەوەکانیەتی و، بایەخەکەشی لە بازنەی ئەمەوە دەخولێنێتەوە، ڕەگەزی مرۆیش بە سروشتی خۆی گۆڕاوە و، بە گۆڕانی ڕەوش و ژینگە و کات و پەرەسەندنی خودی کۆمەڵگە دەگۆڕێت، بەڵام لایەنی زانستی لە تێڕوانینی پیاوانی ئەم ئاراستەیە بە تەنها بەس نیە، چونکە دەبێت بەشێکی هونەریشی لەگەڵ دا بێت.

لەم سۆنگەیەوە دکتۆر "عەبدول کەریم دەروێش" دەڵێت: لایەنی هونەری لە کارگێڕی دا ڕێبەریمان دەکات، لە گەڕان لەوەی پێویستە لەهەر کاتێك و، لە بەرانبەر هەر بارێك دا بە تەنیا بیکەین. هەڵبەت تێڕوانینی پێك هێنانی کارگێڕی لەسەر بنەمای ئەوەی، کە گرنگترین کۆڵەگەکانی ڕەگەزی مرۆڤە، دەبێت چۆنایەتیی جیاجیامان لە هەڵسوکەوت هەبێت، هەرچەندە دوو کەسی تەواو بەیەك چوو نییە، یا بە مانایەکی تر، دوو هەڵوێستی مرۆیی تەواو بەیەك چوو نییە، هونەر یا کارامەیی لە تێگەیشتنی هەڵوێستی مرۆیی و هەڵسوکەوت لە هەمبەریان دا دەبێتە ڕەگەزێکی زیندوو و پێویستی بەڕێوەبردن، بەمەش دەردەکەوێت، کە کارگێڕیی باش هونەری بەکارخستنی زانستە لە کرداری کارگێڕی[٧٦]

دەبێت بڕیارە تاکی و بەهرە خودییەکان لە کارگێڕیی ڕێکخراوەی کارگێڕی دا، لە سەرجەم قۆناغەکانی کرداری کارگێڕی ڕەخساو بێت، هەروەك سەرکەوتنی کارگێڕی دەوەستێتە سەر کۆبوونەوەی هەردوو توانستی زانستی و هونەریی پێ هەڵستەرانی و، کارگێڕیی سەرکەوتوو ئەدگار گەلێکی کەسێتیی دیاری تێ دا دەرەخسێت، کە وای لێدەکات، لە ڕووبەڕوو بوونەوەی گرفتەکان و دانانی چارەسەری بۆیان و، پیادە کردنی بنەما زانستییەکان لە کاتێکی شیاو و بە چۆنیەتییەکی دروست و بێ ڕاڕایی یا کەوتنەوەی هەڵەکان توانستی هەبێت،

---

[٧٦] عبدالكريم درويش وليلى تكلا: أصول الإدارة العامة، ص٥٩.

بەمەش دەردەکەوێت، کە کارگێڕیی باش هونەری بەکارهێنانی زانستە لە کرداری کارگێری.

بەمجۆرە پشتیوانانی ئەم ئاراستەیە بڕیاری ئەوە دەدەن، کە سروشتی بەڕێوەبردنی گشتی سروشتێکی تێکەڵە، لە نێو زانست و هونەر دا بەیەکەوە کۆدەبێتەوە، چونکە ئەمەیە، کە ڕوانگەی گشتیی بەڕێوەبردن پێی دا ڕەت بوە و، هەر سەرنجێك بە پێچەوانەی ئەمە سەرنجێکی کورتهێنە[٧٧]

## خواستی چارەم: سروشتی کارگێڕی لە ئیسلام دا

کارگێڕیی گشتی بە مانای ڕێکخستن و بەڕێوەبردنی هێزی مرۆیی و کەرەستەییە، بۆ بەدەست هێنانی ئامانجە حکومییەکان، بەشێکە و لە چالاکیی هیچ کۆمەڵەیەکی ڕێکخراو دا دانابڕێت و، بەشێك دەبێت لە کاری فەرمانڕەوا، جا فەرمانڕەوا پەی بەم مانایە ببات یا نا، بەلاّم بە سەرنج دانە سروشتی ئەو دەسەلاّتەی، کە لە ڕابردوو دا ولاّتان لەسەری دامەزرا بوون، ئەوا چالاکیی فەرمانڕەوایان پەیوەستە بە کارگێری و لێی جیا نابێتەوە و پێی دەناسرێتەوە، لەبەر ئەمە ئەو وتەیە بلاّو بوەوە، کە بەڕێوەبردن هونەرێکە لەگەڵ کەسەکە لەدایك دەبێت، دەست ناکەوێت.

گومان لەوە دا نییە، کە بەڕێوەبردن لە سەرەتای دا، لە بەهرەی کەسەکی نزیکتر بوو لەوەی لە زانستێکی ڕێکخراو، لەبەر ئەمەشە، کە هونەرێتییەکەی مشت ومڕ هەڵناگرێت، ئەمە بوە یاریدەدەری ئەوەی، کە کارگێڕان لە ولاّتانی کۆن دا،[٧٨] لەسەر بنەمای ئەرستۆکراتی دەسنیشان بکرێن.[٧٩]

بەمجۆرە فەمانڕەوا لە ڕابردوو دا لە ڕێ کردنی کاروبارە گشتییەکان، پشتی بە باش خەملاندنی کاروبارەکانی و، بەهرە کەسێتییەکانی دەبەستا، بەمەش

---

[٧٧] سليمان الطماوي: مبادئ علم الإدارة العامة، ص٢٢.

[٧٨] .سليمان الطماوي: عمر بن الخطاب وأصول السياسة والإدارة الحديثة، ص١٧

[٧٩] .سليمان الطماوي: عمر بن الخطاب وأصول السياسة والإدارة الحديثة، ص١٧

یارمەتیی دا لە کەم کردنەوەی فرمانەکانی ولاّت لە لایەنی سیاسی، کە بریتی بوو لە پاراستنی قەوارەکەی لـە ڕووبـەڕوو بوونـەوەی دوژمنـی دەرەوە و، لـە لێـدانی دەستی ڕولە گێرەشێوێنەکانی یا لە یاسا دەرچوەکان و، بنیات نانی دادگەری کردن لە نێوان خەلکی دا، پاش ئەمە فـەرمانڕەوا کـاری بـەڕێوە نـەدەبرد مەگـەر ئـەم سێیانە:

١. **سووپا.**
٢. **پۆلیس.**
٣. **دادوەری.**

بەلاّم دوای گۆڕانی ولاّتان، لەسەر خزمەت نەك دەسەلاّت دادەمـەزران و، دوای ئەوەی دەرکەوت، کە دەسەلاّتیان درێـژ بـوەوە بـۆ سـەرجەم تاکـەکانی لـە کـاتی لەدایکبوونییەوە تا مردنی، توێژینەوەی پەیوەندیـدار بـە چـۆنیەتیی ڕێکخسـتنی دەسـتگەکانی ولاّت و، دۆزینـەوەی ئـەو بنەمایانـەی بـەڕێوەبردنی گشـتی، کـە فرمانەکانی حکومەت پێك دەهێنێـت لـە کـورترین کـات و کـەمترین تێچـوون و بەوپەڕی کارایی، لە ئەنجامی هەموو ئەم تێخوێندنەوانـەش، زانسـتی بـەڕێوەبردن دروست بوو، لەم کاتەدا دان بەوە دا نرا، کە بەڕێوەبردن لە نێوان هەردوو ئـەدگاری زانست و هونەر دا کۆدەبێتەوە.

ئەویش زانستە بە هێندەی ئەو توێژینەوە و تاقی کردنەوانـەی لـە چارچـێوەی بەڕێوەبردنی گشتی لە ڕێسـا و ئاراسـتەکان، کـە بـۆ بەدەسـت هێنـانی ئامانجـە گشتییەکان پەیڕەو دەکرێن، ئاشکرا دەبێت، هونەریشە چونکە پابەندبوون بە ڕێسـا زانستییەکان لە ڕێکخستنی کارگێری دا بە ئەنجامە هاوشێوەکان ناگات لە هەموو بارێك دا، بەلّکو دەبینین کارگێڕی لـە ژێـر سـەرکردایەتییەك گورجییـەکی بـەرزی هەیە و، لە ژێر سەرکردایەتییەکی تـر کـەم دەبێتـەوە، لەگـەل مانـەوەی تـەواوی ڕەوشەکە وەك خۆی.[٨٠]

---

[٨٠] سلیمان الطماوی: عمر بن الخطاب وأصول السیاسة والإدارة الحدیثة، ص١٩.

بە گەڕانەوەشمان بۆ کارگێڕی لە ولاّتی ئیسلامی دا ئەم ڕاستییانەی خوارەوە دەردەکەون:

**یەکەم**: ولاّتی ئیسلامی لەم پلەدارییە ئاساییە دەرچوە، کە ولاّتانی تر پێی دا ڕەت دەبن، چونکە ئەم ولاّتانە لە یەکەم کاروباریان دا، لەسەر بنەمای دەسەلاّت دامەزراون[٨١]، پاشان وردەوردە بۆ ولاّتێکی خزمەتگوزاریی گۆڕان، لە کاتێك دا ولاّتی ئیسلامی لەوەتەی لە مەدینە دامەزراوە، بە ولاّتێکی خزمەتگوزاری دەستی پێ کرد، بەجۆرێك هەر مووسوڵمانێك سەرجەم مافەکانی هەبوو و، بۆ هەرمندالّێکیش، کە لەدایك دەبوو بەشی لە مالّی دارایی هەبوو هەر چۆنێك بوو بێت، ئەگەر ئاژەلّێك لە بیابانی شام بەربیێتەوە لە عومەر دەپرسرێت، کە بۆچی ئەم ڕێگایەت چاك نەکردوە[٨٢]

کارگێڕیی ئەم ولاّتەی ئیسلامییە، کە ولاّتی خزمەتگوزارییە، پێویستی بە توانستێکی زۆر و گورجییەکی بەرز هەبوو.

**دوەم**: سەرکردایەتیی ولاّتی ئیسلامی کارێکی کەسی بوو، لە بنەڕەت دا لێیەوە پشت بە توانستی خودی دەبەسترا، ئەمەش مانای ئەوەیە، کە ولاّتی ئیسلامی وابەستەی هونەر بوە.

**سێیەم**: ئەو ئەدگارانەی، کە لە پەرتووکە مێژووییەکان، لەسەر سەرکردەکانی مووسوڵمانان تۆمار کراون، لە پێشیانەوە سەرکردە عومەری کوڕی خەتاب خوا لێی ڕازی بێت، لە ئەفسانەیان نزیك دەکات و، ئەگەر بمانەوێت، سەرکردە عومەری کوڕی خەتاب خوا لێی ڕازی بێت وەك نموونەیەکی کارگێڕانی مووسوڵمانان وەربگرین، ئەوا دەبینین، کە هەوالّە دووپات کراوەکان لە ڕێ کردنی ئەم سەرکردە کارگێڕە بارێکی نموونەیی بۆ دادەنێن، کە سەرجەم ئەدگارە خواستراوەکانی ئەمڕۆی سەرکردەیەکی سەرکەوتوو لە کەسایەتیی ئەم سەرکردە کارگێڕە مەزنە دا ڕەخسا

---

[٨١] سليمان الطماوي: عمر بن الخطاب وأصول السياسة والإدارة الحديثة، ص٢٣.

[٨٢] محمد عمارة: الأعمال للإمام محمد عبده، المؤسسة العربية للدراسات والنشر، بيروت، طبعة ثانية، جزء أول، ١٩٧٩، ص٨٣.

بوە، بە ڕادەیەك وامان لێ دەکات، کەبێ گومان بین، لە ئەوەی کەسایەتیی عومەری کوڕی خەتاب خوا لێی ڕازی بێت دووبارە بوونەوەی ئەستەمە، ئەمەش بەسە، کە پەیامبەر ﷺ داوای لە پەروەردەگار کرد، کە ئیسلام بەیەکێك لەو دوو عومەرە شکۆدار بکات.[٨٣]

ئەم وێنەیە پڕشنگدارە و، ئەوەی لە کەسێتیی عومەری کوڕی خەتاب خوا لێی ڕازی بێت بەدی هات بوو، ئەوا بەڕای ئێمە شیاوی دووبارە بوونەوەی نییە و، بە هەڵە داچووین سیستمی فەرمانڕەوایی لە ولاتی ئیسلامی بە بوونی فەرمانڕەوایەکی لەم جۆرە دابمەزرێتەوە، پاشان دەمانەوێت، دڵنیا بین لەوەی سیستمە فەرمانڕەواییەکان لە ئیسلام دا ناکرێت تەنها بە نیازێکی چاك دابمەزرێت، بەڵکو بە مسۆگەری گەلێك و لە چارچێوەی ئیسلام و، بە دیاری کردنی بەرپرسیاری و چاودێرییەکی بەردەوام و لێپێچینەوە، ئەمەش هەمووی لە سەردەمی عومەری کوڕی خەتاب خوا لێی ڕازی بێت پیادە کراوە.

دوای ئەم خستنەڕوە، دەگەینە دەرەنجامێك، کە کارگێڕیی گشتی لە ئیسلام لە بنەڕەت دا هونەرە و، واشی دەبینین ئەمڕۆ خودان سروشتێکی تێکەڵ بێت، واتا وێڕای ئەو هونەرەی، کە سەرکردە سەرەتاییەکانی ئیسلام پێی دەناسرانەوە، ئەو هونەرە ڕەسەنە، بە وردی و بە وەرگیرانی لە پەیامبەری خوا ﷺ پەی بە ڕێسا زانستییەکانیش بردوە، بۆیەش پێویستە ئەم ڕێسا زانستییانە بگیرێتەبەر، کە سەرکردە کارگێڕە موسوڵمانەکان پێیان گەیاندوین.

# بەشی دووەم

# پەیوەندی بەڕێوەبردن بە زانستەکانی تر و تیۆریای بەڕێوەبردن

زانستی بەڕێوەبردن بەو ئەدگارەی، کە زانستێکە لە زانستە کۆمەڵایەتییەکان، لەگەڵ چەند زانستێکی تر، وەك زانستی سیاسی و یاسای کارگێری و ئابووری و دەروونناسی و ڕێناسی، جگە لەمەش ئەو زانستانەی، کە بایەخ بە توێژینەوەی دۆسیەکانی کۆمەڵایەتی دەدەن، بەشداری دەکات.

بۆیەش پێویستە تاوتوێی ئەو پەیوەندییە دروست بوە بکەین، کە لە نێوان زانستی بەڕێوەبردن و ئەم زانستانە دا هەیە، بە مەبەستی دەرخستنی پێگەی زانستیی بەڕێوەبردن لە نێو ئەم زانستانە و، ڕوون کردنەوەی ئەوەی بواری ڕێکەوتن یا کێبڕکێی نێوان ئەم زانستە و ئەو زانستانە هەیە.

هەروەها دەبێت هزری بەڕێوەبردنی ئیسلامی بکۆڵدرێتەوە بۆ زانینی ئەگەری هەبوونی ڕیشە گەلێکی تیۆریای بەڕێوەبردن لە ئیسلام و پەیوەندیی ئەم تیۆریایە بە تیۆریای بەڕێوەبردنی هاوچەرخ.

# توێژبەندی یەکەم

## بەڕێوەبردن و زانستی سیاسی

زانستی سیاسی یەکێکە لەو زانستە کۆمەڵایەتییانەی، کە نەچۆتە ناو زانکۆکان مەگەر لەماوەیەکی کورتی ئەم سەردەمە نەبێت و، زانستی سیاسی زانستێکە ڕێسا و بنەما گەلێکی ڕەسەنی خۆی هەیە[٨٤]

هەڵبەت پێشتر ئاماژەمان بەوە کرد، کە بەڕێوەبردن لەگەڵ بوونی کۆمەڵگەیەکی سیاسیی ڕێکخراو دا بوونی هەبوە، بۆیەش پەیوەندیی بەڕێوەبردن بە سیاسەت پتەو و کۆنە، بەجۆرێك بۆتە بەشێکی دانەبڕاو لێی، مەگەر پێویست بە سەربەخۆ بوونی بکات وەك زانستێکی دامەزراو بۆ خۆی[٨٥]

بەڵام پاش ئەوەی زانستی بەڕێوەبردن وەك زانستێك سەربەخۆ بوو و پایە و بنەماکانی تەواو بوو، کە قەوارەیەکی تایبەتی هەبێت، دەبێت بڕیاری پەیوەندیی پتەوی نێوان زانستی بەڕێوەبردنی گشتی و سیاسە بدرێت و، ئەوە دووپات بکرێتەوە، کە دابڕینی ڕەهایانە لە ڕووی زانستییەوە باش نییە و لە ڕاستیش دا دروست نییە[٨٦]

واشی دەبینین، کە بۆ ئەوەی پێگەی زانستیی بەڕێوەبردنی گشتی سەبارەت بە زانستی سیاسە دیاری بکەین، پێویست دەکات، کە ڕوە پێك چوو و هەروەها ڕوە جیاوازەکانی نێوانیان ڕوون بکەینەوە، لە دوایش دا هەڵوێستی ئسلام دیاری بکەین.

---

[٨٤] محمد المجذوب: المدخل إلى علم السياسة، محاضرات ألقيت على طلبة كلية الحقوق في الجامعة اللبنانية ١٩٦٩- ١٩٧٠، ص٧.

[٨٥] عبد الغني بسيوني عبدالله: أصول علم الإدارة العامة، ص٨٩.

[٨٦] إبراهيم عبد العزيز شسحا: الإدارة العامة، ص١٠٤.

## خواستی یەکەم: ڕوە پێك چویەکانی نێوان زانستی سیاسی و زانستی بەڕێوەبردنی گشتی

دەکرێت ڕوە پێك چویەکانی نێوان بەڕێوەبردن و زانستی سیاسی لە مانەی خوارەوە دا دیاری بکەین:

١- **ڕەسەنێتییەکی هاوبەش:** وای دەبینین، کە زانستی بەڕێوەبردن و زانستی سیاسی ڕەسەنێتییەکی هاوبەش پێکیان دەبەستێتەوە، کە بەڕێوەبردن بەشێکە لە زانستی سیاسی و لێی جیا نابێتەوە[٨٧]

٢- **تەواوکاری:** سیاسەتی گشتی ئەو ئامانجانە دیاری دەکات، کە پێویستە لەسەر کارگێڕیی گشتی پێیان بگات، ئەو ئاواتانەش ڕوون دەکاتەوە، کە دەبێت بەدەستیان بهێنێت، پاش ئەمەش بەرپرسیاریی گەیشتن بەم ئامانجانە و، بەرپرسیاریی بەدەست هێنانی ئەم ئاواتانە، دەکەوێتە سەرشانی کارگێڕیی گشتی، کە دووپاتی بوونی جۆرێك لە تەواوکاریی نێوان ئەم دوو زانستە دەکاتەوە[٨٨]

٣- **دەستوەردانی ئەندامیەتی:** زۆر جار بە ئاشکرا دەستوەردان لە نێوان کارگێڕیی گشتی و حکومەت لە لایەنی ئەندامێتی دا دەبێت، کە دەبێت گردبوونەوەیەك لە نێوان ئەندامێتیی حکومەت و ئەندامێتی کارگێڕی دا هەبێت، بۆ نموونە، وەزیر تەنها بە ئەندامێکی سیاسی لە وڵات دانانرێت، بەڵکو لەگەڵی دا، بە سەرۆکێکی ئەو دەستگە کارگێڕییەش گوزارشت دەکرێت، کە تێی دا کار دەکات.

---

[٨٧] بکر القباني: الإدارة العامة، ص١١١.

[٨٨] سليمان الطماوي: مبادئ علم الإدارة العامة، طبعة ١٩٨٠، ص١٧.

## خواستی دوەم: ڕوە جیاوازەکانی نێوان زانستی سیاسی و زانستی بەڕێوەبردنی گشتی

دیەنە جیاوازەکانی نێوان ئەم دوو زانستە لەمانەی خوارەوە دا دەردەکەوێت:

١. زانستی سیاسی، ڕێباز و سیستمە سیاسی و دەسەلاتەکانی ولات و ڕێکخستنە سیاسییەکانی ناوخۆ و، ئەوانەی پەیوەندییان بەم بابەتە بنەڕەتییانەوە هەیە، لە توێژینەوە و تێخوێندنەوەکان، دەخوێنێتەوە[٨٩]، لە کاتێك دا بەڕێوەبردنی گشتی بەشێوەیەکی بنەڕەتی بایەخ بە تێخوێندنەوەی چالاکی کارگێڕی، بە قۆناغە کارگێڕییە جیاجیاکانی دەدات[٩٠]

٢. سروشتی کاری سیاسی نا سەقامگیرە، چونکە پیاوانی سیاسی، لە ئەنجامی سروشتی ئەو کارەی، کە دەسەلات لێیانی دەوێت، کە سروشتێکی نا سەقامگیرە بە بەردەوام دەگۆڕێن، لە کاتێك دا کارگێڕی بە چەسپاوی و سەقامگیرییەکەی جیا دەکرێتەوە، چونکە سروشتی کاری کارگێڕی نموونەی ئەم جۆرە سەقامگیرییە پێویست دەکات، بۆیە دەبێت پیاوانی کارگێڕیی گشتی، لە پایەکانیان بەردەوام بن بۆ ئەوەی بتوانن بە خواستی فرمانە گشتییەکان هەڵستن، بۆ بەدەست هێنانی چاکسازیی گشتی و ڕاپەڕاندنی خزمەتگوزاریی گشتی[٩١]

٣. کاری سیاسی لەسەر بنەمای بەدەست هێنانی بەرژەوەندی دادەمەزرێت و، ململانێی پارتایەتی و ناکۆکییە کەسەکییەکان و، کۆمەڵە فشارییە جیاجیاکان ڕۆلێکی کاریگەر لە دەرکردنی بڕیارە سیاسییەکان بە بەردەوام، دەگێڕێن، بۆیە مەیدانی سیاسی لە هەر ولاتێك لە ولاتان و لەهەر کاتێك لە کاتەکان دا شانبەشانی ڕاو بنەما و بەها بەرزەکان و، قوربانی دان، مەیدانی جەنجاڵیی

---

[٨٩] محمد مجذوب: المدخل إلى علم السياسة، ص١٠ وما يليها.

[٩٠] عبد الغني بسيوني عبدالله، أصول علم الإدارة العامة، ص٩١.

[٩١] عبد الغني بسيوني عبدالله، أصول علم الإدارة العامة، ص٩١

ئارەزوو و بەرژەوەندی و مەرایی کردن و هەوەس و گومان بردنە[٩٢]، لە کاتێك دا کارگێڕیی گشتی لەسەر بنچینە و بنەمای ژیرانە دادەمەزرێت بۆ بەدەست هێنانی ئامانجە پێوەبەستراوەکانی، بە کەمترین تێچوون و ڕەنج و کات و دارایی[٩٣]

بەڵام ئەم ڕوە جیاوازانە مانای ئەوە نییە، کە دابڕاوییەکی تەواو لە نێوان ئەم دوو زانستە دا هەیە، بەڵکو تێخوێندنەوە و توێژینەوەکانی زانستێك لە ڕۆشنایی مەیدانی تێخوێندنەوە و توێژینەوەکانی زانستەکەی تر دایە، هەروەك هەریەکێکیان تا ڕادەیەکی زۆر سوود لە تێخوێندنەوە و توێژینەوەکانی زانستەکەی تر دەبینێت[٩٤]

## خواستی سێیەم: هەڵوێستی ئیسلام

ئەو ماوە درێژەی تەمەنی وڵاتی ئیسلامی وای کرد، سیستمی فەرمانڕەوایی ئیسلام لە شێوەی جیاجیا دا دەربکەوێت، وەك سەردەمی جێنشینەکانی ڕاشیدین جیاواز بوو لە سەردەمی ئەمەوییەکان، ئەمیش جیاواز بوو لە سەردەمی ئەباسییەکان، هەروەك لە دوای سەردەمی عەباسییەکان لە لێواری هەڵوەشانەوە و ترازانی دا بوو، ئەم ڕاستییەش هەرکەسێك دەستی دەکەوێت، ئەگەر بە پاکی بە تێخوێندنەوەی ئەم بابەتە هەڵبستێت.

لێرە دا ئەو هەڵوێستەی لەبارەی پەیوەندیی زانستی سیاسی بە زانستی بەڕێوەبردنی گشتی و لە سۆنگەی بابەتەکانی تر وەری دەگرین، بەشێوەیەکی تایبەت ئەو هەڵوێستەیە، کە هێڵی سەرەکیی فەرمانڕەوایی لە سەردەمی پەیامبەرﷺ و جێنشینەکانی ڕاشیدینی خوا لێیان ڕازی بێت پێ جیا دەکرێتەوە، دەنوێنێت، چونکە ئەم هێڵە لە تێڕوانینی ئێمە ڕاستیی ئیسلام دەنوێنێت.

---

[٩٢] عبد الحميد متولي: القانون الدستوري والأنظمة السياسية، الجزء الأول، طبعة ثانية ١٩٦٤، ص١٢.

[٩٣] عبد الغني بسيوني عبدالله، أصول علم الإدارة العامة، ص٩٢.

[٩٤] إبراهيم عبد العزيز شيحا: الإدارة العامة، ص١٠٥.

گومانیش لەوە دا نییە، کە پەیوەندیی سیاسەت بە بەڕێوەبردن، پەیوەندییەکی پتەو و کۆنە بۆ سەردەمی پەیامبەر ﷺ دەگەڕێتەوە، نموونەیەکیش لەم بارەوە دەهێنینەوە، "کۆچ" کە تەکبیرێکی سیاسییە و لەهەمان کات دا بڕیارێکی کارگێریشە[٩٥]، دەقی قورئانی پیرۆزیش لەم بارەوە هەیە: ﴿قَالُواْ كُنَّا مُسْتَضْعَفِينَ فِي الأَرْضِ قَالْوَاْ أَلَمْ تَكُنْ أَرْضُ اللّهِ وَاسِعَةً فَتُهَاجِرُواْ فِيهَا﴾[٩٦] واتا: "گوتیان (ئێمە) بێ هێز(بێ توانا و دەست بەسەر) بووین لە خاك(وڵات)ەکە دا (فریشتەکانیش) دەڵێن: ئایا زەوی خوا فراوان نەبوو تا کۆچی بۆ بکەن(لەدەست ستەمکەران ڕزگارتان بوایە)". کاتێك ئازار دانی مووسوڵمانە سەرەتاکانی مەکە توندتر بوو، پەیامبەر ﷺ دوو جار فەرمانی کۆچ کردنی پێ کردن بۆ حەبەشە، پاشان دوای ئەمە کۆچ بۆ مەدینە[٩٧]

هەڵاتن لە ئازار دانی قوڕەیش تەنها هۆکاری سەرەکی نەبوو، کە قوڕەیشییەکان باوەڕیان وا بوو و، بەخۆ بەزل زانی باسیان لێوە دەکرد، بەڵکو هۆکاری ڕاستەقینە لای پەیامبەرﷺ کاتێك ڕێی بە هەندێك لە پەیڕەوانی دا، کە کۆچ بۆ حەبەشە بکەن، برەودان بوو بە بانگەوازەکەی ئیسلام لە نێو حەبەشییەکان و، دەرخستنی ئەوەی شوێنکەوتەکانی لەسەری بوون، لە پابەندی و نموونەی بەرز و، ئارامی و، هەوڵێك بۆ ئاشتی و، دەرخستنی ئەوەی، کە نەیارانیان لەسەری بوون لە ناچار کردن و ستەم کردن.

ئەمانە هەموو لەو کارانە دەچێت، کە وڵاتانی نوێ دەیکەن، کاتێك هەوڵ دەخەنە گەڕ و کار بۆ دەست خستنی ویژدانێکی جیهانییانە دەکەن، لە ڕێگای بانگەوازێکی ئاشتییانە و ناردنی شاند بۆ گەیشتن بە خواست و بانگەشەی پێداویست بە سیاسەتێکی تر[٩٨]

---

[٩٥] علي علي منصور: نظم الكم والإدارة في الشريعة الإسلامية والقوانين الوضعية، ص٢٢٨.
[٩٦] سورة النساء: الآية ٩٧.
[٩٧] .علي علي منصور: نظم الكم والإدارة في الشريعة الإسلامية والقوانين الوضعية، ص٢٢٨
[٩٨] علي علي منصور: نظم الكم والإدارة في الشريعة الإسلامية والقوانين الوضعية، ص٢٢٩.

لەم نموونەیە دا بەڵگەی پەیوەستیی نێوان سیاسە و بەڕێوەبردن لـە ئیسـلام دا دەبینین، ئەم پەیوەستییەش بەشێوەیەکی ڕوون لـە سـەردەمی سـەرکردە عومـەری کوڕی خەتاب خوا لێی ڕازی بێـت، دەردەکـەوێت، کـە سیاسـەت و کـارگێڕی لـە هەموو کارێکی دا پەیوەست بوون بەیەك.

جا شتێك نابینین، کە ڕێگری بکات لە هەڵستان بە تێخوێندنەوەیەکی زانسـتی سیاسـیی ئیسـلامی و، لێکۆڵینـەوە لـە ڕیشـەی تیۆریـای سیاسـیی ئیسـلامی بەشـێوەیەکی سـەربەخۆ لـە سەرچـاوە ئیسـلامییەکان دا، نموونـەی ئـەم کـارەش بەرهەڵستیی ڕەها لەگەڵ ئاراسـتەکانی هـزری ئیسـلامی ناکـات، نـەخێر بـەڵکو لەکاتی ئێستا دا پێویستە هەڵستین بە تێخوێندنەوەیەکی ئیسـلامیی تایبـەت بـە هەر زانستێك لە زانستەکان.

# توێژبەندی دووەم

## بەڕێوەبردنی گشتی و بەڕێوەبردنی کار

زۆربەی نووسەرانی بەڕێوەبردنی گشتی باوەڕیان وایە، کە جیاوازیی گەورە یا سنووی جیاکەرەوە لە نێوان بەڕێوەبردنی تایبەت و بەڕێوەبردنی گشتی دا نییە، بەڵکو ئەم دووانە ملکەچیی یەك بنەما و بنچینەن و، بنەمای هاوبەشی زۆریش هەیە، کە کۆیان دەکاتەوە[٩٩]

لە ڕاستی دا ناتوانین بەم بۆچوونانە خۆمان بدەینە دەست، چونکە ئەگەر دروست بێت، کە بنەما زانستییەکانی بەڕێوەبردن لە مەیدانی پڕۆژە تایبەتەکان دەرکەوتوە و، لە ڕەسەنەوە ڕووەو بەڕێوەبردنی تایبەت ئاراستە کراوە، بەڵام پاشان بنەماکان پەرەیان پێ دراوە، بەوجۆرەی لەگەڵ دۆخ و گرفتەکانی بەڕێوەبردنی گشتی دا دەگونجا پەیڕەو کرا[١٠٠]، لەبەر ئەمە ئەو ڕایە زاڵ دەبێت، کە باوەڕی بە سەربەخۆیی زانستی بەڕێوەبردنی گشتی لە بەڕێوەبردنی کار دا هەیە لەبەر بوونی چەندین جیاوازیی نیوانیان، کە جیایان دەکاتەوە، سەرباری هاوبەشییان لە چەندین ڕووی نزیککەرەوە و بەیەك چوو[١٠١]

لە خوارەوەش دا هەوڵ دەدەین ڕووە پێك چوو و ڕووە جیاوازەکانی نێوان بەڕێوەبردنی گشتی و بەڕێوەبردنی کار بخەینە ڕوو:

١ – **ڕووە پێك چووەکان:** هەریەك لە زانستی بەڕێوەبردنی گشتی و بەڕێوەبردنی کار بۆ پیادە کردنی بنەما و ڕەچەڵەکە گشتییەکان لە کارگێڕی دا، کۆشش دەکەن، لە پێناو بەدەست هێنانی گورجیی کارگێڕی، واتا بە مەبەستی

---

[٩٩] عبد الفتاح حسن: مبادئ الإدارة العامة، دار النهضة العربية، القاهرة، ١٩٧٢، ص٢١.

[١٠٠] عبد الغني بسيوني عبدالله: أصول علم الإدارة العامة، ص٩٣.

[١٠١] سليمان الطماوي: مبادئ علم الإدارة العامة، ص٢٣.

گەیشتن بە ئامانجە دیاری کراوەکان بە کەمترین تێچوون و ڕەنجی مرۆیی و کورترین کاتی توانراو، لەم بوارەش دا دەبینین، کە نزیکیی نێوان ئەم دوو زانستە ڕوونە، لە گرتنەبەری بنەماکانی ڕێکخستنی کارگێڕیی ساغ و، پیادە کردنی ڕێسایەکانی هەماهەنگی و ئاراستە کردن و، دەستەبەر کردنی پەیوەندکارییەکی باش لە نێوان لقە کارگێڕییەکانی ڕێکخراوە و بنکە سەرەکییەکەی.

بەوجۆرە دەبینین کەوا ڕێساکانی بەڕێوەبردن، کە کارایییەکەیان لە پرۆژە تایبەتەکان دا سەلمێنراوە، دەکرێت لە کەرتی گشتی دا پیادە بکرێن، هەروەك زۆرێك لە گرفتە کارگێڕییەکان دەبینین، کە بە چارەسەریی باش و سەرکەوتوانە لە پرۆژە تایبەتەکان دا چارەسەرکراون، دەشێت ئەم چارەسەرییانە لە مەیدانی کارگێڕیی گشتیش دا پەیڕەو بکرێن[١٠٢]

بەڵام سەرباری ئەو ڕوە بەیەك چوانەی، کە لە سەرەوە دا باس کران، دەبینین چەندین جیاوازیی بنەڕەتی هەن، کە کارگێڕیی گشتی لە کارگێڕیی تایبەت جیا دەکەنەوە.

٢ – **ڕوە جیاوازەکان:** دەکرێت ڕوە جیاوازییە جیاکەرەوەکانی کارگێڕیی گشتی لە کارگێڕیی تایبەت لە پێنج جیاکەرەوەی سەرەکی، وەك ئەمەی خوارەوە کورت بکەینەوە:

ا – کارگێڕی ئامرازێکە بۆ بەدەست هێنانی ئامانجێکی دیار کراو، بۆ هەر کارگێڕییەکیش ئامانجێك یا چەندین ئامانجی دیاری کراو هەن، کە کۆشش بۆ پێ گەیشتنیان دەکات، ئەم جیاکارییانەش جیاکەرەوەی نێوان کارگێڕیی گشتی و تایبەتمان بۆ ڕوون دەکەنەوە، هەروەك کارگێڕیی گشتی بۆ بەدەست هێنانی بەرژەوەندیی گشتی کۆشش دەکات، لە کاتێك دا، دەبینین، کە ئامانجی کارگێڕیی تایبەت بەدەست هێنانی قازانجی کەرەستەییە[١٠٣]

---

[١٠٢] عبد الغني بسيوني عبدالله: أصول علم الإدارة العامة، ص٩٣- ٩٤.

[١٠٣] إبراهيم عبد العزيز شيحا: الإدارة العامة، ص٨٠.

ب — بەشێوەیەکی گشتی چالاکییەکانی کارگێڕیی گشتی ملکەچی بنەما و ڕێسا گەلێکی یاسای کارگێڕین، لە کاتێك دا دەبینین، کە چالاکییەکانی کارگێڕیی تایبەت یاسای تایبەتی بەسەر دا پیادە دەکرێت. یاسای کارگێڕی لە وەرگرتنی بڕیارە کارگێڕییە پێویستەکان بۆ تاکەکان جیاوکی گەلێکی دەسەلآتی گشتی بە کارگێڕیی گشتی دەدات و، پەنا بردن بۆ زۆر لێ کردنیان لە جێبەجێ کردنی ڕاستەوخۆی بەناچاری و، بڕیار دانی جیاوکییەکان بۆ گرێبەستکەران لەگەڵی، هەموو ئەمانەش لە پێناو گەیشتنە بەو ئامانجە گشتییانەی، کە کارەکە پشتی پێ بەستاوە بۆ بەدەست هێنانیان.

هەروەك کارگێڕیی گشتی لە چارچێوەیەك لە پابەند بوون بە ڕەوایی و ڕێز گرتنی ماف و ئازادییە گشتییەکان و، لە چارچێوەی پسپۆڕییە دیاری کراوەکان بە یاسا، کاردەکات، لە کاتێك دا کارگێڕیی تایبەت ملکەچی ڕێساکانی ئەو یاسا تایبەتەیە، کە لەسەر تاکەکان پیادە دەکرێت، کە بێ جیاوکی یا هەلآوێردن گیانی یەکسانی تێی دا باڵآ دەستە، وێڕای هەبوونی ڕادەیەکی بەرزی ئازادی، لە ڕێکخستن و کارگێڕی دا[١٠٤]

ج — کارگێڕیی گشتی لە مامەڵەی لەگەڵ جەماوەری سوودمەند بە خزمەتگوزاریی کەرتی گشتی، بنەمایەکی گشتیی گرنگ تێی دا، باڵآ دەستە، کە یەکسانییە لەبەردەم کەرتی گشتی دا.

سەبارەت بە کارگێڕیی تایبەت، ئەوا بە یەکسانی لە نێوان مامەڵەکەران لەگەڵی، بەم پابەندییە یاساییە پابەند نییە، بەڵام جێی تێبینییە، کە یەکسانی جارجار پابەندییەکی ڕەوشتیی پرۆژەی تایبەت، لە هەمبەر مامەڵەکەران لەگەڵی، دەنوێنێت، سەرباری ئەمەش، زۆرجار پرۆژەی تایبەت لە مامەڵە دا ئەگەر بەرژەوەندییەکەی بخوازێت، لە نێوان مامەڵەکەران یا پارەدارکەرانی دا جیاکاری دەکات.

---

[١٠٤] عبد الغني بسيوني عبدالله: أصول علم الإدارة العامة، ص٩٧.

چ – کەرتی گشتی و پرۆژەی گشتی بە مۆرکە قۆرخکارییەکەی جیا دەکرێتەوە، واتا چالاکییەکانی زۆربەی کات لە ڕەوشێکی قۆرخکاری دا پیادە دەکات، لەکاتێك دا دەبینین لە پرۆژە تایبەتەکان دا ڕکابەریی ئازاد، ڕکێفی چالاکییە ئابوورییەکانی پرۆژە تایبەتەکان دەکات.

بوونی پرۆژە گشتییەکان، کە جۆرێك لە ڕکابەریی ئابووری لە نێویان دا هەبێت، هەروەك لە هەندێك ولآت دا ئێستا بوونی هەیە، کە بە دیموکراسی میللی ناسراون، ناونراو بە ڕێسای گشتی لە مۆرکی قۆرخکاریی کەرتی گشتی ناگۆڕێت[١٠٥]

هەروەها بوونی هەندێك لەو پرۆژە تایبەتانەی، کە چالاکییەکانیان لەژێر سایەی سیستمێکی قۆرخکاری ئەنجام دەدەن، ئەمیش لە ڕێسا گشتییەکەی لانادات، چونکە قۆرخکاری لە بواری چالاکییە تایبەتەکان دا پرسێکی هەڵاوێردراوە[١٠٦]

د – کارگێڕیی گشتی ملکەچی فرە شێوەی بەرپرسیاری یاسایی و چاودێرییە، لێرە دا بەرپرسیاری گەلێکی کارگێری هەن، کە خۆی لە ملکەچ کردنی کارگەرانی کارگێڕیی گشتی بۆ سەرۆکەکانیان و، ئەوەی بەدوایەوە دێت لە بەرپرسیارییەکان لە هەمبەریان، دەنوێنێت.

بەرپرسیاریی سیاسیش هەیە، کە بریتییە لە چاودێریی دەستگەی سیاسی و لێپێچینەوە لە کارگێڕیی گشتی، وەك ملکەچیی بۆ ئەنجوومەنی نوێنەران، لە کۆتایش دا بەرپرسیاریی کارگێڕیی گشتی لەبەردەم دادوەری ئاسایی یا کارگێری دا هەیە، کەچی دەبینین کارگێڕیی تایبەت ملکەچی نموونەی ئەم بەرپرسیارییە توندە نابێت بەشێوە جیاجیاکانی و، بەرپرسیاریەتەکەشی لە بنەڕەت دا لە ڕووبەڕوو بوونەوەی بەرپرسیاریی کۆمەڵایەتی کورت دەبێتەوە.

٣ – **هەڵوێستی ئیسلام:** گومان لەوە دا نییە بنەما زانستییە نوێیەکان، کە لە مەیدانی کارگێڕیی تایبەت دا دەرکەوتن، پاشان لە کارگێڕیی گشتی دا پیادە کران، نەخاسمە لە ولآتە یەکگرتوکانی ئەمەریکا، کە زۆرێك لە نووسەرانی وا

---

[١٠٥] فؤاد العطار: مبادئ علم الإدارة العامة، دار النهضة العربية، القاهرة ١٩٧٤، ص١٩.

[١٠٦] إبراهيم درويش: الإدارة العامة في النظرية والممارسة، القاهرة ١٩٧٥، ص٢٥.

لێ کرد بڕوایان وابێت، کە جیاوازیی گەورە یا سنووری جیاکەرەوە لە نێوان کارگێڕیی تایبەت و بەڕێوەبردنی گشتی دا نییە، بەڵکو هەردوکیان ملکەچی یەك بنەمای بنەڕەتین و، ژمارەیەکی زۆر لە بنەمای هاوبەش هەن، کە کۆیان دەکاتەوە[١٠٧]

لە ولاّتی ئیسلامیش ڕەوشەکە تا ڕادیەك لەم بازنەیە نزیك بوو، هەروەك بنەماکانی کارگێڕیی تایبەتی وەرگیراو لە قورئانی پیرۆز و سوننەتی پەیامبەر ﷺ، لە کارگێڕیی گشتی دا پیادە کراوە، بە گوزارشتێکی تر بنەماکانی بەڕێوەبردنی گشتی و بەڕێوەبردنی تایبەت تێهەڵکێشییەك لە نێوانیان دا هەیە.

وای دەبینین، کە ڕێگرێك نییە لە دامەزراندنی زانستێکی بەڕێوەبردنی ئیسلامی، کە ڕێچکە و ڕەگەکەی لە ئیسلام دا وەرگیرا بێت.

---

[١٠٧] عبد الغني بسيوني عبدالله: أصول علم الإدارة العامة، ص٩٩.

# توێژبەندی سێیەم

# بەڕێوەبردنی گشتی و یاسای کارگێری

## یەکەم: لە سیستمە دانراوییەکان

بەڕێوەبردن تەوەری تێخوێندنەوەی هەریەك لە بەڕێوەبردنی گشتی و یاسای کارگێری دەنوێنێت و، لەمیشەوە ناویان پێك دێت، بەیەکەوەش، هەریەك لە چارچێوەی تێخوێندنەوە و توێژینەوەکانیان دا، لە تێخوێندنەوەی سەرجەم لایەنەکانی پەیوەندیدار بە بەڕێوەبردن پشکداری دەکەن[١٠٨]

یاسای کارگێری، لە بنەڕەت دا بایەخ بە تێخوێندنەوەی لایەنی یاسایی پەیوەندیدار بە کارگێڕی، یا بە دەستگەی کارگێڕیی ولآت دەدات، بۆیە ئەو ڕێسا یاساییە جیاجیایانەی تێ دایە، کە بڕیار بەسەر چالاکییە کارگێڕییەکان دەدات، هەروەها یاسای کارگێری بڕیار بەسەر پەیوەندیی نێوان کارگێڕی و تاکەکان بە ڕوون کردنەوەی ماف و ئەرکەکانی هەریەکەیان، دەدات، هەروەك دادوەریی کارگێری خوێندنەوە بۆ بڕیارەکانی دەکات، ئەمەش لە لایەك ئەو ڕێسایانەی، کە پێکهاتەی ڕێکخراوە گشتییەکانی ڕاسپێردراو بە مسۆگەر کردنی پڕ کردنەوەی لایەنی پێداویستەکانی دانیشتوان و، پەیوەندیی ڕێکخراوەکان لەگەڵ یەکتری دا، دیاری دەکات، لە لایەکی تر ڕێسا تایبەتەکان بە چالاکییەکانی ئەو ڕێکخراوانە و پەیوەندییان لەگەڵ تاکەکان، لەخۆ دەگرێت، لە دوایش دا ئەو ڕێسایانەی، کە چاودێریی دادوەری لەسەر کاری کارگێری دیاری دەکەن، لەخۆ دەگرێت[١٠٩]

---

[١٠٨] عبد الغني بسيوني عبدالله: أصول علم الإدارة العامة، ص٩٢- ٩٣.

[١٠٩] إبراهيم عبد العزيز شيحا: الإدارة العامة، ص٩٣- ٩٤.

بەڕێوەبردنی گشتیش گرنگی بە تێخوێندنەوەی دەستگە کارگێرییەکانی ولآت دەدات، بەوەی ڕێکخراوەی کارگێریی جیاجیا دەگرێتەوە، هەروەك بایەخ بە تێخوێندنەوەی لایەنی هونەریی چالاکییەکانی ئەم ڕێکخراوە کارگێرییانە دەدات[١١٠]

سەرباری ئەوەی بۆ هەموو زانستێك چارچێوەیەکی تایبەت بۆ تێخوێندنەوە و توێژینەوە هەیە، بەڵام لەیەك نزیکییان ڕوون و ئاشکرایە، هەروەك هەندێك جار بە تێخوێندنەوەی هەندێك لایەنی ڕێکخستنیی کارگێڕی دەخرێتە ڕوو، لە تێخوێندنەوەکەش دا لە باسی لایەنی یاسایی کورت نابێتەوە، بەڵکو بەرەو باسی لایەنی ئەو ڕێکخستنەش دەچێت، کە بەڕێوەبردنی گشتی بە شێوەیەکی بنەڕەتی بایەخی پیێ دەدات[١١١]

یاسای کارگێری خوێندنەوە بۆ ڕێکخستنی کارگێریی دەستگەی کارگێریی ولآت دەکات، بە دەستگە جیاجیاکانییەوە، جا ناوەندی بن، وەك وەزارەت و فەرمانگە فرە لقەکانی، یا ناناوەندی بن، وەك دەستگە گشتییەکان، هەروەك یاسای کارگێری بایەخ بە تێخوێندنەوەی لایەنەکانی ڕێکخستن لە هەندێك دەستگە دەدات، وەك تێخوێندنەوەکانی فرمانبەرە گشتییەکان و چاودێری لەسەر کارگێڕی و هی تریش[١١٢]

بەڵام بەڕێوەبردنی گشتیی ئێستا بۆ تێخوێندنەوەی لایەنە ڕێکخستنییە هونەرییەکانی سەرجەم بابەتە پەیوەندیدارەکان بە پەیکەری ڕێکخراوە کارگێرییەکان و چالاکییەکانیان تایبەت کراوە.

سەرباری ئەمانەش، تەواوکارییەك لەنێوان زانستی بەڕێوەبردن و زانستی یاسای کارگێری دا هەیە، چونکە تێخوێندنەوەی هەریەکێکیان پێویستە بۆ پێشکەوتن و گەشە پێدانی ئەوەی تر.

---

[١١٠] إبراهيم عبد العزيز شيحا: الإدارة العامة، ص٩٢- ٩٣.
[١١١] محمد كامل ليلة: مبادئ القانون الإداري، الجزء الأول ١٩٦٨- ١٩٦٩.
[١١٢] إبراهيم عبد العزيز شيحا: الإدارة العامة، ص٩٥.

یاسای کارگێری بایەخ بە تێخوێندنەوە یاساییەکانی کارگێڕی دەدات و، تەواوی لایەنــەکانی تــری توێژینــەوە کارگێرییــەکان، ناگرێتــەوە، لێــرە دا ئــەو ڕۆڵــەی بەڕێوەبردنی گشتی دێت، کە توێژینــەوە هونــەری و ڕێکخســتنییەکانی لــە پێنــاو دیاری کردنی چاکترین ڕێکخستنە کارگێرییەکانی لە توانــا دان و ســەرکەوتووترین ئامرازەکان بۆ بەدەست هێنانی گورجیی کارگێڕی، چڕ دەکاتەوە[١١٣]

## دوەم: لە ئیسلام دا

لە میانەی توێژینەوەمان لە بەدواداچوونی تێخوێندنەوەی ولاّتی ئیسلامی لــە ســەردەمە جیاجیاکــانی دا، بۆمــان ڕوون دەبێتــەوە، کــە پێکەوەبەنــدیی نێــوان کارگێڕیی گشتیی ئیسلامی و یاسای کارگێریی ئیسلامی ڕوون و ئاشکرایە.

واشی دەبینین، کە لەم بارەیەوە ولاّتی ئیسلامی لە سەردەمی عومەری کــوڕی خەتاب خوا لێی ڕازی بێت بە نموونە وەربگــرین، کــە ســەرباری ئــەوەی چــالاکییە جەنگییەکان زۆربەی زۆری کاتەکانی عومەریان خوا لێی ڕازی بێت دەبــرد، کەچــی لە بەخشینی تــەواوی هەوڵەکانیشــی بــۆ بــەڕێوەبردنی ولاّت و چــاودێریی لایەنــە ئاوەدانکارییەکان دا سڵی نەدەکرد، هەروەك دیوانی دامەزراند و ولاّتی بۆ ویلایەت گەلێك دابەش کرد، چەندین شاریشی لە دەرەوەی دوورگەی عەرەبی دروســت کــرد و، زۆرێك لە پرۆژەی ئاوەدانکاریی دامەزراند.

لە لایەنی دوەم، ئەوەتا عومەر خوا لێی ڕازی بێت بایەخی داوە بــە ویلایــەتی سکالاّیەکان، کە دادگەی کارگێریی ئیسلامییە، لە پسپۆرییەکانی ئەم دادگەیەش:

١) تێڕوانینی دەسدرێژیی والییەکان بۆ سەر ژێردەستەکانیان.
٢) تێڕوانینی ئەو ستەمەی فرمانبەران لە کۆ کردنەوەی دارایی دا دەیکەن.
٣) تێڕوانینی باری نووسەرانی دیوانەکان.
٤) تێڕوانینی سکالاّی فرمانبەران.

---

[١١٣] ماجد الحلو: علم الإدارة العامة، ص٤٤.

٥) بەربەچ دانەوەی ئەو کارانەی ولاّتی ئیسلامی، کە سەرپێچیی بڕیارەکانی ئیسلامن.

٦) سەرپەرشتی لەسەر جێبەجێ کردنی ئەو بڕیارانەی، کە دادگە ناتوانێت جێبەجێیان بکات.

لێرە دا بڕیار دەدەین، کە دادوەرییەکی کارگێڕیی ئیسلامیی سەربەخۆ هەبوە، لە سایەی ولاّتی ئیسلامی دامەزراوە و، ڕێسا یاساییەکان لە ئەنجامی پیادە کردنی ئەم دادوەرییە کارگێڕییەی ئیسلام دا، بوونی هەبوە و، وای دەبینین، کە پێویستە توێژەران هەڵسن بە توێژینەوە و بەداواداچوونی ئەم یاسا کارگێڕییە ئیسلامییە و کۆ کردنەوەی ڕێساکانی و ڕێك کردنیان لە تیۆرییایەکی ئیسلامیی تەواوکار دا.

پشت بەست بەوەی پێشکەش کرا، ئەوا کارگێڕیی گشتیی ئیسلامی لەگەڵ یاسای کارگێڕیی ئیسلامی دا تێهەڵکێشە.

# توێژبەندی چارەم

## بەڕێوەبردنی گشتی و زانستی ئابووری و دارایی گشتی

زانستی ئابووری ئەو ڕێسایانە دەتوێژێتەوە، کە پەیوەندیدارن بە بەرهەمهێنان و بەکاربردن، بۆیە بایەخی خۆی ئاراستەی تێخوێندنەوەی داهات و بەرهەم هێنان و پاشەکەوت کردن و وەبەرهێنان و تێچوون و دابەش کردن، دەکات[١١٤]

زانستی دارایی گشتیش خوێندنەوە بۆ داهات و مەزاختنەکانی وڵات دەکات و، بایەخ بە توێژینەوەی لایەنە جیاجیاکانی بودجەی گشتی و قۆناغەکانی ئامادە کردنی دەدات، هەموو ئەمانەش ئامانجی ئاراستە کردنی دەرامەتەکانی وڵاتە ڕووەو پڕ کردنەوەی پێداویستییە گشتییەکان[١١٥]

هەڵبەت پەیوەندیی بەڕێوەبردنی گشتی و زانستی دارایی و ئابووری قوڵتر بووە، دوای ئەوەی ڕۆڵی وڵاتانی نوێ زیادی کرد، لە ئەنجامی دەستوەردانی لە زۆرێك لە بوارە ئابوورییەکان، کە پێشتر لە چالاکیی تایبەتەوە قۆرخ کرابوون، بۆیە پێداویست دروست بوو بە وەرگرتنی بنەمای ئابووری و ڕێساکانی دارایی گشتی، لە ڕێکخراوە کارگێرییەکان[١١٦]

پێشتریش ئاماژەمان بەوە دا، کە زانستی بەڕێوەبردنی گشتی، ئامانجی بەدەست هێنانی ئامانجە گشتییەکانی وڵاتە، بە بەرزترین ئاستی تەواوێتی، واتا بە کەمترین تێچوون و بەوپەڕی ڕەنجی مرۆیی و، بە کورترین کات، لێرە دا بەڕێوەبردنی گشتی لە لایەنی ئابووری لە تەك زانستی ئابوورییەوە، بەشداری لەم ئامانجانە دا دەکات، ئەو زانستەی، کە بنەمای تەواوێتیی ئابووری بەکاردەخات، واتا بەکارخستنی دەرامەتە فەراهەمەکان، لە پێناو بەدەست هێنانی بەرزترین

---

[١١٤] عاطف صدقي: مبادئ المالية العامة، دار النهضة العربية، القاهرة ١٩٧٠، ص٩ ومايليها.
[١١٥] إبراهيم عبد العزيز شيحا: الإدارة العامة، ص١٠٨.
[١١٦] إبراهيم درويش : الإدارة العامة في النظرية الممارسة، ١٩٧٥، ص٥٨.

توانای بەرهەم هێنانی توانراو، هەروەك بەڕێوەبردنی گشتی لەگەڵ ئەو داراییە گشتییەش دا بەشداری دەكات، كە ئامانجی ئاراستەكردنی دەرامەتەكانی وڵاتە ڕوەو پڕ كردنەوەی پێداویستییە گشتییەكان بە بەرزترین توانستی توانراو.

**هەڵوێستی ئیسلام:** هەڵوێستی ئیسلام لەم پرسە دا بەوە پوخت دەبێت، كە كارگێڕیی گشتیی ئیسلامی و ئابووریی ئیسلامی و دارایی ئیسلامی، هەموو ئەمانە شان بەشانی یەكتری ڕێگەیان گرتوە[117]، لەم سۆنگەیەوە بە باشی دەزانین، كە پەیوەندیی نێوان ئەم زانستانە بخەینە ڕوو، بە وەرگرتنی ماوەی فەرمانڕەوایی عومەر ی كوڕی خەتاب خوا لێی ڕازی بێت وەك نموونەیەكی تێخوێندنەوەكە.

لێرە دا دەگەینە وردترین خالەكان لە سیستمی كۆمەڵایەتیی ئیسلامی، جا ئەگەر بەپێی زاراوەی سەردەمی نوێ و دابەش كردنەكانی ڕێمان گرتەبە و، سیستمی ئابووریمان گەڕاندەوە بۆ دوو ڕەگەزە ناسراوەكەی، كە: بەرهەمهێنان و دابەش كردنن، ئەوا دەبینین، كە تازە كردنەوەی سیستمی ئیسلامی بەشێوەیەكی ڕوون و ئاشكرا لە چارچێوەی ڕەگەزی دابەش كردن دەركەوتوە[118]

ڕەگەزە باوەكانی بەرهەم هێنان لەو ناوچەیەی، كە ئیسلامی لێ بەدەركەوت وەك ئەدگارێكی بنەڕەتی جەختی لەسەر بازرگانی دەكردەوە، كە خوای پاك لە قورئانی پیرۆز دا تۆماری كردوە، لەكاتێك دا ئاماژەی بە كاروانی هاوینە و زستانە كردوە، ئەویش لەهەر كوێیەك ئاو بوونی هەبوو بێت، خەڵكەكە شوانییان تێ دا كردوە و، پەروەردەی ئەو ئاژەڵانەشیان كردوە، كە دەكرا لەگەڵ كەشی ناوچەكە دا ڕام بن و، لەسەرووشیانەوە وشتر، كە سامانی ڕاستەقینەی خەڵكەكە بوو، بەدوای ئەمیشەوە ئەسپ و مەڕ، هەروەك خەڵكی ناوچەكە لە شوێنە جیاجیاكان دا، كشتوكاڵیشیان زانیوە، نەخاسمە لە دەوروبەری شار دا، بەڵام سەبارەت بە پیشەسازی، ئەوا لە سەرەتای دا بوە و لە كەلوپەل و پێویستییەكانی ژیانی ڕۆژانە دەرنەدەچوو، جا كەلوپەلی ئاسایی بن یا جەنگی.

---

[117] سليمان الطماوي: عمر بن الخطاب وأصول السياسة والإدارة الحديثة، ص٤٠٢.

.سليمان الطماوي: عمر بن الخطاب وأصول السياسة والإدارة الحديثة، ص٤٠٢

ئەو گۆڕانەی ئیسلام لەم بوارە دا دای هێناوە، لەوە دا خۆی دەبینێتەوە، کە ڕەگەزی مرۆیی تێکەڵ بە پەیوەندییەکانی بەرهەم هێنان کردوە، لە خوارەوەش دا ئاماژە بە گرنگترین ڕێنماییە داهێنراوەکانی ئیسلام دەکەین:

یەکەم: یاساخ کردنی سوو.

دووەم: یاساخ کردنی مامەڵە کردن بە هەندێك کاڵا، وەك مەی و بەراز.

سێیەم: یاساخ کردنی هەندێك چالاکیی زیانگەیەنەر بە کۆمەڵگە، وەك قومار[119]

لەتەك ئەم بەشە نەرینییەی، کە لەسەر قەدەغە کردن و یاساخ کردن دامەزراوە، ئیسلام ڕێسا گەلێکی ئەرینیشی داناوە، کە مامەڵە مرۆڤایەتییەکان سەرپشك دەکات وەك: قەدەغەکردنی قۆرخ کردنی خۆراك، قەدەغە کردنی ساختە، پێدانی پاداشتی کارکەر.

ئەو گۆڕانە گەورەیەی، کە ئیسلام لە بواری پەیوەندییە ئابوورییەکان هێنایە کایەوە، لە ڕەگەزی دابەش کردنەوە دەردەکەوێت، ئەوەتا کۆمەڵگەی مرۆڤایەتی بەر لە ئیسلام لەسەر بنەمای تاکڕەوی ڕەها دامەزرا بوو، هەر کەسێك خۆپەرستیی بە داراییەکەی دەکرد، چونکە دەسەڵاتی کەسی لەسەر نەبوو، مەگەر بەربەستی خودی و نەریتی باوی بۆماوەی کۆمەڵگەکەی، لەسەروشیانەوە ئەو ڕێزەی خەڵکەکە هەیان بوو[120]

بەڵام ڕێسایەکی ڕوون و ڕێك نەبوو، کە مەودای ئەم ڕێز و چۆنایەتییەکەی دیاری بکات، یا ئەدگاری پابەندیی بۆ زیاد بکات.

ئیسلام هات و ڕێکخستنێکی وردی بۆ دانا، گرنگترینی وێنەکانیشی زەکاتە، لێرە دا بەڕوونی مەودای دەستوەردانی کارگێڕیی گشتی لە ڕێگای هەڵستانی ئیسلام بە دانانی ڕێکخستنێك لەگەڵ ئابووری و دارایی گشتی دا دەبینین،

---

[119] .سليمان الطماوي: عمر بن الخطاب وأصول السياسة والإدارة الحديثة، ص٤٠٣
[120] .سليمان الطماوي: عمر بن الخطاب وأصول السياسة والإدارة الحديثة، ص٤٠٣

دەستگەی زەکات، وەك کارگێڕییـەکی گشـتیی ئیسـلامی، بـاجێکی پابەندکـەری ولاّتی ئیسلامییە.

جا ئەگەر خەڵکی لەژیانی پەیامبەر ﷺ ئەم ڕێکخستنە نوێیەیان بە ناچاری لـە هەندێك کات دا پەسەند کردبێت، ئەوا بە گەڕانەوەی پەیامبەر ﷺ بـۆ لای خـوای بڵند، زەکات بـوە یەکـەم هۆکـاری پاڵنـەر بـۆ هەڵگەڕانـەوەی ژمارەیـەکی زۆری موسوڵمانان لە دەرەوەی شاری مەدینـە، چـونکە جۆرێـك لـە سـەرانەیان تێـی دا دەبینی، کە بە بە فەمانڕەوایانی مەدینە دەدرا، چاوە چـنۆکەکەیان کـوێر کردبـوو لەوەی، کە کەڵکی گشتیی بۆ مووسوڵمانان و بەتایبەت بـۆ هـەژارەکانیان تـێ دا بوو.

شان بە شانی زەکات، کە بۆ ئەو خەرجییانە تەرخان دەکرێت، کە قورئانی پیرۆز دیاریی کردوون، ئیسلام هەندێك کۆکردنەوەی دارایی لە پەرسـتنەوە دانـابوو، کـە هەموو مووسوڵمانێك بەگوێرەی توانای خۆی دەی دا، وەك زەکاتی سەرچـاکردنەوە و سوونەتی سەربڕین لە جەژنی قوربان و، پاککەرەوە(کفارە) داراییە باوەکان، ئەمە لەژێر ڕۆشنایی ئارەزوومەندانەی موسوڵمانان لە خێر کردن.

پاشان پەیامبەر ﷺ، کە شەڕی کەوتە پێش، داوای لە مووسوڵمانان کـرد هـەر کەس بە پێی توانـای خـۆی ببەخشـێت، کـە هـەبوو بـە هـەموو ئـەوەی هـەیبوو دەیبەخشی، وەك ئەوەی ئەبوو بەکری سدیق خوا لێی ڕازی بێت، کردی و، هەشبوو نیوەی ئەوەی هەیبوو دەیبەخشی یا کەمتر لەمـە، پەیامبـەریش درود و سـەلامی خوای لەسەر بێت دانی بە کاری هەمویان نا، چونکە خۆبەخش خواسـتی پاداشـتی ڕۆژی دوایی دەکـرد بـە گـوێرەی ئـەوەی ویـژدان و ئایینەکـەی لێیـان دەویسـت، هەڵسوکەوتی دەکرد.

هەروەها ڕێکخستنی ئابووریی عومەر خوا لێی ڕازی بێت، کە بـۆی مایـەوە و کاروباری درایە دەست، پەیکەرە گشتییەکەی بـە چەسـپاوی مایـەوە وەك ئـەوەی سـەردەمی پەیامبـەر ﷺ، بـەلاّم کۆششـی عومـەر خـوا لێـی ڕازی بێـت لـە

وردەکارییەکەی دا، تا ڕادەیەکی زۆر گۆڕا و، هۆکارێـک بـوو بـۆ ئـەو پەرەسـەندە قەبانەی، کە دوای کۆچی دوایی ئەم، سەریان هەڵدا.[١٢١]

بـەمجۆرە مـەودای گرنگیـی تێخوێندنـەوەی ئـابووری و دارایـی و، مـەودای پێداویستیی کارگێڕ بۆ تێگەیشتن لە کێشە ئابووری و داراییەکان بۆ کارگێڕییەکەی ڕۆشنایی ڕەوشی ئابووری و دارایی لـە وڵات ڕوون دەبێتـەوە، ئەمـەش لـە پێنـاو گەیشتنی بەو ئامانجانـەی، کـە لـە کـارگێڕی دا کۆشـش بـۆ بەدەسـت هێنانیـان دەکرێت.

[١٢١] سليمان الطماوي: عمر بن الخطاب وأصول السياسة والإدارة الحديثة، ص٤٠٤- ٤٠٥.

# توێژبەندی پێنجەم

## بەڕێوەبردن و دەروونناسیی کۆمەڵایەتی

دەروونناسیی کۆمەڵایەتی لقێکە لە لقەکانی دەروونناسی، کە ڕەفتاری کۆمەڵایەتییانەی تاك و کۆمەڵ دەخوێنێتەوە، وەك بەدەنگەوە هاتنێك بۆ تایبەتمەندییە کۆمەڵایەتییەکان، بایەخیش بە تێخوێندنەوەی کارلێکی کۆمەڵایەتی و ئەنجامی ئەم کارلێکە دەدات و، ئامانجیشی بنیات نانی چاکترین کۆمەڵگەی دامەزراوە لەسەر تێگەیشتنی ڕەفتاری تاك و کۆمەڵە[١٢٢]

توێژینەوەکانی دەروونناسیی کۆمەڵایەتی بەم ناوە توانست بە توێژەران دەدەن لە بوارەکانی بەڕێوەبردنی گشتی، لە تاقی کردنەوەی ناخی گرفتە بەئەنجام هاتوەکانی پەیوەندییە مرۆییەکان، لە ڕێکخراوە کارگێڕییەکان و گەیشتن بە چارەسەریی باش بۆی.

پاڵنەری دەروونی و ئاراستە ڕەفتارییەکان کاریگەرییەکی گەورەیان لە دەستکەوتنی کاری کارگێڕی لە تەواوی قۆناغەکانی کرداری کارگێڕی دا هەیە[١٢٣]

هەڵبەت بایەخی تێخوێندنەوەی ڕەفتار و توێژینەوە دەروونییەکان لە بەڕێوەبردنی گشتی دا زیادی کرد و، لە زۆرێك لە بابەتەکانی دا لقی لێ بوەتەوە، کە توێژینەوە لە بوارەکانی پەیوەندیکاری لە ناوەوەی کۆمەڵە کۆمەڵایەتییەکان دا دەکات، هەروەك ئەم بوارە بەندە بە تیۆریای ڕاگەیاندنی پەیوەندیدار بە بەستنەوەی کۆمەڵەیی و پێشوازی کردنی شێوازی کار، لە کۆتاییش دا هەموو ئەمانە نیشان

---

[١٢٢] عبد السلام حامد زهران: علم النفس الاجتماعي، القاهرة، عالم الكتب، الطبعة الرابعة ١٩٧٧م، ص٩- ١٠

[١٢٣] عبد الغني بسيوني عبد الله: أصول علم الإدارة العامة، ص١٠٥.

کردنێکی دەروونی بۆ هەر یەك لە کەرتەکانی کاری بە کۆمەڵ لە ڕێکخراوی کارگێڕی پێك دەهێنێت.

گرنگییەکی زۆریشی بۆ ئەنجامەکانی توێژینەوە لە شێوەی بیرۆکراتی و هۆکارەکانی بوونیان و، چۆنیەتیی زاڵ بوون بەسەریان دا بە شێوازێکی زانستی دیاری کراو، هەیە.

هەروەها دەروونناسییەکی تریش بەناوی دەروونناسیی پیشەسازی هەیە، کە بایەخ بە دەستنیشان کردنی زانستییانەی کارکەران لە فرمانی گشتیی وڵات دەدات و، بە شێوەیەکی گشتیش بایەخ بە گرفتە پەیوەندیدارەکان بە کاروباری کارکەران لە کارگێڕی دا دەدات.

بەمەش لە توێژینەوەی زانستیی زۆرێك لە مەیدانەکانی بەڕێوەبردنی گشتی هاریکارییەکی کارای دەروونناسیی کۆمەڵایەتی دەکات و، ڕۆشنایش دەخاتە سەر زۆربەی ئەو گرفت و ئاستەنگییانەی، کە لە بواری پەیوەندییە مرۆییەکان لە ناوەوەی ڕێکخراوە کارگێڕییەکان دا دەردەکەون، کە لە سەرکەوتنی بەسەر ئەم ئاستەنگی و گرفتانەش دا یارمەتیی دەدات، بۆئەوەی کارگێڕی ڕێگای نەخشە بۆ کێشراوی ڕوەو بەدەست هێنانی ئامانجە دیاری کراوەکان بگرێت[١٢٤]

**هەڵوێستی ئیسلام:** گومان لەوە دا نییە، کە دەروونناسی بە شێوەیەکی گشتی و دەروونناسیی کۆمەڵایەتی بە شێوەیەکی تایبەتی لە زانستە دروست بوە نوێیەکانن، ئاخاوتنیش لە هەڵوێستی ئیسلام لە بارەی پەیوەندیی بەڕێوەبردنی گشتی بە دەروونناسیی کۆمەڵایەتی، مەبەست لێی وەرگرتنی پەیوەندیی نێوان بەڕێوەبردنی گشتی و نێوان هەڵوێست گەلێکە، کە کارگێرانی موسوڵمانان گرتویانەتەبەر و پێش دروست بوونی ئەم زانستە تۆی دۆزینەوەی دەروونناسیی کۆمەڵایەتییان چاندوە، بێ دووپات کردنەوەی گرنگی دان بە زاراوە زانستییە نوێیەکان، چونکە بە هیچ جۆرێك مەبستی ڕەهامان نییە، کە باس لە بوونی دەروونناسیی ئیسلامی بە مانای نوێی وشەکەی بکەین، هیچ کاتێکیش ئامانجمان

---

[١٢٤] عبد الغني بسيوني عبد الله: أصول علم الإدارة العامة، ص١٠٥- ١٠٦.

نابێت، لەگەڵ ئەمەش دا لە وشەی دابڕێنەر لەم بـوارە دا بـۆ خـودان پسـپۆڕان لـە دەروونناسی و ئایینی ئیسلامی جیّدەهێڵێن.

ئەوەی گرنگە بۆ ئێمە باسی بکەین ئەوەیە، کە بەڕێوەبردنی گشتیی ئیسلامی گرنگـی بـە ڕەفتـاری تـاك و کۆمەڵـە دەدات لـە کۆمەڵگـەی ئیسـلام[١٢٥]، ئـەم بەڕێوەبردنی ئیسلامییەش خودی تاك دەتوێژێتەوە و زۆرجار پاڵنەرە دەروونییەکانی تاك و کۆمەڵەش، کە دەیانبزوێنێت شی دەکاتـەوە، ئەمـەش توانـا بـە کـارگێڕان دەدات لە تاقی کردنەوەی ناخی گرفتە بە ئەنجام هاتوەکانی پەیوەندییە مرۆییـەکان بۆ گەیشتن بە چارەسەرییەکی باش.

بۆ ئەمە نموونەیەکی ئەزموونی عومەری کوڕی خەتاب خوا لێی ڕازی بێـت لـە ڕێکخستنی سەرجەم کەرتەکانی ولاتی ئیسلامی دەهێنینەوە، چونکە ئەم جۆرێـك لە تێخوێندنەوەی دەروونناسیی کۆمەڵایەتیی کردوە، ئەگەر چی ئـەم زانسـتە لـەو کاتی دا ناسراو نەبوو، بـەڵام عومـەری کـوڕی خـەتاب خـوا لێـی ڕازی بێـت بـە خوارسـك پـەی بـە گـرنگترین بنـەماکانی ئـەم زانسـتە بـردوە و لـە کارگێڕییـە گشتییەکەی دا پیادەی کردوە.

نموونەیەکی تر دەهێنینەوە، کە بریتییە لە هەڵستانی عومـەری کـوڕی خـەتاب خوا لێی ڕازی بێت، بە دەستنیشان کردنـی زانیسـتییانەی کارکـەران لـە فرمـانی گشتی لە دەولەتی ئیسلامی و، بایەخ دانی بە شێوەیەکی گشتی بە هەموو گرفتـە پەیوەندیدارەکان بە کاروباری کارکەران لە کارگێڕیی ئیسلامی.

هەڵبەت عومەری کوڕی خەتاب خوا لێی ڕازی بێـت فرمانـدار کردنـی گـەورە هاوەڵانی ڕەت دەکردەوە، لە نموونەی عـەلی و عوسـمـان وتەڵحـە و عەبـدول ڕەحمـان کوڕی عەوف خوا لێیان ڕازی بێت، هۆکاری ئەمەیان لێ پرسـی، پاسـاوەکەی ڕوون بوو: "نامەوێت بە کارکردن پیسیان بکەم"[١٢٦] واتە لە ئـاژاوە دەیانپـارێزم، بـەڵام لەڕاستی دا ڕەزای خوای لەسەر بێت کارگێر بوو بە خوارسك بەر لە دۆزینەوەی ئەم

---

[١٢٥] سليمان الطماوي: عمر بن الخطاب وأصول السياسة والإدارة الحديثة، ص٤٧٥.

[١٢٦] سليمان الطماوي: عمر بن الخطاب وأصول السياسة والإدارة الحديثة، ص٤٧١.

زانستە، پیادەی دەروونناسیی کۆمەڵایەتی و پیشەسازیی کردوە، چونکە ئەوپڕاو پڕ بوو لە شاراوە دەروونییەکانی مرۆڤ و، وەهاشی پێ باش بوو، کە لە ڕوی کارگێڕییەوە لەبارترە لە فرمانەکان دووریان بخاتەوە و کەسانی تر لە شوێنیان دا دەستنیشان بکات.

## هۆکارە ڕاستەقینەکانیش ئەمانەن:

**یەکەم:** هەڵبەت عومەری کوڕی خەتاب خوا لێی ڕازی بێت، دەیویست ئەمانە لە کاروباری کۆشش کردن دا هاریکاریی بکەن، چونکە ئەمان بەتوانسترینی خەڵك بوون بۆی، ولاتی ئیسلامیش پێویستی بە ڕەنجێکی باش هەبوو.

**دوەم:** هەروەك ویستویەتی لە کاروباری گشتی دا ئامۆژگاریی بکەن، لەبەر ڕاستگۆیی باوەڕ و دووریان لە نیگاری دونیا.

**سێیەم:** دەیویست سەرچاوەی ئاژاوە نەبن، کاتێك لە ناوچەیەك جیا بوون دەبێت، بە هۆی پێگەیان لای پەیامبەر ﷺ و پێشینەی تێکۆشانیان لە ئیسلامدا.

**چارەم:** ڕەنگە ئەمەش هۆکاری سەرەکی و گرنگترینیان بێت، ئەویش عومەر خوا لێی ڕازی بێت لەوە دەترسا، کاتێك هەڵەیان کرد، نەتوانێت بەو شێوەیە لێپێچینەوەیان لەگەڵ دا بکات، کە گەرەکییەتی، لەو سزایەی لەسەریانە، چونکە لە لێپێچینەوەی کارگەرانی دا زۆر توند بوو[١٢٧]

هەموو ئەمانە دوویات دەکەنەوە، کە کارگێڕی ئیسلامی، لە شێوەی نموونەی پێشوی عومەر خوا لێی ڕازی بێت گرنگیی بە هاندەرە دەروونی و ئاراستە ڕەفتارییەکان و، کاریگەرییان لە بەدەست هێنانی کاری کارگێڕی لە سەرجەم قۆناغەکانی دا داوە، هەروەها عومەر خوا لێی ڕازی بێت لەڕوی دەروونییەوە گشت کەرتێك لە کەرتەکانی کاری ئیسلامیی نیشان دەکرد.

---

[١٢٧] .سليمان الطماوي: عمر بن الخطاب وأصول السياسة والإدارة الحديثة، ص٤٧١

# توێژبەندی شەشەم

## بەڕێوەبردنی گشتی و ڕێناسیی ئیسلامی

ڕێناسی لە زاراوەی شارەزایان و ڕەچەلەکییەکان کار کردنە بە بڕیارە ڕەوا وەرگیراوەکان لە بەڵگەنامە وردەکارییەکان[١٢٨]

هەروەها ڕێناسی تاوتوێی کردەوە هەست پێکراوەکانی پەرستگەران دەکات، ئەویش بە ڕوونکردنەوەی ئەو بڕیارە ئاینییانەی، کە خوا پەرستگەرەکانیی پێ ڕاسپاردوە، لەبەر ئەمە کردەوە هەست پێکراوەکانی پەرستگەران بابەتی ئەو ئاینزانییەیە، پێیەوە بڕیارە ئایینییە ڕاسپێردراوەکانی ئاشنا دەبین[١٢٩]

بەڵام مانای ئاین لە ڕێناسی گشتگرترە، چونکە ئاین باوەڕ و ئاکاری پەرستگەرەکان دەگرێتەوە، ڕێناسیش تەنها تایبەتە بە کردەوەی پەرستگەرەکان، ئەویش لە ئایینە ئەگەر بە گشتی گوزارشتی بکەین.[١٣٠]

بۆیەش وای دەبینین، کە چاکتر وایە باس لە پەیوەندیی نێوان بەڕێوەبردنی گشتی و ئاین بکەین.

لەبەر ئەوەی کارگێڕیی گشتیی ئیسلامی، وەك لە پێشتر باسمان کرد، ڕێکخستن و بەڕێوەبردنی هێزی مرۆییە بۆ بەدەست هێنانی ئامانجەکانی حکومەتی ئیسلامی لە چارچێوەی بڕیارەکانی ئاین، بۆیە پەیوەندیی نێوان ئاین و بەڕێوەبردنی گشتی پتەوە، ئەمیش پەیوەندییەکە لە شێوەی ڕەسەنێتیی لقەکە.

---

[١٢٨] إبراهيم سلقيني: أصل الفقه الأسلامي، ص٨.

[١٢٩] محمود محمد الطنطاوي: المدخل إلى فقه الإسلامي، القاهرة، مكتبة وهبة، رقم الإيداع ٥٠١٠/ ٨٧، ص١٤ وما يليها.

[١٣٠] محمود محمد الطنطاوي: المدخل إلى فقه الإسلامي، القاهرة، مكتبة وهبة، رقم الإيداع ٥٠١٠/ ٨٧، ص١٦.

نموونەیەك لەم بارەوە دەهێنینەوە، هەڵبەت دەرامەتی ولاَت لەسەردەمی عومەر خوا لێی ڕازی بێت زیادی کرد، بە جۆرێك ئاوەز توانای باوەڕ کردنی نەبوو، بەهۆی ئەو دەستکەوتانەوە، کە سوپاکانی مووسوڵمانان لە ولاَتانی مەزوپۆتامیا و فارس و شام و میسر دەستیان کەوت بوو، بەجۆرێك وای لە جێنشین کرد، کە بتوانێت مووچەیەکی دیاری کراو لە خانەی دارایی، بۆ هەر مووسوڵمانێك ببڕێتەوە، عومەر خوا لێی ڕازی بێت پلانێکی کارگێریی جیاوازی لە شێوازی ئەبوبەکر خوا لێی ڕازی بێت، گرتەبەر، کە جیاوازی لە نێوان خەڵکی لە بەخشین دا دانا، بەگوێرەی هەڵوێستی پێشویان لە بانگەوازی ئیسلامی، لە تێکۆشانیان لە پێناوی دا، لەبەر ئەم هۆیە بۆ چەند چینێکی خەڵك مووچەیەکی تەواو بەرزی دیاری کرد بوو[١٣١]

لێرە دا دەبینین، کە چۆن عومەر خوا لێی ڕازی بێت ، بە پێی بڕیارەکانی ئایین و لەچارچێوەی دا کۆششی کردوە، بە مەبەستی گۆڕینی ئەو پلانە کارگێرییەی، کە ئەبو بەکر خوا لێی ڕازی بێت لەسەری ڕۆیشت بوو.

بەمجۆرە نەك هەر مەودای گرنگی، بەڵکو پێویستیی تێخوێندنەوەی ڕێناسی و ئایینی بەڕێوەبردنی گشتی ئیسلامی و، مەودای پێداویستیی کارگێری ئیسلام بۆ تێگەیشتنی دۆزی ڕێناسی و ئایینمان بۆ ڕوون دەبێتەوە، بە مەبەستی ڕێکخستنی کارگێڕیی ئیسلامی بۆ گەیشتن بە ڕێکخستنێکی تایبەتی ولاَتی ئیسلامی.

---

[١٣١] سليمان الطماوي: عمر بن الخطاب وأصول السياسة والإدارة الحديثة، ص٤٧٦.

# توێژبەندی هەفتەم

## سەربەخۆیی بەڕێوەبردنی گشتی

لەگەڵ دەست پێکی سەدەی نۆزدەی زاینی لە ژمارەیەك وڵاتی ئەوروپایی، وەك ئەڵمانیا و نەمسا و فەرەنسا، پەرتووك گەلێکی نوێی بەڕێوەبردنی گشتی، وەك تێخوێندنەوە گەلێکی سەربەخۆی تایبەت بە خۆی دەستی پێ کرد، بەڵام کۆدەنگییەك لەسەر گرنگتر لە زۆرینەی دانراوەکان هەیە، کە وتارەکەی "ۆدرۆ ویلسنWoddrow Wilson "ە، کە پرۆفیسۆری زانستە سیاسییەکانی زانکۆی برنستۆنی ئەمەریکیی ئەو کاتە بوو، کە لە ژێر ناونیشانی"تێخوێندنەوەی بەڕێوەبردنی گشتی" لەساڵی ١٨٨٧ی زایینی بڵاوی کردەوە، پاشانیش پرۆفیسۆر ویلسن لە کاتی جەنگی جیهانیی یەکەم دا بوو بە سەرۆکی وڵاتە یەکگرتوەکانی ئەمەریکا، هەروەها خاوەنی بنەما بەناوبانگەکانی ویلسنە، لەم وتارە دا تایبەتمەندییەکانی بەڕێوەبردنی گشتیی وەك تێخوێندنەوەیەکی سەربەخۆ لە زانستی سیاسی دیارخست. ئەم وتارە بەهایەکی گەورەی پێ درا و، بەو ئەدگارەی لە ڕووی مێژووییەوە یەکەم توێژینەوەی زانستیی نوێ بوو، کە بە وردی ئەدگار و گرفتەکانی بەڕێوەبردنی گشتی دیاری بکات، جێی خۆی لە "ناوەندی دەرکردن" دا کردەوە[١٣٢]، هەڵبەت بڵاو کردنەوەی ئەم وتارە دەرکردنی یاسای چاك کردنی خزمەتی شارستانیی لە ساڵی ١٨٨٣ی زایینی بەناوی "بندڵتۆن" پێشخست، کە ناوەڕۆکەکەی باس لە پەیڕەوی کردنی سیستمی لێوەشاوەیی دەکات، لە دامەزراندن لە فرمانە گشتییەکان، لە ڕێگای ئەنجام دانی تاقی کردنەوە لە ڕێگەی لێژنەی خزمەتی شارستانی. ئەم یاسایەش دوای قۆناغێکی دوور و درێژی خەبات دژی سیستمی دەرەبەگی، کە دوای سەربەخۆیی وڵاتە یەکگرتوەکانی ئەمەریکا سەری

---

[١٣٢] عبد الغني بسيوني عبد الله: أصول علم الإدارة العامة، ص٧٠- ٧١.

هەڵ دا وەك مافێکی دەستکەوتوی پارتی براوە لە هەڵبژاردن، تەنانـەت "جـێمس جارفیلد"ی سەرۆکی ئەمەریکا لەبەر پەرۆشیی بۆ چاکسـازیی فرمـانی و کۆتـایی هێنان بە سیستمی دەرەبەگی بە گوللە پێکرا

پێکرانی "جارفیلد" پەلەی لە دەرچوونی یاسای "بندلتۆن"دا کرد.

مانای دەرکردنی ئەم یاسایەش لابردنی سیستمی دەرەبەگی بوو لە پڕ کردنەوەی فرمانە گشتییەکان، کە لەو کات دا پـەیڕەوی دەکـرا، هـەروەك پـارتی بـراوە لـە هەڵبژاردنەکان ژمارەیەکی زۆری لە پشتیوانانی پارتی بەرهەڵستکار دەردەکـرد بـۆ دامەزراندنی پشتیوانانی خۆی لەم فرمانانە[١٣٣]

لە ساڵی ١٨٨٣ی زاینیش ویڵسۆن پلـەی دکتـۆرای لـە زانکـۆی "هـۆپکینز" بەدەستهێنا، پاشان دوای دەرچوونی یاسـای "لێوەشـاوەیی"، بەدواداچـوونی ئـەو بەرەوپێش چوونانەی دەکرد، کە لە ئاستی کارگێڕیی گشتی دا ڕویان دەدا، ئەوەبوو پـاش ئەمـە وتارەکـەی، کـە لـە سـەرەوە هـاتوە بـڵاو کـردەوە، کـە بیرۆکـە و بانگەشەکانی بۆ سەربەخۆیی بەڕێوەبردنی گشتی لە خۆ دەگرێت.

هەڵبەت وێڵسن ڕوونی کردۆتەوە، کە دەبێـت کـارگێڕیی گشـتی بـۆ بەدەسـت هێنانی ئامانجەکانی پشت بە بنەما گـەلێکی زانسـتی ببەسـتێت، بـە گـورجترین ئامراز و، ڕەخنەی لـە کـارگێڕیی ئەمـەریکا گـرت بـەوەی، کـە لـە چـۆنییەتیی کارەکانی دا بە ڕێگەی ئەم بنەما زانستییانە بەڕێوە ناچێت، سەرباری قەبە بـوونی پەیکەری ئەم کارگێڕییە، هەروەها ڕای خۆیشی لە بارەی یاسای "لێوەشاوەیی" دا، کە لە ساڵی ١٨٨٣ی زایینی دەرچوو، هـەروەك بـە هـەنگاوێکی سـەرەتایی ڕووەو چاکسـازیی ڕاسـتەقینەی کـارگێڕیی دامـەزراو لەسـەر بنـەمای زانسـتییانەی بەڕێوەبردنی گشتی دەربڕی[١٣٤]

ویڵسۆن ئاواتی تێخوێندنەوەی کارگێڕیی دیاری کرد، بەوەی دەرخستنی ئەوەیە، کە حکومەت دەتوانێت بەوردی بیکا لە لایەك و، چۆنیەتیی ڕاپەڕانـدنی کاروبـارە

---

[١٣٣] عبد الغني بسيوني عبد الله: أصول علم الإدارة العامة، ص٧١.

[١٣٤] عبد الغني بسيوني عبد الله: أصول علم الإدارة العامة، ص٧٢.

دیاری کراوەکانی سەرەوە بە بەرزترین تەواوێتیی لەبار و، بەکەمترین توانستی لەبار لە ڕەنج و دارایی لە لایەکی تر، پاشان دوای ئەمە بانگەوازی پێویستیی سەربەخۆیی بەڕێوەبردنی لە زانستی سیاسی کرد، هەروەك بانگەشەی پێویستیی سوود وەرگرتنی کرد لە تێخوێندنەوەی زانستی بەڕێوەبردن لە ئەزموونەکانی ولآتانی تر، بە ڕوانینە جیاجیایی سیستمی سیاسی.

هەڵبەت دوا بەدوای ئەمە بزوتنەوەی زانستییانەی بەڕێوەبردن پشتیان بەست بە دوو ناویانگ بلاویوەوەی جیهانی کە: تایلەری ئەمەریکی، دامەزرێنەری قوتابخانەی زانستیی بەڕێوەبردن و، فایۆڵی فەڕەنسی، خاوەنی قوتابخانەی کرداری کارگێڕی[١٣٥]، لە خوارەوەش دا هەوڵ دەدەین، کە گرنگترین بیرۆکەکانی هەریەك لەم دووانە بخەینە ڕوو:

## یەکەم: فریدریك تایلەر

تایلەر ئامانجی بەدەست هێنانی تەواوێتیی بەرهەمداری بوو، لە ڕێگای ئەو بیرۆکانەی خستیە ڕوو، کە دەکرێت لەمانەی خوارەوە دا پوختیان بکەین:

١ - تێخوێندنەوەی هەردوو ڕەگەزی کات و جوولە، بە مەبەستی پوخت کردنی سەرکەوتووترین ڕێگە بۆ دەستکەوتنی کار لە نێو ڕێگە بەکارخراوەکانی ڕاپەڕاندنی.

٢ - دەستنیشان کردنی باشترین تاکەکان بۆ کارکردن و، مەشق پێکردنیان لەسەر بنەمایەکی زانستییانەی پێڕۆیی.

٣ - گرتنەبەری بنەمای پسپۆڕی و دابەش کردنی کار، هەروەك هەیە بە کاری جێبەجێ کردن هەڵ دەستێت و، هەشە ئاراستە کردن و سەرپەرشتی کردن و بەدواداچوون دەگرێتە ئەستۆ.

---

[١٣٥] عبد الغني بسيوني عبد الله: أصول علم الإدارة العامة، ص٧٢.

٤ - هاریکاریی نێوان هەڵسەران بە پیشەی کارگێڕی و کارکەران لە بەرهەم هێنان و کارە جێبەجێ کردنییەکان دا[١٣٦]

جا ئەگەر بیرۆکەکانی تایلەر لە بواری کارگێڕیی دا تایبەت پیادە کرابن، بەڵام لە گواستنەوەی بۆ کارگێڕیی گشتیش دا دوانەکەوتوە، کە ئاماغجی دوانەهاتووی بەدەست هێنانی تەواوێتیی بەرهەمدارییە.

هەڵبەت هەڵگیرسانی جەنگی جیهانیی یەکەمیش کاریگەرییەکی گەورەی لە پەلە کردن لە پیادە کردنی بنەما زانستییەکانی بەڕێوەبردن لە بواری کارگێڕیی گشتی دا کرد، بە تایبەتیش سەبارەت بە پێکەوەنان و ڕێکخستنی سووپا و تەواوێتیی بەرهەمداریی جەنگی و، ئامادە کردنی دەرامەتەکان، بۆ ڕووبەڕوو بوونەوەی ڕەوشی جەنگی و بەتایبەتیش لە وڵاتە یەکگرتوەکانی ئەمەریکا و بەریتانیا[١٣٧]

## دوەم: هێنری فایۆڵ

فایۆڵ بە ڕابەری بەڕێوەبردنی گشتی و بەڕێوەبردنی کاری سەردەمی نوێ دادەنرێت، چونکە هەڵستا بە زەق کردنەوەی ئەو بنەما زانستییانەی، کە فرمانەکانی پرۆژەی لەسەر دادەمەزرێت و، ئەو فرمانانەشی بەشێوەیەك دیاری کردوە، کە سەرجەم کردارەکانی پەیوەندیدار بە بەگەڕخستنی هەر پرۆژەیەك دەگرێتەوە، جا مۆرکێکی ئاسایی هەبێت یا ئاڵۆز، گەورە بێت یا بچووك.

## ئەو فرمانانەشی فایۆڵ دیاریی کرد ئەمانەی خوارەوەن:

١) فرمانی هونەری، بریتییە لە بەرهەم هێنان و ساز کردن و گۆڕین.
٢) فرمانی بازرگانی، بریتییە لە کردارەکانی فرۆشتن و کڕین و ئاڵوگۆڕ کردن.

---

[١٣٦] .إبراهيم عبد العزيز شيحا: الإدارة العامة، ص١١٢ وما يليها
[١٣٧] عبد الكريم درويش وليلى تكلا: أصول الإدارة العامة، ص٩٠.

٣) فرمانی دارایـــی، بریتییــە لــە کردارەکـانی دەستخســتن و بەگەڕخســتنی سەرمایە.

٤) فرمانی ئاسایش، بریتییە لە پارێزگاریی خەڵکی و داراییان.

٥) فرمـــانی ژمێریـــاری، بریتییـــە لـــە ئامـــادە کردنـــی بودجـــە و تێچـــوون و ئامارەکان.

٦) فرمانی کارگێڕی، فایۆل ئەم فرمانە کارگێڕییــەی بۆ پێـنج ڕەگــەز دابــەش کردوە، کە بە ئەمانەی خوارەوە کورتیان دەکەینەوە[١٣٨]:

- **پلان دانان.**
- **ڕێکخستن.**
- **ئاراستە کردن.**
- **هەماهەنگی.**
- **چاودێری.**

هەروەها فایۆل ڕوونی کردوەتــەوە، کــە پێـنج فرمانەکــەی یەکــەم لــە لایــەن سەرجەمەوە بە باشی ناسراون، بەڵام فرمانە کارگێڕییــەکان پێداویستییان بە ڕاڤە و وردەکاری هەیە، ئەمەش ئەوەیە، کە فــایۆل کردویــەتی، هــەروەك هەڵســتاوە بــە دیاری کردنی کردەکانی هەر ڕەگەزێك لە ڕەگەزەکانی کردارە کارگێڕییــەکان.

سەرباری ئەو سەرکەوتنە گەورەیەی، کە بەڕێوەبردنی زانستی بەدەستی هێنــاوە لە بابەتی بەڕێوەبردن و مەیدانی بەڕێوەبردنی گشتی تا ڕادەیەکی زۆر، بەڵام ڕەخنە گەلێکی تونــدی ئاراســتە کــراوە بــەوەی ڕەگــەزی مرۆیــی و مــۆرکی مرۆییــەتیی کارگێڕیی پشتگوێ خستوە، هەروەها، پیادە کردنی بنەما زانستییەکان مۆرکێکی کۆییلایەتیی مرۆڤی وەرگرتوە و، بە داڕشتنێکی زانستیی وشك دایڕشتوە بەتاڵ لە بایەخ دان بە لایەنی مرۆیی و لایەنە دەروونییەکانی کارکەران لە پرۆژە جیاجیاکان دا، چونکە بەتەنها بۆ تێخوێندنەوەی ڕەگەزی کار دامەزراوە[١٣٩].

---

[١٣٨] هنري فايول: الإدارة الصناعية والعامة، باريس ١٩٧٠، ص١ وما يليها.

[١٣٩] عبد الغني بسيوني عبد الله: أصول علم الإدارة العامة.

**هەڵوێستی ئیسلام:** لەم بوارە دا وای دەبینین، کە تەنگییەکی ئاشکرا و بنەڕەتی لە سیستمی دانراویی نوێ دا هەیە، لە کاتێك دەبینین لە ئیسلام دا لە هەموو ڕێکخستن و یاسا دانانێك لە دونیا و ڕۆژی دوایش دا مرۆڤی مەبەستە، هەر لەگەڵ لەدایکبوونییەوە تا کۆچی دوایی کردنی، هەموو شتێکی بۆ ڕێکخستوە، هەروەك پێشتر لە خستنەڕوی تێخوێندنەوەکەمان و لە بارەی مرۆییەتیی کارگێڕیی ئیسلامی باسمان کرد، کە کار پێوەری چاکی و خراپیی مرۆڤە و، لە دەستپێشخەرییەکانی دا لێپێچینەوەی لەگەڵ دا دەکرێت، هەڵبەت پابەند بوون لە نێوانِ دونیا و ڕۆژی دوایش، لە ئیسلام دا، کاریگەریی بەسەر ڕاپەڕاندنی کاری مرۆیی دا هەیە.

مووسوڵمان کارەکەی بە "بەناوی خوا" دەست پێدەکات، خوای گەورەش ئاگاداری دەبێت، ئەمەش شتێکە دەروونی پڕ دەکاتەوە، هیوای پاداشت و ڕەزامەندیی خوای پاك و بڵند دەکات، هەروەك بینیشمان، کە دەستنیشان کردنی سەرکردە و والی و کارکەرانی وڵات پشتی بە بەرزەفتکاریی زۆر دەبەست و، لایەنی مرۆیی تێی دا پێگەیەکی بەرچاوی گرت بوو، ئەم لایەنەی مرۆییش لە کارگێڕیی گشتیی ئیسلامی دا بە نوێترین ئاراستە زانستییە هاوچەرخەکان گوزارشت دەکرێت، هەروەك دەبینین سەرنەکەوتنی بنەما زانستییە پەتییەکان سەلمێنراوە، کە لە کارگێڕی دا لایەنی مرۆیی فەرامۆش دەکەن، لەبەر ئەمە تیۆریا زانستییە نوێیەکان لە کارگێڕی دا ڕویان کردۆتە بایەخ دان بەم لایەنەی مرۆییەتی.

هەڵبەت دوای ئەو کەم و کوڕییانەی، کە لە ئەنجامی یەك لایەنەی بزوتنەوەی بەڕێوەبەردنی زانستی ڕووی دا، ژمارەیەك زانا لە سەردەمی نوێ دا هەڵستان بە جاڕدانی بایەخ دان بە پەیوەندییە مرۆییەکان لەتەك لایەنی پیادە کردنی بنەما زانستییەکانی بەڕێوەبردن، بۆ ئەوەی هاوسەنگییەك لەنێوان ئەم دوو لایەنە دروست بێت، واتە ئەو زانایانە دوای سەدان ساڵ هەڵستان بە جاڕدانی پیادە کردنی بنەما جێگیر و چەسپاوەکان، کە وڵاتی ئیسلامی لە پێشیانەوەیە.

هەڵبەت بزوتنەوەی ئەم زانایانەش بە توێژینەوەکانی "ئاڵتوون مایۆ" دەستی پێ کرد، بەو ئەنجامە گەیشت، کە بەستنەوەی بەرهەم هێنان بە باری دەروونی و گیانی هاریکاریی کارمەندان بە باش دەزانێت.

هەروەها "هاربەرت سایۆن"یش هەڵستا بە تێخوێندنەوەی دەروونی و کۆمەڵایەتی، کە کاریگەرییەکی گەورەیان لە هاتنە کایەی ئاراستە مرۆییەکان لە مەیدانی بەڕێوەبردنی گشتی دا هەبوو[١٤٠]

هەڵبەت سایۆن ڕوونی کردۆتەوە، کە پاڵنەرە دەروونی و ئاراستە ڕەفتارییەکان کاریگەرییەکی گەورەیان لەسەر قۆناغە جیاجیاکانی کرداری کارگێڕی دا هەیە، بەتایبەتیش قۆناغی وەرگرتنی بڕیار.

بەڵام لە وڵاتە عەرەبییەکان لە میانەی کۆنگرە عەرەبییەکانی زانستی بەڕێوەبردنی گشتی، بایەخ دان بە بەڕێوەبردنی گشتی دەستی پێ کرد، کە لەساڵی ١٩٥٧ی زایینی دەست بە بەسترانی کرا و، لەمیانەی دروست بوونی ڕێکخراوەی عەرەبی بۆ زانستە کارگێڕییەکان، کە کۆمەڵەی وڵاتانی عەرەبی ڕێکخستنی ئەم کۆنگرانەی گرتە ئەستۆی خۆی، کاتێك یەکەم کۆنگرە لەساڵی ١٩٥٧ی زایینی بەسترا، پاشان بەستنی کۆنگرەکان دوای ئەمە درێژەیان کێشا.

ڕێکخراوەی عەرەبی بۆ زانستە کارگێڕییەکان ساڵی ١٩٦٩ی زایینی لە چارچێوەی کۆمەڵەی وڵاتانی عەرەبی دروست بوە، کە کەسایەتییەکی واتایی و بودجەیەکی سەربەخۆی هەیە و، ناوەندەکەشی لە قاهرەیە.

---

[١٤٠] عبد الغني بسيوني عبد الله: أصول علم الإدارة العامة، ص٧٧.

# توێژبەندی هەشتەم

# تیۆریای بەڕێوەبردن لە ئیسلام دا

## ئایا تیۆریایەکی ئیسلامیی تایبەت بە بەڕێوەبردن هەیە؟

دەبێت لە خستنەڕوی تێخوێندنەوەی بەڕێوەبردنی گشتی، کە تێخوێندنەوەیەکی بەراوردکارییە، هەڵستین بەم بابەتە بە شێوەیەکی ڕوون و ڕاستەوخۆ.

تیۆریای بەڕێوەبردن ئامانجی دیاری کردنی نموونەیەکی دیارە بۆ ڕەفتاری مرۆڤ، کە ڕاڤەی دەکات لە بڵاو کردنەوەی بۆ قایل کردنی کەسانی تر وەك فەلسەفەیەکی نموونەیی فراوان دەبێت و لە هەڵ و مەرجەوە بۆ ڕەوشێکی نموونەیی بەرز دەبێتەوە، لە ڕووی ئەوەی بڕیار دەدات، کە بارودۆخێکی ژیانی لەسەریەتی، کە ناودەبرێت بە تیۆریای ڕێسایی "Théorie normative" و زۆربەی تیۆریاکانی بەڕێوەبردنی لەم جۆرەن، کە تیۆرگەرەکانی هەوڵی دیاری کردنی ڕەفتارێکی نموونەیی دیار بۆ ڕێکخراوەی کارگێڕی و ڕەفتارە مرۆییەکان دەدەن لە ناو ئەم ڕێکخراوانە، سەرباری ئەوەشی، کە هەر تیۆرێك دەبێت دیدێکی نموونەیی بگرێتەوە، کە کۆشش بۆ بەدەست هێنانی بکات، بەڵام مەودای نزیکیی ئەم تیۆریایە لە پیادە کردنی کردەنیی پشت بەو بنەما و بنچینانە دەبەستێت، کە لێی پێك دێت، ئەمەش ئەو سەنگەیە، کە تیۆریایەکە پێیەوە شیاوی پەسەند کردن و قایل کردن و پیادە کردن دەبێت[١٤١]

---

[١٤١] أحمد إبراهيم أبو سن: الإدارة في الإسلام، مكتبة وهبة، طبعة ثالثة ١٤٠٠ﻫ/ ١٩٨٤م، ص١٥٥.

بـە هـۆی ئـەوەی هـەر تیۆریایـەکی کـارگێڕیش ئامـانجی لێـك دانـەوە و هەڵسەنگاندنی ڕەفتاری مرۆڤە لە ناوەوەی ئەم ڕێکخراوانـە و، ڕاڤـە کردنـی ئـەو ئاستەنگانەیە، کە دێنە پێش و، هەوڵ دەدات بە ملکەچی پێکردنیـان بـۆ ئـەوەی ببێت بە تیۆریایەکی پەسەند کراو و شیاوی پیادە کردن، بەڵام سەرکەوتنی تیۆریای کارگێڕی پشت بە مـەودای فراوانـی سەرچـاوەکانی دەبەسـتێت، بـۆ لێکدانـەوەی ڕەفتاری کارگێڕی و مەودای توانستی، لـە گفتوگـۆ کردنـی ئـەو گۆڕانانـەی، کـە کاریگەرییەکی کارا و ڕاستەوخۆ لە ڕەفتاری مرۆڤ دەکەن لـە نـاوەوەی ڕێکخـراوە، ئەمەش ئەو تایبەتمەندییانەن، کە هەر تیۆریایەکی لە یەکی تر پێ جیا دەکرێتەوە.

زانایانی بەڕێوەبردن تێبینی دەکەن، کە زۆرینـەی ئـەو تیۆریایانـەی، بـاس لـە گرفتە کارگێڕییەکان دەکەن تیۆریـای بەشـەکین، بـەمانای ئـەوەی جـەخت لەسـەر تێخوێندنەوە و شیکاری تەنها تاکە گۆڕێنەرێك یا دوو گۆڕێنەر لـە گۆڕێنـەرەکانی گرفتی کارگێڕی دەکەنەوە و، لە ڕۆشنایی ئەم شـیکارە بەشـەکییانەش چـارەیەکی فەلسەفی پێشنیار دەکرێـت، کـەوا دەبینرێـت، چـارەیەکی نموونەییـە، کـە ئەرکـە پەیڕەوی بکرێت بۆ تێگەیشتنی ڕەفتـاری ڕێکخراوەکـان و، چـارەی گرفتـەکانی و چاکسازیی بەڕێوەچوون و ڕاپەڕاندنیان.

هەروەها زانایانی بەڕێوەبردن تێبینی دەکـەن، زانسـتی بـەڕێوەبردن پێویسـتی بەتیۆریایەکی گشتگرتر هەیە، کە چارەسەرێکی جیهـانی و فـراوان پێشـکەش بـە گرفتەکانی هەر کۆمەڵگەیەك بکات و، ئەو ڕایەشـی، کـە کـۆدەنگی لەسـەرە بـۆ گەیشتن بـە تیۆریایـەکی گشـتگری گشـتی لـە بـەڕێوەبردن دا، دەوەسـتێتە سـەر گوزارشت کردنی ڕێکخراوەی کارگێڕی بە بەشێك لە تەواوی کۆمەڵگە، ئەمە لەبەر ئەوەی کارگێڕیی بەشێکە لە تەواوی کۆمەڵگە، پاشان کار کـردن بـۆ گەیشـتن بـە فەلسـەفەیەکی کـارگێڕی ڕێنمـوونی کـراو بـە بنـەما و بـەها و کـەلتووری ئـەم کۆمەڵگەیە، لەبەر ئەوە بەڕێوەبردن بەشێکە لە کۆمەڵگە، چونکە بـەوەی تێـی دا ڕوودەدات لە کەلتوور و بیروباوەڕ و بەها ڕەفتارییەکان کاری لێ دەکرێـت، بۆیـەش

تیۆریای کارگێڕیی گشتگر لە ڕاستی دا تیۆریایەکی کۆمەڵایەتییە وەك بەشێکی کراوە لە سیستمی کۆمەڵایەتیی گشتی دەڕوانێتە کارگێڕی

لەم ڕووەوە تیۆریای کارگێڕیی گشتگر پەیوەستە بە ژینگەی کۆمەڵایەتی، کە پێی کاریگەر دەبێت و کاریگەریی لێ دەکات و، ناکرێت لە هیچ بارێك دا لە تیۆریای کۆمەڵایەتی جیا بکرێتەوە، کە کۆمەڵگەیەك باوەڕی پێی هەیە.

هۆکاری شکست هێنانی زۆرینەی تیۆریا کارگێڕییەکان لە گۆڕەپانی کارگێڕیی هاوچەرخ دا، بۆ تیۆرگەرانی ئەم تیۆریایانە دەگەڕێتەوە، کە بە شێوەی جیاواز سەرنەکەوتن لەوەی کارگێڕی بە بەشێکی لکاوی سیستمی کۆمەڵایەتی گوزارشت بکەن، لەو کاتەی، کە تیۆریاکانیان تێی دا داناوە[١٤٢]

پێش ئەوەی ڕووەو تیۆریای بەڕێوەبردن لە ئیسلام دا بڕۆین، کە بە تیۆرێکی گشتگر گوزارشتی دەکەین، چونکە لە هەڵ و مەرجی کۆمەڵایەتیی سیستمی ئیسلامیی گشتی جیا نابێتەوە، وا باشە، هەندێك نموونەی ناسراو لە تیۆریاکانی ڕێکخراوە کۆمەڵایەتییەکانی گۆڕەپانی کارگێڕی بخەینە ڕوو، بۆ گفتوگۆ کردنی تایبەتمەندی و هۆکارەکانی شکست هێنانیان لە لێك دانەوە و هەڵسەنگاندنی ڕەفتاری مرۆیی لە ناوەوەی ڕێکخراوە دا[١٤٣]

## خواستی یەکەم: تیۆریا هاوچەرخەکان

### تیۆریای یەکەم: تیۆریای بەڕێوەبردنی زانستی

ستایشی فەیلەسووفانی ئەم تیۆریایە دەکرێت، کە یەکەم بوون لەوەی زانستییانە بیریان لە لێك دانەوەی ڕەفتاری کارکەرانی ڕێکخراوەی کارگێڕی و، لە چۆنیەتیی هاندانیان بۆ زیاتر بەخشین و ڕەنج دان کردوەتەوە، بەڵام هەوڵەکانیان بۆ چاك کردنی باری کۆمەڵایەتیی کارکەران لە ناوەوەی ڕێکخراوەی کارگێڕی نەبوو،

---

[١٤٢] أحمد إبراهيم أبو سن: الإدارة في الإسلام، ص١٥٦.
[١٤٣] أحمد إبراهيم أبو سن: الإدارة في الإسلام، ص١٥٦.

بەڵکو هەوڵەکانیان دوان بوو لەسەر گرفتە بەرهەمدارییەکان و، چۆنیەتیی توانینی بەرز کردنەوەی بەرهەمی تاکی کارکەر تا لە کۆتاییی دا ئەو ئایدۆلۆژیایە سەرمایەدارییە بگەشێتەوە، کە پشت دەبەستێت بە زیاد بوونی بەرهەم لەگەڵ کەمیی تێچوون، وەك پێوەرێکی بنەڕەتی بۆ سەرکەوتنی ئەم ئایدۆلۆژیایە.

هەروەها تیۆریاکانیان ڕووەو زیاد کردنی بەرهەم بوەتە هۆی مامەڵە کردن لەگەڵ تاکی کارکەر وەك ئامرازێك لە ئامرازەکانی بەرهەم هێنان. بۆیە بۆ ئەوەی تاك بتوانێت ئەوپەڕی وزەی بەرهەمداریی خۆی لە سازگە یا کێڵگە دا بخاتە گەڕ، دەبێت کارگێڕی بایەخ بە مەشق پێکردنیان بدات لەسەر کار و، دەبێت لە ڕێگەی سەرپەرشتیاران چاودێری بکرێن، تاوەکو کاتی کار کردن بەفیڕۆ نەدەن، چونکە سوود بە بەرهەم هێنان ناگەیەنێت و، دەبێت ئەم کارکەرانە هانیش بدرێن، بە هاندانێکی مایەکی بەجۆرێك کارگێڕی بە پێی چەندایەتیی بەرهەم هێنانی ڕۆژانەی لە یەکەکانی بەرهەم هێنانی پیشەسازیی زیاد بکات و، سزاشی بدرێت ئەگەر چەندایەتیی بەرهەم هێنانی داوا لێ کراوی ئەو ڕۆژەی کەم کردەوە[١٤٤]

هەروەها فەلسەفەی بەڕێوەبردنی زانستی لە پەرتووکەکانی فرێدرێك تایلەر و، هێنری فایۆڵ لە ڕوانگەیان بۆ تاکی کارکەر لەم خاڵانەی خوارەوە دەخوولێنەوە:

١ - تاکی کارکەر دروستکراوێکی چەلەنگە و ئابوورییانەیە، بەمانای ئەوەی، تەنها پاداشتی مایەکی هانی دەدات، بۆ ئەوەشی بگاتە ئەوپەڕی بەهەمدارییەکەی، لەسەر کارگێڕی پێویست دەکات، کە کرێی زیاد بکات هەرچەندە بەرهەمداریی ڕۆژانەی زیادی کرد.

٢ - تاکی کارکەر بایەخ بە ئامانجەکانی ئەو ڕێکخراوە نادات، کە تێی دا کار دەکات، بەڵکو هەموو بایەخەکەی لە تەواوێتیی پێداویستییە فسیۆلیجییە مایەکییەکانی کورت بوەتەوە، بۆیەش لەسەر دەسەڵاتی ڕێکخراوە، کە تەواوێتیی ئابووریی پێویستی بۆ بڕەخسێنێت.

---

[١٤٤] إبراهيم أبو سن: الإدارة في الإسلام، ص١٥٧.

٣ - تاکی کارکەر پێویستی بە مەشق هەیە بۆ باش بوونی ئاستی کـار کردنـی و، بەرز کردنەوەی بەرهەمداریی و، پێویستی بە سەرپەرشتیارییەکی ورد هەیە لـە ڕێگای سەرۆکە ڕاستەوخۆکانی، تاوەکو خۆی لە کارەکەی نەدزێتەوە یـا لـە کـاتی نەهاتنی سەرپەرشتیاران دا سستی بنوێنێت.

## ڕەخنە گرتنی تیۆریای زانستی:

١- یەکەم ڕەخنە، کە ئاراستەی تیۆریای بەڕێوەبردنی زانستی کرایەوە ئەوەیـە، کە تیۆریایەکی بەشەکییە بنەچەی بایەخەکانی بۆ تاکی کارکەر چڕ کردۆتـەوە، لـە شیکارەکەشی دا بۆ ڕەگەزێکی سەرەکی بۆ کرداری کارگێڕیی دامەزراو لەسەر زیاد کردنی و بەرزکردنەوەی گورجی وەرگرتوە، لە کاریگەریی ڕەگەزەکانی تـر لـە زیـاد کردنی بەرهەم هێنـان بـێ ئاگایـە، وەك کۆمەڵـە بچـووکەکانی کارگـەران و ئـەو سەندیکایانەی کارگەران، کە کارکەر لە ڕووی کۆمەڵایەتییەوە وابەستەیانە، کە لـە پەرۆشییان بۆ کار کردن یا یاخی بوون لێی کاریگەریی بەسەریانەوە هەیە.

٢ - لە بۆچوونی بۆ کارکەر لە ڕەگەزی مرۆیـی بـێ ئاگایـە، بـەمانای ئـەوەی فەلسەفەکەی ڕووەو مرۆڤ ئەوەیە، کـە ئـەم بـەدیهاتوەکی ئابوورییـە و بیرناکاتـەوە مەگەر لە زیاد بوونی دەسهاتی کەرەستەیی بە تەنها و، ئەم فەلسەفەیە وای گریمان بردوە، کە پاداشت و کرێی ڕۆژانە و کرێی زیاد کراو، کە دەدرێت بـە ئەوانـەی بـە باشی کار دەکەن، دوو بنەچەن لە هاندانی لە کار کردن و، بێ ئاگایە لەوەی مـرۆڤ لایەنی دەروونی و کۆمەڵایەتی و ژینگەیی هەیە، کە کاریگەرییان کەمتر نیـە لـە پاڵنەری کەرەستەیی و، کرێی ڕۆژانە و کرێی زیاد کراو.

٣ - لێدوانەکانیان لـەوەی لـە نـاوەوەی ڕێکخـراوەی کـارگێری دا ڕوو دەدات، کورت کردۆتەوە، بێ بایەخ دان بەوەی لە ژینگەی کۆمەڵایـەتی دا ڕوو دەدات، لـە کاریگەریی لەسەر تاکی کارکەر، بۆیە ئەم تیۆرە لە لێك دانەوەی دروستی ڕەفتاری کارکەر لە ناوەوەی ڕێکخراوەی کارگێڕییەکـەی شکسـتی هێنـا، ڕەنگـە باشـترین بەڵگەش لەسـەر ئـەمە ئەوە بێت، کە سـەبارەت بـە فریـدرێك تایلـەر ڕووی دا لـە

لێکۆڵینەوە و لێپرسینەوەکانی لە کۆنگرێسی ئەمەریکی، دوای ئەوەی سەندیکاکانی کارکەران هەڵستان بە خۆپێشان دانی ناڕەزایی لە فەلسەفەی تایلەر لە بەڕێوەچوونی دامەزراوە پیشەسازییەکانی ئەمەریکا و، ئەم سەندیکایانە بە سووکایەتی کردن بە مرۆییەتی کارکەر و فەرامۆش کردنی سۆز و هەستەکانی تۆمەتباریان کرد[١٤٥]

## تیۆریای دوەم: تیۆریای قوتابخانەی پەیوەندییە مرۆییەکان

ئەم قوتابخانەیە وەك کاردانەوەیەکی تیۆریای بەڕێوەبردنی زانستی هات. هەڵبەت بانگەشەکانی وەك بەدیهاتوکی کۆمەڵایەتی دەڕواننە تاك، کە کارلێك دەکات لەگەڵ ئەو کۆمەڵەی کاریان لەگەڵ دا دەکات و، ڕا و باوەڕەکانیان کاریگەری لە ڕەفتاری دەکەن و، هەست کردنی تاك بە وابەستە بوونی بۆ کەمەڵەکە هانی ڕەنج دان و بەخشینی دەدەن، بەڵکو پڕ کردنەوەی پیداویستییە کۆمەڵایەتییەکانی بەر لە کەرەستەییەکانە، بنچینەی هاندانین لە کار دا.

لەم ڕووە ستراتیجییەتی تیۆریای کارگێڕی لای قوتابخانەی پەیوەندییە مرۆییەکان گۆڕا، ڕووەو لێك دانەوەی ڕەفتاری تاکی کارکەر لە ڕێکخراوەی کارگێری، بایەخی بانگەشەکانی، جەخت کردنەوە بوون لە تێخوێندنەوەی پێداویستییە کۆمەڵایەتی و دەروونییەکانی تاکی کارکەر و، زیاد کردنی بایەخ دان بە هەستەکانی تاکی کارکەر، جەخت کردنەوەش لەسەر پاڵنەرە کۆمەڵایەتییەکان زیادی کرد، بەو پێیەی بزوێنەری بنەڕەتیی توانستەکانی کارکەرن لە زیاد کردنی بەرهەم هێنان لە ڕێکخراوە، یا لە دەستگەی پیشەسازی.

هەڵبەت قوتابخانەی پەیوەندییەکان بانگەشەی داننانی کارگێڕیی دەکرد، بە کۆمەڵە بچووکەکانی ناوەوەی دەستگە و، بانگەشەی باش کردنی شێوازی سەرکردایەتیی دەکرد لە لایەن سەرپەرشتیار و چاودێرانی کارگەران و، هاوسۆزی

---

[١٤٥] إبراهيم أبو سن: الإدارة في الإسلام، ص١٥٨.

لەگەڵ کارکەران بە باشترین شێوە و، گفتوگۆی گرفتە کۆمەڵایەتی و خانەوادەییەکانیان لەگەڵ دا بکەن، لە بایەخ پێ دانەکانیان وەك هاوبەشێك لە کار نەك وەك بەکرێ گیراوێك هەستیان پێ بکەن.

هەروەها ئەم تیۆرییە ڕوونی کردۆتەوە، کە کارکەران ئامانج و بۆچوون گەلێکی خۆیان هەیە، جیاواز لە ئامانجەکانی ڕێکخراوە و ڕەنگە بەرهەڵستیشی بێت، هەروەها ئەمە بوەتە پابەندییەك لەسەر کارگێڕی، کە گفتوگۆی ئەم ئامانج و دیدانە لەگەڵ کارکەران بکات و، کۆشش بکات بۆ بەدەست هێنانیان لە ڕێگای پێ سپاردنی هەندێك لە دەسەڵاتەکانی بە کارکەران و بەشدار کردنیان لە وەرگرتنی ئەو بڕیارانەی، کە پەیوەندیی بەوانەوە هەیە ، بەمەش کارکەران هەست بە مرۆییەتی و سەربەرزییان دەکەن، ئەم هەستەش خۆی لە خۆی دا هانی زیاتری بەرهەم هێنان و بەخشینیان دەدات.

## ڕەخنەگرتنی قوتابخانەی پەیوەندییە مرۆییەکان:

١ - سەرباری بایەخ دانی بانگەشەکەرانی ئەم قوتابخانەیە، پێشەکیشیان "ئالتوون مایۆ" بە هۆکارە مرۆییەکان و، پاڵنەرە کۆمەڵەییەکانی تاکی کارکەر، بەڵام فەلسەفەکەیان تازە نەبوو، بەڵکو گرفتە بەرهەمدارییەکان هەر مانەوە و تەوەری خولانەوەی پەیوەندییە مرۆییەکان بوون، بە مانای ئەوەی، کە ئامانجی دانانی بە ڕێکخستنە نارەسمییەکانی کارکەران و، باش کردنی سەرکردایەتی و بەرز کردنەوەی گیانی واتایی کارگەران، بەو گوزارشتە بوو، کە دوو ئامرازن، کارگێڕی بۆ زیاد کردنی بەرهەم بەکاریان دەهێنێت، لەکاتێك دا فەلسەفەی بەڕێوەبردنی زانستی دامەزرا بۆ مەشق پێکردن و هاندانیان لە ڕوی کەرەستەیی بۆ ئەوەی بەرهەمدارییەکەیان زیاد بکات، بەڵام فەلسەفەی پەیوەندیە مرۆییەکان دامەزرا بۆ داننان بە کۆمەڵە بچووکەکانی کارکەران و گۆڕینی شێوازی سەرپەرشتیاری و سەرکردایەتیی کارگەران، لە شێوازی توندی و ڕەقییەوە بۆ شێوازی مرۆیی نەرم، کە دوو بنەچەی بەرزکردنەوەی بەرهەمداریی کارکەرن.

هەڵبەت ئەم قوتابخانەیە لە داوا کردنــی گــۆڕینی شـێوازی مامەڵـەی کـارگێڕ لەگەڵ کارگەران بە بوونی سۆزداری لەگەڵیان لـەبڕی شـێوازی تـاکڕەوی و زۆر لـێ کردن مایەوە[١٤٦]

٢ - ئەم تیۆرە بایەخی بە لایەنی کۆمەڵایەتی و مامەڵەی باشـی کارکـەر داوە و، وەك گۆڕێنەرێکی بنەڕەتی بۆ هاندانی تاك بۆ زیـاد کردنــی بەرهەمدارییەکـەی گوزارشتی کردوە و، ڕێکخستنی ڕەسمیی دامەزراوەی کارگێڕی و لایەنە هونـەری و ئابوورییەکانی وەك هۆکارێکی گرنگ لە کرداری کارگێڕی فەرامۆش کردو و، باسی پەیوەندیی دەسەڵاتی نێوان کـارگێڕی و کارکـەرانی نـەکردوە، بـەڵکو وای گریمـان بردوە، کە هەر ناکۆکییەك لەسەر دەسەڵاتی نێوان کارگێڕی و کارگەران شتێك نییە مەگـەر دیاردەیـەکی نـەخۆش و نـا دروسـت و، هـەرگیز ڕووش نـادات ئەگـەر، کەناڵەکانی پەیوەندی کردنی نێوان کارگێڕی و کارگەران کراوە بـوون، کـە دەبێتـە هۆی تەبایی تەواو لە نێوان ئارەزوویـەکانی کارکـەران و ئامانجـەکانی ڕێکخـراوەی کارگێڕی.

٣ - ئەم تیۆریایە کاریگەرییە ژینگەییەکانی لەسەر ڕێکخراوە فەرامۆش کردوە و، نەیتوانیوە بە تەواوی وێنای ڕاستەقینەی ڕێکخسـتن بکـات، وەك سیسـتمێکی هەندەکی، کە بە ژینگەی کۆمەڵایەتی کاریگەر نابێت و کاریگـەریی لێ دەکـات، بەڵکو بایەخەکەی بە تاکی کارکەر لە ناوەوەی ڕێکخراوەی کارگێڕی کورت بوەتەوە و، لە کاریگەریی ژینگەی کۆمەڵایەتی لەسەر ڕێکخراوەی کارگێڕی نـەدواوە، جـا وەك ئەو فەلسەفەیە مایەوە، کە لە پێشیشی دا هەندەکییە لە تیۆریاکەی دا[١٤٧]

## تیۆریای سێیەم: تیۆریای بیرۆکراتی

کۆمەڵناسی ئەڵمانی "ماکس ویبر" تیۆری بیرۆکراتیی وەك تیۆرێکی ئاوەزی و پێویست، کە لەگەڵ کۆمەڵگەی پیشەسازی لـە ڕۆژاوای ئـەوروپا بگونجێـت دانـا.

---

[١٤٦] أحمد إبراهيم أبو سن: الإدارة في الإسلام، ص١٥٨.
[١٤٧] أحمد إبراهيم أبو سن: الإدارة في الإسلام، ص١٦٠.

سەرباری ئەوەی "ماکس ویبر" باوەڕی بەوە نەبوو، کە سیستمی بیرۆکراتی لە وڵاتە پیشەسازییەکان ڕێز لە تاکی کارکەر بگرێت و ئازادیی براوتی پێ بدات، بەڵام پێی وابوو، کە سیستمی بیرۆکراتی زۆر چەسپاو و ڕاستەقینەترە لەمانی تر، بەڵکو سیستمی بیرۆکراتی وەك بەشێکە لە سیستمی کۆمەڵایەتیی گشتگر، گەیشتە ئەوەی، کە هەر سیستمێکی کۆمەڵایەتی ئەگەر بە سیستمێکی کلاسیکی دەستی پێ کردبێت لە دوایی دا بە سیستمێکی بیرۆکراتی کۆتایی پێهێناوە.

هەروەها "ویبر" هەندێك تایبەتمەندیی بنەڕەتیی بۆ سیستمی بیرۆکراتی لەو ڕێکخراوە کارگێڕی و سەربازی و، ئایینی و پیشەسازییانەی، کە کۆمەڵگەی ڕۆژاوایی لەخۆی گرت بوون، چەسپاند و، ڕوونیشی کردوەتەوە، کە هیچ ڕێکخراوەیەك دەستی لەم تایبەتمەندییانە بەرنابێت، ئەمانیش:

١ - ڕادەیەکی بەرزی پسپۆڕی لە کار کردنی بیرۆکراتی دا بوونی هەبێت و، کاریش لە هەر ڕێکخراوەکی کارگێڕی لەسەر بنەمای پسپۆڕی دابەش بکرێت.

٢ - لە هەموو ڕێکخراوەکی کۆمەڵایەتی دەسەڵات پلەپلەییە و، لە ئاستە باڵاکانەوە پلەپلە کەم دەبێتەوە بۆ ئاستەکانی خواروو لە ڕێکخراوە دا.

٣ - پەیوەندیی نێوان تاکەکان ڕەسمییە و کەسێتی نییە و، پشت بەوە دەبەستێت، کە یاسا و گەڵاڵەنامەکان دیاریی دەکەن و، ئەوەی لە ئاستە بڵندەکانی پەیکەری ڕێکخستن لە دەسەڵاتی ڕەسمی هەیەتی، کە کارکەران هان دەدات بۆ گوێڕایەڵی و پەرەپێدانی بەرهەم.

٤ - دامەزراندنی کارکەران لەسەر بنەمای توانست و تەواوێتیی هونەری دەبێت و، پشت بە پەیوەندیی خزمایەتی و هاوەڵێتی و هەواداریی تیرەگەری یا هۆزگەرایی نابەستێت.

ئەمەیە تایبەتمەندییەکانی بیرۆکراتی لە شێوە نموونەییەکەی لە کۆمەڵگەی ڕۆژاوایی و لە هەموو ڕێکخراوەکانی دا. هەڵبەت لە تیۆرەکەی دا ئەمە بیر دەخاتەوە، کە تاکی کارکەر لە ڕێکخراوەی بیرۆکراتی، کەسێکە لەسەر بنەمای یاسا و گەڵاڵە نامەکان مامەڵە دەکات و، خاڵییە لە پەیوەندییە مرۆییەکان و

پەیوەستیی کۆمەڵایەتی و، بڕیارەکانی بێ کەمترین لێك دانەوەی کەسی دەردەکات، هەروەها کارکەران لە ئاستەکانی خوارووی ڕێکخراوە کەسانێکن ئازادی و، هیچ دەستڕۆییەکیان لە وەرگرتنی بڕیار دا نییە، بەڵکو تاکی بێ ویستن و پابەندن بە جێبەجێ کردنی ئەو فەرمانانەی، کە لە سەرۆکە ڕاستەوخۆکانیانەوە پێیان دەگات و، بە گوتەی (Automatous) ئاماژیان پێ دەکرێت، ئەمەش مانای ئەوەیە، کە ئەمان شتێك نین زیاتر بێت لە بەشەکانی ئامێرێکی گەورەی بەرهەم هێنان.

## ڕەخنە گرتنی تیۆریای بیرۆکراتی:

١ - "ویبر" پێی وایە، کە سیستەمی بیرۆکراتی سەرباری ئەوەی باشترین سیستەمێکی کارگێڕییە، بەوپێیەی بڕیار لەسەر بنەمای ئاوەز وەردەگرێت و، تاکەکان پابەندن بەو یاسا و گەلاڵە نامانەی، کە خۆیان نەخشەیان بۆ کێشاوە، بەڵام سیستەمێکە تێی دا بوارێکی فراوان بۆ ئازادیی تاك نییە" بەڵکو تاك بزاوتی سنووردارە و کۆتکراو و بێ ویستە، سەرباری هەموو ئەمانەش ئەو سیستەمە بیرۆکراتییەی "ویبەر" دایناوە ڕووبەڕوی سەردەم دەبێتەوە و، سەلمێنراوە، کە شیاوی پیادە کردنی ڕاستەقینەیە لەسەر ئاستی تەواوی جیهان.

٢ - تیۆریای بیرۆکراتی ڕەخنەی لێ گیراوە بەوەی جەخت لەسەر دەسەڵاتی ڕەسمی لە ڕێکخراوەی کارگێڕی دەکاتەوە و، کردویەتی بە گۆڕێنەرێکی بنەڕەتی، کە تاکەکان دەبزوێنێت و ڕەفتاری کارگێڕیان ئاراستە دەکات و، لایەنە مرۆیی و توانستە خۆیەتییەکانی تاکی لە پاڵنانی خۆیان بۆ کارکردنی بەدیهێنەری و وەستایانە، ئەگەر ئاراستەیەکی باش بوونی هەبوو، فەرامۆش کردوە[١٤٨]

---

[١٤٨] أحمد إبراهيم أبو سن: الإدارة في الإسلام، ص١٦٢.

## تیۆریای چارەم: تیۆریای ڕەفتاریی نوێ

گومان لەوە دا نییە، کە قوتابخانەی پەیوەندییە مرۆییەکان لە نیشان کردن و شی کردنەوەی هۆکار و گۆڕێنەرە نوێیە کاریگەرەکان لەسەر ڕەفتاری تاکی کارکەر لە ڕێکخراوەی کارگێڕی سەرکەوتوو بوو و، هەڵبەت تێخوێندنەوە مەیدانییەکانیش گرنگیی ئەم گۆڕێنەرانەیان لە تێخوێندنەوەی ڕەفتاری مرۆیی و پەیوەستییان بە کرداری کارگێڕی سەلماندوە، هەروەك دەرگای لەسەر دەروونناسان و، دەروونناسانی کۆمەڵایەتی و کۆمەڵناسان کردەوە، کە هزری ڕێکخستن بە تیۆریا و نموونەی زۆر پەرە پێ بدەن، تاك بکەنە تەوەرەی جەخت کردنەوەیان، بەو پێیە چارەسەریان بۆ دانا، کە تاك بەدیهاتوەکە کۆشش بۆ بەدەست هێنانی خودی خۆی دەکات، ئەوەتا "ماسلۆ" پلیکانەیەکی قووچەکیی بۆ پێداویستییەکانی تاك لە فسیۆلۆجی و دڵنیایی و کۆمەڵایەتی و خودی و لە کۆتاییش دا بەدەست هێنانی خود دانا و، تاکی کارکەری بە کەسێکی جێبەجێکەریان دانا، هەر کاتێك بە پێداویستییە فسیۆلۆجیەکانی گەیشت، بیری دەگوازێتەوە بۆ گەیشتن بە پێداویستییە دڵنیاییەکانی، پاشان کۆمەڵایەتی و بۆ دوا پلیکانەی قووچەکیی پێداویستییەکان، ئەمەش مانای وایە، کە تاك واز ناهێنێ لە هیچ قۆناغێك لە قۆناغەکانی کاری ڕێکخستن دا مەگەر خودی بەدەست هێنا، هەروەها هەست کردنی بە پێداویست لە بەدەست هێنانی پێدویستییەکانی پاڵنەری بنەڕەتیی کاری تاکە.

هەڵبەت تاکی کارکەریشی بەمانەی خوارەوە ناساندوە:

١ - نەرینی نییە و ڕقیشی لە کار نییە، بەڵکو خۆشی دەوێت، چونکە سارچاوەی خۆشی و ڕەزامەندییەتی.

٢ - توانستی وەرگرتنی بەرپرسیاریی هەیە، بەڵکو خۆشی دەوێت و کۆششی بۆ دەکات.

٣ - هاندەر گەلێکی ناوخۆیی خودیی هەیە، کە هەڵقوڵاوی هەستیەتی و، هاندەرەکانی هەموی دەرەکی و کەرەستەیی ڕووت نین، بە مانای تەنها پاداشتی

کەرەستەیی پاڵنەری نین، بەڵکو ئەو هاندەرە ناوخۆییانەی، کە لە ناخییەوە هەڵدەقوڵێن پاڵی دەدەن.

٤ - لە کارەکەی دا سەربەخۆیی خۆش دەوێت و، ڕقی لە چاودێریی پۆلیسی لە لایەن سەرپەرشتیار و سەرۆکەکانەوە دەبێتەوە.

بۆیەش بانگەشەی ستراتیجیەتێکی نوێی ڕووەو مرۆڤی کارکەر کرد، کە لە ناوەڕۆکی دا لە ستراتیجیەتی فەیلەسووفەکانی بەڕێوەبردنی زانستی جیاوازە[١٤٩]

١) لەسەر کارگێڕییە، کە کارگێڕییەکی بەشداری پێ کردن و ڕاوێژکاری بێت.

٢) تاکە کارکەرەکان لە وەرگرتنی بڕیارەکان دا بەشدار بکات، بۆ ئەوەی بڕیارەکان کۆمەڵەیی بن نەك تاکی.

٣) پڕ کردنەوەی پێداویستییە دەروونییەکانی تاك، شتێکی بنەڕەتییە و پێویستە لەسەر کارگێڕیی ڕێکخراوە کەشێك بۆ ئەمە بڕەخسێنێت.

٤) متمانە بە تاکەکانی بدات بۆ ئاراستە کردنیان ڕووەو ئامانجەکانی ڕێکخستن، لە بڕی سەپاندنی کۆنترۆڵ و چاودێریی توند لەسەریان.

٥) باوەڕی هەبێت بەوەی، کە چاودێریی خودیی تاك لەسەر خۆی باشترین جۆرەکانی چاودێرییە.

## ڕەخنەگرتنی تیۆریای ڕەفتاری نوێ:

بەڵام سەرباری ئەوەی ئەم تیۆریایە گەشبینانەیە بۆ مرۆڤ و، مامەڵەی لەگەڵ لایەنەکانی ئەرێنییە، کەچی ئەم تیۆریایانە لە دەستەبەر کردنی لایەنە دیاری کراوەکان یا شێوازێکی دیار کراو، کە بکرێت پشتی پێ ببەسترێت لە چارەسەر کردنی گرفتی سازاندنی نێوانی ئارەزووی کارکەران و ئامانجەکانی کارگێری دا، کورتی هێناوە.

---

[١٤٩] أحمد إبراهيم أبو سن: الإدارة في الإسلام، ص١٦٣.

چەند زانایەکی بەڕێوەبردن ئەو تیۆریای بەڕێوەبردنـە بەشـداری پـێ کردنـەیان دانا، کە ئامانجی دابەش کردنەوەی دەسەڵاتە لە ڕێکخستنی کارگێری، بە جۆرێـك کارکەران لە وەرگرتنی بڕیاری کۆتایی دا پشکدار بن، بۆ ئـەوەی جیـاوازیی نێـوان ئامانجی کارکەران و ئامانجی ڕێکخراوە و کارگێریەکەی نەمێنن، بەڵام ئەم تیۆریایە لە کۆمەڵگـەی سـەرمایەداریی ڕۆژاوا دا سـەرکەوتوو نـەبوو، چـونکە فەلسـەفەی کارگێریی بەشداری پێ کردن، یا دیموکراتییەتی بەشـداری پـێ کـردن، دەبێـت لـە دەسترۆییەکانی خاوەن کار کەم بکرێتەوە و، دەسترۆییەکانی کارکەران زیاد بکرێت، بێگومان ئەمـەش فەلسـەفەیەکی ڕاپـەڕیوە و پێچـەوانەی پێکهاتـەی ئـابووری و سیاسیی وڵاتی سەرمایەدارییە، بۆیە بەشداری پێ کردن بە شـێوەیی بـێ نـاوەڕۆك مایەوە، لەو بوارانە دا کارگێری پێیەوە پابەند دەبوو، کـە زیـانی تـێ دا نەبوایـە، ئەگەرنا هەستیان دەکرد، کە بەشداری پێ کردنی کارکـەران لـە دەسـەڵاتیان کـەم دەکات، ئەمەش بە تەواوی ڕەت دەکەنەوە[١٥٠]

هەروەها سەبارەت بە وڵاتـانی هاوبەشـیش، تیۆریـای بەشـداری پـێ کردنـی دیموکراتی لە کارگێڕی لە زۆربەی جـاران دا سـەرکەوتوو نـەبوو، کارکـەریش بـەو شێوەیە مایەوە، کە جیاوازییەکی زۆری لەگەڵ کارکەرانی وڵاتـانی سـەرمایەداریی ڕۆژاوایی نەبوو، کـە ئامرازێـك لـە ئامرازەکـانی بەرهـەم هێنانـە و بەشـێکە لـە بەشەکانی ئامێری بەرهەمهێنەر[١٥١]

## تیۆریای پێنجەم: تیۆریای شیکاریی سیستمەکان

تیۆریای شیکاری سیستمەکان لە جیهانی بەڕێوەبردن دا، بە نوێترین تیۆریایـە ڕەفتارییەکان گوزارشت دەکرێت، هەروەها ئەم تیۆریایـە پشـتی بـە نووسـینەکانی کۆمەڵناسان بەسـتوە، بەتایبـەتیش نووسـینەکانی "تـالکۆت پێرسـن Talcot Person"، کـە لـە مـاوەی پـەنجاکانی سـەدەی بیسـتەم، دەربـارەی سیسـتمی

---

[١٥٠] أحمد إبراهيم أبو سن: الإدارة في الإسلام، ص١٦٤.

[١٥١] .أحمد إبراهيم أبو سن: الإدارة في الإسلام، ص١٦٤

کۆمەڵایەتی بڵاوی کردوەتەوە، پاشان لە ماوەی شێستەکانەوە دەست کرا بە بەکارخستنیان بۆ تێخوێندنەوەی سیستمی کارگێڕی.

ئەم تیۆریایە دووپاتی گوزارشت کردنی سیستم "System" بە وردترین یەکە دەکاتەوە، کە دەکرێت ببێتە چارچێوەیەکی زانستی بۆ تێخوێندنەوەی بابەتی، هەروەك کۆمەڵگە یەکەیەکە یا سیستمێکی گشتییە لە چەندین یەکەی بچووکتر پێك دێت، کە هەر یەکەیەك بۆ خۆی سیستمێکە، ئەمانیش سیستمی سیاسی و کۆمەڵایەتی و کارگێڕین.

هەروەها سیستمی کارگێڕی بە سیستمێکی کراوە گوزارشت دەکرێت، کە لەگەڵ یەکەکانی تر لە کۆمەڵگە دا کارلێك دەکات، زانیاری و و وزە و دەسەڵات و کەرەستە و هێزی مرۆیی بەرهەمهێنی لێ وەردەگرێت و پێی دەدات و ئاڵوگۆڕی لەگەڵ دا دەکات. هەروەها سیستمی کارگێڕی لە ڕەگەز گەلێکی پێکەوە بەستراوی لقی پێك دێت، کە سیستمی هونەری و زانیاری و هێزی مرۆیی و سیستمی ئابووری دارایین[152]

## تیۆریای سیستمی ئەم سوودانەی خواوەرەوەی لە تێخوێندنەوەی بەڕێوەبردن دا ڕەخساندوە:

١ - ئەم تیۆریایە بۆ یەکەم جار تێڕوانینێکی گشتگری بۆ توێژەری زانستیی بەڕێوەبردن لە کارگێڕیی ڕێکخراوە دا ڕەخساند، کە توێژەر دەبێت وەك سیستمێکی کراوە بڕوانێتە بەڕێوەبردن، پێیەوە بتوانێت ڕەگەزی گرفتە کارگێڕییە جیاجیاکان لە بەندە سیاسی و کۆمەڵایەتی و هونەری و مرۆییەکان و، مەودای کارلێك کردنی هەموو ئەم ڕەگەزانە لەگەڵ ژینگەی دەرەوە دا، ببینێت

بۆیە تیۆری سیستم هەولێکی ئامانجدارە بۆ پێکەوەنانی تیۆرێکی گشتگر، کە وەك سیستمێکی لقی لەو سیستمە کۆمەڵایەتییە گشتییە، کە بەشێوەیەکی بەردەوام کارلێکی لەگەڵ دەکا و کاریگەریی بۆ هەیە و کاریگەرە بۆی، بڕوانێتە سیستمی کارگێڕی.

---

[152] .أحمد إبراهيم أبو سن: الإدارة في الإسلام، ص١٦٥

تیۆرە کلاسیکییەکان تەوەرەی بایەخەکانی دەربارەی تـەواوێتیی بەرهەمـداری داناوە و تاوتوێی کردارە ناوخۆییەکان لـە ڕێکخـراوە کارگێڕییـەکان دەکـات، بـێ پێدانی گوزارشتێکی تەواو بۆ هێـزی دەرەکـی، وەك کێشـە ئابوورییـەکان و بـەها کۆمەڵایەتییەکان، کە ژینگـەی دەرەوەی لـێ پێـك دێـت، هەڵبـەت لـەم ڕوانگـە سنووردارەشەوە، ئەوە بەرهەم هاتوە، کـە ئـەم تیـۆرە بەشـەکییانە بـە وەرگـرتنی ڕەگەزێك وەك تەوەری فەلسەفەکەی تەواو دەبێت و، ڕەگەزەکانی تـر وەلا دەنێـت، کە کاریگەری و گرنگییان لە ڕێکخراوەی کارگێڕی کەم نییە[١٥٣]

٢ - تیۆریای سیستم بیرمەنـدی کـارگێڕی لـە گرنگیـی ڕەگـەزە جیاجیاکـانی پێکهاتوو بۆ کرداری کارگێڕی لە ناوەوەی ڕێکخراوە، هەستیار و هۆشیار دەکـات، لە پلان دانان و ڕێکخستن و چاودێری کردن و ئاراسـتە کـردن و، لـە تـەکنۆلۆژیا و ڕەگەزە هونەری و ئابووری و دارایی و ڕاگەیاندنییەکان.

٣ - تیۆریـای سیسـتم هاریکـاری کارگێڕەکانـە لـە تێگەیشـتنی ڕێگـەی بەڕێوەچوونی ڕێکخراوەی کارگێڕیی ئاڵۆز" جەختی بایەخەکانی لەسـەر ئـەو هێـزە کۆمەڵایەتی و ئابووری و تەکنۆلۆژیا و ژیارییانەی، کە بە ڕێکخراوە کارگێڕییەکان دەورەدراون لەسەر کارلێکەکانیان، دەکاتەوە و، ئەو تێگەیشتنە کلاسـیکییەی وەلا ناوە، کەوا بەو پێیە بڕوانێتە بەڕێوەبردن، کە سیستم و بنەما گـەلێکی چەسـپاوە، لە هەموو هەلۆێستێك و هەموو ژینگەیەك ئەرکە پیادە بکرێت.

٤ - تیۆریای سیستم بوە هۆی شۆڕشێکی کارگێڕی، کە لە کۆتایی شێسـتەکان و سەرەتای هەفتاکانی سەدەی بیستەمەدا دەستی پێ کرد و، وای لـە بیرمەنـدانی کارگێڕی کـرد، کـە تـا ڕادەیـەکی زۆر چـاو بـە زۆربـەی دانپیـانراوە کـارگێڕی و کلاسیکی و ڕەفتارییەکان بخشێننەوە، کە پەیوەندیدارن بە بنەماکانی ڕێکخسـتنی کارگێڕی و شێوازەکانی سەرکردایەتیی کارگێڕی و ئەو هاندەر و پاڵنەرانەی، کە لە ناوەوەی ڕێکخراوە دا پاڵ بە کارکەران دەنێن.

---

[١٥٣] .أحمد إبراهيم أبو سن: الإدارة في الإسلام، ص١٦٥

# ڕەخەگرتنی تیۆریای شیکاریی سیستەمەکان

تیۆریای شیکاریی سیستەمەکان سەرکەوتوو بوو، کە تیۆریایەکی پێڕۆیی و وەسفیشە، هەروەك گرنگیی ڕوانگەی گشتگری تێخوێندنەوەی ڕێکخراوەی کارگێڕی بەو پێیەی سیستمێکی لقییە لە چارچێوەی سیستمێکی کۆمەڵایەتیی گەورە دا زەق بووەوە و، بە بڕی ئەو ڕەنج و بەخشینە پەسەند کراوەی لە لایەن کۆمەڵگە، بەوەی لە کۆمەڵگە دا ڕوو دەدات کاریگەر دەبێت، بەمەش ئەم تیۆرە نزیکترین تیۆریایە بەو گوزارشتەی تیۆریایەکی گشتگرە لە چاو تیۆریا هاوچەرخەکانی تر.

**پوختە**: دوای خستنە ڕوی ئەم تیۆریایە هاوچەرخانە و، بەر لە هەڵستانمان بە خستنەڕووی تیۆریای ئیسلامی، بەشێوەیەکی ئاسایی پێمان وایە، کە ئەم پرسیارەی خوارەوە دەربڕین:

بۆچی تیۆریایە هاوچەرخەکان لە لێك دانەوە و هەڵسەنگاندنی ڕەفتاری تاکی کارکەر لە ڕێکخراوەی کارگێڕی دا، شکستیان هێنا؟

ئەگەر سەرنجێکی تاکی کارکەر بدەین لە ناوەوەی ڕێکخراوەی کارگێڕی لە سەدەی نوێ دا، دەبینین، کە ئەم تاکی کارکەرە کەسێکی شپرزەیە، ناتوانێت پێداویستییە ئابووری و دەروونییەکانی پڕ بکاتەوە و، دەسەڵاتی ڕەسمی لە ڕێکخراوە ڕەت دەکاتەوە و، لە نەیارییەکی بەردەوام دایە لەگەڵی و، تا ئێستاش هەوڵ دەدات مافەکانی و باش کردنی مەرجەکانی کار کردنی لە ڕێگای خۆپێشاندان و مان گرتن و وەستاندنی کار و فشاری سەندیکاکان بەدەست بهێنێت و، لەم تیۆریایە کارگێڕییانەدا نەبینرا، کە بتوانرێت چارەیەکی بنەڕەتی بۆ ناکۆکییەکانی کار و پەیوەندییە پیشەسازییەکان دابنرێت و، ئەم تیۆریایانە نەیانتوانی بگەن بە ڕاستیی ئەوەی پاڵ بە کارکەر دەنێت و ڕەفتارە کارگێڕییە ئەرێنییەکەی لە ناوەوەی ڕێکخراوە دیاری بکەن، کە ئایا پاڵنەری ئابوورییە؟ ئایا ڕەگەزی مرۆییە لە کارگێڕی؟ ئایا لایەنی ڕێکخستنە؟ ئایا ترسانی لە دەسەڵاتی ڕەسمی هانی دەدات

بۆ گوێڕایەڵیی ئەو یاسا و گەڵاڵەنامە و فەرمانانەی، کە لە سەرۆکەکانیەوە پێی دەگات؟ ئایا باوەڕ و ڕا و بەها ئایینی و ئاکارییەکانیەتی، کە لە ژینگەی کۆمەڵایەتیی لەوەتەی منداڵییەوەی دەورەی داوە؟ یا سەرجەم ئەمانەن؟

چاودێریی ڕەفتاری فرمانی کارکەر ڕووبەڕووی نا ئومێدییەکی توند بووەوە بەهۆی شکست هێنانی ئەم تیۆرییە کارگێڕییانە لە چارەسەر کردنی لادانە ڕەفتارییەکان لە لایەن فرمانبەران و کارکەران.

بە ڕوونی دەبینین بەرتیل تەشەنەی سەندوە، تەنانەت لە ڕێکخراوە کارگێڕییەکانی ئەوروپا و ئەمەریکاش، وێڕای دەرکەوتنی لایەنگیری و قۆستنەوەی هێز لە بەرژەوەندیی فرمانبەرێکی تایبەت. جێی سەرسووڕمانیشە، کە هەموو ئەم نەخۆشییە کارگێڕییانە لە لایەنگیری و بەرتیل و قۆزتنەوەی دەسەڵات، سەرجەم ئاستەکانی ڕێکخراوەی کارگێری پێك دەهێنێت و سەرکردە کارگێری و سیاسیەکانیش پارێزراو نین، سەرباری ئەوەی دەرامەت گەلێکی کەرەستەیی و پایەی کۆمەڵایەتییان هەیە، کە دەبوایە بەس بێت بۆیان و ئارەزوە مایەکی و پێداویستییە دەروونی و کۆمەڵایەتییەکانیان پڕ بکاتەوە. زۆرجار گوێ بیست دەبین، کە ئەندامێکی ئەنجوومەنی پیران یا سەرۆك کۆمار یا بەڕێوەبەرێکی گشتیی هاوبەشگەیەکی گەورەی جیهانی بەهۆی وەرگرتنی بەرتیل یا قۆزتنەوەی پایە ڕەسمییەکەی یا پیادە کردنی جۆرێك لە لایەنگیری، پایەکەی لە دەست داوە.

باوەڕمان وایە، کە هۆکاری شکست هێنانی ئەم تیۆریایانە پەیوەندیدارە بە فەلسەفە لە هەمان کات دا پێڕۆیەکەشی.

هەڵبەت تیۆریایە کارگێڕییە هاوچەرخەکان ڕێکخراوەی کارگێڕییان بە جیا لە ژینگەی کۆمەڵایەتیی دەورەدەری دا تێخوێندوەتەوە، تەنها بایەخیان بەوە داوە، کە لە ناوەوەی ڕێکخراوە ڕوو دەدات، لە پەیوەندی و ڕەفتارەکان، بێ ئەوەی ڕوو بکەنە ئەو گۆڕانکارییە ژینگەییانەی، کە کاریگەرییەکی بەهێزیان لەسەر ئەوەی لە ناوەوەی ڕێکخراوە دا ڕوو دەدات، هەیە.

ئەو فەلسەفەیەشی، کە باوەڕمان پێی هەیە ئەوەیە، کە ڕێکخراوەی کارگێری بەشێکی لقییە لە ژینگەی کۆمەڵایەتیی گشتی و، بەشێکە کاریگەرییەکی ڕیشەیی هەیە بەوەی، کە لە کۆمەڵگە دا ڕوو دەدات لە دۆخی سیاسی و ئابووری و ڕووناکبیری و سروشتی، کاری دەکرێتە سەر[١٥٤]

لەبەر ئەوە، ئەوەی لە ناوەوەی ڕێکخراوە کارگێرییەکان دا ڕوو دەدات چاك نابێت، تەنها بە چاك کردنی ژینگەی کۆمەڵایەتیی گەورە نەبێت، ئەمەی دەیلێین تیۆریای بەڕێوەبردنە لە ئیسلام، کە لە نێوان ڕەفتاری کارگێری فرمانی کارکەر لە ڕێکخراوەی کارگێری و، نێوانی ڕەفتارە کۆمەڵایەتییە گشتییەکەی لە دەرەوەی ئەم ڕێکخراوەیە دانابڕێت.

لایەنی دووەم ئەم تیۆریایە هاوچەرخانە لە شیکاریان بۆ ئەوەی لە ناوەوەی ڕێکخراوەی کارگێری دا ڕوو دەدات، بایەخیان بە بەش گەلێکی بچووك بچووك داوە و، لایەنەکانی تریان وەلا ناوە، بۆ نموونە، تیۆری بەڕێوەبردنی زانستی بایەخی بە گرفتی بەرهەمداری داوە و بەمە کۆتایی پێ هێناوە، کە گۆڕێنەری کەرەستەی پاڵ بە کارکەر دەنێت و گۆڕانکارییە دەروونی و کۆمەڵایەتییەکان و کاریگەرییانی لەسەر تاکی کارکەر ڕەچاو نەکردوە.

لە کۆتاییش دا ئاماژە بەوە دەکەین، کە تیۆریای شیکاریی سیستەمەکان لە زەق کردنەوەی گرنگیی ڕوانگەیەکی گشتگر بۆ تێخوێندنەوەی ڕێکخراوەی کارگێری سەرکەوتوو بوو، بەو پێیەی سیستمێکی لقییە لە چارچێوەی سیستمێکی کۆمەڵایەتیی گەورە پێوەی بەندە و بە قەد بەخشینەکانی بەوەی لە کۆمەڵگە دا ڕوو دەدات کاریگەر دەبێت، بەمەش ئەم تیۆریایە نزیکترینە بەو گوزارشتەی، تیۆریایەکی گشتگرترە لەمانی تر لە تیۆریایە نوێیەکان.

---

[١٥٤] أحمد إبراهيم أبو سن: الإدارة في الإسلام، ص١٦٨.

## خواستی دوەم: تیۆریای بەڕێوەبردن لە ئیسلام:

تیۆریای بەڕێوەبردن لە ئیسلام دا، کە لە خوارەوە دەیخەینە ڕوو، بە جەخت کردنەوەی لەسەر سەرجەم گۆڕێنەرەکان، کە کار لە کرداری کارگێری دەکەن لە ناوەوە و دەرەوەی ڕێکخراوە و بەستنەوەی ڕەفتاری تاکی کارکەر بە کارلێکە کۆمەیەڵایەتییەکان، جیا دەکرێتەوە.

هەڵبەت تیۆریای ئیسلامی ڕەهەند گەلێکی کۆمەڵایەتیی تەواو و کاریگەری خستۆتە ناو ڕەفتاری کارگێری لە ناوەوەی ڕێکخراوە، ئەویش ڕەهەندی ئاکارییە. کەواتە لە ئیسلام دا کارگێری بە بێ ئاکار نییە، هەروەك کۆمەڵگەی ئیسلامیش بێ ئاکار نییە.

## تایبەتمەندییەکانی تیۆریای بەڕێوەبردن لە ئیسلام چین؟

١ - تیۆریای بەڕێوەبردن لە ئیسلام دا، بەندە بە ڕوانگەی کۆمەڵایەتیی کۆمەڵگەی ئیسلامی و، بەندە بە ئاکار و بەهایە کۆمەڵایەتییەکانی ئیسلام(گۆڕێنەری کۆمەڵایەتیی ئاکاریی).

٢ - تیۆریای بەڕێوەبردن لە ئیسلام دا بایەخ دانەکەی جەخت لەسەر گوڕێنەری ئابووری و پاڵنەری مایەکی پوخت دەکاتەوە و، کار بۆ پڕ کردنەوەی پێداویستییە فسیۆلۆجییەکانی تاك دەکات( گۆڕێنەری کەرەستەیی ئابووری).

٣ - ڕاوێژ کردن لە کارگێری دا ڕەگەزێکی بنەڕەتییە.

٤ - تیۆریای ئیسلامی بایەخ بە هۆکارە مرۆیی و گیانییەکان دەدات و، وەك مرۆڤ ڕێز لە مرۆڤ دەگرێت و، لە کرداری کارگێری دا بەشدارییان پێ دەکات و، هەر یەك بە پێی توانستە ئاوەزی و ئامادەباشییە دەروونییەکانی(گۆڕێنەری مرۆیی)

٥ - تیۆریای ئیسلامی بایەخ بە سیستم و دیاری کردنی بەرپرسیارییەکان دەدات و، ڕێز لە دەسەڵاتی ڕەسمی و ڕێکخستنی ڕەسمی دەگرێت و، ڕێز لە

پەیکەری ڕێکخستن دەگرێت و لە چاکە دا گوێڕایەلی دەکات( گۆڕینـەری ڕەفتـار و سیستم).

**لە خوارەوەش ئەم پێنج تایبەتمەندییە ڕاڤە دەکەین:**

## ١ – بەڕێوەبردن لە ئیسلام دا بەشێکە لە سیستمی کۆمەلاّیەتی:

ئیسلام مەبەست لە بوون دیاری دەکات، هەروەها هاوسەنگیش لە نێوان تاك و بوون و کۆمەڵگە دا هەیە، بەو گوزارشتەی تـاك بەشـێکە لـە بـوون و لـە زۆر لـە ئایەتەکانی قورئانی پیرۆز دا ئەم پەیوەستییەی نێوان تاك و بوون تێبینی دەکرێـت: ﴿وَمَا خَلَقْتُ الْجِنَّ وَالْإِنسَ إِلَّـا لِيَعْبُـدُونِ٥٦مَـا أُرِيـدُ مِـنْهُم مِّن رِّزْقٍ وَمَـا أُرِيـدُ أَن يُطْعِمُونِ﴾[١٥٥]. واتا: "جنۆکە و مرۆڤیشم بەدی نەهێناوە مەگەر بۆ پەرسـتن {٥٦} (هیچ) ڕۆزیم لێیان ناوێت و خۆراکم لیّ ناوێن".

هەڵبەت خوای پاك و بلّند ڕێباز و سیستمێکی کۆمەلاّیەتیی هێناوەتە بـوون، بـۆ ئـەوەی ژیـانی کـارگێڕی و سیاسـی و کۆمـەلاّیـەتی و ئـابووریی مـرۆڤ بـە ڕێکخستنێك ڕێك بخات لەگەڵ نهێنیی بوون هەماهەنگ بێت، کە پەرستنی خوایە.

پەرستگەری مانای دابڕان لە کارکردن و گۆشەگیری کردن لە دونیـا نییـە، کـە لەگەڵ پەیامی مرۆڤ لە ئاوەدان کردنەوەی زەوی و بلاّو کردنەوەی بڕیارەکـانی خـوا تێی دا پێچەوانە بێت، پەرستگەری هەموو کارێکی سوودمەند لە ژیان دەگرێتەوە.

یەکەم فرمانەکانی سیستمی کۆمەلاّیـەتیی ئیسـلامی لـە ولاتـی ئیسـلامی، بریتییە لە ڕەخساندنی کەشێکی گونجاو بۆ تاك، بۆ ئەوەی ئەم تاکە هەڵسـتێت بـە پەرستنی خوا لە زەوی و جێبەجێ کردنی ئەو بڕیارانەی، کە لـە پـەرتووکی خـوا و سوننەتەکانی پەیامبەر درود و سەلامی خوای لەسەر بێت هاتوون.

---

[١٥٥] سورة الذاريات: الآيتان ٥٦- ٥٧.

ئەم پەرستگەرییەش بەدەست نایەت لە تێگەیشتنە دروستە فراوانەکەی بەوەی، کە وا لە مرۆڤ بکات، ژیان و تەواوی قسە و کردەوە و هەڵسوکەوت و پەیوەندییەکانی لەگەڵ خەڵکی دا، ئەوە پیادە بکات، کە ئیسلام داینـاوە، مەگـەر کۆمەڵگە ڕێکخراو بوو بەو جۆرەی، کە ڕێگە خـۆش بکـات بـۆ تـاك، کـە ژیـانی لەسەر پێڕۆی ئیسلامیی خوازراو دابڕێژێت.

کرداری پێکەوەنانی خێزانیش دەستپێکی شانەیەکی بنـەڕەتیی کۆمەڵگەیـە، پاشان دەستگەی ئابووری و سیاسی و کارگێڕی، بەمەش سیستمی کۆمەڵایـەتیی ئیسلامی تەواو دەبێت: ﴿الَّذِينَ إِن مَّكَّنَّاهُمْ فِي الْأَرْضِ أَقَامُوا الصَّلَاةَ وَآتَوُا الزَّكَاةَ وَأَمَرُوا بِالْمَعْرُوفِ وَنَهَوْا عَنِ الْمُنكَرِ وَلِلَّهِ عَاقِبَةُ الْأُمُورِ﴾[١٥٦]. واتـا: "ئەوانەی(کەشایەنی یارمەتی دانن) لە زەوی دا توانامان پێداون نوێژ ئەنجام دەدەن و زەکات دەدەن و فەرمان بە چاکە دەکەن و بەر لە خراپە دەگرن ئاکامیش هەر بـۆ لای خوایە"

هەروەها لە فرمانەکانی سیستمی کۆمەڵایەتیی ئیسلامی دادگەری کردنـە لـە نێوان خەڵك و ڕێکخستنی ژیانی ئابووری و کۆمەڵایەتی و کارگێڕییە[١٥٧]

کارگێڕی یەکێکە لەو ئامرازانەی، کە وڵاتی ئیسلامی بۆ گەیشتن بە ئـاوات و فرمانەکانی بەکاری دەخات[١٥٨]

بۆ ئەوەشی کـارگێڕی لـە توانـای دابێـت کردەکـەی ڕاپـەڕێنێت وەك ئـەوەی ویستراوە، دەبێت بە بنەماکانی کۆمەڵگەی ئیسلامییەوە بەند بێت، بۆیە کارگێڕی بەندە بە ژینگەی ئیسلامی و، تاکی کارکـەریش پابەنـدە بـە بنـەماکانی ڕێبـازی ئیسلامی لە هەر کوێیەك بێت، لـەماڵ و لـە دوکـان و لـە کێڵگـە و ڕێکخـراوەی کارگێڕی و کۆڕە کۆمەڵایەتییەکان، خوا دەپەرستێت و لە هـەر هـەنگاوێکی، کـە دەیهاوێژێت، چاوی لە خوایە.

---

[١٥٦] سورة الحج: الآية ٤١.

[١٥٧] أحمد إبراهيم أبو سن: الإدارة في الإسلام، ص١٧٢.

[١٥٨] أحمد إبراهيم أبو سن: الإدارة في الإسلام، ص١٧٣.

فرمانبەری مووسوڵمان، لە شوێنی کارەکەی، چاوی لە خوایە و لە هەر هەنگاوێکی ڕۆژانەی دا خۆی بۆ دەپارێزێت، بە ڕەفتارێك دەچێتە ڕێکخراوە کارگێڕییەکەی، کە ترسی خودایە لە هەموو ئەوەی پێی دەدرێت یا داوای لێ دەکرێت لە فرمانەکان.

فرمانبەری مووسوڵمان پاشخانێکی ئاکاریی ئیسلامیی هەیە، کە ڕەفتارەکەی لە ناوەوەی ڕێکخراوەی کارگێڕی ئاراستە دەکات، لێرە دا ڕەفتاری لە ناوەوەی ڕێکخراوە بەند دەبێت بە ڕەفتاری لە دەرەوەی ڕێکخراوە، کە تاکە ڕەفتارێکە پابەندە بە فەرمانەکانی خوا و دوورکەوتنە لە یاساخەکانی لە هەر شوێنێك، کە خۆی لێی بێت.

ئەم پابەندیە ئاکارییە پەرستییە باوەڕییەش ئەوەیە، کە ڕەفتاری کارکەر لە کۆمەڵگەی مووسوڵمان و لە ڕێکخراوەی کارگێڕی لە وڵاتی ئیسلامی ئاراستە دەکات.

کەواتە پەیوەستییەکی ئاکاریی پتەو لە نێوان کۆمەڵگەی مووسوڵمان و لە نێوان ڕێکخراوەی کارگێڕی دا هەیە، کە بە بەشێکی دانەبڕاو لێی گوزارشت دەکرێت، بە ئاکارەکانی کۆمەڵگە و بنەماکانی ڕێبازی ئیسلامی ڕێنمویی دەبێت.

ڕەخساویی ژینگەیەکی ئیسلامی خۆی لە خۆی دا ڕێکخراوە گەلێکی کارگێڕیی لێ بەدەست دێت، کە کارکەر و فرمانبەری بڕوادار و لە خواترس لەخۆ بگرێت، لە خوا بترسن و بیپەرستن و، گوێڕایەڵیی فەرمانەکانی بکەن و لە کاتی وەرگرتنی بەرپرسیاریی فرمانی بۆ ڕاسپێردراویان، لە یاساخەکانی دوور بکەونەوە

بەمەش ڕێکخراوەی کارگێڕی بەو شێوەیە بەڕێوە دەچێت، کە کۆمەڵگەیەکی مووسوڵمانی پابەند بە باوەڕ و ڕێبازی خوای لێ دەوێت.

## ٢ - کارگێڕیی ئیسلامی کار بۆ پڕکردنەوەی پێداویستییەکانی کارکەری مووسوڵمان دەکات:

فرمـان لـە ڕووی چـەمکی بـەڕێوەبردنی ئیسـلامی، بریتییـە لـە سـپاردە و بەرپرسیاریی کەسایەتی لە لای تاکی کارکەر: ﴿إِنَّ اللّهَ يَأْمُرُكُمْ أَن تُؤدُّواْ الأَمَانَاتِ إِلَى أَهْلِهَا وَإِذَا حَكَمْتُم بَيْنَ النَّاسِ أَن تَحْكُمُواْ بِالْعَدْلِ﴾[١٥٩] واتا: "هەڵبەتە خـوا(ی گەورە) فەرمانتان پێ دەکات، کە سپاردەکان(ئەگەر پێتـان درا) بـۆ خاوەنـەکانیان بگێڕنەوە و ئەگەر(کاتێك)یش فەرمانڕەواییتان لە نێـو خـەڵکی دا کـرد، ئـەوا بـە دادگەری بیکەن"

سپاردەش فرمانە گشـتییەکانە، بـە بەڵگـەی فـەرموودەی پەیامبـەر ﷺ: (إذا ضيعت الإمانة فانتظروا الساعة) قيل يا رسول الله: وما إضاعتها؟ قال: (إذا اسند الأمر إلى غير أهله فانتظروا الساعة)[١٦٠]، واتـا: (ئەگـەر سـپاردە نـەما، ئـەوا چاوەڕوانی ڕۆژی دوایی(الساعه) بن، وترا: ئـەی پەیامبـەری خـوا سـپاردە نـەمان چییە؟ فەرموی: (کاتێك کاروبـار درا دەسـت کەسـانی ناشـیاو، چـاوەڕوانی ڕۆژی دوایی بن).

هەروەها سپاردە، پێدانی فرمان و بەرپرسیاری بە کەسی بە توانسـت و ڕازگـر دەخوازێت، جا ئەگەر فرمانەکە بەو سپاردەیی و دڵسـۆزییەی داواکـراوە جێبـەجێ کرا، لەسەر سەرکار ئەرك دەبێت، جـا ڕێکخـراوەی کـارگێڕیی حکـومی بێـت یـا تایبەت، کە پاداشـتی کارکـەر بـە گـوێرەی کارەکـەی بـدات، هـەروەها ئیسـلام ڕایسپاردوە، کە کرێ لە لایەن کرێ گرتە زانراو بێت، پەیامبـەری خـواش ﷺ لـەم بارەوە دەفەرموێت: (من استأجر أجيراً فليعطه أجره). واتا: (هەرکەسێك کەسـێکی بەکرێ گرت با کرێیەکەی بدات)، هەروەك ڕاشی سپاردوە، کە دەبێت یەکسەر دوای

---

[١٥٩] سورة النساء: الآية ٥٨.

[١٦٠] صحيح البخاري: الجزء الثالث، ص٥٠.

تەواو بوونی کارەکەی کرێیەکەی بدرێت بە بێ دواخستن: (أعطوا الأجیر حقه قبل أن یجف عرقه). واتا: (مافی کرێگرتە بدەن بەر لە وشك بوونەوەی ئارەقەی).

تیۆریای بەڕێوەبردن لە ئیسلام دا داوای بەزەیی هاتنەوە بە کارکەر دەکات و، ئەوەی پێی نەکرێت ڕاینەسپێرن لەوەی، کە لە وزەی دا نییە: ﴿لاَ یُکَلِّفُ اللّهُ نَفْسًا إِلاَّ وُسْعَهَا لَهَا مَا کَسَبَتْ وَعَلَیْهَا مَا اکْتَسَبَتْ﴾[161]. واتا: "خوا زۆری لە کەس ناکات، کە لە توانای دا نەبێت، ئەوەشی داناوە تەنها لە قەدەر توانای خۆیەتی، ئەوەی بەدەستی دێنێت(لە چاکە) بۆ خۆیەتی و ئەوەشی بەدەستی دێنێت (لە خراپە)لەسەر خۆیەتی".

هەروەها ئیسلام قۆستنەوەی توانستی کارکەران و چەوساندنەوەی کارکەران لەوەی لە وزەیان دا نییە، ڕەت دەکاتەوە بێ دانی کرێی دادگەرانە، کە لەگەڵ سروشتی کارەکەی بلوێت.

گیانی دوژمنایەتی و بەش بەش بوونی چینایەتی نێوان خاوەن کاران، وێڕای خودی وڵاتی ئیسلامی وەك ڕێکخراوەکی کارگێڕیی، لە لایەك و نێوان کارکەران لەلایەکی تر، لە ئیسلام دا بوونی نییە.

مافە تاکییە پێدراوەکانی فرمانبەر و ئەرکی سەر شانی وڵاتی ئیسلامیش لە لایەنی پاریزگاریی تاکەکان لە ستەم، بوارێك بۆ ناکۆکیی نێوان کارکەر و خاوەن کار ناهێڵێتەوە.

وڵاتی ئیسلامی ئەو دادوەرە خودان پسپۆڕییانە دەرەخسێنێت، کە کاروباری کارگەران و کارگێری جیا دەکەنەوە بەوجۆرەی دادگەری بۆ هەردوولا بەدەست بهێنێت.

بەڕێوەبردنی ئیسلامی دوورتر لەمەش دەڕوا، کە ڕەچاوی قەبارەی خێزانی تاکی کارکەر لە کاتی دیاری کردنی کرێ دا دەکات، هەروەك کرێی خێزاندار زیاترە

لە کەسێکی سەڵت و، کارگەر مافی داوا کردنی زیاد کردنی کرێی هەیە ئەگەر بەس نەبوو بۆی[١٦٢]

هەروەها ئیسلام کارکەر لەیاد ناکات لەکاتی پەککەوتنی بە هۆی نەخۆشی یـا تەمـەن گـەورەیی، بـەڵکو ئـەرکی سەرشـانی ولاتـی ئیسـلامییە کـە دڵنیـایی کۆمەڵایەتی بۆ هاولاتییان بڕەخسێنێت، بە بەدەست هێنانی بنەمای دەسـتەبەریی کۆمەڵایەتی لە ئیسلام، بۆ ئەمەش نموونەیەك دەهێنینەوە، کە سەرکردەی کـارگێڕ عومەری کوڕی خەتاب خوا لێی ڕازی بێت پێی هەڵستاوە، کاتێك بەلای کۆمەڵێك دا ڕەت بوو سوالکەرێکی بینی پیرێکی کوێر بوو، لە پشتەوە دەستێکی لـە قـۆڵی دا پێی گوت: تۆ لەکام خاوەن پەرتووکانی؟ گوتی: جولەکـە. گـوتی: چـی ناچـاری کردویت بەم کارەت، کەوا دەیبینم؟ گوتی: نەدار و بەسالاچووم و داوای سەرانەم لێ دەکەن بۆ ئەوەی بیدەم، جا عومەر بەدەستی خۆی بردی ناردی بۆ لای خەزنـەداری ماڵی دارایی و پێی گوت: سەرنج بدە ئەمە و هاوشێوەکانی بـە خـوا دادگـەریمان لەگەڵ دا نەکردوە، ئەگەر لاوێتیمان خوارد و پاشان وازی لێ بهێنین لە کاتی پیری، بەڵکو خێر بۆ هەژاران و بێ نەوایانە، ئەمەش لە بێ نەوایانی خاوەن پەرتووکە، جا سەرانەی لەسەر لابردرا[١٦٣]

## ٣ – بنەمای ڕاوێژ لە بەشدار بوون لە کارگێڕی دا

ئەم بنەمایە یەکێك لە کۆڵەگـە و تایبەتمەندییـەکانی تیۆریـای کـارگێڕی لـە ئیسلام دا پێك دەهێنێت و، بەشداری کردنیش فەرمانێکە پابەنـد بـوونی ئەرکـە، ﴿وَشَاوِرْهُمْ فِي الأَمْرِ﴾[١٦٤] واتا: "لە کاروبارەکانیش دا ڕاوێژیان پێ بکە".

خوای پاك ڕێزی لە ئادەمیزاد گرتوە و مرۆییەتی و سـەربەرزییانی پاراسـتوە، ئەمیش بە بەشدار کردنیان لە فەرمانڕەوایی و کارگێڕی دا.

---

[١٦٢] أحمد إبراهيم أبو سن: الإدارة في الإسلام، ص١٧٥.
[١٦٣] أحمد إبراهيم أبو سن: الإدارة في الإسلام، ص١٧٥.
[١٦٤] سورة آل عمران: الآية ١٥٩.

هەڵبەت پەیامبەر ﷺ لە بەڕێوەبردنی وڵاتی ئیسلامی دا، ڕژد بوە لەسەر ڕاوێژ کردن، هەروەك چارچێوەی ئەم سیستمە ڕاوێژییەی داناوە، کە ئەنجوومەنێکی بۆ پێك هێناوە لە چاردە نەقیب، کە لە خاوەن ڕاو چاوکراوەکان دەستنیشانی دەکردن، لەوانەی، کە بە ئاوەزی و چاکی گەواهییان بۆ دەدرا، جێنشینەکانی ڕاشیدینیش خوا لێیان ڕازی بێت ڕێی ڕاوێژیان گرتەبەر بە ڕێگەی سەرمەشقیی پەیامبەر ﷺ، هەروەك ئەبوبەکر خوا لێی ڕازی بێت، کاتێك کاروبارێکی بکەوتبوایە پێش، پێویستی بە ڕاوێژی خاوەن ڕاو ڕێناسان بوایە، بانگی چەند هاوەڵێکی لە کۆچکەر و پشتیوانان دەکرد، وەك عومەر و عوسمان و عەلی و عەبدوڕەحمان کوڕی عەوف و مەعازی کوڕی جەبەل و ئوبەی کوڕی کەعب و زەیدی کوڕی سابت و هی تریش[١٦٥]، خوا لێیان ڕازی بێت، ئەمەش بە مەبەستی وەرگرتنی ڕاوێژیان و هەڵوەستە کردن لەسەر ڕاکانیان.

عومەری کوڕی خەتابیش خوا لێی ڕازی بێت هیچ کارێکی مەزنی نەدەبڕاندەوە، بێ ڕاوێژی هاوەڵانی، بەڵکو ئەم سەرکردە کارگێڕە مەزنە زۆر ڕژد بوو لە بەشدار کردنی خەڵکی لە فەرمانڕەوایی، هۆی ئەمەیان لێ پرسی گوتی: (دەترسم هەڵەیەك بکەم هیچ کەس لە ئێوەش لە ترسم قسەم لەگەڵ دا نەکات)[١٦٦]

بنەمای ڕاوێژ نیشانەیەکی بەرچاوە لە کارگێڕی، ئەم بنەمایەش لە توانای دایە، کەوا لە کارکەر بکات، بە ئەرینی و کارا بە ڕۆڵێکی بەرچاو پشکداری لە بەڕێوەبردنی دەستگەکەی دا بکات، هەروەك بەرپرسان لە بەڕێوەبردنی ڕێکخراوەی کارگێڕیی ئیسلامی وا لێ دەکات پابەند بن پێی وەك سەپێنراوێکی خوایی، کە خستویەتییە سەر کۆمەڵگەی مووسوڵمانان و، وەك شێوازێك تاکی کارکەر بەشدار بکات لە وەرگرتنی بەرپرسیاریی کارگێڕی، کە هانیان بدات لە کار کردن و ڕەنج دان و بەخشین.

---

[١٦٥] أحمد إبراهيم أبو سن: الإدارة في الإسلام، ص١٧٦.

[١٦٦] أحمد إبراهيم أبو سن: الإدارة في الإسلام، ص١٧٦.

هەڵبەت ئیسلام چۆنیەتیی دیاری کردنی شێوازی بەشداری کردنی لە لایەن کارکەران لە فەرمانڕەوایی و کارگێڕی دا بۆ کۆمەڵەی مووسوڵمانان جێهێشتوە، بەو جۆرەی لەگەڵ سروشتی کار و قەبارە و ڕەوشی دەوروبەری ڕێکخراوەی کارگێری بشێت.

لەبەر ئەوەی کۆمەڵەی کارکەران لە هەر ڕێکخراوەکی کارگێریی ئیسلامی بە باوەڕ و ڕەفتار پابەندن بە ئیسلام، بۆیە ئەگەری ناکۆکیی دەسەڵاتی نێوان گەورە سەرکردە کارگێرییەکان و نێوانی کارکەرانی تر شتێکە ڕوودانی ئەستەمە، چونکە هەموان پابەندن و، هەموویان کار بۆ بەرژەوەندیی گشتیی ئیسلامی دەکەن و، مەبەست و ئامانجی خۆیەتی بۆ کۆمەڵەیەك نییە، کە لەگەڵ ئامانجی کۆمەڵەیەکی تری کارکەران جیاواز بێت، بۆیە بابەتی بەشدار کردن بەرهەڵستیی سەرکردە کارگێرییەکانی لێ نابینرێت، وەك ئەوەی لە ڕێکخراوە کارگێرییە هاوچەرخەکان دا دەبینرێت، کە هێزە جیاجیاکان لە پێناوی فراوان کردنی چارچێوەی ئەو دەسەڵاتانەی پێیان دراوە، ململانێ دەکەن.

ئەمەش لە ڕێکخراوەی کارگێریی حکومی و، لە ڕێکخراوەی کەرتی تایبەت پەسەندە، چونکە ئامانجی ڕێکخراوەی بازرگانی و پشەسازییە تایبەتەکان لە ولاتی ئیسلامی دا لە ڕووی چەمك و پیادە کردن، لە ولاتی پیشەسازیی هاوچەرخی نا ئیسلامی دا جیاوازە.

دەستگەی پیشەسازیی تایبەت لە ئیسلام ئامانجی زیاد کردنی بەرهەم هێنان نییە، لە پێناو زیاد کردن و قەبە کردنی داستهاتی خاوەن کارو کارکەران.

زەنگینی و بەرهەم هێنانی بێ سنوور و دەوڵەمەند بوونی نابەجێ و گەنج کردنی زێڕ و زیو لە ڕەفتاری ئسلامی نین.

ئابووریی ئیسلامی بنەمای زیاد کردنی دەستهاتی تاك و دەستهاتی نەتەوەیی بێ کۆتایی ڕەت دەکاتەوە، لێرە دا جیاوازیی نێوان ئابووریی ئیسلامی و ئابووریی ولاتە پیشەسازییە نوێیەکان دەردەکەوێت، هەروەك ئابووریی دوەمیان ئامانجی زیاد بوونی بێ بڕانەوەیە لە دەستهاتی نەتەوەیی و دەستهاتی تاك بێ وەستان.

پێوەری پێشکەوتن و پەرە سەندن و گەشە پێدان لە ولاَتی ئیسسلامی پێـوەری کەرەستەیی و زیاد بوونی کەرەستەی نییە، بۆیە لە سیستمی ئیسـلامی دا خـاوەن کار ئارەزوی زیاد بوونی دەستهاتی نییە لەسەر مافی کارکەران و، کارکەرانیش لـە ڕێگای فشار و ململانێ و مان گرتن بۆ زیاد کردنی دەسـتهات و جیاوکییـەکانیان لەسەر مافی کار، کار ناکەن، بەلکو سەرجەمیان بۆ ڕەخساندنی ڕادەیەکی گونجـاو لە پاراستن و مسۆگەریی کۆمەلاَیەتی بۆ کارکەر کۆشش دەکەن.

لێرە دا دەبینین، کە هیچ سیمایەکی ناکۆکی و ململانێ لەسـەر دەسـەلاَت لـە ڕێکخراوەی کارگێڕیی ئیسلامی دا بوونی نییە، جا ڕێکخراوەی حکـومیی گشـتی بێت یا ڕێکخراوەی کەرتی تایبەت.

لەبەر ئەمە، لە ئیسلام دا سەرجەم بروایان بە بنەمای ڕاوێـژ و بەشـدار کـردن وەك شێوازێکی کارگێڕیی ساخ لە ڕێکخـراوەی کـارگێڕیی ئیسـلامی دا هەیـە و، هەمووشیان بڕوایـان بـەوە هەیـە، کـە خـاوەن کـار مـاف گـەلێکی زانـراو و بـۆ کارکەریش ماف گەلێکی زانراو هەیە و، ولاَتی ئیسلامیش بەردەوام چاودێریی ئەم پەیوەندییە دەکات و ڕێکی دەخات[١٦٧]

## ٤ – سروشتی مرۆییەتیی سەرکردایەتیی کارگێڕیی ئیسلامی:

سەرکردایەتیی کارگێڕی لە ڕێکخراوەی ئیسلامی بە هێزی بڕوا بوون بە ئامانج و بە ڕژد بوون بۆ گەیشتن بە ئاواتی وێنا کراو، لە ڕێگای کۆمەلێك لە کارکـەران و بـڕوا بـوان بـە پەیامەکـەیان بـە پـەی بردنیـان بـە بەرپرسـیارییەکەیان و، ئارەزوومەندییان بۆ پاداشتی خوای شکۆمەند، جیا دەکرێتەوە.

هەروەك بە میانگیرییەکیش، کە خاوەنی کارامەیی مرۆییە لـە سـەرکردایەتی کردنـی کارکـەران لـە ڕێکخـراوەی کـارگێڕی، جیـا دەکرێتـەوە. هـەروەك

[١٦٧] أحمد إبراهيم أبو سن: الإدارة في الإسلام، ص١٧٧.

سەرکردایەتییەکی دەسەڵاتخوازی و بڵندخوازی نییە و، سەرکردایەتییەکی فەرامۆشکەر و کەمتەرخەمیش نییە، بەڵکو سەرکردایەتییەکە هەڵسوکەوت باش دەکات بۆ هەر بارێك چارەیەك دادەنێت. سەرکردەی کارگێر عومەری کوڕی خەتاب خوا لێی ڕازی بێت بە کورتی ناساندویەتی دەڵێت: "ئەم کاروبارە چاك نابێت مەگەر نەرمی لە هێز دا و بەهێزی لە نا توندی" کە سەرکردایەتییەك نییە بایەخ بە بەرهەمداری لەسەر مافی مرۆیی بدات و، سەرکردایەتییەکیش نییە بایەخ بە بەختەوەریی تاك بدات لەسەر مافی بەرهەم، بەڵکو سەرکردایەتییەکە، نێوانی ئەم دوانە بەجۆرێك هیچیان بەسەر ئەوەی تریان دا زاڵ نابێت، هاوسەنگ دەکات[١٦٨]

پەیوەندییە مرۆییەکان لە کارگێڕی دا، خواستێکی بنەڕەتییە پشکداری لە گەیاندن و پڕ کردنەوەی پێداویستییە دەروونیەکانی تاکی کارکەر دەکات، بۆ ئەوەی ئەگەر ئەم پێداویستییانە پڕ بوونەوە، کارکەر هەست بە ڕەزامەندییەکی زۆر و هاریکارییەکی زۆر و پەسەندکەری کارەکەی بێت، لە پێشەکیی ئەم پێداویستییە دەروونییانەش، هەست کردنی کارکەرە بە دڵنیایی و ئاسوودەیی لە ڕێکخراوەکەی و، هەست کردنییەتی بە وابەستە بوونی بۆی و پشکداری کردنی لە بەدەست هێنانی ئامانجەکانی و، هەست کردنی بەوەی، کە بەرپرسیار و، سەرکردە و سەرپەرشتیارە کارگێڕەکان، ڕێز لە هەوڵەکانی دەگرن و دان بە چاکییەکەی دەنێن و، ڕاپەڕاندنە باشەکەی بەرز دەنرخێنن و کار بۆ بەرەو پێش چوونی فرمانەکەی دەکەن.

تاکی کارکەر لە تێڕوانینی ئیسلام بوونەوەرێکی ڕێزدارە و لە لایەنی کارمەندییەکەی مامەڵەیەکی باشی لەگەڵ دا دەکات[١٦٩]

---

[١٦٨] أحمد إبراهيم أبو سن: الإدارة في الإسلام، ص١٧٨.

[١٦٩] أحمد إبراهيم أبو سن: الإدارة في الإسلام، ص١٧٩.

## ٥ – بایەخ دانی تیۆریای بەڕێوەبردن لە ئیسلام بە دەسەڵاتی ڕەسمی و ڕێکخستنی کارگێڕی:

هەڵبەت ئیسلام بە ڕێکخستنی کۆمەڵەیی و ئەوەی پێویستیەتی لە پلەپلەیی سەرۆکایەتیی دەسەڵات ئاشنایە، بەرلەوەی لایەنەکانی تر هەستی پێ بکەن.

پلەپلەیی دەسەڵاتی سەرۆکایەتی مانای ئەوە نییە، کە بەرپرسی یەکەم لە هەموو دەسەڵات دا تاکڕەو بێت، بەڵکو ئیسلام چەندین بەندی بۆ داناوە، کە لەچارچێوەکەیەتی.

سەرکردایەتی لە ئیسلام دا سەپێنراو نییە تاك ڕەوی لە وەرگرتنی بڕیار دا بکات، بەجێشی نەهێشتوە بۆ ئەوانەی، کە خودان پسپۆڕیی لە خوار ئەمن، بەڵکو مووسوڵمانی ناچار بە ڕاوێژ کردوە بە ڕێباز و بە پیادە کردن، لە ڕەفتار کردنی لەهەر کارێکی کۆمەڵەیی لە ڕێکخراوەی کارگێڕی و، ناچاری کردوە بەوەی ئەو ڕایە وەربگرێت، کە کۆمەلەیەك کۆدەنگییان لەسەر کردوە و لەسەر مووسوڵمانانی کردوەتە ئەرك، کە پەیڕەوی لە سەرکردە بکەن مەگەر فەرمان بە یاخی بوون بدات، ئەمە کارێکە نە گوێی بۆ دەگیردرێت و نە گوێڕایەلیی دەکرێت[١٧٠]

پێکەوەنانی کۆمەڵایەتی لە ئیسلام دا هەموو کارمەندان لە کارگێڕیی بڵندەوە بۆ ئەمپەڕی ئاستی کارکەرانی ڕێکخراوەی کارگێڕی دەگرێتەوە و، هیچ جیاکەرەوەیەکی چینایەتی لە نێوانیان دا نییە، چونکە ڕەگەزی ڕاوێژ کردن و بەشدار کردنی کۆمەڵەیی بۆ سەرجەم تاکەکانی ڕێکخراوە هەیە، هەریەك بەگوێرەی پسپۆڕی و بەرپرسیارییەکەی، کە بوارێك بۆ ڕێکخستنی ناڕەسمی ناهێڵێتەوە، تاوەکو کۆشش بۆ بەدەست هێنانی خواست گەلێکی چینێك بکەن، یا ناڕاستەوخۆ ڕکێفی خۆی لەسەر ئاراستە کردنی دەسەڵات لە ڕێکخراوەی کارگێڕی، بسەپێنێت.

---

[١٧٠] أحمد إبراهيم أبو سن: الإدارة في الإسلام، ص١٨٠.

پلەپلەیی لە سەرۆکایەتیی دەسەڵات پشت بە دانانی چینایەتیی سەپێنراو لە کۆمەڵگەی ئیسلامی نابەستێت، بەڵکو پشت بە ڕادەی زانینگەرایی و مەودای هونەری کار دەبەستێت.

لەبەر ئەوەی تاکەکان جیاوازن، هەرواش لە ئاستەکانی کار کردن و توانست لە ڕاپەڕاندن دا، پلەپلەیی سەرۆکایەتی لە ئیسلام دا پشت بە پلەپلەیی کارەکان و جیاوازییان لە زانست و پەی بردن و زانینگەرایی دەبەستێت.

کۆمەڵگەی ئیسلامی کۆمەڵگەیەکی باوەڕییە و، فرمانبەری گشتی تاکێك لە تاکەکانی ئەم کۆمەڵگەیە و، هەڵدەستێت بە ڕاپەڕاندنی کار بۆ بەرژەوەندیی خودی کۆمەڵگەی، لەبەر ئەمەش سێ ئەرکی لەسەرە:

**ئەرکی یەکەم:** پشکداری لە جێبەجێ کردنی بڕیارەکانی ڕێبازی ئیسلامی بکات، ئەمەش پێویستی بە هەواداری بۆ ڕێبازی ئیسلامی دەبێت نەك بۆ کەسانی فەرمانڕەوا و، هەوادارییەکەی ناچاری دەکات، کە دەستپێشخەریی چاکسازیی لادانە کارگێڕییەکان بکات و، ئاگاداریی کەوتنەوەی هەڵە و کەم و کوڕییەکان بێت و، بۆ هاوهەڵوێستی لەگەڵ بەرپرسان لە ڕێکخراوەی کارگێڕی بۆ چارە کردنی هەڵوێستەکان بەوەی خوا و پەیامبەرەکەی ڕازی بکات، کۆشش بکات.

**ئەرکی دوەم:** ڕاپەڕاندنی کار بە دڵسۆزی و خۆیەکلا کردنەوە و سپاردەیی، هەست بکات بەوەی بەرپرسیارییەکەی بەرانبەر خوایە بەرلەوەی بە بەرپرسیاریی بەرانبەر سەرۆکەکانی بێت، کەواتە فرمان سپاردە و پەیمانە.

**ئەرکی سێیەم:** لە چاکە دا گوێڕایەلیی سەرۆکەکان بکرێت، گوێڕایەلی کردنی بەرپرس پرسێکی پێویستە بۆ ڕێکخستنی ژیان و بەڕێوەچوونی.

**پوختە:** ئەوەی پێشکەشمان کرد پوختی دەکەینەوە: کە تیۆریای بەڕێوەبردن لە ئیسلام گشتگرە و تەواوکارییە و بەمانەی خوارەوە جیا دەکرێتەوە:

١ - پەیوەندیی کارگێڕی و کۆمەڵگە پەیوەندییەکی بەهێزە، هەروەك کارگێڕی سیستمێکی لقییە لە سیستمی گشتگری کۆمەڵگەی ئیسلامی و، پابەندە بە پیرۆزیی بەها ڕەفتاری و باوەڕییەکانی کۆمەڵگەی ئیسلامی.

٢ - تیۆریای بەڕێوەبردن لە ئیسلام دا گرفتی دەسـەڵاتی ڕێکخـراوە چارەسـەر دەکات بەو پێیەی دەسەلاتێکی کۆمەڵەییە، کە تێی دا کارگێریی بلند تەنها نابێت بـێ کارکـەران، بـەڵکو بەشـداری بەرپرسـیارییان دەکـات بـۆ بەدەسـت هێنـانی ئامانجەکانی کارکەران و خاوەن کار بێ ململانێ، چـونکە ئامانجـەکان هاوبـەش و یەکگرتوون.

٣ - تاکی کارکەر لە ڕێکخراوەی کارگێری هەوڵی دڵسۆزی و خۆپارێزی دەدات لە کارەکـەی و بەشـداری لـە وەرگرتنـی بڕیـار دا دەکـات و، پابەنـد دەبێـت بـە گوێڕایـەڵی کردنـی خـاوەن بڕیارەکـانی، مـادەم پـەیڕەوی ڕێبـازی ئیسـلامی و بەرژەوەندیی گشتیی ئیسلامی بکەن.

٤ - سەرکردایەتی لە ئیسـلام دا هـەوڵی بەشـدار کـردن و ئامۆژگـاری کـردن دەدات و، بەڕادەیەکی بەرز لە وەرگرتنی ڕەخنـە لـە پێنـاو بەرژەوەنـدیی گشـتیی ئیسلامی جیا دەکرێتەوە[١٧١]

[١٧١] أحمد إبراهيم أبو سن: الإدارة في الإسلام، ص١٨٢- ١٨٣.

# بەشی سێیەم

## بابەتەکانی بەڕێوەبردنی گشتی و ڕێگەکانی توێژینەوە تیایان دا.

لە خوارەوە دوو بابەتی بەرایی دەخوێنین:

١ - باسەکانی تێخوێندنەوەی زانستی بەڕێوەبردن و، دیارترین دابەش کردنەکان، کە بۆ ئەم باسە دانراوە دەخوێنین، پاشان ئەو پێڕۆیە دیاری دەکەین، کە دەیگرینەبەر لەم بابەتانە دا.

٢ - تێخوێندنەوەی ڕێگەکانی توێژینەوە لە بەڕێوەبردنی گشتی دا.

# توێژبەندی یەکەم

## توێژینەوەکانی زانستی بەڕێوەبردنی گشتی

چەندین بۆچوون لە سۆنگەی دیاری کردنی ئەو باسانەی بەڕێوەبردنی گشتی، کە تێخوێندنەوەکەیان لیٚ پێك دێت، هەن، ئەو دابەش کردنانە جیاوازن، کە زانایان بۆ ڕەگەزەکانی کرداری کارگێری دایانناوە، کە تەوەری تێخوێندنەوەی بەڕێوەبردنی گشتی پێك دەهێنن. هەروەك هەندێکیان چەندین ڕەگەزیان تێکەڵی یەك ڕەگەز کردوە، لە کاتێك دا هەندێکی تریان هەڵستاون بە بەش بەش کردنی تاکە ڕەگەزێك بۆ چەندین ڕەگەز و، هەروەها ئەو ڕیزبەندییەش، کە هەریەکەیان بۆ ڕەگەزەکانی کاری کارگێری دایانناوە، جیاوازە[١٧٢]

هەیانە ڕێکخستنی بە یەکەمی ئەم ڕەگەزانە داناوە، لە کاتێك دا هەندێکی تریان پلان دانانیان لە سەرروی ئەم ڕەگەزانە داناوە.

نموونەی ئەم دابەش کردنانە دەخەینە ڕوو، پاشان ئەو دابەش کردنانەش دیاری دەکەین، کە لە میانەی تێخوێندنەوەکەمان بۆ تاوتویٚ کردنی بەڕێوەبردنی گشتی پەیڕەویی دەکەین.

### یەکەم: دابەش کردنی هێنری فایۆڵ بۆ کرداری کارگێری

پێشتر ئاماژەمان بەو شەش فرمانە دا، کە فایۆڵ دیاریی کردبوون، کە سەرجەم کردارەکانی پەیوەندیدار بە بەگەڕخستنی هەر پڕۆژەیەك دەگرێتەخۆ. هەروەك فایۆڵ هەڵستاوە بە خستنەڕویەکی خێرای فرمانە سەرەتاییەکان، پاشان تێخوێندنەوەکەی بۆ فرمانە کارگێرییەکان تەرخان کردوە و، ڕەگەزەکانی ئەمەی دوایی بۆ پێنج

---

[١٧٢] عبد الغني بسيوني عبد الله: إصول علم الإدارة العامة، ص١٠٧.

ڕەگەزی سەرەکی دابەش کردوە، کە ئەمانەن: پلان دانان – ڕێکخستن – ئاراستە کردن – هەماهەنگی – چاودێری.

پاش ئەمە فایۆڵ هەڵستاوە بە راڤە کردنی چەمکی هەر ڕەگەزێك لەو ڕەگەزانە و ناوەڕۆکیان و، ئەو مەرجانەشی، کە پێویستە برەخسێندرێن بۆ ئەوەی لە کرداری کارگێری دا هەر ڕەگەزێك ڕۆلی خۆی بە سەرکەوتوویی بگێرێت.

بۆ نموونە فایۆڵ سەبارەت بە پلان دانان ڕوونی کردوەتەوە، کە کردەی پلان دانان، دانانی بەرنامەی کارە، پاش ئەمە بەرنامەی کاری تازەی دیاری کردوە و، مەرجە پێویستەکانی دانانی بەرنامەیەکی باشی بۆ کار کردن لەسەر ئاستی پلانی پرۆژە پشەسازییەکان و لەسەر ئاستی پلانی گشتیی نەتەوەیی، ڕوون کردوەتەوە.

ئەم دابەش کردنەش بە بنچینەی سەرجەم دابەش کردنەکانی، کە دواتر دانران گوزارشت دەکرێت[١٧٣]

## دوەم: دابەش کردنی لۆتەر جۆلیك بۆ باسەکانی بەڕێوەبردنی گشتی

لۆتەرجۆلێك ئەو ڕەگەزانەی، کە تێخوێندنەوەی بەڕێوەبردنی گشتی لێ پێك دێت، بۆ ئەمانەی خوارەوە دابەش کردوە: پلان دانان – ڕێکخستن – فرماندار کردن – ئاراستە کردن – هەماهەنگی – ڕاپۆرتەکان – بودجە[١٧٤]

## سێیەم: دابەش کردنی ئیسلامی

ئەو پرسیارەی لە زەین دا دروست دەبێت لە بارەی خستنەڕوومان لەم ناونیشانە (واتە دابەش کردنی ئیسلامی) ئەمەیە: ئایا دابەش کردنێکی ئیسلامی بۆ کرداری کارگێری و باسەکانی بەڕێوەبردنی گشتی هەیە؟

---

[١٧٣] عبد الغني بسيوني عبد الله: أصول علم الإدارة العامة، ص١٠٧.

[١٧٤] .عبد الغني بسيوني عبد الله: أصول علم الإدارة العامة، ص١٠٩

گومان لەوە دا نییە ئەگەر کارگێڕیی گشتیی ئیسلامی هەبێت، ئەوا هەڵبەت ئەم کارگێڕییە گشتییە ئیسلامییە، نموونەی ئەم جۆرە دابەش کردنەی هەیە، ئەگەر چی بەشێوەیەکی لەخۆگرتوویی بێت، بۆیەش هەوڵ دەدەین لە خوارەوە دا، دەست بخەینە ئەم دابەش کردنە، لە میانەی پیادە کردنی کارگێڕیی گشتیی ئیسلامی، پێشمان وایە، کە باسی ئەم پرسە بۆ سەردەمی عومەری کوڕی خەتاب خوا لێی ڕازی بێت، بگێڕینەوە.

لەمیانەی بەدواداچوونی پێڕۆی سەرکردەی کارگێر عومەر خوا لێی ڕازی بێت لە پیادە کردنی کارگێڕیی گشتی دا، بۆمان ڕوون دەبێتەوە، کە کرداری کارگێڕی بەو شێوەیەی خوارەوە دابەش کراوە: پلان دانان – ڕێکخستن – سەرکردایەتیی کارگێڕی و وەرگرتنی بڕیار – هەماهەنگی و پەیوەندیکاری – چاودێری.

ئەم دابەش کردنە ئەگەر بەم شێوەیە ڕوونەش دەرنەخرابێت، بەڵام ئێمە دەیگرینە دەست لەو پیادە کردنەی، کە سەرکردەی کارگێڕ عومەری کوڕی خەتاب خوا لێی ڕازی بێت پێی هەڵتساوە، لەم تێخوێندنەوەیە دا هەوڵ دەدەین، کە دابەش کردنی ناوبراو لە مۆڵگەکەی دەربخەین، نەك هەوڵ دان بۆ دانانی دابەش کردنێك، کە دروست کراو بێت.

پلان دانانی ئیسلامی شێوازێکی کاری کۆمەڵەییە، کە عومەری کوڕی خەتاب خوا لێی ڕازی بێت بۆ ڕووبەڕوو بوونەوەی پێشبینییە ئایندەییەکان کاری پێ کردوە، بە پشت بەستن بە پێڕۆیەکی هزری و باوەڕ بوون ویست و پەنا گرتن بە خوا و، بۆ بەدەست هێنانی ئامانجە ئایینییەکان، کە پەرستنی خوا و ئاوەدان کردنەوەی بوونە، کۆشش بکات.

ڕێکخستنیش بنیاتێکی ڕێکخستنیی پیادە کراوە لە وڵاتی ئیسلامی و، لەسەر پەرتووکی خوا و سوننەتی پەیامبەر ﷺ دامەزراوە، کە ئاواتی بەدەست هێنانی ئامانجێکی ڕەوایە لە سایەی ڕەوشێکی مرۆیی.

ئەوەندە بەسە، کە عومەری کوڕی خەتاب خوا لێی ڕازی بێت یەکەم کەس بوە تۆماری دیوانی کردوە و، وڵاتی بۆ ویلایەت گەلێك دابەش کردوە و، شاری لە

دەرەوەی دوورگەی عەرەبی دروست کردوە و زۆرێك لە پرۆژەی ئاوەدان کردنەوەی ئەنجام داوە[١٧٥]

سەبارەت بە سەرکردایەتیی کارگێری و وەرگرتنی بڕیاریش، ئەوا بلیمەتیی ڕاستەقینەی عومەر خوا لێی ڕازی بێت، لە بواری سەرکردایەتیی کارگێری و وەرگرتنی بڕیار دا، دەرکەوت، باشترین نموونەش لەسەر ئەمە هەڵوێستی عومەر بوو لە پرسی جێنشینی و هەڵستانی بە دەستنیشان کردنی والییەکان.

سەبارەت بە هەماهەنگی و پەیوەندیکاریش، ئەوا عومەر خوا لێی ڕازی بێت بەوە ناوبانگی دەرکردوە، کە کارێکی بێ ڕاوێژی موسوڵمانان نەدەبڕاندەوە و، یەکەم ئەو بڕیارە گەورەیەشی، کە لە ئەنجامی ڕاوێژ کردن دەرچوو، پەیوەندیی بە بنەمایەکی گرنگ هەیە، کە لە دوایی دا بوە جێی پەیڕەوی کردن، ئەویش، ئایا جێنشین بەسەرۆکایەتیی سوپا بۆ جەنگ بچێت، هەروەك لە ڕۆژگاری پێشوو دا شا و میرەکان دەیان کرد، یا لە پایتەختی وڵات دا بمێنێتەوە و، سوپاکان یەك لە دوای یەك ڕەوانە بکات.

هەروەك عومەر خوا لێی ڕازی بێت دوای ڕاوێژێکی دوور و درێژ گەیشتە ڕێسایەکی هاوچەرخ، ئەم ڕێسایەش بڕیار دەدات، کە سەرۆکی وڵات سەرکردایەتیی کردەنیی سوپا ناگرێتە ئەستۆ، بەڵکو بۆ شارەزایەکی جێ دەهێڵێت، بۆ ئەوەی ڕەنجی خۆی لە وێنا کردنی سیاسەتی بڵند و ئامادە کردنی وڵات بۆ شەڕ لە کاتی جەنگ دا تەرخان بکات.

ئەگەر ئەم ڕێسایە لەدایکبووی هەماهەنگییەك و پەیوەندیکارییەك و ڕاوێژێکی کراوە نەبێت، چۆن عومەری کوڕی خەتاب خوا لێی ڕازی بێت دەیتوانی هەموو ئەم سووپایانە، لەم ماوە کاتییە کورتە دا بە ئاسیا و ئەفەریقا بگەیەنێت و، ئەو سەرکەوتنانە بەدەست بهێنێت، کە پێشتر بە دەرئاسا گوزارشت دەکران[١٧٦]

---

[١٧٥] سليمان الطماوي: عمر بن الخطاب وأصول السياسة والإدارة الحديثة، ص٣٠٦.

[١٧٦] سليمان الطماوي: عمر بن الخطاب وأصول السياسة والإدارة الحديثة، ص١٣٣- ومايليها.

ئەوەشی پەیوەندیدارە بە چاودێری، ئەوا پێشتر ئاماژەمان پێ دا، کە عومەری کوڕی خەتاب خوا لێی ڕازی بێت، تەنها بە دەستنیشان کردنێکی باشی فرمانبەرانی ڕازی نەدەبوو، بەڵکو شێوازی کار کردن و ئەو ڕێسایانەشی بۆ دیاری دەکردن، بۆ ئەوەی لە دوایی دا ببێت بە بنەمایەك بۆ لێپێچینەوەیان، ئەمەش پێڕۆیەکی ئیسلامیی سوونەتی پەیامبەرە ﷺ، هەروەك والییەکانی و کارگەرانی لەسەر بنەمای لێهاتوویی و بەگوێرەی ئەو کارەی دەیانگرتە ئەستۆ، دیاری دەکرد و، بەردەوام بە ئامۆژگاری باربۆی دەکردن و بەردەوام چاودێریی بەسەر دا دەکردن و، کارەکانیانی دەردەخست و دەیپشکنی و بەدوای هەواڵیان دا دەچوو، هەریەکێکیان خراپ بوایە لە کار دا لای دەبرد.

هەروەها لێیەوە گێڕدراوەتەوە دوورود و سەلامی خوای لەسەر بێت، کە عەلائی کوڕی حەزرەمیی لە کار لادا، کە لە بەحرەین کار بەدەست بوو لەبەر سکاڵای شاندی عەبدول قەیس و، لەسەر ئەو زەکات و شتانەشی کۆیان دەکردەوە لێپێچینەوەی لەگەڵ کارگەرانی دا دەکرد لەوەی خەرجیان دەکرد، هەروەك یەکێك لە کارکەرانی بەوەی کۆی کرد بووەوە هات و گوتی: "ئەمە بۆ ئێوە، ئەمەش دیارییە بۆ من، جا پەیامبەر ﷺ تووڕە بوو و، هەڵستایەوە بۆ وتار دان بۆ خەڵکی و لۆمەی لەم جۆرە کردەوەیەی کرد، ئەمەش بنەمای ئەو ڕێسا یاساییەیە، کە سەرجەم یاسا دانراوییەکان لەخۆیان گرتوە، کە دیاری بۆ فەرمانڕەوا جۆرێکە لە بەرتیل.

بە پشت بەستن بەمەی پێشکەشمان کرد، دەبێت تێخوێندنەوەی کرداری کارگێری بە گوێرەی دابەش کردنێکی شیاو بگرینە ئەستۆ، بەڵام بەر لە دەست کردن بەم تێخوێندنەوەیە پێمان وایە، کە دەبێت ڕێگەکانی توێژینەوەی بەڕێوەبردنی گشتی بخەینەڕوو.

# تویژبەندی دووەم

## ڕێگەکانی تویژینەوە لە بەڕێوەبردنی گشتی

پێویستە لەسەرمان روونی بکەینەوە، کە ناوەڕۆکی پێڕۆی زانستی لە یەك تویژینەوە دایە و گشتییە، واتا گشتگرە بۆ هەموو لقەکانی زانستە سروشتی و کۆمەلآیەتییەکان و، ئەم پێڕۆیەش لەسەر تێبینی و ئەزموون و هەلێنجانی ئەو ئەنجامانەی، کە پاشان دەگۆڕێن بۆ بنەما گەلێکی گشتی، بەسەر سەرجەم بارە پێك چوەکان پیادە دەبێت. هەنگاوەکانی ئەم پێڕۆیەش بۆ دوو قۆناغ دابەش دەبێت.

**قۆناغی یەکەم**: قۆناغی تێبینی و پەی پێ بردنە، واتا بە شێوەیەکی ورد تێبینیی ڕەگەزەکانی دیاردەکە، بابەتی تویژینەوەکە و، شیکاری هەر بەشێکی پێك هاتوو بۆی و، باس کردنی پەیوەندیی نێوان ڕەگەز و بەشەکانی ئەو دیاردەیە.

**قۆناغی دووەم**: بریتییە لە تێگەیشتنی دیاردەکە و پوخت کردنی ئەنجامەکان و دانانی لە دارشتەی ڕێسا و بنەما گشتییەکان. واتا گشتاندنی ئەم ئەنجامانە.

پێڕۆی زانستی هەمان سروشت و ناوەڕۆکی هەیە و، لەم نیارەوە لە زانستێکەوە بۆ زانستێکی تر جیاوازیی نییە، بەلآم ڕێگە یا ئامرازە هونەرییەکان بە پێی بابەت دەگۆڕێت، واتا هەر زانستێك لە زانستەکان ڕێگە گەلێکی تویژینەوەی تایبەت بەو بابەتانەی خۆی هەیە، لەگەلّ زانستەکانی تر کۆکە یا جیاوازە[١٧٧]

ئەوەی پەیوەندیداریشە بە بەڕێوەبردنی گشتی، ئەوا هەلّبەت وەك زانستێکی کۆمەلآیەتی لەگەلّ زانستە کۆمەلآیەتییەکان لە هەندێك ئامرازی تویژینەوە دا

---

[١٧٧] عبد الغني بسيوني عبد الله: أصول علم الإدارة العامة، ص١١١.

بەشدار دەبن، بەڵام پێویست نییە هاوتایی تەواو لەسەرجەم ڕێگەکانی توێژینـەوەی ئەو زانستانە دا هەبێت، چونکە هەر زانستێك مەیدانی توێژینەوەی تایبەت بەخۆی هەیە و، بوارەکانی تێخوێندنەوەکەی خودییە.

## هەڵوێستی ئیسلام لە ڕێگەکانی توێژینەوە:

لە تێخوێندنەوە ئەکادیمییەکانی لەم سۆنگەوە بۆ مان ڕوون دەبێتەوە، کە پێڕۆی زانستی لە لایەن زانایانی مووسوڵمانەوە تـەواوکارە، کـە دەستپێشـخەر بـوون بـۆ تێگەیشتنی ئەم ڕێگە زانستییە.

لەسەرینی ئەمەش لـە مەیـدانی بـەڕێوەبردنی گشـتی دا وا باشـە بەرنامـەی توێژینـەوەی زانسـتی لەسـەر دیـاردە و گرفتـە پەیوەندیـدارەکان بـەڕێکخراوە کارگێڕییەکان پیادەی بکەین، بە جۆرە جیاوازەکانیان و، بـە بەکارخسـتنی ئـەوەی لەگەڵ بابەتە کارگێڕییەکان لە ڕێگە و شێوازی توێژینەوە بسازێت.

لە میانەی توێژینەوەکەمان لە بەڕێوەبردنی گشتی دا ئەم ڕێگەیانـەی خـوارەوە دەخوێنین.

## یەکەم: پشکنینی بەڵگەنامە ڕەسمییەکان

بەڵگەنامە ڕەسمییەکان ئەو بڕیـارە وەزاری و ئامـاری و ڕوون کـراوە ڕەسمییانـە لەخۆ دەگرێت، کە لە دەستگەی بەرپرسی وڵات دەردەچن.

هەروەها بەڵگەنامە ڕەسمییەکان بڕیارە دادوەرییـەکانیش دەگرێتـەوە، چـونکە بەڵگەنامەی گرنگن بۆ توێـژەر لـە لایـەنی یاسـایی لـە بـەڕێوەبردنی گشـتی دا، هەرەوها ئەو ڕایانەش لەخۆ دەگرێت، کە لە دەستە ڕاوێژکارییەکان دەردەچـن، بـە پشت بەستن بە داواکاریی یەکە کارگێڕییە جیاجیاکانی دەستگەی کـارگێڕیی وڵات لە پرسە یاساییەکان.

هەروەك کۆنووسـی دانیشـتنەکان، بەڵگەنامـە گـەلێکی گـرنگ و تایبـەتن، مەبەست لێیان کۆنووسی دانیشتنەکانی ئەنجوومەنی ڕاوێژ و ئەنجوومەنی نوێنـەران

و لیژنـەکانی و، کۆنووسـی دانیشـتەکانی ئەنجوومـەنی وەزیـران و ئەنجوومەنـە خۆجێیێیەکانە.

هەروەك توێژەر سوود لە چاو خشاندنەوە بەو بڕیارە جیاجیایانەش دەبینێت، کە وەزارەت و فەرمانگـە فـرە لقـەکان لـە سـەرجەم پرسـە کـارگێری و ئـابووری و کۆمەڵایەتییەکانی پەیوەندیدار بە دەستگەی کـارگێریی وڵات، ئامـادەی دەکـەن، هەروەها توێژەر سوود لە نۆڕینی بڵاوکراوە ناوخۆیی و گرێ بەستە کارگێرییـەکانی فەرمانگە میرییەکانیش دەبینێت[١٧٨]

## دوەم: تێخوێندنەوەی سەرچاوە زانستییەکان

سەرچاوە زانستی و پەرتووك و توێژینەوە تایبەتەکان لە بەڕێوەبردنی گشتی دا، گوزارشتن لە سەرچـاوەی بنـەڕەتیی هـەر کەسـێك، کـە توێژینـەوەی بابـەتێك لـە بابەتەکانی بەڕێوەبردنی گشتی دەکات، لـەم بـوارەوە دا دەبیـنین، کـە پـەرتووك و توێژینەوەکانی زانایانی بەڕێوەبردنی گشتی، لە ویلایەتە یەکگرتوەکانی ئەمـەریکا و فەرەنسا و میسر شوێنی دەرچوونی سەرجەم ئەم سەرچاوانە لـە سـەردەمی نـوێ دا، دەگرنەوە.

سەبارەت بە سەرچاوە ئیسلامییەکانیش، ئـەوا کردەکـە ئەسـتەمتر لـەوەی لـە سەرچاوە بیانییەکان دا هەیە، چونکە لەسەر توێژەرە، کە یەکەم جار تێخوێندنەوەی مێژوی ئیسلامی بکات، پاشان تیۆریا و پەراوێزەکانی لێ دەربکـات، پـاش ئەمـە لەسەریەتی لەگەڵ سەرچاوە هاوچەرخەکان دا بـەراوردیان بکـات و، لـە دوایـش دا ئەنجامەکانی پوخت بکات.

---

[١٧٨] عبد الغني بسيوني عبد الله: أصول علم الإدارة العامة، ص١١٢.

## سێیەم: تێخوێندنەوەی ڕەوش و ڕاپرسییەکان

ئەم شێوازە پشت بە چڕ بوونەوەی توێژینەوە و تێخوێندنەوەکان لە تەنها بارێکی دیاری کراو دەبەستێت، وەك باری دابەزینی بەرهەمی یەکێك لە کارکەران لە ماوەیەکی کاتیی دیاری کراو و جگە لە باری تریش، هەروەك بارەکە لەبەردەم ئەو توێژەرە دادەنرێت، کە تێخوێندنەوەکەی دەگرێتە ئەستۆ و ڕای خۆیی لە سۆنگەیەوە دەدات و، خستنەڕووی چارەسەری گەلێکی جیاجیا، کە پێی باشە بۆ چارە کردنی بارەکە، هەموو ئەمانەش لە پێناوی گەیشتنە بە چارەسەر[١٧٩]

بەڵام سەبارەت بە ڕاپرسی، ئەوا لەسەر بنەمای پێشکەش کردنی نموونەی پرسیاری دیاری کراو بۆ ژمارەیەك کارکەر لە کارگێرییە جیاجیاکان دا ئەنجام دەدرێت، بۆ ڕاپرسی و وەرگرتنی دید و بۆچوونیان لە سۆنگەی گرفتێك لەو گرفتانەی سەرقالیان دەکات، یا سیستمێك لە سیستمە کارگێرییەکان، کە پێشنیاری پیادە کردنی کراوە و، دانی ڕایان لەبارەی ئەو کارانەی ڕایدەپەڕێنن و، جگە لە پرسە پەیوەندیدارەکانی بە کاری کارگێڕی.

پاش ئەمە، توێژەر هەڵدەستێت بە ڕیزبەند کردنی ئەم نموونە و کلێشانە و هەماهەنگ کردنیان و، پوخت کردنی ئاراستەی ڕایە تۆمارکراوەکانی تێی دان، بۆ دەرکردنی ئەنجام گەلێك لە سۆنگەی پرسی بابەتی توێژینەوە و، ڕێژەی سەدی بۆ داکۆکیکەران و بەرهەڵستکەران یا بێ لایەنان دیاری دەکات، هەروەها لەگەڵ دیاری کردنی ڕێژەی سەدی بۆ ئەو هۆکارانەی، کە هانی هەریەك لەو کەسانەی داوە، بۆ وەرگرتنی ئەو هەڵوێستەی، کە تۆماریان کردوە.

لە کۆتاییش دا توێژەر دەتوانێت ئاراستەی گشتیی ئەوانەی، کە ڕایان تۆمار کراوە بەرانبەر گرفتەکە یا ئەو پرسەی، کە خراوەتە بەردەمیان دیاری بکات،

---

[١٧٩] عبد الغني بسيوني عبد الله: أصول علم الإدارة العامة، ص١١٤

هەروەها سوود لەو هۆکارانەش ببینێت، کە بەرهەڵستکەران باسیان کردوە لە پێشنیاری چەند هەموار کردنێك.[١٨٠]

## چارەم: تێخوێندنەوەی مەیدانی و پەیوەندی کردنی کەسی

سەردانی مەیدانی لە بینینی ڕەوشی کارگێری و، تێبینی کردنی بەڕێوەچوونی کار لە ڕێکخراوە کارگێرییەکان لە هەڵ و مەرجی کردەنی دا، کردەیەکی بنەڕەتییە، چونکە توێژەر هەڵدەستێت بە تێبینی کردنی دیاردە کارگێرییەکان لە شوێن و ژینگەکەی دا، وەك خۆیشی ئەو شێواز و ڕێوشوێنانە دەبینێت، کە بە کردەنی پیادە دەکرێت

ئەم سەردانە مەیدانییەش بەدواداچوونی پەیوەندییە کەسییەکان و بە بەرپرسان و دیداری کارگێران دەکات، بۆ ئەوەی توێژەر ئەو زانیاری و ڕوونکردنەوە و ڕاڤە کراوانەی دەست بکەوێت، کە دەیەوێت و، پەیوەندیدارە بە ڕێکخراوەی کارگێری و، ڕێکخستنیان و ڕێگەی کارکردن و ڕەوشی کارکەران تێیان دا، جگە لەو پرسانەی تریش، کە پەیوەندیدارن بە توێژەری کارگێڕ.

هەروەها سوود لەوە دایە، کە پەیوەندی بە کەرتی فراوانی کارکەران بکرێت بۆ ئاشنا بوونی گرفت و ڕایان لە کارەکانیان و مەودای سازانیان لەگەڵ سەرۆکەکانیان و، ئەو ئاستەنگییانەی لە پەیوەندی کردن پێیانەوە تووشی دەبن، ئایا گوێ بۆ دیدو بۆچوونیان دەگرن، تا چ ڕادەیەکیش پەیوەندیی مرۆیی لە ناوەوەی ئەم ڕێکخراوە دا ڕەخساوە.

توێژەر لە میانەی بە وردی و نیانی شی کردنەوەی و، ئەم پەیوەندییانەش ئەنجام بدات، لەگەڵ تێگەیشتنی لە باری دەروونی و کۆمەڵایەتیی ئەوانەی پەیوەندییان پێوە دەکات، بە ئەنجام گەلێکی ورد دەگات، کە بە بابەتی دەناسرێن[١٨١]

---

[١٨٠] عبد الغني بسيوني عبد الله: أصول علم الإدارة العامة، ص١١٥.

[١٨١] ماجد الحلو: علم الإدارة العامة، ص٥٦.

لە کۆتاییش دا دەبێت ئاماژە بە ئەوە بکەین، کە سەرجەم ڕێگەکانی توێژینەوە، کە پێشتر باسمان کرد ، هەرگیز ناکۆك نین بەڵکو تەواوکەرن، واتا تەواوکەری یەکترن، هەندێکیان کەم و کورتی لەو زانیاریانەی، کە ڕێگەکانی تر نەیانتوانیوە دەستیان بکەوێت، تەواو دەکەن، جا توێژەر لە بەڕێوەبردنی گشتی دا پەنا بۆ هەموو ئەو ڕێگەیانە دەبات، کە باسمان کرد، ڕەنگە پشت بەستن بە هەندێکیان بەس بێت، ئەگەر بینی لە توێژینەوەکەی دا بە ئەنجام گەلێکی بابەتیی یەکلاکەرەوە گەیشتوە.[١٨٢]

ئێستاش دوای ئەوەی بەندی بەراییمان تەواو کرد، وا باشە بکەوینەخۆ بۆ ورد بوونەوە لە پرسی بابەتی کردارە کارگێڕییەکان.

ئەو ڕێگەیانەشی، کە پەیڕەویی دەکەین لە تێخوێندنەوەی بابەتی کرداری کارگێری هەمان ئەو ڕێگەیە، کە پێشتر لە میانەی بەندی بەرایی دا گرتمانەبەر، کە لەهەر قۆناغێکیش لە قۆناغەکانی کرداری کارگێری، جۆرە باوەکەی سیستمی دانراوی دەخەینە ڕوو، پاشان ئەوەی لە سیستمی کارگێریی ئیسلامی دا بەرانبەر لەگەڵی دەخەینە ڕوو، لەگەڵ پوختە کردنی ئەوەی دەتوانرێت لە ئەنجامەکان لە ڕۆشنایی توێژینەوە بەراوردییەکە.

---

[١٨٢] عبد الغني بسيوني عبد الله: أصول علم الإدارة العامة، ص١١٦.

## کرداری کارگێڕی

**ئەم ئەم تێخوێندنەوەیە بۆ پێنج بەند دابەش دەکەین، کە بریتین لە ڕەگەزە سەرکییەکانی کرداری کارگێڕی**

بەندی یەکەم: پلان دانان.

بەندی دوەم: ڕێکخستن.

بەندی سێیەم: سەرکردایەتیی کارگێڕی و وەرگرتنی بڕیار.

بەندی چارەم: هەماهەنگی و پەیوەندیکاری.

بەندی پێنجەم: چاودێری بەسەر کارگێڕیی گشتی.

# بەندی یەکەم

# پلان دانان

## بەرایی

بەکارهێنانی زاراوەی پلان دانان لەسەردەمی نوێ دا سەری هەڵداوە، بەکارهێنانی لە چارچێوەیەکی فراوان دا دەستی پێ کرد، بە دەستپێکی لە بواری کەسی و خێزانی و، دواتر گەیشت بە پلان دانان بۆ ئاستی تەواوی ولاَت، بە تێپەڕبوون بە ڕێکخراوە و هاوبەشگە و دەستگەکان و، هی تر لەو چالاکییانەی، کە جەخت لەسەر بەدەست هێنانی ئامانجێکی دیار دەکەنەوە.

هەروەها پلان دانان بنکەی یەکەمی لە نێوان ڕەگەزەکانی کرداری کارگێری دا گرتوە، بەهۆی چەمك و پێکهاتەکەی، هەروەك وێنای هێلکارییە گەورەکانی ئاینده لە ڕێگای دیاری کردنی ئامانجەکانی ڕێکخراوەی کارگێری دەبێت، پاشان دەستەبەر کردنی ئامرازەکانی بەدەست هێنانی ئەو ئامانجانە بە هەنگاو گەلێکی شیاو و هەماهەنگکاری، بە بەکارخستنی توانستە کەرەستەیی و مرۆییە فەراهەمەکان، لە دواییش دا لە بەدواداچوون و چاودێریی ئەوەی بەدەست دێت لە پلانەکە و ئەوەی لێیەوە دەمێنێتەوە، بۆ هەڵسەنگاندنی مەودای سەرکەوتن یا ڕوە کەم و کوڕییەکان لەو بەدەستهاتوانە.

بێ پلان دانانێکی ساخیش چالاکیی کارگێری دەبێتە کارێکی هەڕەمەکی و لۆژلۆژ و بێ هەنگاوی ڕێك لە ڕێ کردنی ڕێکخراوە بە ئاراستەی خۆی، کە دەبێتە هۆی پشێوی و ئاشووب لە کار کردن دا، ئەمەش لەگەڵ ئەو گیانی سەردەمی

خێرایی و پێشکەوتن و هەلّپەی ئەو ئامانجانە دا ناگۆنجێت، کە گەلان پەرۆشینە، بۆیە پلان دانان بوەتە نیارێکی پێویست بۆ هەر ڕێکخراوەکی کارگێڕی و، دروشمێکی سیاسیی بۆ زۆرێك لە ولآتانی جیهان.

پلان دانانیش لە میانەی سێ بەشی یەك دوای یەك دەخوێنین:

بەشی یەکەم: پەیوەندیدارە بە تاوتوێ کردنی ئەو بنەمایانەی، کە پلان دانان و جۆرەکانی لەسەر دادەمەزرێت.

بەشی دوەم: تایبەت دەکەین بە تێخوێندنەوەی پلان دانان لە ئیسلام دا.

بەشی سێیەم: نموونەکانی پلان دانانی ئیسلامی.

# بەشی یەکەم

## بنەماکانی پلان دانان و جۆرەکانی

هێنری فایۆڵ پلان دانان پێناسە دەکات بەوەی:"هەواڵزانییە بە ئایندە و ئامادەسازییە بۆی"[١٨٣]

هەڵبەت چەندین پێناسە بۆ پلان دانان دانراون، کە هەمویان لە دەوری ئەم مانایە دا دەخولێنەوە، مەگەر ئەو داڕشتنانەی، کە پێناسەکانی پێوە کراوە.

لەم پێناساناەش، ئەوەی دکتۆر سلێمان تەماوی دیاری کردوە بەوەی: "پلان دانان لە فراوانترین ماناکانی دا، مانای ئەو تەگبیرەیە، کە بۆ ڕوویەڕوو بوونەوەی ئایندە دەکرێت بۆ پلان گەلێکی پێشتر ڕێکخستراو، بۆ بەدەست هێنانی ئامانجە دیاری کراوەکان"[١٨٤]

دکتۆر ماجد حەلو پێناسەی دەکات بەوەی: "دانانی بەرنامەیەکی ئایندەییە بۆ بەدەست هێنانی ئامانجە دیار کراوەکان، لە ڕێگەی گلدانەوەی تواناکان و تەرخان کردنیان بۆ دانانی ئەم ئامانجانە بۆ جێبەجێ کردنیان لە میانەی ماوەی دیاری کراودا"[١٨٥]

دکتۆر ڕەفعەت موحەمەد عەبدول وەهابیش پێناسەی کردوە بەوەی: "کردارێکی تێخوێندنەوەی ئایندەیە، لە پێناو گەیشتن بە ئامانجە دیاری کراوەکان لەگەڵ دانانی ڕیزبەندی و ڕێوشوێن گەلێکی پێویست بۆ بەدەست هێنانی ئەم ئامانجانە"[١٨٦]

دکتۆر عەبدول غەنی بەسیۆنیش پێناسەی کردوە بەوەی: "دیاری کردنی

---

[١٨٣] هنري فايول: الإدارة الصناعية والعامة، ص٤٨.

[١٨٤] سليمان الطماوي: مبادئ علم الإدارة العامة، ص١٦١.

[١٨٥] ماجد الحلو: علم الإدارة العامة، ص١٣١.

[١٨٦] محمد رفعت عبد الوهاب: الإدارة العامة، ص١٠٧.

ئامانجە ئایندەییەکان و دەستەبەر کردنی ئامرازەکانی بەدەست هێنانیانە لە ماوەیەکی کاتیی دیاری کراو دا"[١٨٧]

کەواتە چەمکی پلان دانان، سێ ڕەگەزی سەرەکی لەخۆدەگرێت:

١) دیاری کردنی ئامانجەکان.

٢) دەستەبەر کردنی ئامرازەکان.

٣) دیاری کردنی ماوەی جێبەجێ کردن.

دیاری کردنی ئامانجەکانیش لە ڕێکخراوەکەوە بۆ یەکێکی تر جیاوازە، بە گوێرەی جۆری ئەو چالاکییەی هەر ڕێکخراوەك پیادەی دەکات و، ئەو ئامانجانەش جیاوازن بەگوێرەی سیستمی هەر ولاّتێك و مەودای هەلّپەی گەلەکەی و، بڕی ئەو توانایە کەرەستەیی و مرۆییانەی هەیەتی بۆ بەدەست هێنانی ئەم ئامانجانە.

سەبارەت بە ئامرازەکانی ئەم ئامانجانەش، ئەوا دەبێت لەگەلّ سروشت و پێداویستییەکانی ئامانجەکان بسازێت و، لەگەلّ زنجیرە کاتییەکەی جێبەجێ کردنی پلانەکە هەماهەنگ بێت.

گومانیش لەوە دا نییە، کە ڕەخساندنی ئەم مەرجانە لە ئامرازەکان، پشت بە تێخوێندنەوەیەکی وردی پێشهاتە هەنووکەییەکان و، دەست بەسەرداگرتنی توانایە فەراهەمەکان و توانای بەکارهێنانیان لە ئایندە دا دەبەستێت.

سەبارەت بە ماوەی پلان دانانیش، ئەوا ئەم پرسە دەوەستێتە سەر مەودای ئەو ماوە کاتییەی، کە گەرەکە لەمیانەی دا پلانەکە جێبەجێ بکرێت، هەروەك پلانی درێژخایەن و، پلانی مام ناوەند و، پلانی کورت خایەنیش هەیە[١٨٨]

بۆ ئەمەش ئەم بەشە بۆ دوو توێژبەند دابەش دەکەین:

توێژبەندی یەکەم: تێی دا تاوتوێی ئەو بنەمایانە دەکەین، کە پلان دانانی لەسەر دادەمەزرێت.

توێژبەندی دوەم: جۆرە جیاجیاکانی پلان دانان.

---

[١٨٧] عبد الغني بسيوني عبد الله: أصول علم الإدارة العامة، ص ١٢٣.

[١٨٨] عبد الغني بسيوني عبد الله: أصول علم الإدارة العامة، ص١٢٤.

# توێژبەندی یەکەم

## بنەماکانی پلان دانان

پلان دانان بە چەند قۆناغێك دا تێپەڕ دەبێت، بە قۆناغی پلان و پاشان پەسەند کردنی دەست پێ دەکات و، پاش ئەمەش قۆناغی جێبەجێ کردنی دێت، لە کۆتاییش دا قۆناغی بەدواداچوون و هەڵسەنگاندنی دێت[189]

سەرنجە بنەڕەتییەکانی پلان دانان لە ماوەی قۆناغی ئامادەکردنی دا دەوران دەکات، چونکە وێنای نەخشەسازییە خراوەڕوەکانی پلان بە ئامانج و ماوەی جێبەجێ کردنی و ئەو کەرەستە کەمایەکی و مرۆییانەی، کە پێویستی دەبێت و، ئەو ڕوون کراوە و ئامارانەی، کە پشتیان پێ دەبەستێت، دەکرێت.

لە قۆناغی ئامادە کردنیش دا، پرسی بەشدار کردنی ئەو کەرتە کارگێری و هونەرییانە زەق دەبێتەوە، کە هەڵدەستن بە جێبەجێ کردن، لە ڕێگای دیاری کردنی بیرو بۆچوونەکانیان و، پێشکەش کردنی تێبینی و پێشنیارەکانیان، ئەمەش مۆرکێکی دیموکراتی بە پلان دانان دەبەخشێت و، هەست کردن بە بەرپرسیاری لای ئەو یەکە کارگێرییە جیاجیایانە بوونی دەبێت، کە جێبەجێ کردنی پلانەکە دەگرنە ئەستۆ.

بۆ سەکەوتنی پلانیش دەبێت لەسەر چەندین بنەما و کۆڵەگەی زانستیی بنەڕەتی دابمەزرێت، کە دەتوانین بۆ ئەم بنەمایانەی خوارەوەی بگێڕینەوە[190]:

١) دیاری کردنی ئامانجەکان.

٢) دەستەبەر کردنی ئەو توانا کەرەستەیی و مرۆییانەی پلانەکە پشتیان پێ دەبەستێت.

٣) دیاری کردنی ماوەی کاتیی پێویست بۆ جێبەجێ کردنی پلانەکە.

---

[189] عبد الكريم درويش وليلى تكلا: أصول الإدارة العامة، ص٢٣.

[190] عبد الغني بسيوني عبد الله: أصول علم الإدارة العامة، ص١٢٥.

٤) یەکێتیی پلان.
٥) ناوەندییەتیی دانانی پلان.
٦) پابەند بوون بە پلان.
٧) نیانیی پلان.
٨) چاودێریی جێبەجێ کردنی پلانەکە و هەڵسەنگاندنی ئەنجامەکانی.

## یەکەم: دیاری کردنی ئامانجەکان

پێویستە پلان دانان بەدەست هێنانی ئامانجێك لەخۆبگرێت، هەروەك ناکرێت وێنای پلان دانان بکرێت بێ ئامانج و، ئامانجیش ئەو مەبەستەیە، کە گەرەکە لە میانەی پابەند بوون بە پلانەکە بەدەست بهێنرێت [191]

دەشبێت ئامانج یا ئامانجەکانی پلان ڕوون و بە وردی دیاری کراو بێت بۆ ئەوەی بوار بۆ هیچ شارەوایی و شپرزەییەك لە تێگەیشتن یا لێك دانەوە نەهێڵێتەوە [192]

ئامانجەکانیش لە ڕووی ماوەکانیان بۆ ئامانجە دوور مەودایەکان و ئامانجە کورت مەودایەکان و، لە ڕووی گرنگییەکەشی بۆ ئامانجە بنەڕەتییەکان و ئامانجە لقییەکان و، لە ڕووی سروشتی ئامانجەکەش بۆ ئامانجی کۆتایی و ئامانجی نێوەند، لقیان لێ دەبێتەوە.

لێرە دا چەند مەرجێك هەن، کە ئەرکە لە ئامانجەکە دا ڕەخساو بن لەنێویان:

١ - ڕەوا بێت و لەگەڵ بەهاکانی کۆمەڵگە و بنەماکانی بسازێت.

٢ - لای کۆمەڵ پەسەند کراو بێت و، بەرهەڵستیی ئامانجە کەسییەکانیان نەکات.

٣ - ڕوون و تێگەیشتوانە بێت.

٤ - ئامانجێکی ڕاستەقینە بێت بتوانرێت بەدەست بهێنرێت [193]

---

[191] فرناس عبد الباسط البنا: التخطيط، القاهرة ١٩٨٥، ص٤٠.

[192] سليمان الطماوي: مبادئ علم الإدارة العامة، ص١٧٢.

لەلایەکی تریش پێویستە ڕیزبەندییەك بۆ یەکەمینەکانی جێبەجێ کردنی ئامانجەکان بە ڕێگای زانستیی ورد، دابنرێت، بەجۆرێك یارمەتیی بەدەست هێنانی ئامانجە دیار کراوەکان بدات بۆ گەیشتن بەو ئامانجانەی، کە لە ڕیزبەندییەکە دا بەدوای دێن، هەروەك لەسەر پلانە ڕەچاوی ئەو ماوە کاتییە بکات، کە هەر ئامانجێك بۆ جێبەجێ کردن پێویستییەتی، ئەمەش دابەش کردنی پلانەکە بۆ ئامانجی درێژ خایەن و ئەویتر مام ناوەند، سێیەمیش کورت خایەن، دەخوازێت.

لە دواییش دا دەبێت ئامانجەکان بە هەماهەنگیی تەواو لە نێوانی و لە نێوان توانا و ئامرازە فەراهەمەکان دا بۆ جێبەجێ کردنی، دیاری بکرێت، چونکە ناکرێت ئامانجی هەڵپە دابنرێت، لە کاتێك دا دەرامەتی لاواز بۆ بەدەست هێنانی دابنرێت لەگەڵ قەبارەی ئەو ئامانجانە نەشێت، کە ئەنجامەکەی لە گەیشتن بە ئامانجەکان شکست بێنێت، ئەمەش بەزۆری لە وڵاتە تازە پێگەیشتوەکان ڕوو دەدات، کە دەیەوێت خۆی بە وڵاتە پێشکەوتویەکان بلکێنێت، پلانی قەبە و هەڵپە دادەنێت، کە لەگەڵ توانستە ئابووری و توانا مرۆییەکانی دا ناگونجێت، کە ئەنجامەکەی شکست هێنان دەبێت[١٩٤]

## دوەم: دەستەبەر کردنی ئەو تواناىانەی پلانەکە پشتیان پێ دەبەستێت

لە لایەنی یەکەم دا دەبێت ئەو دەرامەتە کەرەستەیی و سروشتییانە گلبدرێنەوە، کە پلانەکەی لەسەر دادەمەزرێت و، لە لایەنی دوەمیش دەبێت دەستگەیەکی کارگێڕیی گونجاو هەڵبستێت بە کردەی جێبەجێ کردنی پلانەکە.

---

[١٩٣] عبد الكريم درويش وليلى تكلا: أصول الإدارة العامة، ص٢٧٤.

[١٩٤] عبد الغني بسيوني عبد الله: أصول علم الإدارة العامة، ص١٢٦.

گڵدانەوەی دەرامەتەکانیش پشت بە ڕوونکراوە و ئاماری ورد و زانیاریی دروست دەبەستێت، بۆ ئەوەی دانانی پلانەکە لە ڕۆشنایی ڕوونکراوە و زانیاریی نا ورد دا ئەنجام نەدرێت.

دەرامەتەکانیش ئەمانەی خوارەوە دەگرێتەوە:

أ- بەرهەمی نەتەوەیی ولآت.
ب- قەبارەی پاشەکەوت کردن و وەبەرهێنان.
ج- سەرچاوەکانی وزە و دەرامەتی سروشتی.
د- قەبارەی هەنارده و هاوردەکان.
هـ- تێکڕاکانی بەکاربردن و بەرز بوونەوەی نرخ و، جگە لەمانەش لە توانا ئابووری و دارایی و سروشتییەکان.

دەبێت دەستگەیەکی کارگێریی ئامادەباش و شارەزا و گورجیش بە پلانەکە هەڵبستێت، چونکە نەبوونی گورجیی دەستگەی کارگێری دەبێتە هۆی شکست هێنانی پلانەکە[١٩٥]

## سێیەم: دیاری کردنی ماوەی کاتیی پێویستی جێبەجێ کردنی پلانەکە

خۆی لەخۆی دا وا بوە، کە پلان بە ماوەیەکی دیاری کراو بۆ جێبەجێ کردنی بەندە، کە بە پلانی ساڵانەیی و پێنجینەیی ناودەبرێت، یا پلانی دوو هەندەی دەستهات لە دە ساڵ، یا جگە لەم ناوانەش[١٩٦]

دەبێت ماوەی کاتیی پلانەکە ئاوەزانە بێت، واتا کاتی دیاری کراوی پلانەکە و قۆناغەکانی جێبەجێ کردنیان لەگەڵ توانستی کۆمەڵگە و تواناکانی بگونجێت، چونکە ئەو پلانەی، کە کاتێکی کەمتر لە کاتی گونجاو بۆ جێبەجێ کردنی بۆ

---

[١٩٥] عبد الغني بسيوني عبد الله: أصول علم الإدارة العامة، ص١٢٧.
[١٩٦] عبد الغني بسيوني عبد الله: أصول علم الإدارة العامة، ص١٢٨.

دیاری دەکرێت لە ماندویەتیی کۆمەڵگە زیاد دەکات، هەروەك ئەو پلانەی، کە کاتێکی زیاتر لە کاتی گونجاوی بۆ دیاری دەکرێت، ئەوا لە بەفیڕۆچوونی وزەکانی کۆمەڵگەی لێ دەکەوێتەوە لە میانەی ماوە زیاد کراوەکە دا[١٩٧]

هەڵبەت پلانی درێژ دادەنرێت، پاشان بۆ پلانی تری مام ناوەند دابەش دەبێت، ئەمەی دواییش بۆ پلانی سالانە بەش بەش دەبێت، واتە ماوەی کاتی هەمویەکیی پلان، بۆ قۆناغی کاتیی دیاری کراو و کۆك لەگەڵ جێبەجێ کردنی هەر بەشێکی پلانەکە دابەش دەبێت[١٩٨]

## چارەم: یەکێتیی پلان

مەبەست لە یەکێتیی پلان ئەوەیە، کە بۆ وڵات یا ڕێکخراوەی کارگێڕی جگە لە تاکە پلانێکی سەرەکی بوونی نییە، جا ئەگەر لە پیادە کردن دا لە پلانێك زیاتر بوونی هەبوو، ئەوا پشێوی تەشەنە دەکات و ئاشووبیش زاڵ دەبێت.

بەڵام بنەمای یەکێتیی پلان بێ دابەش کردنی پلانی سەرەکی بۆ پلانی لقی، یا بەشی فرە، بە پێی کەرتە گشتییەکان لە وڵات سەبارەت بە پلانی نەتەوەیی گشتگر بەدەست نایەت، وەك کەرتی پیشەسازی و کەرتی کشتوکاڵ و کەرتی بازرگانی، بەڵام مەرجە و، دەبێت ئەم پلانە لقییانە تەواوکەر و کۆك بن لەگەڵ پلانی سەرەکی لە قۆناغە جیاجیاکانی جێبەجێ کردن، بۆ ئەوەی لە کۆتایی دا ئامانجەکانی پلانەکە بەدەست بێن[١٩٩]

## پێنجەم: ناوەندێتیی دانانی پلان

بنەمای ناوەندییەتیی دانانی پلان یەکێك لەو بنەما گرنگانەیە، کە پلان دانانی لەسەر دادەمەزرێت، چونکە مسۆگەرییەکی سەرەکییە لە مسۆگەرییەکانی

---

[١٩٧] فرناس عبد الباسط البنا: التخطيط، ص٥١.

[١٩٨] عبد الغني بسيوني عبد الله: أصول علم الإدارة العامة، ص١٢٨.

[١٩٩] عبد الغني بسيوني عبد الله: أصول علم الإدارة العامة، ص١٢٨.

سەرکەوتنی، کە بەرنامەیەکی تەواوکەری زانستیی کردەنی دەڕەخسێنێت و، سەرجەم ئەو دەرامەتانەی، کە پلانەکە پێویستییەتی، کۆ دەکاتەوە، هەروەها هاوسەنگی و هەماهەنگیی پێویست لە نێوان پلانی کەرتە جیاجیاکان لە کاتی جێبەجێ کردن دا بەدەست دەهێنێت، بەجۆرێك لە کۆتایی دا دەتوانێت ڕووبەڕوی ئەو گرفتە گشتییانە ببێتەوە، کە ناچنە چارچێوەی کاری کەرت یا دەستگەیەك لە دەستگەکانی[٢٠٠]

## شەشەم: پابەند بوون بە پلان

مەبەست لە پابەند بوونی پلانەکە پابەند بوونە بە ئامانجەکانی ئەو پلانە و، ڕێز گرتنی دەقی ئامراز و ڕێوشوێنەکانی، کە بۆ جێبەجێ کردنی ئەم ئامانجانە نووسراون، بەجۆرێك هەر کارێکی پێچەوانەی بڕیارەکانی پلانەکە بێت بە ناڕەوا گوزارشت بکرێت.

پابەند نەبوون بە بنەمای پابەند بوونی پلان، دەبێتە هۆی کەمتەرخەمی و تەمبەڵی لە جێبەجێ کردن و، بایەخ نەدان بەدەست هێنانی هەر ئامانجێك لە ئامانجەکانی پلانەکە لەکاتی دیاریکراوی خۆی و، بەشێوەیەکی دیارکراو لەپلان دا.

تێبینی دەکرێت، کە حکومەتەکانی وڵاتانی ڕۆژاوا پەنا بۆ ئامرازی ورووژاندن و پاڵنان دەبەن بۆ ڕاکێشانی کەرتی تایبەت ڕوەو بەرنامەی پلانی ئابووری[٢٠١]

## هەفتەم: نیانیی پلان

نیانیی پلان ئەدگارێکی گرنگە، توانا بە هەموار کردنی پلانەکە دەدات بە گوێرەی گۆڕێنەرە ناکاوییەکان، چونکە توانای پلان بۆ هەموار کردن ئەدگارێکی

---

[٢٠٠] عبد الغني بسيوني عبد الله: أصول علم الإدارة العامة، ص٣١٥.
[٢٠١] محمد رفعت عبد الوهاب: الإدارة العامة، ص١٣٨.

زیندەگییە، ژیانی پلان و نەوەستان و کۆتایی نەهاتنی بەر لە جێبەجێ کردنی، لەخۆدەگرێت، ئەگەر ڕەوشێکی ناکاویی کتوپڕ و چاوەڕوان نەکراو کەوتەوە[٢٠٢]

بنەمای نیانیش دانانی پلان گەلێکی جێگرەوەی بەدواوەیە، کە بۆ پیادە کردن ئامادەبێت، ئەگەر پلانی سەرەکی شکستی خوارد یا پیادە کردنی هەڵوەشایەوە لە ئەنجامی ئەو گۆڕانەی، کە ڕوو دەدات.

ئەو ڕەوش و گۆڕانکارییانەش زۆر و فرەن، بە نموونە هەڵگیرسانی شەڕ یا لە کورتی دانی بەروبوومی کشتوکاڵی لە وڵات، بۆ ئەمەش دەبێت دەستگەی بەرپرس هەڵستێت بە پلان دانان بۆ ڕووبەڕوو بوونەوەی نموونەی ئەم ڕەوشانە بە هەموار کردنێکی خێرای پلان، یا بە جێ گرتنەوەی پلانێکی تر لە شوێنی دا، لە نێو پلانە جێگرەوەکان، کە لەگەڵ ئەم گۆڕانکارییانە بگونجێت[٢٠٣]

## هەشتەم: چاودێریی جێبەجێ کردن و هەڵسەنگاندنی ئەنجامەکانی

کرداری جێبەجێ کردنی پلان، دەبێت کردەیەکی تری یاوەر بێت، کە بریتییە لە بەدواداچوونی هەنگاوەکانی جێبەجێ کردن و، چاودێری کردنی بەڕێوەچوونی کارەکان لەم پلانە دا، بۆ ئەوەی بۆ بەرپرسی پلان مەودای سەرکەوتن لە هەر قۆناغێك لە قۆناغەکان و، ئەوەی ئایا دەرامەتە ئامادەکراوەکانی جێبەجێ کردن تەواون یا نا و، هێندەی گورجیی دەستگەی کارگێری لە جێبەجێ کردن، دەربکەوێت[٢٠٤]

گرنگی بەدواداچوونی هەنگاوەکانی جێبەجێ کردن و چاودێریی بەڕێوەچوونی کار لە پلان دا لە باری کەوتنەوەی بارێکی ناکاوی، دەردەکەوێت، کە دەبێتە ئەرك

[٢٠٢] فرناس عبد الباسط البنا: التخطيط، ص٥١.
[٢٠٣] عبد الغني بسيوني عبد الله: أصول علم الإدارة العامة، ص١٣١.
[٢٠٤] عبد الغني بسيوني عبد الله: أصول علم الإدارة العامة، ص١٣١.

لەسەر دەستگەی بەرپرس لە پلان لە دەستوەردان، لە ڕێگای هەموار کردنی پلانەکە، یا بە جێگرتنەوەی پلانی جێگرەوە.

ئەوەشی پێویستە دووپات بکرێتەوە، ئەوەیە، کە پێویستە لەسەر هەڵستەران بە پلان، هەڵسەنگاندنی خێرا و وردیی جێبەجێ کردنە لە هەر قۆناغێکی پلان، کە بەدەست دێت، ئەمەش بۆ ئاشنا بوونی ڕووی کورتییەکان یا هۆکارەکانی نا وردی لە جێبەجێ کردن ئەگەر لە کار کردن دا هەبوو، بۆ دەرباز بوون و نەهێشتنیان لە قۆناغەکانی داهاتوی پلان.

هەموو ئەمانە لە کۆتایی دا دەبنە هۆی ئاسان کردنی هەڵستان بە هەڵسەنگاندنی گشتگری پلان بە تەواوی، بە مەبەستی پوخت کردنی مەودای ئەو سەرکەوتنەی پێی گەیشتوە لە بەدەست هێنانی ئامانجە دیاری کراوەکانی ئەم پلانە[٢٠٥]

---

[٢٠٥] عبد الغني بسيوني عبد الله: أصول علم الإدارة العامة، ص١٣١

# توێژبەندی دووەم

## جۆرەکانی پلان دانان

پلان دانان بۆ چەند جۆرێك دابەش دەبێت.
یەکـەم: پلان دانان بە پێی ڕادەی گشتگری.
دووەم: پلان دانان بە پێی چارچێوەی کـــات.
سێیەم: پلان دانان بە پێی چارچێوەی شوێن.
لە خوارەوەش خوێندنی ئەم جۆرانە یەك دوای یەك دەگرینە ئەستۆ:

### یەکەم: پلان دانان بە پێی ڕادەی گشتگری

پلان دانان بە پێی ڕادەی گشتگری بـۆ پـلان دانـانی گشـتگر و پـلان دانـانی بەشەکی دابەش دەبێت.

أ. **پلان دانانی گشتگر:** مەبەست لەمە ئەوەیـە، کـە پـلان دانـان بـەش بەشی پەسەند ناکات، واتە ناکرێت لە پلان دانانی پەیوەندیدار بـە بـوارێکی دیـار کراو بگەین، بێ سەرنج دانە بوارەکانی تری تەواوکەری ئەم بوارە، بۆیە نابێـت بـە ڕوانگەیەکی تاك لایەنە سەرنج بدرێتە پلان دانان، کە لە لایەنە جیاجیاکانی ژیانی کارگێڕی و سیاسی و ئابووری و کۆمەلآیـەتی و سـەربازیی دوور بخاتـەوە، چـونکە پلان دانان بە هەڵ و مەرجی ژیانەوە بەندە و تێی دا ئەنجام دەدرێـت و، گوزارشـتە لە پێداویستییەکانی تاکەکانی و، ئامانجەکانیان بەدەست دەهێنێت[٢٠٦]

ئەمەش مانای ئەوە نییە، کە پلان دانان جۆرێکە لە پلان دانانی گشتگر کورت کرابێتەوە، بـەڵکو پـلان دانـان چـەند جـۆرێکی هەیـە لـەنێویان: **پـلان دانـانی**

---

[٢٠٦] فرناس عبد الباسط البنا: التخطيط، ص٦٣.

**ئابووری و، پلان دانانی کۆمەڵایەتی و، پلان دانانی سەربازی** و، پلان دانانی کارگێری، هەروەها دەتوانین هەر جۆرێکیان بۆ چەند جۆرێکی تر دابەش بکەین، هەروەك پلان دانانی ئابووری دابەش دەبێت بۆ **پلان دانانی پیشەسازی و پلان دانانی کشتوکاڵی** و، پلان دانانی کارگێرییش دابەش دەبێت بۆ **پلان دانانی ناوەندی و پلان دانانی نا ناوەندی** و، دەکرێت پلان دانانی سەربازیش دابەش بکرێت بۆ **پلان دانانی هێرشی و پلان دانانی بەرگری**.

کەواتە چۆن مانای گشتگری بەدەست دێن لەگەڵ ئەم هەموو جۆرەی پلان دانان دا؟ ئەمە مانای ئەوەیە، کە هەموو جۆرەکانی پلان دانان، بە پلان دانانی ئابووریی پەتی بەندن، چونکە کۆمەڵگە چەندین لایەنی کۆمەڵایەتی و سیاسی و کارگێری و سەربازی لەخۆ دەگرێت لەگەڵ لایەنی ئابووری کارلێك دەکەن، پێی کاریگەر دەبن و کاریگەریی لێ دەکەن[٢٠٧]

ب. **پلان دانانی بەشەکی:** مەبەست لە پلان دانانی بەشەکی، ئەو پلان دانانەیە، کە بایەخ بە چالاکییەك لە چالاکییەکانی کۆمەڵگە دەدات و جەختی لەسەر دەکاتەوە و، لە گرنگترینی جۆرەکانی، پلان دانانی ئابووری و پلان دانانی کۆمەڵایەتی و، پلان دانانی ئاوەدانکاری و، پلان دانانی سەربازین.

## دوەم: پلان دانان بەپێی چارچێوەی کات

پلان دانان بەپێی چارچێوەی کات بۆ ئەم بەشانەی خوارەوە دابەش دەبێت:

أ. **پلان دانانی درێژ خایەن:** ئەو پلان دانانەیە، کە مەوداکەی پەیوەندیدارە بە ماوەیەکی کاتیی درێژ، هەندێك بە دە ساڵ یا زیاتری دیاری دەکەن و، هەندێکی تریش کاتەکەی لە دەوری بیست و پێنج ساڵ و سی ساڵی

---

[٢٠٧] حمدية زهران: التخطيط الاقتصادي- الفكر- النظرية- التطبيق، مكتبة عين شمس ١٩٨٣، ص٧٤.

دادەنێن[٢٠٨]، هەندێکیش پلان دانان بۆ قۆناغێکی کاتی بڕەکەی پێنج ساڵ و زیاتر بێت، لە پلان دانانی درێژ خایەنی گوزارشت دەکەن[٢٠٩]

ئەم جۆرەی پلان دانانە بە گشتگری جیا دەکرێتەوە، چونکە زیاتر لە بوارێك دەگرێتەوە، هەروەك ئامانج گەلێکی سەرەکی لە خۆ دەگرێت، کە بایەخ بە کۆمەڵگە بە گشتی دەدات، بەڵام ئەم جۆرەی پلان دانان بە ئەستەمترین جۆرەکانی پلان دانانی بە پێی ماوەی کاتی گوزارشت دەکرێت، لە بەر ئەوەی گۆڕانی ڕەگەزێکی بنەڕەتییە لە پلان دانان، هەروەك هەواڵداری ڕەگەزێکە بۆ ڕووبەڕوو بوونەوەی گۆڕان و، لەباری ماوەی کاتیی درێژ دا، ئەگەری ڕوودانی گۆڕان و ڕووداوی چاوەڕوان نەکراو زیاد دەکات، هەروەك هەواڵداری لە شێوەی ئەم جۆرە گۆڕان یا ڕەوشەکانی دەوروبەری نا ورد دەبن[٢١٠]

ب. **پلان دانانی ناوەند خایەن:** پلانی گشتگری درێژ خایەن بۆ کۆمەڵێك لە پلانی ناوەند خایەن دابەش دەبێت، ماوە کاتییەکەیان لە نێوان پێنج و هەفت ساڵ دا دادەنرێت، پلانی ناوەند خایەن بایەخ بە وردەکاریی ئامانجە نەتەوەییەکان دەدات و، ڕێوشوێن و ئامراز و سیاسەت گەلێکی پێویست بۆ پابەند بوون پێی بۆ بەدەست هێنانی ئامانجەکان، لەخۆدەگرێت.

ئەم جۆرەی پلان دانان بە نیانی لە جێبەجێ کردن جیا دەکرێتەوە بۆ ئەوەی بتوانێت ڕووبەڕوی ئەو گۆڕان و ڕەوشانە ببێتەوە، کە لە کاتی جێبەجێ کردن دا سەر هەڵ دەدەن[٢١١]

ج. **پلان دانانی کورت خایەن:** ئەو پلان دانانەیە، کە مەوداکەی پەیوەندیدارە بە ماوەیەکی کاتیی کورت، مانگ یا ساڵێك یا دوو ساڵ.

---

[٢٠٨] حمدية زهران: التخطيط الاقتصادي- الفكر- النظرية- التطبيق، مكتبة عين شمس ١٩٨٣، ص٧٤.

[٢٠٩] ماجد الحلو: الإدارة العامة، ص١٧٧.

[٢١٠] فرناس عبد الباسط البنا: التخطيط، ص٧٦.

[٢١١] حمدية زهران: التخطيط الاقتصادي- الفكر- النظرية- التطبيق، ص٧٥.

هەروەها ئەم جۆرەی پلان دانان بە ساناترین جۆرەکانی پلان دانان بە پێی ماوەی کاتی، گوزارشت دەکرێت، چونکە ئەو گۆڕانکارییانەی، کە لەم ماوە کاتییە کورتە دا ڕوو دەدەن، گۆڕانکاری گەلێکی سنووردارن، هەروەك هەواڵداری کردنیشیان بە وردی دەبێت.

ئەم جۆرەی پلان دانان بەوە جیا دەکرێتەوە، کە زۆر نیانە توانای ڕووبەڕووبوونەوەی گۆڕانکاری و بارە ناکاوییەکانی هەیە، هەروەك لە میانەی قۆناغەکانی جێبەجێ کردنی پلانەکە دا بە دواداچوون و هەڵسەنگاندنی بەردەوام بە دەست دێت.

دەبێت ئاماژە بەوەش بکەین، کە سەرجەم جۆرەکانی پێشوو بە یەکەوە بەندن و، دەبێت سازان لەنێوانیان دا هەبێت، بەجۆرێك پلان دانانی کورت خایەن و ناوەند خایەن لەگەڵ ئەو ئامانجە سەرەکییانەی، کە پلان دانانی درێژ خایەن هەوڵی بەدەست هێنانیان دەدات ڕێ بکەن[٢١٢]

## سێیەم: پلان دانان بە پێی چارچێوەی شوێن

پلان دانان بە پێی چارچێوەی شوێن بۆ پلان دانانی نەتەوەیی و پلان دانانی ناوخۆیی دابەش دەبێت:

أ. **پلان دانانی نەتەوەیی:** ئەو پلان دانانەیە، کە چارچێوەکەی هەرێمی وڵات بە تەواوی دەگرێتەوە، بە ڕوانینە گشتگرییەکەی بۆ کەرتە جیاجیاکان.

ب. **پلان دانانی ناوخۆیی:** ئەو پلان دانانەیە، کە چارچێوەکەی لە ناوچەیەکی جوگرافی دا دیاری دەکرێت لە ناوەوەی وڵاتێك، وەك پارێزگە یا شار یا دێ[٢١٣]

هەروەها پەیڕەوی کردنی شێوازی ناوەندێتیی پلان دانان، لە پلان دانانی نەتەوەیی و، نا ناوەندییەتیی پلان دانان لە پلان دانانی ناوخۆیی دا ئەنجام دەدرێت،

---

[٢١٢] عادل حسن: الإدارة، مؤسسة شباب الجامعة بالإسكندرية ١٩٧٩، ص٢٥٩- ٢٦٠.

[٢١٣] ماجد الحلو: الإدارة العامة، ص١٧٨

ئەمە مانای بوونی دابڕاوی لە نێوان ئەم دوە لە پلان دانان دا، نییە، بەڵکو دەستگەی ناوەندیی پلان دانانی نەتەوەیی دەبێت ڕەچاوی پێداویستییە ناوخۆییەکانی ناوچە جوگرافییەکانی وڵات بکات و، زانیاری لە بارەی دەرامەت و تواناکانی هەر ناوچەیەکی لەبەردەست دا بێت و، بۆ ئەوەشی پلانی گونجاو و چاك بێت، دەبێت بە پلانە هەرێمییەکان پاڵپشتی بکرێت[٢١٤] و، دەستگەی پلان دانانی ناوەندیش هەڵستێت بە هەماهەنگی لە نێوان ئەم پلانانە، بۆ زیاد کردنی کارایی لە بەدەست هێنانی ئامانجە نەتەوەییەکان.

پلان دانانیش لە ناوەوەی یەکەیەکی کارگێڕی بە شێوازی پلان دانانی ناوەندی دەبێت، یا بە شێوازی پلان دانانی نا ناوەندی.

مەبەست لە پلان دانانی ناوەندی، کورت کردنەوەی کرداری پلان دانانە لە دەست کۆمەڵەیەکی ناوەندی، کە بەرپرسی ڕاستەوخۆ بن لە بەردەم سەرۆکی کارگێڕی.

مەبەست لە نا ناوەندیش، دابەش کردنی کرداری پلان دانانە لەنێو تاکە پسپۆڕەکان لە کارگێڕی و بەشە جیاجیاکان دا، بەجۆرێك سەربەخۆییان هەبێت لە تاکە هەڵستەرەکان بە کردەی جێبەجێ کردن لە هەمان کارگێڕی و بەشەکان دا[٢١٥]

---

[٢١٤] حسن توفيق: الإدارة العامة، القاهرة، مطبعة الجد، ١٩٦٩- ١٩٧٠، ص١٥٠

[٢١٤] عادل حسن: الإدارة، ص٣٥٦- ٣٥٩.

# بەشی دوەم

# پلان دانان لە ئیسلام

## بەرایی

هەندێك باوەڕیان وایە، کە ئیسلام دانی بە پلان دانان بۆ ئایندە نەناوە، لەسەر بنەمای ئەوەی، کە زانیاری بە ئایندە دەچێتە بازنەی زانایی بە پەنهان، کە مافی خوا لە زانینی دا سەربەخۆیە، هەروەك دەفەرموێت: ﴿عَالِمُ الْغَيْبِ وَالشَّهَادَةِ وَهُوَ الْحَكِيمُ الْخَبِيرُ﴾[٢١٦]. واتا: "زانای پەنهانی و ئاشکرا و هەر ئەویشە دانا و شارەزە" و، خوای گەورە دەشفەرموێت: ﴿قَالُواْ لاَ عِلْمَ لَنَا إِنَّكَ أَنتَ عَلاَّمُ الْغُيُوبِ﴾[٢١٧]. واتە: "گوتیان ئێمە زانستمان نییە(لەبارەوە) هەڵبەتە تۆی زانەر بە پەنهانەکان"

باوەڕ بوونیش بەوەی، کە ئیسلام پلان دانان ڕەت دەکاتەوە باوەڕێکی هەڵەیە، چونکە پلان دانان بەشێکە لەو کارەی، کە ئیسلام هاندەرە بۆی، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَقُلِ اعْمَلُواْ فَسَيَرَى اللّهُ عَمَلَكُمْ وَرَسُولُهُ وَالْمُؤْمِنُونَ وَسَتُرَدُّونَ إِلَى عَالِمِ الْغَيْبِ وَالشَّهَادَةِ فَيُنَبِّئُكُم بِمَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ﴾[٢١٨]. واتا: "(ئەی پەیامبەر بەو عەرەبانە) بشڵێ کردەوە(ی چاك)بکەن (کە قازانجی بۆ خۆتان هەیە) خوا و پەیامبەر و بڕوادارانیش دەیانبینن و بۆ لای زانای پەنهانی و ئاشکرا دەگەڕێنەوە، جا بەوەی دەیکەن هەواڵتان پێ دەدات"

هەڵبەت هەندێك بیرمەند لە بواری بەڕێوەبردنی ئیسلامی دا بایەخیان بە پلان داناوە، هەندێکیشیان تەنها بە شیاندنی نەوەستاون، بەڵکو بە ئەرکێکی بڕوا بوونی گوزارشتیان کردوە، چونکە هزر کردن پایەی پلان دانانە و، هزر سەرچاوەی

---

[٢١٦] سورة الأنعام: الآية ٧٣.

[٢١٧] سورة المائدة: الآية ١٠٩.

[٢١٨] سورة التوبة: الآية ١٠٥.

زانینگەراییە، زانیاریش بنەمای ڕەفتاری ڕێکە لە پەیوەندیی مرۆڤ بە بەدیهێنەر و بەدیهێنراو[٢١٩]

لێرە دا دەتوانین بڕیار بدەین، کە پلان دانانی باش بنیاتنراو لەسەر هـزر کـردن ئەرکێکی ئیسلامییە.

لە خوارەوەش دا ئەم بەشە لە دوو توێژیەند دا دەخوێنین:

توێژیەنـدی یەکـەم: ئـەو بنەمایانـەی پـلان دانـانی ئیسـلامیی لەسـەر دادەمەزرێت.

توێژیەندی دوەم: جۆرەکانی پلان دانانی ئیسلامی.

---

[٢١٩] فتح الباب، حسن: التخطيط والتنظيم في الهجرة، طبعة المجلس الأعلى للشؤون الإسلامية، ص١٩.

# توێژبەندی یەکەم

## بنەماکانی پلان دانانی ئیسلامی

پلان دانانی ئیسلامی شێوازێکی کاری کۆمەڵەییە بە هۆکار بۆ ڕووبەڕوو بوونەوەی پێشبینییە ئایندەییەکان، دەگیردرێتەبەر و، پشت بە پێڕۆیەکی باوەڕی دەبەستێت و، بڕوای بە ویست هەیە و، پەنا بە خوا دەگرێت و، بۆ بەدەست هێنانی ئامانجی پەرستنی خوا و، ئاوەدان کردنەوەی بوون، کۆشش دەکات.

دەکرێت پێناسەی پێشوی پلان دانانی ئیسلامی کورت بکەینەوە و، بڵێین: "پلان دانانی ئیسلامی شێوازێکی کۆمەڵەیی بەرنامەی هزریی باوەڕییە، بۆ بەدەست هێنانی ئامانجێکی کۆشش دەکات.

لە خوارەوەش دا تایبەتمەندییەکانی پلان دانانی ئیسلامی بە پشت بەستن بەم پێناسەیە دەخەینە ڕوو:

### یەکەم: پلان دانانی ئیسلامی شێوازێکی کاری کۆمەڵەییە

ئیسلام زۆرترین بایەخی بە کاری کۆمەڵەیی داوە و، لەمیانەی خوێندنەوەی ڕشتەی وتەکان لەو ئایەتانەی هانی کارکردن دەدەن، تێبینی دەکەین، کە زۆرینەی ئەو ئایەتانە بە شێوەیەکی سەرجەمی هاتوە، قسە کردنی بۆ کۆمەڵە، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَقُلِ اعْمَلُواْ فَسَيَرَى اللّهُ عَمَلَكُمْ وَرَسُولُهُ وَالْمُؤْمِنُونَ﴾[٢٢٠] واتە: "(ئەی پەیامبەر بەو عەرەبانە) بشڵێ کردەوە(ی چاکە) بکەن (کە قازانجی بۆ خۆتان هەیە) خوا و پەیامبەر و بڕوادارانیش دەیانبینن "، کە لێرە دا بە کۆ هاتوە (بکەن) بە شێوەیەکی تاکی نەهاتوە(بیکە)، ئەمە ئاراستە کردنی خوای گەورەیە

---

[٢٢٠] سورة التوبة: الآية ١٠٥.

لە کار کردنی بە کۆمەڵەیی، چونکە کارە مەزنەکان، تاکەکان بە تەنیا پێی هەڵناستن، بەڵکو کۆمەڵەکان پێی هەڵدەستن.

پلان دانانی ئیسلامیش هەوڵی هەموو تاکێك و تاکەکانی کۆمەڵگە جێ دەکاتەوە، کە هەر تاکێك لە پلان دا ڕۆڵی ئەرینیی خۆی هەیە و، بۆ هیچ تاکێك نیە هەڵوەستە لەسەر هەڵوێستێکی بەرهەڵستیی ئەو پلانە ئیسلامییە بکات، کە کۆمەڵ پێی ڕازییە و بڕیاری لەسەر داوە، هەروەك بۆ هیچ کەسێك ناشێت، لە ڕێگەی بەدەست هێنانی ئەو ئامانجانە بوەستێت، کە خواستراوە بەدەست بهێنرێت.

جا ئەگەر یەکێك لە تاکەکان نەیتوانی بەشداری لە جێبەجێ کردنی پلانەکە دا بکات، لەبەر پەککەوتنی یا نەخۆشی یا پیریی، ئەوا کۆمەڵگەی ئیسلام لە دەرەوەی وزەی خۆی لێ ناخوازێت، بەڵکو لە بەشداری کردنی جێبەجێ کردنی پلانەکە دا دەیبوورێت، بەڵام لەو باشییەی، کە لە جێبەجێ کردنی دا بەدەست دێت لە بیری ناکات تا بە تەواوێتیی خۆی دەگات، ئەمەش بێ داوا لێ کردنی، کۆششی هاوشێوە، بە پیادە کردنی بنەمای دەستبەریی کۆمەڵایەتی لە ئیسلام دا.

## دوەم: پلان دانانی ئیسلامی بە هۆکار دەگیردرێتەبەر بۆ ڕووبەڕوو بوونەوەی پێشهاتە ئایندەییەکان

ناوەڕۆکی پلان دانانی ئیسلامی لە ئامادەسازی بۆ ئایندە دەردەکەوێت، هەڵبەت خوای حەق و بەفەڕ فەرمانی ئەم ئامادەکارییەمان پێ دەکات بەر لە هەڵستان بە کار، هەروەك دەفەرموێت: ﴿وَأَعِدُّواْ لَهُم مَّا اسْتَطَعْتُم مِّن قُوَّةٍ وَمِن رِّبَاطِ الْخَيْلِ تُرْهِبُونَ بِهِ عَدْوَّ اللّهِ وَعَدُوَّكُمْ وَآخَرِينَ مِن دُونِهِمْ لاَ تَعْلَمُونَهُمُ اللّهُ يَعْلَمُهُمْ﴾[٢٢١]. واتا: "بە پێی توانا(هەموو هۆکارەکان) لە هێز(ی شەڕ کردن) و لە ئەسپی شەڕیان بۆ ئامادە بکەن، بۆ ئەوەی دوژمنانی خوا و دوژمنانی خۆتانی پێ بترسێنن، جگە لە ئەوانی تریش، کە نایان ناسن خوا دەیان ناسێت"، لەم ئایەتە

---

[٢٢١] سورة الأنفال: الآية ٦٠.

پیرۆزە دا بەڵگەیەکی ڕاشکاوانە هەیە لەسەر ئامادەسازی بۆ ئەوەی لە زانستی ئێمە دەردەچێت و دەچێتە زانستی خوای گەورە: ﴿وَآخَرِينَ مِن دُونِهِمْ لاَ تَعْلَمُونَهُمُ اللّهُ يَعْلَمُهُمْ﴾. واتا: "جگە لە ئەوانی تریش، کە نایان ناسن خوا دەیان ناسێت".

هەروەك خوای بە فەڕ و بڵند پاداشتی ئامادەسازیی وەك پاداشتی کارەکەی بە تەواوی داناوە، کە لە کۆتایی ئەم ئایەتەی پێشوو دەفەرموێت: ﴿وَمَا تُنفِقُواْ مِن شَيْءٍ فِي سَبِيلِ اللّهِ يُوَفَّ إِلَيْكُمْ وَأَنتُمْ لاَ تُظْلَمُونَ﴾[٢٢٢]. واتا: "شتێك لە پێناوی خوا نابەخشن، مەگەر پاداشتەکەی بە تەواوی وەردەگرن و ستەمیشتان لێ ناکرێت"

هاتنی ئەم بەڵێنەی خواوەند دوای فەرمان کردن بە گرتنەبەری زانیاری بۆ ڕووبەڕوو بوونەوەی دوژمنان، بەڵگەیە لەسەر ئەوەی، کە خەرج کردن لە ئامادەسازی یا بۆ ڕووبەڕوو بوونەوەی دوژمن خەرج کردنە لە پێناو خوا لە شێوەی تێکۆشان لە پێناوی خوا.

هەروەها ئامادەکاریی کار کردن گوزارشتە لە بەڵگەیەکی بەهێز لەسەر ویستی کار، هەروەك نەبوونی ئامادەکاری بۆ کار بە بەڵگەی هەڵاتن و ڕازی نەبوون بە ڕاپەڕاندنی گوزارشت دەکرێت، خوای گەورە لە بارەی دواکەوتوان لە شەڕی تەبووك دا دەفەرموێت: ﴿وَلَوْ أَرَادُواْ الْخُرُوجَ لأَعَدُّواْ لَهُ عُدَّةً﴾[٢٢٣]. واتا: "(ئەم دەغەلانە) ئەگەر بیان ویست بایە(بۆ جەنگ) دەربچن ئەوا خۆیان بۆ ئامادە دەکرد"، واتا ئەم دواکەوتوانە ئەگەر بیان ویستبوایە لەگەڵ پەیامبەر ﷺ بۆ ئەم شەڕە دەربچن، ئەوا ئامادەکارییان بۆ ئەم کارە دەکرد بەو شێوەیەی، کە گونجاوە لە خواردەمەنی و کەلوپەل، بەڵام ویستیان دەرنەچن بە بەڵگەی نەبوونی ئامادەییان بۆی، پۆزشێکی لاوازیان بۆ پەیامبەر ﷺ هێنایەوە[٢٢٤]

[٢٢٢] سورة الأنفال: الآية ٦٠.

[٢٢٣] سورة التوبة: الآية ٤٦.

[٢٢٤]، تحقيق محمد محيي الدين عبد الحميد، مكتبة محمد علي صبيح.ﷺابن هشام، أبو عبد الله محمد بن اسحاق بن يسار المطلبي: سيرة النبي

## سێیەم: پلان دانانی ئیسلامی پشت بە پێڕۆیەکی باوەڕی دەبەستێت

پلان دانانی ئیسلامی بە باوەڕی ئیسلامییەوە بەندە، کە لەسەر پێڕۆیەکی باوەڕی، کە بنەماکەی پەنا گرتنە بە خوا و، بەند بوونە بە ویستی خوا، دادەمەزرێت، ئەمەش ئەدگاری گیانی لە پلان دانانی ئیسلامی زیاد دەکات، کە لە بەستویی کاری پلان دانانی ئایندەیی و وشك بوونی کەم دەکاتەوە.

بنەمای باوەڕیش لە پلان دانانی ئیسلامی دا بۆ ئاراستە کردنی خوای گەورە بۆ مووسوڵمانان، دەگەڕێتەوە، بەجۆرێك دەکرێت بڵێین وێنا کردنی سیاسەتی گشتیی پلان دانانی ئیسلامی، ساز کردنی خوای شکۆمەندە، ئەم سیاسەتانەش لە ئایەتەکانی قورئانی پیرۆز دا دەبینین.

کار دەگاتە ئەوەی، کە خوای شکۆمەند پلانێکی تۆکمە بۆ یەکێك لە پەیامبەرەکانی دابنێت و، ئەم پلانەی بۆ دەکاتە بەهرە و ڕای دەسپێرێت بۆ جێبەجێ کردنی، هەروەك ئەوەی پاك و بڵند لەگەڵ هەواڵبەرەکەی یوسف دا سڵاوی خوای لێ بێت، کردی، هەروەك لەگەڵ پەیامبەری موحەمەد ﷺ یش لە ڕێککەوتنی حودەیبیە دا کردی، کاتێك عومەری کوڕی خەتاب خوا لێی ڕازی بێت بەرهەڵستیی ئەم ڕێککەوتنەی کرد و بە پەیامبەر ﷺ ی گوت: ئایا ئێمە مووسوڵمان نین و ئەوانیش هاوبەش دانەر؟ کاتێکیش وەڵامی بە بەڵێ دایەوە گوتی: کەواتە لەبەر چی بەسەرشۆڕی.و کەمی لە ئاینمان دا ڕازی ببین" جا پەیامبەری خواش ﷺ وەڵامی دایەوە: (أنا عبد الله ورسوله، لن أخالف أمره ولن يضيعني)[٢٢٥] واتا (من بەندە و پەیامبەری خوام، سەرپێچیی فەرمانی ناکەم، لەیادیشم ناکات).

ئەم دەقە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی، کە پلان دانان بۆ ڕووبەڕوو بوونەوەی قوڕەیش پلانێکی خواوەندیی گیانی بوو، لە لایەن خوای بڵندەوە بۆ پەیامبەرەکەی ﷺ

---

[٢٢٥]، الجزء الثالث، ص٧٨٢.ﷺابن هشام: سيرة النبي

کاتێکیش مووسوڵمان دەست بە پلان دانان دەکات، ئەوا لە بڕوا بوونی بە خوا دوورناکەوێتەوە، بەڵکو بە هۆی بڕوای بە ویستی خوای گەورە بە پشت بەستن بێی، بە داوا کردنی خوا بۆ سەرخستنی لە بەدەست هێنانی ئەو ئامانجەی کۆششی بۆ دەکات.

## چارەم: پلان دانانی ئیسلامی پشت بە بەرنامەیەکی هزری پەنا بە خوا گرتوو دەبەستێت

هەڵبەت پێشتر ڕوونمان کردەوە، کە پلان دانان لە ئیسلام دا، شێوازێکی کارە بە هۆکار دەگیردرێتەبەر و، ئەو کارانەش دیاری دەکات، کە پێویستە لە ئایندە دا ئەنجام بدرێت، بۆ ئەوەی بە گۆڕانکارییە ئایندەییەکان ڕووبەڕووی ناکاوی نەبنەوە، بەڵام ئەم شێوازە لە کار کردن دا بە بەند بوون بە پێڕۆیەکی هزری جیا دەکرێتەوە و، ئەم بەرنامە هزرییەش نێوانی شێوازی کار کردن و نێوان ویستی خواوەند پێکەوە دەبەستێتەوە

شێوازی کار کردن شێوازێکی ڕەها نییە، بەڵکو شێوازێکە بەندە بە ویستی خوا و، بنەمای ئەو پێڕۆیە هزرییەش لە فەرمایشتی خوای شکۆمەندەوە وەرگیراوە: ﴿وَلَا تَقُولَنَّ لِشَيْءٍ إِنِّي فَاعِلٌ ذَٰلِكَ غَدًا٢٣إِلَّا أَن يَشَاءَ اللَّهُ﴾[٢٢٦] واتا: "(ئەی پەیامبەر هەرگیز) بۆ شتێك مەڵێ سبەینێ دەیکەم {٢٣} مەگەر (بڵێیت) ئەگەر خوا ویستی".

مەبەستیش لەم دوو ئایەتە پیرۆزە ئەوەیە، کە مرۆڤ شتێك لەبارەی کارەکەی نەڵێت، گەر ویستی بیکات و، مکوڕ بێت لەسەر کردنی، من بەیانی دەیکەم، بەڵکو لەسەریەتی نیازی کارەکەی و ویستی خوا بەیەکەوە ببەستێتەوە و، نەڵێت بەیانی ئەمە دەکەم مەگەر لەباری خۆ بەدەستەوەدانی بە خوا.

---

[٢٢٦] سورة الكهف: الآيتان ٢٣، ٢٤.

لە ڕۆشنایی ئەم ئایەتە پیرۆزەوە دەبینین، کە دەشێت بیر لە مکوڕ بوون لە نیازی کردنی شتێکی ئایندەیی بکرێتەوە، واتا بەمانایەکی تر دەشێت پلانی کار بۆ ڕۆژی داهاتوو، یا مانگی داهاتوو، یا ساڵی داهاتوو دابنرێت، بەڵام ئەم شیانە بە ویستی خوای شکۆمەندەوە کۆتە و بەستراوەتەوە[٢٢٧]

پلان دانان لە ئیسلام دا بیرکردنەوەیە لە ڕاپەڕاندنی کارێکی ئایندەیی و، مکوڕ بوون لەسەر کردنی ئەم کارە لە کاتی دیاری کراوی خۆی، ئەویش بە ویستی خوا.

## پێنجەم: پلان دانانی ئیسلامی بۆ بەدەست هێنانی ئامانجێکی ڕەوا کۆشش دەکات

پلان دانانی ئیسلامی هەوڵی بەدەست هێنانی ئامانجێکی ڕەوا دەدات، بۆیە ئامانج لە پلان دانانی ئیسلامی بە ڕەوایی و تایبەتمەندییەوە دەناسرێتەوە.

پلان دانانی ئیسلامی جیاکارە و لەوە دا لە پلان دانانی نا ئیسلامی جیا دەکرێتەوە، کە دواین ئامانجی پلان دانانی یەکەم لە بەردەوامیی پەرستنی خوا و ئاوەدان کردنەوەی بوونە، لە میانەی تێر کردنی پێداویستییەکانی تاک، لە کاتێک دا تێر کردنی پێداویستییەکان بە ئامانجی سەرەکی و کۆتایی لە پلان دانانی نا ئیسلامی دادەنرێت.

لە گوزارشت کردن لە ڕەزامەندیی خوای شکۆمەند ئامانجێکی کۆتایی بوونی پاڵنەری خود بۆ بەدەست هێنانی ئامانج دەردەکەوێت، ئەم پاڵنەرە خودییەش لە ویژدانی کەسی و، لە ویژدانی ئاینێکی سەقامگیر لە قووڵایی دەروونی مرۆڤ هەڵدەقووڵێت.

---

[٢٢٧] محمد محمود حجازي: التفسير الواضح، دار التفسير للطباعة والنشر، القاهرة ١٩٨٠، المجلد الثاني، الجزء الخامس عشر، ص٥٩.

# توێژبەندی دووەم

# جۆرەکانی پلان دانانی ئیسلامی

پلان دانانی ئیسلامی پلان دانانێکی گشتگرە، هەموو لایەنەکانی ژیانی باوەڕی و ئابووری و کۆمەڵایەتی و سەربازی و کارگێڕی دەگرێتەوە و وا باشە هەر بەشێك لە بەشەکانی ئەم پلان دانانە گشتگرە بە جۆرێك لەجۆرەکانی پلان دانانی ئیسلامی گوزارشت بکەین.

بەمەش جۆرەکانی پلان دانانی ئیسلامی ئەمانەن: پلان دانانی بانگەوازی ئیسلامی، پلان دانانی ئابووری، پلان دانانی کۆمەڵایەتی، پلان دانانی سەربازی، پلان دانانی کارگێڕی.

لە خوارەوەش دا ڕوون کردنەوەی سێ لەم جۆرانە بە سەرنج دانە پەیوەست بوونی ڕاستەوخۆی بە بابەتی تێخوێندنەوەکە، دەگرینە ئەستۆ.

## یەکەم: پلان دانانی ئابووری[٢٢٨]

ئیسلام بایەخی بە پلان دانانی ئابووری داوە، ئەم بایەخەش لە میانەی سوورەتێکی تەواو لە پەرتووکی خوای شکۆمەند، دەردەکەوێت، هەموو ئەوەی پەیوەندیدارە بە بەڕێوەبردنی گشتی لەخۆ دەگرێت و، جەخت لەسەر پلان دانانی ئابووری دەکاتەوە، ئەم سوورەتەش، سوورەتی یوسفە سلاوی خوای لێ بێت. بۆیە ئەو قورئانە پیرۆزەی، کە لەسەر پەیامبەر ﷺ دابەزیوە، بە ڕاستترین بەڵگە گوزارشت دەکرێت، کە لە ناوەڕۆکەکەی دا بنەما و ڕێسا و بنەچەکانی بەڕێوەبردنی گشتیی بەشێوەیەکی گشتی و، بنەما و ڕێسا و بنەچەکانی ئابووریی بەشێوەیەکی

---

[٢٢٨] فرنانس عبد الباسط البنا: التخطيط، ص٩٤.

تایبەت پاراستوە. هەروەها نموونەیەکی پیادەیی نایابی پلان دانانی ئابووریی لە میسر، لە میانەی ساتێك لە سەردەمەکان لە خۆدەگرێت، هەروەك ئەم سوورەتە پیرۆزە بە ئاراستە کردنێکی پەروەردگەری و ڕابەرێکی ڕاستگۆی هەر کۆمەڵگەیەکی مرۆڤایەتی، کە بە ماوە گەلێکی خۆش گوزەرانی و داکشان دا ڕەت دەبن، لە تەواوی گۆی زەوی بە درێژایی چەرخەکان، گوزارشت دەکرێت، بە جۆرێك وڵاتە نوێیەکان سوود لەم ئەزموونە ئابوورییە ڕابەرە لە پلان دانانی ئابووری وەردەگرن، ئەویش بە پاشەکەوت کردنی هەندێك لە دەرامەتی ئابووری لە ساڵانی خۆشگوزەرانی و شادمانی، بۆ پشت پێ بەستنی لە ساڵانی وشکەساڵی و داکشان دا.

هەروەها پەیامبەریش ﷺ بایەخی بە پلان دانانی ئابووری داوە لە ناوەوەی وڵاتەکەی لە مەدینە، کە برایەتیی لە نێوان کۆچکەر و پشتیوانەکان دا دروست کرد و، برایەتیش هاوبەشیی لە سامان لەخۆ دەگرت، لە کاتی مردن دا، تاوەکو میراتی ڕەت کردەوە تەنها بۆ پشتان لە کاتی دابەزینی فەرمایشتی خوای گەورە: ﴿وَأُوْلُواْ الأَرْحَامِ بَعْضُهُمْ أَوْلَى بِبَعْضٍ فِي كِتَابِ اللّهِ﴾[٢٢٩] واتا: " لە پەرتووکی(قورئان) خوا دا خزمان و خۆیشان(لەبارەی ڕاسپاردە و چاکە کردن لەگەڵیان دا) هەندێکیان لە هەندێکی تریان لە پێشترن "

برایەتیش بە یەکەم پلانی ئابووری گوزارشت دەکرێت، کە پەیامبەر ﷺ دانا، هەروەك بە قۆناغی پلان دانانی ئابووری و ڕووبەڕوو بوونەوەی گرفتی هەژاریش گوزارشت دەکرێت، بە تایبەت، کە کۆچکەرەکان لە یاوەرانی پەیامبەر ﷺ ماڵ و شوێنیان لە مەکە بەجێهێشت بوو.

پاشان قۆناغی دووەم هات بە سەپاندنی زەکات بەوەی پلانێکی ئابووریی گشتگر لە خۆ دەگرێت بۆ کۆتایی هێنان بەم گرفتە، هەروەك هەندێك توێژەر لە سەربردەی پەیامبەر موحەمەد ﷺ ڕایانگەیاندوە، کە زەکاتی لە مەدینە سەپاندوە، ئەوەش دوای کۆچی پەیامبەر ﷺ بۆ ئەوێ و، بنیات نانی مزگەوت و، برایەتییەکەی نێوان

---

[٢٢٩] سورة الأنفال: الآية ٧٥.

کۆچکەر و پشتیوانەکان، ئیبن حەزمیی ئەندەلووسی دوای ئەوەی باس لـە نانـەوەی برایەتیی پەیامبەر ﷺ لە نێوان کۆچکەر و پشتیوانانان دەکات، دەڵێت: "پاش ئەمە لە مەدینە زەکاتی سەپاند"[٢٣٠]، لەم بارەوە حافز ئیبن کەسیر دەڵێـت: "کـە خـوای گەورە بڕیاری سـەپاندنی زەکـاتی دا بـۆ پشـتگیری و یارمـەتی دانـی کۆچـکەرە هەژارەکان بوو، ئەوەشی گوتوە، کە هەندێك لە زانایانی فـەرموودەکانی پەیامبــەر شەکەت و ماندوو بوون لە لێکۆڵینەوەی کاتی سەپاندنی زەکات"[٢٣١]

بە سەرنج دانە گرنگیی ئەزموونی یوسفیش سڵاوی خوای لێ بێت لە پلان دانان دا، ئەو ئەزموونەی، کە لە بایـەخ دانـی پـەرتووکی خـوا پێـی، هەڵـدەقوڵێت و، سەرکەوتنی لە بەدەست هێنانی ئامانجەکانی، وا باشـە، کـە وەك کورتەیـەك ئـەم ئەزموونە بخەینە ڕوو.

## ئەزموونی یوسف سڵاوی خوای لێ بێت لە پلان دانان دا:

خوای گەورە سوڕەتی یوسفی بەسـەر پەیامبـەر ﷺ دابەزانـد، وەك بەدەنگـەوە هاتنێکی یاوەران، کە پێیان گوت: ئەی پەیامبەری خوا ﷺ ئەگەر ئەم چیرۆکەمان بەسـەر دا بخوێنیتـەوە، جـا ئـەم ئایەتـە دابـەزی: ﴿نَحْنُ نَقُصُّ عَلَيْكَ أَحْسَنَ الْقَصَصِ﴾[٢٣٢] واتا: "ئێمە جوانترین چیرۆکت بەسەر دا دەخوێنینەوە"

سوڕەتی یوسف بـە سـوڕەتە چـیرۆکییەکان گوزارشـت دەکرێـت، کـە چـەندین مەبەست لەخۆ دەگرێت، مەبەستمان لێی ڕابەریی خوای گەورە بـۆ پەیامبەرەکـەی ﷺ و مووسوڵمانان بۆ گرنگیی پلان دانـانی ئـابووری لـە وڵاتـی ئیسـلامی لێـك دانەوەی بـەر لـە ڕوودانـی دەبیـنین، ئەمـەش لـە میانـەی ئـەو ئایەتانـەی، کـە

---

[٢٣٠] ابن حزم، أبو محمد علي بن أحمد بن سعيد بن حزم: جوامع السيرة النبوية، مكتبة التراث الإسلامي، القاهرة ١٩٨٣، ص٧٤.

[٢٣١] ابن كثير، الحافظ أبو الفداء إسماعيل: الفصول في اختصار سيرة الرسول ﷺ تحقيق محمد العيد طراوي ومحيي الدين مستو، دار العلا بدمشق، طبعة أولى، ص١٠٦- ١٠٧

[٢٣٢] جلال الدين السيوطي: باب النقول في أسباب النزول، القاهرة، طبعة الحلبي، ص١٢٩- ١٣٠.

پەیوەندیدارن بە سەرکەوتنی یوسف سڵاوی خوای لێ بێت بەسەر کێشەی ئابووری، کە زانی بەسەر وڵات دا دێت، ئەمەش لە ڕێگای ڕوون کردنەوەی خەونی پادشا، کە خوای گەورە بە فەرمایشتی خۆی باسی دەکات: ﴿وَقَالَ الْمَلِكُ إِنِّي أَرَى سَبْعَ بَقَرَاتٍ سِمَانٍ يَأْكُلُهُنَّ سَبْعٌ عِجَافٌ وَسَبْعَ سُنبُلاَتٍ خُضْرٍ وَأُخَرَ يَابِسَاتٍ يَا أَيُّهَا الْمَلأُ أَفْتُونِي فِي رُؤْيَايَ إِن كُنتُمْ لِلرُّؤْيَا تَعْبُرُونَ﴾[٢٣٣]. واتا: "(ڕۆژێکیش) پادشا (بە وەزیرو ئەوانەی لە دەوری بوون) گوتی من( لە خەو) هەفت چێڵی قەڵەوم بینیوە، کە هەفت چێڵی لەڕ خواردویانن و هەفت گوڵە گەنمی سەوزم بینی لەگەڵ هەفت گوڵەگەنمی وشکەوە بوو (جا گوتی) ئەی شارەزایان (مانای ئەو خەوە) پێم بڵێن ئەگەر ئێوە لە مانای خەو لێك دانەوە دەزانن". هەروەك یوسف ئەم خەوەی لێکدایەوە، ئەم لێك دانەوەیەش لە فەرمایشتی خوای گەورە دا هاتوە: ﴿قَالَ تَزْرَعُونَ سَبْعَ سِنِينَ دَأَبًا فَمَا حَصَدتُّمْ فَذَرُوهُ فِي سُنبُلِهِ إِلاَّ قَلِيلاً مِّمَّا تَأْكُلُونَ (٤٧) ثُمَّ يَأْتِي مِن بَعْدِ ذَلِكَ سَبْعٌ شِدَادٌ يَأْكُلْنَ مَا قَدَّمْتُمْ لَهُنَّ إِلاَّ قَلِيلاً مِّمَّا تُحْصِنُونَ (٤٨) ثُمَّ يَأْتِي مِن بَعْدِ ذَلِكَ عَامٌ فِيهِ يُغَاثُ النَّاسُ وَفِيهِ يَعْصِرُونَ﴾[٢٣٤] واتا: "گوتی هەفت ساڵ لەسەریەك بە باشی کشتوکاڵ دەکەن، کە دەیدوورنەوە هەر لەناو گوڵەکەی خۆی دا هەڵی بگرن، مەگەر کەمێکی، لەوەی دەیخۆن{٤٧} پاشان دوای ئەم هەفت ساڵە هەفت ساڵی نەهات و وشکەساڵی دەبێت ئەوەی لە هەفت ساڵە هاتەکە دا کۆی دەکەنەوە لەو هەفت ساڵە وشکە دا دەیخۆن، تەنها کەمێکی نەبێت، کە بۆ چاندنەوە و تۆ کردن هەڵی دەگرن{٤٨} پاشان دوای ئەم(هەفت ساڵە ناخۆش و نەهات)ە ساڵێك دێت خەڵکی کشتوکاڵ دەکەن و لێیەوە شەربەت دروست دەکەن".

لە لێکدانەوەی ئەم ئایەتانە دا موحەمەد ڕەشید ڕەزا دەڵێت یوسف سڵاوی خوای لێ بێت، ئەرکی خەڵکی ڕوون کردەوە ئەوەی لەسەریانە بیکەن بۆ چارەسەر

---

[٢٣٣] سورة يوسف: الآية ٤٣.

[٢٣٤] سورة يوسف: الآيتان ٤٧- ٤٩.

کردنی ئەوەی ئەم خەونە مانای دەدات، لەو مەترسییانەی لەسەر وڵات و بەندەکان بەر لە ڕوودانی، کە لە ڕوانگەی ئەم تەگبیرە کردەنییەدا ڕوونی کردەوە[٢٣٥]

یوسف سلاوی خوای لێ بێت چیڵی بە ساڵ لێك دایەوە، لەبەرئەوەی ئەو زەوییە دەکێڵێت، کە بەرهەم و کشتوکاڵی لێ دەردەچێت، ئەمانیش گوڵی سەوزن و، چێڵە لاوازەکانیش، کە قەڵەوەکان دەخۆن، بە وشکە ساڵی لێك دایەوە، کە تێی دا ئەوەی لە ساڵانی بە پیت کۆیان کردەوە دەیخۆن، ئەوانیش گوڵە وشکەکانن[٢٣٦]، کە دەست بەسەر گوڵە سەوزەکان دەگرن، کە دەنکەکان ڕەق بوون و، هیچ سەوزاییەتیی تێ دا نەماوە[٢٣٧]

یوسفیش پێی گوتن: ﴿تَزْرَعُونَ سَبْعَ سِنِينَ دَأَبًا﴾. واتا: "هەفت ساڵ لەسەریەك بە باشی کشتوکاڵ دەکەن"، هەواڵی پێدان، کە هەفت ساڵ کشتوکاڵ دەکەن، ئەویش هەواڵێکە لە مانای فەرمانە بۆ جەخت لەسەر کردنەوەی پێویستیی بەدەست هاتنی فەرمانەکە، وەك ئەوەی بوونی هەیە و ئەویش هەواڵی دەدات[٢٣٨] و، هەواڵی پێدان، کە ئەم کشتوکاڵە بە پێی نەریتی بەردەوامیان دەبێت و، داواشی لێ کردن، کە تۆیەکان دوای دوورینەوەی بەرهەمەکان لە ناو گوڵەکانیان بهێڵنەوە بێ دروێنە کردنیان نەوەك مۆرانە بیخوات و، فەرمانی پێ کردن، کە دروێنەی ئەوەی بەرهەمیان هێناوە بە ڕێژەیەکی کەمی پێداویستییەکانیان بۆ خواردن بەکار بهێنن و، ڕێژە زۆرەکانیش بۆ کاتێکی پێویست پێی بپارێزرێت، کە هەفت ساڵە وشکەکانن، خەڵکی تێی دا هەڵدەستن بە خواردنی ئەو خۆراکەی پاشەکەوتیان کردوە لەو خواردنەی ساڵانی ڕابردوو، تەنها کەمێکی ئەوەی خرپیان کردۆتەوە و یا

---

[٢٣٥] محمد رشيد رضا: تفسير المنار، الجزء ١٢، دار المنار، ص٣١٩.

[٢٣٦] ابن كثير: تفسير القرآن العظيم- تحقيق عبد العزيز غنيم ومحمد عاشور ومحمد إبراهيم البنا، طبعة الشعب، المجلد الرابع، ص٣١٨.

[٢٣٧] الألوسي: روح المعاني في تفسير القرآن العظيم والسبع المثاني، طبعة المنيرية، الجزء الثاني عشر، ص٢٤٩.

[٢٣٨] الزمخشري: الكشاف عن حقائق التنزيزل وعيون الأقاويل في وجه التأويل، تحقيق محمد الصادق قمحاوي الحلبي، الجزء الثاني، ص٣٢٥.

پاشەکەوتیان کردوە بۆ تۆکردن، پاشان یوسف هەواڵێکیشی پێدان، کە لە خەوەکەی پادشا دا نەبوو، خوا فێری کرد بۆ دەرخستنی باشی و پێگەکەی ئەویش ئەوەیە، کە دوای ئەم ساڵانە، ساڵێك دێت، کە باران تێی دا ڕوو دەکات، میوە زۆر دەبێت و خەڵکی تریێ دەگوشن[٢٣٩]، ئەم هەواڵەش لە فەرمایشتی خوای گەورە دا هاتوە: ﴿ثُمَّ يَأْتِي مِن بَعْدِ ذَٰلِكَ عَامٌ فِيهِ يُغَاثُ النَّاسُ وَفِيهِ يَعْصِرُونَ﴾[٢٤٠] واتا: "پاشان دوای ئەم( هەفت ساڵە ناخۆش و نەهاتە)ە ساڵێك(ی هات و خۆشی) دێت خەڵکی میوە بەرهەم دەهێنن و دەیانگوشن"

هەروەها عەکرِمە و ئیبن ئەباس لە پەیامبەری خواوە ﷺ گێڕاویانەتەوە، کە فەرمویەتی: (لقد عجبت من يوسف وكرمه وصبره، والله يغفر له حين سئل عن البقرات العجاف والسمان، ولو كنت مكانه ما أخبرتهم، حتى اشترط عليهم أن يخرجوني)[٢٤١] واتا: (سەرم سووڕماوە لە ئارامی و سەربەرزیی یوسف، خوا لێی خۆش بێت، کاتێك پرسیاری چێڵە قەڵە و سیسەکانی لێ کرا، ئەگەر لە جێگای بام هەواڵم پێ نەدەدان، تا لە گرتووخانە دا دەریان دەهێنام)، کاتێك پادشا گوێی لە لێك دانەوەکەی یوسف بوو بۆ خەوەکەی داوای یوسفی کرد، بەڵام یوسف گوتی لە گرتووخانە دا دەرناچم بەر لەوەی پادشا لە پاکییەکەی بێ گومان بێ لە تۆمەتی نیاز خراپی کردنی بە ژنی ئازیز، ئەبو هورەیرەش گێڕاویەتەوە لە پەیامبەری خواوە ﷺ فەرمویەتی: (ولو لبثت في السجن ما لبث يوسف لأجبت الداعي)[٢٤٢]. واتا: (ئەگەر بە قەد یوسف لە گرتووخانە دا مابامەوە، وەڵامی داواکارم دەداوە)، کە پادشا ئارەزوەکەی بەدەست هێنا و گومانی لە پاکی یوسف نەما یوسفی بانگ کرد و پێی گوت: ﴿إِنَّكَ الْيَوْمَ لَدَيْنَا مَكِينٌ أَمِينٌ﴾[٢٤٣]. واتا: "لەمڕۆوە تۆ لای ئێمە پایەیەکی جێی متمانەت هەیە"، یوسفیش فەرموی: ﴿اجْعَلْنِي عَلَىٰ خَزَائِنِ الْأَرْضِ

---

[٢٣٩] البغوي: تفسير البغوي، معالم التنزيل، طبعة الحلبي، الجزء الثاني، ص٢٨٧- ٢٨٨.

[٢٤٠] القرطبي: الجامع لأحكام القرآن، طبعة مطبعة دار الكتب المرية، الجزء التاسع، ص٢٠٤- ٢٠٥.

[٢٤١] الشوكاني: فتح القدير، طبعة الحلبي، الجزء الثالث، ص٣٢.

[٢٤٢] أخرجه البخاري- كتاب التفسير- تفسير سورة يوسف، طبعة الحلبي، الجزء٦، ص٥٩٦.

[٢٤٣] سورة يوسف: الآية ٥٤.

إِنِّي حَفِيظٌ عَلِيمٌ﴾[٢٤٤]. واتا: "لەسەر گەنجینەکانی ولآت دامبنێن، من پـارێزەرێکی بە زانستم"، واتا بمکە بە والیی پارێزەری کۆگەی ئەو شوێنەی، کە لە ولآتی میسر دانەوێلەی لێ کۆدەکرێتەوە، چونکە مـن شـارەزام بـە چـۆنیەتیی کۆکردنـەوەی و، بەتالّ کردن و داهاوێشتن و دەرهاوێشتنی[٢٤٥]

یوسفیش سلآوی خوای لێ بێت فەرمانداریی میسـری گرتـە ئەسـتۆ و بـەدوای جێبەجێ کردنی پلانە ئابوورییەکەی دا چوو، پاشان دۆخی ساڵە بێ بارانییەکـەی و برسێتیی ڕووبەڕوو بوەوە و ڕێوشوێنەکانی گرتە بەر لە کۆگە کردنـی دانەوێڵـە دا، کە هەڵستا بە کردنەوەی کۆگە گـەلێك و، فرۆشـتنی ڕۆزی بـۆ خـەلکی میسـر و، خەلکی فەلەستینیش دەهاتنە لای بۆ کڕینـی خـواردن، کـە برسـێتی زەوییـەکانی ئەمانیشی گرتبوەوە[٢٤٦]

هەڵبەت یوسف سلآوی خوای لێ بێت کارگێریی ولآتی باش کرد، لەم سالآنە دا تا پەڵە هەورەکە لاچوو، خوای گەورەش نێوانی یوسف و باوان و برایـەکانی بەیـەك گەیاندەوە[٢٤٧]

لەم خستنەڕوەی پێشووی چیرۆکی یوسف سلآوی خوای لێ بێت ئەم ئەنجامانـەی خوارەوە پوخت دەکەین:

١ - یوسف سلآوی خوای لێ بێت هەڵستا بە ئامادە کردنی پلانێك بۆ ڕووبەڕوو بوونەوەی ئەو بێ بارانییەی، کە زانی ولآت دەگرێتەوە و، ئەم پلانەش بە زانیـاریی پادشا پەسەند کرا و، ڕێوشوێنەکان بۆ چـۆنیەتیی جێبـەجێ کردنـی گیرایەبـەر و، یوسفیش هەڵستا بە جێبەجێ کردنی ئەم پلانە و بەدواداچوونی.

---

[٢٤٤] سورة يوسف: الآية ٥٥.
[٢٤٥] الشوكاني: فتح القدير، طبعة الحلبي، الجزء الثالث، ص٣٥.
[٢٤٦] عبد الوهاب النجار: قصص الأنبياء، دار التراث، القاهرة، ص١٦٧.
[٢٤٧] محمد الشرقاني: الأنبياء في القرآن الكريم، القاهرة، طبعة الشعب، ص١٢٤.

٢ - ئەم پلانەی پێشوو باسمان کرد، لە جۆری پلانە نەتەوەییەکانە، کە هەموو میسری گرتەوە، بەڵکو بۆ فەلەستینیش درێژ بووە، هەروەك ئەم پلانە لە جۆری پلانە ماوە درێژەکانە، کە گەیشتە پازدە ساڵ.

٣ - یوسف سڵاوی خوای لێ بێت هەڵستا بە ئامادە کردنی یەکەم بودجەی پلان دانانیی بنیاتنراو لەسەر بنەمای زانستی و، تێی دا پایەکانی بودجەی پلان دانانی لە چەرخی نوێ دا تەواو کرد، کە لەجۆری بودجە درێژ خایەنەکانە[٢٤٨]

٤ - هەڵبەت سورەتە پیرۆزەکە، ئەو ئەدگارانەی ڕوون کردوەتەوە، کە پێویستە لە پلان دانەر دا هەبن، وەك پاراستن و زانین و تەگبیر کردن و خۆپارێزی و ئارامی و پەنا گرتن بە خوا و چاکەکاری و ژیری و ڕاستگۆیی و ڕازگری و دادگەری و بەخشندەیی و دڵسۆزی[٢٤٩]

٥ - یوسف بایەخی بە جێبەجێ کردنی پلانە ئابوورییەکەی دا، هەروەك هەڵستاوە بە پێوانە کردنێکی گشتگری زەوییەکانی میسر و، دیاری کردنی ژمارەی دانیشتوان لەهەر شار و دێیەك، هەروەك هەڵستا بە ئامار کردنی دەرامەتەکان لە ئازوقە و ئاژەڵ و پەلەوەر و دانەوێڵە و، بۆ هەر کەرتێك یا کێڵگەیەك یا کارگێرییەك، نووسەرێکی دانا، کە هەڵستێت بەم کارانە، هەروەك ژمارەیەکی زۆر شوێنی بۆ دانەوێڵە پاراستن دامەزراند و، گەورەکانی لە شارە گەورەکان دانا و، بچووکەکانیش لە شارە بچووکەکان و، لەسەر کەنارەکانی نیل داینا، بۆ ئەوەی کرداری دابەش کردن و فرۆشتن ئاسان بێت[٢٥٠]

٦ - یوسف سڵاوی خوای لێ بێت بە وردییەکی کۆتاهێنەر و تەگبیرێکی باش ڕووبەڕووی ئەو برسێتییە بوەوە، کە ڕووبەڕووی وڵات بوەوە، هەروەك بۆ هەر کڕیارێك بە پێوانەی تەنها باری وشترێك لە دانەوێڵەی دەفرۆشت، بۆ ئەوەی خواردن بەشی

---

[٢٤٨] مرسي سلامة: أصول الإدارة هي في الإصل من منهج الله، بحث مقدم للمؤتمر العلمي السنوي الثالث، المنهج الاقتصادي في الإسلام بين الفكر والتطبيق والذي أعدته كلية التجارة، جامعة المنصورة، مطبوعات المؤتمر، ص٥- ٦

[٢٤٩]. سيد قطب: في ظلال القرآن، طبعة دار الشرق، القاهرة، الجلد الرابع، ص١٩٤٩- ٢٠٣٧.

[٢٥٠] حمدية زهران: التخطيط الاقتصادي، ص٢٠- ٢١.

هەموان بکات[٢٥١]، هەروەك یوسف لە بەخشین دا یەکسانیی لە نێوان تاکەکان دا پەیڕەو کرد، کە بۆ هەر تاکێك پێوانەی باری وشترێك هەبوو، واتا بۆ هەر تاکێك ڕادەیەکی تەواوی لە خۆراك دانا بوو[٢٥٢]

## دووەم: پلان دانانی سەربازی

ئیسلام بایەخی بە پلان دانانی سەربازی داوە، ئەم بایەخەش لە بنەڕەت دا پەروەردگارییە لە لایەن خوای حەق و بڵند، کە دەفەرموێت: ﴿وَأَعِدُّواْ لَهُم مَّا اسْتَطَعْتُم مِّن قُوَّةٍ وَمِن رِّبَاطِ الْخَيْلِ تُرْهِبُونَ بِهِ عَدْوَّ اللّهِ وَعَدُوَّكُمْ﴾[٢٥٣]. واتا: "بە پێی توانا(هەموو هۆکارەکان) لە هێز(ی شەڕ کردن) و لە ئەسپی شەڕیان بۆ ئامادە بکەن، بۆ ئەوەی دوژمنانی خوا و دوژمنانی خۆتانی پێ بترسێنن"، ئامادەکاری قۆناغێکە لە قۆناغەکانی پلان دانان، بەڵکو قۆناغی ئامادەکاری بە گرنگترین قۆناغەکانی پلان دانان گوزارشت دەکرێت، بەوەی، کە بەکارخستنی دەرامەتی مرۆیی و دارایی لەم ئامادەکارییە دا لە خۆ دەگرێت و، پلان دانانیش باش نابێت، ئەگەر لەسەر ئامادەکارییەکی باش دانەمەزرێت.

هەڵبەت خوای پاك و بڵند هانی بایەخ دانمان بە قۆناغە سەرەتاییەکانی پلان دانانی سەربازی دەدات، ئەویش قۆناغی پەیوەست بوون و ئامادەکارییە بۆ ڕووبەڕوو بوونەوەی دوژمن، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ اصْبِرُواْ وَصَابِرُواْ وَرَابِطُواْ وَاتَّقُواْ اللّهَ لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ﴾[٢٥٤]. واتا: "بڕوادارینە ئارام بگرن و ئارامگر بن و بەیەکەوە پەیوەست بن و پارێزکار بن بەڵکو سەرفراز بن" و، پەیامبەری خواش ﷺ لەبارەی ئەرك بوونی پەیوەست بوون بە سنووری خوا و، بەردەوام پاسەوانی و شەوخوونی لە پاراستنی و، ئامادەکاری بۆ ڕێ گرتن لە

---

[٢٥١] سید قطب: في ظلال القرآن، المجلد الرابع، ص٢٠١٧.
[٢٥٢] حمدية زهران: التخطيط الاقتصادي، ص٢٣- ٢٥.
[٢٥٣] سورة الأنفال: الآية ٦٠.
[٢٥٤] سورة آل عمران: الآية ٢٠٠.

دوژمن لێی دواوە و، پەیوەست بوونیشیان بە مەزنترین کاری نزیك بوونەوەیان لە خوای شکۆمەند، گوزارشت دەکرد[٢٥٥]

هەروەك خوای گەورە پلان دانانی وریاییمان ئاراستە دەکات، خوای بڵند دەفەرموێت: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ خُذُواْ حِذْرَكُمْ فَانفِرُواْ ثُبَاتٍ أَوِ انفِرُواْ جَمِيعًا﴾[٢٥٦] واتا: "بڕوادارینە(لە ڕاست دوژمنانتان) وریا بن ئامادە بن بۆ بەرەنگاربوونەوەیان( هیچ کەسێك بە تەنیا نەچێت بۆ لایان) بەشێوەی دەستەی یەکگرتوو ڕوویەڕویان بوەستن(ئەگەر زۆر نەبوون خۆ ئەگەر زۆر بوون) سەرجەمتان بەرەنگاریان ببنەوە"، بەڵکو پلانێکی وردەکاریی بۆ نوێژ کردن لە مەیدانی تێکۆشان (جیهاد) دا بۆ داناوین، کە بە وریایی و پارێزەوە ئاودەبرێت و، دانانی چەك، مەگەر پۆزشت هەبێت، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَإِذَا كُنتَ فِيهِمْ فَأَقَمْتَ لَهُمُ الصَّلاَةَ فَلْتَقُمْ طَآئِفَةٌ مِّنْهُم مَّعَكَ وَلْيَأْخُذُواْ أَسْلِحَتَهُمْ فَإِذَا سَجَدُواْ فَلْيَكُونُواْ مِن وَرَآئِكُمْ وَلْتَأْتِ طَآئِفَةٌ أُخْرَى لَمْ يُصَلُّواْ فَلْيُصَلُّواْ مَعَكَ وَلْيَأْخُذُواْ حِذْرَهُمْ وَأَسْلِحَتَهُمْ وَدَّ الَّذِينَ كَفَرُواْ لَوْ تَغْفُلُونَ عَنْ أَسْلِحَتِكُمْ وَأَمْتِعَتِكُمْ فَيَمِيلُونَ عَلَيْكُم مَّيْلَةً وَاحِدَةً﴾[٢٥٧] واتا: "ئەگەر لە نێویان بویت، (پێشەوایی) نوێژت بۆ ئەنجام دان، با کۆمەڵێکیان لەگەڵت دا ئەنجامی بدەن و چەکەکانیان هەڵبگرن، کە کڕنووشیان برد با بچنە پشتتانەوە و کۆمەڵەکەی تر، کە نوێژیان نەکردوە با لەگەڵت دا نوێژ بکەن و چەکەکانیان هەڵبگرن، بێ بڕواکان لە هەل دان بۆ ئەوەی لە چەك و کەل و پەلەکانتان بێ ئاگابن و هەڵتان بقۆزنەوە".

مووسوڵمانان بایەخیان بە پلان دانانی سەربازیش داوە و، مکوڕ بوونە لەسەر ڕەخساندنی ئەو کۆڵەگانەی، کە ساخیی ئەم پلانە و، سەرکەوتنی بەدەست دەهێنن، لەم کۆڵەگانەش:

---

[٢٥٥] أحمد حسين: الحرب على هدى القرآن والسنة، طبعة المجلس الأعلى للشؤون الإسلامية، القاهرة، الكتاب الثامن والثمانون، ص٤٢- ٤٣.

[٢٥٦] سورة النساء: الآية ٧١.

[٢٥٧] سورة النساء: الآية ١٠٢.

١ - بەشداریی نێوان سەرکردە و سەربازەکانی لە دانانی پلان دا.

٢ - جێبەجێ کردنی پلانەکە لە نێو پەیوەندییەکی باشی نێوان سەرکردە و سەربازەکانی دا بێت.

٣ - گیانی شەڕکردن، واتا گیانی واتایی سووپا بەرز بێت.

**کۆڵەگەکانی پلانی سەربازی:** پێمان وایە چەندین کۆڵەگەی پلانی سەرکەوتوی سەربازی هەن، هەندێکی دەخەینە ڕوو، بۆ نموونە شەڕی بەدری گەورە دەکەینە ڕێبەر:

١ – **ڕاوێژ:** مەبەست لێی ڕاوێژ کردنی سەرکردەیە بە سەربازەکانی و، لە ڕای خۆی دا زۆرداری نەکات، پەیامبەریش ﷺ لە ڕووبەڕوو بوونەوەی هاوبەش دانەران ڕاوێژی بە هاوەڵانی کرد، کاتێك زانی هاتوون بۆ پارێزگاری لە کاروانەکەیان، هەروەها پەیامبەری خوا ﷺ بە ڕاوێژی کۆچکەران نەوەستا، بەڵکو ڕاوێژی بە پشتیوانانیش کرد، هەروەك سەعدی کوڕی مەعاز پێی گوت: "ئەی پەیامبەری خوا بەکارمان بهێنە بەو جۆرەی گەرەکتە، سوێند بەوەی، کە تۆی بە حەق ڕەوانە کردوە، ئەگەر ئەم دەریایەمان بۆ نیشان بکەیت بچیتە ناوی لەگەڵت دێینە ناوی، یەك پیاومان دوا ناکەوێت"[٢٥٨]، هەروەها پەیامبەر ﷺ سەبارەت بەو شوێنەی لێی دابەزی بوو ڕاوێژی بە هاوەڵانی کرد، کە حەبابی کوڕی مونزوری ئەنساری ئاماژەی پێ کرد، پێی گوت: "بە باشی دەزانم بۆ لای گردێك بچین، کە پێشتر شارەزایم ئاوی زۆرە و سازگارە، لەوێ دابەزین و پێش خەڵکەکە بکەوین"، پەیامبەریش ﷺ ڕاوێژەکەی پەسەند کرد[٢٥٩]

٢ - **کۆ کردنەوەی زانیاری و ڕوون کردنەوەکان:** هەڵبەت سووپای ئیسلام بە پێی چەند و چۆنی بەدوای هەواڵی دوژمنی دا دەگەڕا، ئەوەتا پەیامبەری خوا ﷺ لەو دوو بەندەی، کە هەندێك هاوەڵی لە لای بەدر دەست بەسەریان کردن، پرسیاری شوێنی قورەیشییەکانی لێیان کرد، گوتیان: لە پشتی

---

[٢٥٨] ابن هشام: السيرة النبوية، الجزء الثاني، ص٤٤٧- ٤٤٨.

[٢٥٩] فرناس عبد الباسط البنا: التخطيط، ص١٠٤.

ئەم گردەن و، کاتێك لێی پرسین: چەندن؟ گوتیان: نازانین. جا پێـی گـوتن: ڕۆژانـە چەند جار وشتر دەکوژنەوە؟ گوتیان: ڕۆژێك دە و ڕۆژێك نۆ. پەیامبەری خـواش ﷺ فەرمویی لە نێوان نۆسەد تا هەزار کەس دان)[٢٦٠]

٣ - **بەکارخستنی دەرامەتە فەراهەمەکان:** پێوستە دەرامەتـە فەراهـەم کراوەکان لە جێبەجێ کردنـی پـلان دانـان دا بـەکاربخرێن، ئـەم دەرامەتانـەش یـا دەرامەتی مرۆیین یا کەرەستەیی و، لە شەڕی بەدر ژمارەی مووسوڵمانان سێ سـەد و چاردە تا نۆزدە پیاو و دوو ئەسپ بوو، یەکێکیان هـی زوبێـری کـوڕی عـەوام و ئەوەی تر هی میقدادی کوڕی ئەسوەدی کەندی بوو و، هەفتا وشتریان لەگەڵ بوو، دوو پیاو یا سێیان بە نۆرە لەسەر یەك وشتر دەبوون[٢٦١]

٤ - **لە خوا ترسان(پارێزکاری):** هەڵبەت سەربازانی سووپای ئیسلام بـە خۆپارێزی و دووری لە یاخی بوون ڕازا بوونەوە و، زۆریی بڕوا بوون بە خوا و پابەند بوون بە فەرمانەکانی و واز هێنان لە یاساخ کراوەکانی شان بەشان بوو لەگەڵ چەند و چۆنیی دەرامـەتەکان، ئەمـەش ئەوەیە، کە بە ئاشکرا لە شەڕی بـەدر دەرکـەوت، هەروەك مووسوڵمانان، کە لە ژمارە و چەند و چـوونی دا کـەمیش بـوون، بەسـەر هاوبەشدانەران دا سەرکەوتن، کە لە ژمارە و چەندو چـۆنی دا زۆر بـوون، هـەروەك ئەبوبەکر بۆ سووپای مووسوڵمانانی نووسی پێش ڕوودانی جـەنگی یـەرمووك کـە: "کۆ ببنەوە و ببن بـە سـووپایەکی یـەك ڕیـز، لێشـاوی بـێ بـاوەڕان بـە لێشـاوی موسوڵمانان ڕەت بکەنەوە، لە بەرئەوەی ئێـوە پشـتیوانی ئـایینی خـوان و خـوای گەورەش ئەوە سەردەخات، کە ئایینی خـوا سـەر بخـات و، ئـەو کەسـەش ڕیسـوا

---

[٢٦٠] ابن القيم: زاد المعاد في هدى خير العباد، تحقيق طه عبد الرؤوف طه، طبعة الحلبي، القاهرة، الجزء الثاني، ص٩٦.

[٢٦١] ابن القيم: زاد المعاد في هدى خير العباد، تحقيق طه عبد الرؤوف طه، طبعة الحلبي، القاهرة، الجزء الثاني، ص٩٥.

دەكات، كە بیّ باوەڕ بێت، هەروەها هاو شێوەی ئێوە لەناو ناچن لە کەمی، بەڵکو لە ڕێگەی گوناهەكان تووشی زیان دەبن، جا خۆتان لە گوناه بپارێزن"[٢٦٢]

## سێیەم: پلان دانانی كارگێڕی

پلان دانانی كارگێڕی بایەخ بە دانانی ئەو پلانە جێبەجیّ كردنییانە دەدات، كە بەكارخستنی توانا و دەرامەتە فەراهەمەكان لە خۆ دەگرێت، ئەمەش بۆ بەدەست هێنانی ئامانجەكان.

حكومەت و دەسەڵاتی سیاسی لە كارگێڕیی دانراوی دا هەڵدەستن بە دانانی ئەو ئامانجانە و، وێنا كردنی سیاسەتی پێویست بۆ بەدەست هێنانی و، ڕۆڵی كارگێڕی لە پلان دانانی جێبەجیّ كردنی دا كورت دەكەنەوە و، ڕەنگە ماوە بە بەشداری كردن لە دانانی ئامانجەكان و وێنا كردنی سیاسەتەكانیش بدات.

بەڵام لە بەڕێوەبردنی ئیسلامی دا، ئەوا دوا ئامانج پەرستنی خوا و ئاوەدان كردنەوەی بوونە و، بۆ بەدەست هێنانی ئەم دوایین ئامانجانەش، دەبێت ئامانجە قۆناغییەكان بەدەست بێن، كە سەرجەمیان بۆ بەدەست هێنانی ئەمانجە كۆتاییەكان هەوڵ دەدەن و، سیستمی ئیسلامیش بە جۆرە جیاجیاكانی، لە سیاسی و ئابووری و كارگێڕی و نێونەتەوەیی و سەربازی بۆ بەدەست هێنانی ئامانجە قۆناغییەكان كۆشش دەكەن، ئەویش لە پێناو گەیشتن بە بەدەست هێنانی ئامانجی كۆتایی[٢٦٣]

سەبارەت بە وێنا كردنی سیاسەت، هەندێك دەڵێن هەر خوای گەورەیە، كە سیاسەتی گشتیی داناوە و، هەر ئەمیشە ئامانجە سەرەكییەكان دیاری دەكات و، پەیامبەریشی ﷺ ئاگادار دەكرد بۆ جێبەجیّ كردنیان.

---

[٢٦٢] عبد الوهاب النجار: تاريخ الإسلام- الخلفاء الراشدون، القاهرة، طبعة المطبعة السلفية، ص٩٤-٩٥.

[٢٦٣] محمد عبد المنعم خميس: الإدارة في صدر الإسلام، طبعة المجلس الأعلى للشؤون الإسلامية، ص٤٣.

ئەم گوزارشتە ئەگەر چی پەسەندە، بەڵام ورد نییە، چونکە سیاسەت لە پلان دانانی کارگێڕیی ئیسلامی، دەبێت سیاسەتێکی ڕەوا بێت، لەم بارەوە گوتراوە: "سیاسەتێك نییە مەگەر لەگەڵ ئیسلام دا کۆك بێت".

ئیبن قەیم لە بارەی ئەم وتەیەوە دواوە دەڵێت: مەبەست لە گوتنی: "تەنها ئەگەر لەگەڵ ئیسلام دا کۆك بێت" واتا لەگەڵ ئەوەی لە ئیسلام دا هاتوە، پێچەوانە نەبێت، ئەوا دروستە، ئەگەر مەبەست سیاسەت نییە تەنها ئەوەی لە ئیسلام دا گوتراوە، ئەوە هەڵەیە بە هەڵە دانانی هاوەڵانیشە[٢٦٤]

ئیبن قەیم سیاسەتی گشتیی ئیسلامیی لە گشت فرمانێکی ژیان ڕوون کردوەتەوە، دەڵێت: "خوای گەورە پەیامبەرەکەی ناردوە و پەرتووکەکەی دابەزاندوە بۆ ئەنجام دانی یەکسانی لە نێو خەڵکی دا، ئەویش ئەو دادگەرییەیە، کە ئاسمان و زەویی لەسەر دامەزراوە، جا ئەگەر نیشانەکانی دادگەری دەرکەوت و، لەهەر ڕێگایەك دا ڕەنگی دایەوە: ئەوا ڕێبازی خوا و ئایینەکەیەتی.... خوای گەورەش ڕوون دەکاتەو بەو ڕێگانەی دایناوە: کە مەبەست لە دامەزراندنی دادگەری نێوان بەندەکان و هەڵستانی خەڵکی بە دادگەری بەهەر ڕێگەیەك، کە دادوەری و دادگەری لێ بێتە دی ئەوە لە دینە و پێچەوانەی نییە[٢٦٥]

لەمەوە دەردەکەوێت، کە بنەمای سیاسەتی ڕەوای گشتی لە کارگێڕیی وڵاتی ئیسلامی، لە دامەزراندنی دادگەریی نێوان خەڵکی دا دەردەکەوێت.

سیاسەتیش پەیوەستییەکی پتەوە بە ئامانجەوە بەندە، واتا سیاسەتی گشتیی ڕەسەن بە دوا ئامانجەوە بەندە و، سیاسەت گەلێکی قۆناغیش هەیە، کە لەچارچێوەی سیاسەتی گشتیی ڕەسەن دا دەخولێتەوە و، بە ئامانجە قۆناغییەکانەوە بەندە، هەموو ئەو ئامانج و سیاسەتانەش هەوڵی بەدەست هێنانی

---

[٢٦٤] ابن القيّم: الطرق الحكمية في السياسة الشرعية، تحقيق د. محمد جميل غازي، طبعة المدني بالقاهرة، ١٩٧٧، ص١٧- ١٨.

[٢٦٥] ابن القيّم: الطرق الحكمية في السياسة الشرعية، تحقيق د. محمد جميل غازي، طبعة المدني بالقاهرة، ١٩٧٧، ص١٩.

ئامانجی کۆتایی دەدەن و، سیاسەتی ئیسلامیش بە چەسپاوی و سەقامگیری و ڕوونی جیا دەکرێتەوە.

سەقامگیریی سیاسەتی ئیسلامی، دەبێتە هۆی سەقامگیریی پلان و چەسپاویی، هەروەك ڕوونیی سیاسەت دەبێتە هۆی ڕوونیی پلان و ئاسانیی جێبەجێکردنی، ئەم چاکییانەش یارمەتیی سەرکەوتنی پلان و بەدەست هێنانی ئامانجەکانی دەدەن.

دوای دانانی ئامانجە قۆناغییەکان و وێنا کردنی سیاسەتە بەشەکییەکان، کارگێری هەڵدەستێت بە دانانی پلانی جێبەجێ کردنی و بەرنامەی پێویست بۆ جێبەجێ کردنی ئەو ئامانجانە، بۆ گەیشتن بە ئامانجی کۆتایی، هەروەك کارگێرانی جێبەجێ کردنی دەسەلاتی سیاسی، لە دانانی ئامانجە قۆناغییەکان و وێنا کردنی سیاسەتی بەشەکی بەشداری دەکەن و، لەسەر سەرۆکی کارگێری پێویستە ڕاوێژ بە کەسانی پسپۆڕ لەم بارەوە بکات، پەیامبەری خواش ﷺ پێشەنگی سەرۆکە کارگێرییەکانە لەم بارەوە، هەروەك لە دایکە عائشەوە خوا لێی ڕازی بێت دەگێڕنەوە، فەرمویەتی: پیاوێکم نەدیوە زیاتر لە پەیامبەری خوا ﷺ ڕاوێژ بە پیاوان بکات[٢٦٦]

ڕاوێژ لە بواری پلان دانانی کارگێری دا چەندین کەڵك بەدەست دەهێنێت، لەنێویان:

١- **ڕاستەقینەیی پلان:** ئەمەش لەبەر ئەوەی بەشدار کردنی جێبەجێکەران لە دانانی پلان، نەکەوتنەوەی ئەو کارە سەختانەی دەبنە هۆی لەکارخستنی جێبەجێ کردنی، مسۆگەر دەکات.

٢ - **ئاسانیی جێبەجێ کردنی پلان:** ئەمەش بۆ ئاسانیی تێگەیشتنی جێبەجێکەران لە ئامانجە قۆناغییەکان، کە خواستراوە بەدەست بێن و، بایەخ دانیان بەجێبەجێ کردنی ئەو پلانەی، کە پشکداریان لە دانانی دا کردوە.

---

[٢٦٦] أبو محمد بن حبان الأصبهاني "ابو الشيخ": أخلاق النبي وآدابه، تحقيق أحمد محمد موسى، مراجعة محمد عبد الرحمن عثمان، مؤسسة الأهرام بالقاهرة، ١٩٨١، ص٢٥٩.

**٣ - مەشق پێ کردن لەسەر پلان دانان:** بەشدار کردنی تاکەکان لە دانانی پلان ڕایان دەهێنێت لەسەر بیرکردنەوەی زانستیی ڕێکخراو، توانست لەسەر تێبینی کردن و خوێندنەوە و هەواڵداری، بۆ هەڵستان بە کردارەکانی پلان دانان بە گورجییەکی بەرز، تەیاریان دەکات.

ئەوەی پێشوو پوخت دەکەین، کەوا کارگێڕیی ئیسلامی ڕابەرێك بوو لە بڕیاردانی بەشدار کردنی کارگێڕەکان لەگەڵ سیاسییەکان لە دانانی ئامانجە قۆناغییەکان و وێنا کردنی سیاسەتەکان، لە کاتێك دا سیستەمە دانراوییەکان بێ پشتگیری کردنی ئەم بەشدار کردنە دەستیان پێ کرد، بۆ بەدەست هێنانی جیا کردنەوەی دەسەڵاتەکان، بەجۆرە مایەوە، پاشان بەم دواییە ڕوی کردە پەسەند کردنی، دوای ئەوەی خەوشەکانی تاکڕەویی دەسەڵاتی سیاسی لە دانانی ئامانجەکان و وێنا کردنی سیاسەتەکان ڕوون بوەوە، ئەمەش بە دەرچوون لە ئەوەی، کە بنەمای جیا کردنەوەی نێوان دەسەڵاتەکان دەیخوازێت[٢٦٧]

---

[٢٦٧] فرناس عبد الباسط البنا: التخطيط، ص١٠٨.

# بەشی سێیەم

# نموونەکانی پلان دانانی ئیسلامی

## بەرایی

پەیامبەری خوا ﷺ بۆ دامەزراندنی ولاّتی ئیسلامی بایـەخی بـە پـلان دانـان داوە، لەبەر ئەوەی کۆمەڵگەی مەکەیی بەرهەڵستیی بانگەوازەکـەیان کـرد و، بـە هەڵوێستێکی دوژمنکارانە بەرانبەر مووسوڵمانان وەستان و، لە ئازاردانیان دا بـە زەبر بوون، بۆیە پەیامبەری خوا ﷺ بیری لە سەربەخۆیی بوون لە کۆمەڵگەی مەکە و، سەقامگیر بوون لە زەوییەکی تازەی دڵنیا کردەوە، کـە بـۆ بانگـەواز بشـێت و شوێنێکی دڵنیا بێت بۆ ولاّتە تازەیەکەی ئیسلام[٢٦٨]

گەڕانیش لە شوێنێکی سەقامگیریی ولاّتی تازەی ئیسلام لە هەمان ئەو کاتـە دایە، کە پەیامبەر ﷺ پلانەکـەی تێـی دا جێبـەجێ دەکـات بـۆ بـلاّو کردنـەوەی بانگەوازی ئیسلام، قۆنـاغی کـۆچ کـردنیش بـۆ حەبەشـە قۆنـاغێکی کـاتی بـوو ئامادەکاریی بۆ ئایندە و جێگیر بـوون لـە شـوێنێکی شـیاوی لـەخۆ گـرت بـوو، هەروەك پەیامبەری خوا ﷺ بانگەوازەکەی بۆ خێڵەکان دەکرد، بۆ بانگخوازی و، لە هەمان کاتیش دا بۆ گەڕان لە ولاّتێکی دڵنیا بۆ ولاّتەکەی، هـەروەك لـە بەسـتنی پەیمانی ئەقەبەی یەکەم دا، سەبارەت بە بەستنی پەیمانی عەقەبەی دووەمیش، ئـەوا پەیمانێکی بڕوایی بوو، کە پشتیوانانی ئەوس و خەزرەج بەدەنگیەوە هاتن، هەروەك لە هەمان کات دا ڕێککەوتنێکی کۆتایی بوو لەسـەر شـوێنی سـەقامگیر بـوونی ولاّتی تازە. ئەم کارانەی پێشووش، بۆ کۆچـی پەیامبـەری خـوا درود و سـەلامی خوای لەسەر بێت، بە کارێکی ئامادەکاری گوزارشت دەکرێن لە پێناو دامەزراندنی

---

[٢٦٨] محمد سليم العوا: في النظام السياسي للدولة الإسلامية، المكتب المصري الحديث، الطبعة الثالثة، ١٩٧٩، ص٤٠.

وڵاتی ئیسلامی، بەڵام ئەو کارانەی، کە بە کۆچ کردنی پەیامبەری خوا ﷺ لەمەکەوە بۆ مەدینە دەست پێ دەکەن، بە کار گەلێکی جێبەجێ کردنی گوزارشت دەکرێن بۆ دامەزراندنی ئەو وڵاتە و بەڕێوەبردنی

لەگەڵ پەسەندمان بەوەی، کە پلان دانان بۆ دامەزراندنی وڵاتی ئیسلامی لەوەتەی خستنەڕوی بانگەواز بۆ خێڵەکان و کۆچ بۆ حەبەشە و، بەردەوام بوون لە بەستنی دوو پەیمانەکەی عەقەبەی یەکەم و دوەم، دەستی پێ کرد، بەڵام بە چاکی دەزانین، کە قۆناغەکانی دامەزراندنی وڵاتی ئیسلامی لەو کاتەوەی کارە جێبەجێ کردنییەکان دەستیان پێ کرد، دەست پێ بکەین، واتا لەوەتەی کۆچی پەیامبەری خوا ﷺ بۆ مەدینە[٢٦٩]

لە خوارەوەش نموونەکانی پلان دانانی ئیسلامی وەرگیراو لە قۆناغەکانی پلان دانانی دامەزراندنی وڵاتی ئیسلامی دەخەینە ڕوو.

بۆ ئەم نموونانەش بە گوێرەی قۆناغەکانی دامەزراندنی وڵاتی ئیسلامی لە چار توێژبەند دا دەخەینە ڕوو:

توێژبەندی یەکەم: نموونەی پلان دانانی کۆچی پەیامبەری خوا ﷺ بۆ مەدینە.

توێژبەندی دوەم: پلان دانانی بنیات نانی مزگەفت.

توێژبەندی سێیەم: پلان دانانی برایەتیی نێوان مووسوڵمانان.

توێژبەندی چارەم: پلان دانانی ڕاگەیاندنی وڵاتی ئیسلامیی لە مەدینە.

---

[٢٦٩] فرناس عبد الباسط البنا: التخطيط، ص١٣٦.

# تویژبەندی یەکەم

## نموونەی پلان دانان

## کۆچی پەیامبەر ﷺ بۆ مەدینە

**لە ڕووداوەکانی کۆچی پەیامبەری خوا، ئەمانەی خوارەوە پوخت دەکەین:**

١ - کۆچ لەسەر بنەمایەکی ساخی پلان دانان و ئەوەی پێویستییەتی لە تەگبیر و بڕیار دان و ڕەهەندەکانی تێڕوانین ئەنجام درا، مەبەستیش لە کۆچ چوون بوو بۆ ولاتێك، کە خەڵکەکەی بڕوا بە ئیسلام بهێنن و، ببێت بە بڕیارگەیەك بۆ ولاتی ئیسلامی، کە کار بۆ بڵاوکردنەوەی ئایینی ئیسلام بکات و، دڵنیایی شوێنکەوتەکانی بکات.

٢ - پەیامبەر ﷺ ئەو ئامرازە کەرەستەیی و مرۆییانەی ئامادە کرد، کە لەگەڵ ڕەوشی کۆچەکەی دەگونجان و، ڕووبەڕووی ئەو ڕەوشانەش بوەوە، کە ئەگەری دووچار بوونیان لە میانەی ڕێگە دا دەکرا[٢٧٠]

٣ - پەیامبەری خوا ﷺ هەڵستا بە ڕێکخستنی ئامرازە بەکارخراوەکان بۆ گەیشتن بە ئامانج و، ئەم ڕێکخستنەش پایەکانی لەسەر بنەمای زانستی دامەزرا بوو، کە لەنێوی دا دابەش کردنی کار بوو.

---

[٢٧٠] حسن فتح الباب: التخطيط والتنظيم في الهجرة، المجلس الأعلى للشؤون الإسلامية، الكتاب السابع والتسعون، ص٣٧.

٤ - پەیامبەری خوا ﷺ لە جێبەجێ کردنی پلانەکەی دا شێوازێکی کار کردنی پەیڕەو کرد، کە تایبەتمەندیی بێ دەنگیی هەبوو، هەروەك پەیامبەری خوا ﷺ نیازی خۆ و کۆچ کردنی لەسەرجەم هاوەڵانی شاردەوە، جگە لە ئەبوبەکر و عەلیی کوڕی ئەبی تالْب خوا لێیان ڕازی بێت، زانیاریی ڕاستەوخۆیان لەبارەوە هەبوو، بەر لە جێبەجێ کردنی ڕاستەوخۆی پلانەکە[٢٧١]

ئەبو بەکری سدیق خوا لێی ڕازی بێت، کاتێك پرسیاریان لێ دەکرد: کێ لەگەڵتە؟ دەیفەرموو: ڕێنمایەك ڕێنمونیم دەکات. بوخاریش گێڕاویەتییەوە، کە وەڵامی ئەو کەسەی دەداوە، کە لێی دەپرسی ئەوە کێیە لە پێشت دەڕوات؟ دەیفەرموو: ڕینمونیی ڕێگەم دەکات، کەسەکە وای دەزانی مەبەستی ڕێگایە، کەچی مەبەستی ڕێگەی خوایە[٢٧٢]

٥ - بە گەیشتنی پەیامبەری خوا ﷺ بۆ مەدینە چار پایەکانی ولاتی ئیسلام تەواو بوون، ئەمانیش:

أ. باوەڕی ئیسلام.
ب. خاك
ج. گەل.
د. سیستمی سیاسی.

خەڵکی مەدینە لە ئەوس و خەزرەج و لە کۆچکەران بۆی لە مەکەوە، بڕوایان بە ئیسلام هەبوو، ئەمەش پایەی باوەڕە.

خاکی مەدینەی ڕووناك کراویش هەرێمی ئەم ولاتە دروست بوە بوو.

گەلی مەدینەش لە کۆچکەر و پشتیوان و نیشتەجێیانی تری لەسەر ئەم زەوییەی مەدینە پێك دەهات، کە پەیامبەر ﷺ پەیمانی لەگەڵ دا بەستن.

---

[٢٧١] حسن فتح الباب: التخطيط والتنظيم في الهجرة، المجلس الأعلى للشؤون الإسلامية، الكتاب السابع والتسعون، ص٥٨- ٥٩.

[٢٧٢] محمد الصالحي: سبل الهدى والرشاد في سيرة خير العباد، تحقيق مصطفى عبد الواحد وعبد العزيز عبد الحق، الجزء الثالث، طبعة المجلس الأعلى للشؤون الإسلامية، ص٣٥٧- ٣٥٨.

سیستمی سیاسیش بە ڕەخساندنی ئەو ڕەگەزەی دەسەڵاتی سیاسییە بەدەست دێت، کە بە کۆچی پەیامبەر ﷺ و گرتنە دەستی سەرۆکایەتیی دەسەڵاتی سیاسی تێی دا ڕەخسا[٢٧٣].

لەم مانایەوە پرۆفیسۆر عەبدول حەمید متەوەلی دەڵێت: کۆچ بە فاکتەرێکی بنەڕەتی لە پێك هێنانی وڵاتی ئیسلامی گوزارشت دەکرێت، چونکە پەیامبەری خوا ﷺ دوای کۆچی بۆ مەدینە هەڵستا بە دامەزراندنی وڵات و، پەیامبەری خواش ﷺ بوە سەرۆکی وڵاتی ئیسلامی لە مەدینە لە کاتێك دا لە مەکە تەنها پەیامبەرێك بوو[٢٧٤].

لەوەی پێشوو ڕوون دەبێتەوە، کە کۆچی پەیامبەری خۆشەویست هەڵاتن یا کۆچ کردن نەبوو لە وڵاتێك بۆ وڵاتێکی تر بۆ خواستنی دڵنیایی، بەڵکو ڕووبەڕوو بوونەوەیەکی خوێندنەوە بۆ کراوی خودان پلان و ئامانج گەلێکی دیاری کراو بوو، کە بە ئامادەکاری و پلان دانان بە ئاواتەکەی گەیشت.

---

[٢٧٣] محمد سليم العوا: في النظام السياسي للدولة الإسلامية، ص٤٧.

[٢٧٤] عبد الحميد متولي: مبادئ نظام الحكم في الإسلام، منشأ المعارف بالإسكندرية ١٩٧٨، ص٩٨.

# توێژبەندی دووەم

## پلان دانانی بنیات نانی مزگەفت

لە میانەی هەڵ و مەرجی هەڵستانی پەیامبەر ﷺ بە بنیات نانی هەردوو مزگەفتی قەبا و مزگەفتی پەیامبەری خوا ﷺ تێبینیی ئەمانەی خوارەوە دەکرێت:

١ - بایەخ دانی پەیامبەری خوا ﷺ بە بنیات نانی مزگەفت لەهەر شوێنێك ژمارەیەك مووسوڵمانی تێ دا نیشتەجێ بن.

٢ - بەشداری کردنی خودی پەیامبەر ﷺ لە بنیات نانی دوو مزگەفتەکە، وەك ئەوەی پاڵپشتییەکانی ئایینی ئیسلامی و پایەکانی وڵاتی ئیسلامی دابمەزرێت.

٣ - پەیامبەری خوا ﷺ بنەچەیەکی بۆ بنەمای یەکسانیی نێوان فەرمانڕەوا و فەرمانڕەوایی کراوان دا دانا، کە پێشەنگییەك بوو بۆ هەر فەرمانڕەوایەکی مووسوڵمانان، کە لە دوایەوە دێن.

٤ - هەڵستانی خودی پەیامبەری خوا ﷺ و فەرمانڕەوای مەدینە لە بنیات نانی مزگەفت و بەشدار بوونی لەگەڵ مووسوڵمانان لەم بنیات نانە، بەڵگەی گرنگیی باوەریی مزگەفت و، ڕۆڵی سیاسی و کارگێریی مزگەوت لە سەرکردایەتیی گەل بوو.

ڕۆڵی مزگەوتی پەیامبەر ﷺ لە مەدینە دا تەنها بە شوێنی پەرستن و بەجێگەیاندنی نوێژ کورت نەبوبوەوە، بەڵکو مزگەفت ئەمانەی خوارەوەشی گرتەوە[٢٧٥]:

١) مزگەفت زانکۆیەك بوو تێی دا هاوەڵانی پەیامبەری خوا ﷺ لێیەوە زانستە ئایینی و مرۆڤایەتییەکان فێر دەبوون.

---

[٢٧٥] محمد الطيب النجار: القول المبين في سيرة سيد المرسلين، القاهرة، دار الاعتصام، ص١٥٦.

٢) مزگەفت خانەیەك بوو بۆ ڕاوێژ، کە لە کاروبارەکان دا پەیامبەری خوا ﷺ ڕاوێژی بە هاوەڵانی دەکرد.

٣) مزگەفت بڕیارگەیەکی سەرکردایەتیی کردنی سووپای ئیسلام بوو، تێـی دا بەیداخی سەرکردەکان دیاری دەکـرا و، لێیــەوە غـایش و شـالاوەکان دەردەچـوون، هەروەك بە شـوێنی هانـدانی مووسـوڵمانان و پاڵنانیـان بـۆ تێکۆشـان گوزارشـت دەکرێت.

٤) مزگەفت ماڵێك بوو بۆ پێشوازیی شاندی خێڵـەکان و نێردراوەکانیـان بـۆ لای پەیامبەری خوا ﷺ.

٥) مزگەفت دادگەیەك بوو بۆ دادوەری کردن لە نێو نەیاران دا

دوای ڕوون کردنەوەی ئەم ڕۆڵە مەزنانەی، کە مزگەفتی پیرۆزی پەیامبەری خوا لە مەدینە پێی هەڵستاوە، پەی بەو ڕۆڵە دەبەین، کە ئەم مزگەفتە لە بەڕێوەبردنی وڵاتی ئیسلامی دا گێڕاویەتی.

# توێژبەندی سێیەم

## پلان دانانی برایەتیی نێوان مووسوڵمانان

برایەتی بە قۆناغێکی گرنگی قۆناغەکانی پلان دانانی دامەزراندنی وڵاتی ئیسلامی گوزارشت دەکرێت، هەروەك برایەتی ئەم سوودانەی خوارەوەی بەدەست هێنا[٢٧٦]:

١ - قەرەبوو کردنەوەی کۆچکەران بە سۆز لەبەر پچڕاندنی پەیوەندیی کەس و کاریان لێیان، هەروەك هەر تاکێك برایەتیی لە ڕاهی خوا باشتر و بە بەزەیی تر لە برای خۆی لە بەزەیی دا دەست دەکەوت.

٢ - بەدەست هێنانی دەستەبەریی کۆمەڵایەتی لە نێوان تاکەکانی یەك کۆمەڵگە، بە تایبەت کۆچکەران، کە ماڵ وشوێنیان لە مەکە بەجێهێشت بوو.

٣ - یەکخستنی ئاراستە ڕووەو یەك ئامانج، ئەویش لە ڕێگەی یەکخستنی هەستی کۆمەڵایەتیی نێوان تاکەکانی کۆمەڵگە.

٤ - زیاد بوونی ڕادەی پەیوەست بوون و هاریکاریی نێوان تاکەکانی کۆمەڵ، ئەویش لە ڕێگەی وروژاندنی هەست کردن بە پێویستیی و، دەرخستنی ئەو سوودانەی، کە بریتین لە هەست کردنی هەر تاکێك بە پێداویستیی بە ئەوی تر و ڕازی بوونی بە واز هێنان و بەخشین و هەست کردنی بە گونجان و تێکەڵاوی لە کەسێتیی کۆمەڵ.

شێخ موحەمەد غەزالی ڕاستی و گەشە کردنی برایەتیی ئیسلامی گێڕاوەتەوە بۆ ئەوەی، کە هاوەڵانی پەیامبەری خوا ﷺ لەسەر ئەدگاری پاك و، بنەما گەلێکی چاك و، ئامانج گەلێکی بەرز پەروەردە بوونە، وێرای شکۆداریی ئەو سەرمەشقییەی، کە ئەم برایەتییە بەدەستی هێناوە..

---

[٢٧٦] أحمد عز الدين خلف عبد الله: السيرة المحمدية الخالدة- العصر المكي، المكتبة الإسلامية التجارية بطنطا ١٩٦٠، ص١٣٩- ١٤٠.

دەشڵێت برایەتی بە یاسا و ڕێوڕەسم ناسەپێنرێت، بەلاّم ڕێ لـە فـەرمانڕەواش ناگرێت لە سەپاندنی بەسەر خەڵك دا، ئەویش وەك ئـەوەی لەسـەر سـەربازیەتی و دانی باج دەسەپێنرێت[٢٧٧]

هەروەها برایەتیی نێوان کۆچکەر و پشتیوانان بە یەکـەم پیـادەی برایـەتی لـە ئیسلام دا گوزارشت دەکرێت، ئەو بنەمایەی، کە کۆمەڵی مرۆڤایەتیی پێشخست و بنەمای پێـوە بەنـد بـوونی نـەکردوە بـە ڕەگـەزی و خۆویسـتی، بـەڵکو بـاوەڕی ئیسلامی، کردوە بنەمای ئەم پەیوەست بوونە.

---

[٢٧٧] محمد الغزالي: فقيه السيرة، دار الكتب الحديثة، القاهرة ١٩٦٥، الطبعة السادسة، ص١٩٣-١٩٤.

# توێژبەندی چارەم

## پلان دانانی ڕاگەیاندنی دەستووری مەدینە

پەیامبەری خوا ﷺ دەستوورێکی بۆ ولاتی ئیسلامیی دامەزراو دانا، کە مـافی سەرجەم تاکەکانی ئەم ولاتـە تـازە و ئەرکـەکانیانی لـە کۆچـکەر و پشـتیوانان و جولەکـەکان، ڕوون کردوەتـەوە، ئـیبن ئیسـحاق دەڵێـت پەیامبـەری خـوا ﷺ نووسراوێکی لە نێوان کۆچکەر و پشتیوانان دا نووسی و، جوولەکە مافەکانیان تـێ دا پارێزراو بوو و پەیمانی لەگەڵ دا بەستن، لەسەر ئاین و دارایی خۆیان پشـتیوانیی کردن و مەرجی بۆ دانان و مەرجداری کرد لەسەریان، پاشـان دەقـی نووسـراوەکەی باس کردن[٢٧٨]

هەڵبەت توێژەران لـە بـواری بەڵگەنامـە سیاسـییەکانی پەیامبـەری خـوا ﷺ بایەخیان بە شی کردنەوەی دەقەکانی ئەم بەڵگەنامەیە داوە، هەروەك توێژەران لـە بواری سیستمی سیاسیی ئیسلامی دا بایەخیان بە ڕوون کردنەوەی بەهای سیاسیی ئەم بەڵگەنامانە و گرنگییان سەبارەت بە ولاتی ئیسلامی دروست بوو، داوە[٢٧٩]

هەروەها توێژەران، لە بواری بەڕێوەبردنی گشتیی ئیسلامی دا، بایـەخیان بـەم بەڵگەنامانە داوە لە ڕوونکردنەوەی چۆنیەتیی بـەڕێوەبردنی ولاتـی ئیسـلامی لـە لایەن پەیامبەری خوا ﷺ.[٢٨٠]

لـە گـرنگترین بەنـدەکانی ئـەم بەڵگەنامـە کـارگێری و سیاسـییانەی ولاتـی ئیسلامی ئەمانەی خوارەوەن:

---

[٢٧٨] ابن هشام: السيرة النبوية- الجزء الثاني، ص٣٤٨.
[٢٧٩]، طبعة جامعة الخرطوم، ص١٦- ٢٦.ﷺعون الشريف قاسم: دبلوماسية محمد
[٢٨٠] محمد عبد المنعم خميس: الإدارة في صدر الإسلام، طبعة المجلس الأعلى للشؤون الإسلامية ١٩٧٤، ص٦٢- ٦٤.

١ - موسـوڵمانان لـە قـوڕەیش و خـەلکی یەسـریب و شـوێنکەوتەکان، کـە پێیانەوە بەندن و، لەگەڵیان تێدەکۆشن وەك تاکە میللەتێکن.

٢ - بڕوادارانی خۆپارێز، دەستیان لەسەر هەموو سەرلێشـێواوێکە، ئەگەرچـی کوڕی یەکێکیانیش بێت.

٣ - بڕواداران پشتیوانی یەکترن دژ بە خەڵکانی تر.

٤ - هەرکەسـێك لـە جولەکـە شـوێنکەوتەمان بێـت، ئـەوا سـەرکەوتن و سەرمەشـقیی بـۆ هەیـە، سـتەمیان لێ ناکرێـت و گەلەکۆمـەیان لـە هەمبـەر دا ناکرێت.

٥ - هاوبەشدانەر بۆی نییە پـەنای مـاڵ یـا گیـانی قوڕەیشـییەکان بـدات و، نەهێڵێت دەستی بڕوادارانی بگاتێ.

٦ - هەر ناکۆکییەك ڕوو بدات، بۆ لای فەرمودەی خوا و بۆ لای موحەمـەدی پەیامبەری خوا ﷺ دەگەڕێندرێتەوە.

٧ - جوولەکـەکان وەکـو موسـوڵمانان لـە شـەڕ دا خـەرجییان لەسـەرە، بـۆ جوولەکەکان ئایینی خۆیان و بۆ موسوڵمانانیش ئایینی خۆیان و، هاوپەیمانانیان و خۆیان مەگەر تاوان بکەن، جوولەکە خەرجیی خۆیان لەسـەرە و، موسـوڵمانانیش خەرجی خۆیان و، لە نێوانیان دا پشتیوانی یەکتری هەیە لە بەرانبەر هـەر کەسـێك دژایەتیی خاوەنانی ئەم نووسراوە بکات، هەروەها لە ئامۆژگـاری و چـاکەی دوور لە گوناه هەیە.

٨ - هەروەها ئەوەی لە نێوانی خاوەنەکانی ئەم پەڕاوە دا ڕوو دەدات لە ڕووداو و بەگژیەك دا چوون، کە ترسی تێکچوونی هەبێت، ئـەوا بـۆ لای خـوای گـەورە و پەیامبەرەکەی ﷺ، دەگەڕێندرێتەوە.

هەروەك لەم نووسراوە دا هەندێك بەنـدی پەیوەندیـدار بـە مانـەوەی هەنـدێك نەریتی پێشووی تایبەت بـە خـوێن بـایی فیدیـەی بەنـدکراوەکان و تۆڵـە هـاتوە، هەروەها باسی پشتگیری نەکردنی تاوانباران و پشتگیری کردنی سـتەم لێکـراوان و پاراستنی مافی دراوسێ و بەستنی ئاشتەوایی هاتوە.

لە خستنەڕووی بەندەکانی ئەم پەیماننامەیە تێبینی دەکرێت، کەوا بریتییە لە دەستوورێکی سیاسی و سیستمێکی کارگێڕی بۆ بەڕێوەبردنی ولاّتی ئیسلامیی دامەزراو، هەروەك بەڵگەیە لەسەر دادپەروەری و بەخشندەیی ئیسلام لەگەڵ ناموسوڵمانان، هەروەك ئەم پەڕاوە هەموو دانیشتوانی شاری مەدینەی گرتەوە لە مووسوڵمانان و جوولەکە و هاوبەشدانەران.

هەڵبەت پەیامبەر ﷺ ئەم پەڕاوەی لەگەڵ گەیشتنی بۆ شاری مەدینە و پێش ئەوەی ئیسلام سەریکەوێت و بەهێز ببێت، بەست و، بە بەڵگەیەکی مەزنێتیی سیاسی و، لێهاتوویی کارگێڕیی گوزارشت دەکرێت، کە مەدینەی کردە یەکەیەکی یەکگرتوو و قەڵایەکی بەهێز.

# بەندی دووەم

# ڕێکخستن

## بەرایی

کرداری ڕێکخستن بریتییە لە قۆناغی دووەم لە قۆناغەکانی کرداری کارگێڕی، هەروەك لە ڕاستی دا بە گرنگترین فرمانەکانی کارگێڕی لە کاتی ئێستا دا گوزارشت دەکرێت، چونکە کارگێڕی بێ ڕێکخستنێکی ساغ ناتوانێت، هەڵستێت بە جێبەجێ کردنی ئەو سیاسەتە گشتییانەی، کە دەسەڵاتی تایبەت لە وڵات وێنای دەکات.

پلان دانان و ڕێکخستن دوو فرمانی تێهەڵکێشن، چونکە پلان دانان ناتوانێت بێ ڕێکخستنێکی ساخی ئەو دەستگەیەی، کە بە دانانی پلان و جێبەجێ کردنی هەڵدەستێت، سەرکەوتوو بێت، هەروەك ڕێکخستن لە پلان دانان دا کاریگەریی هەیە، کە بەرەو سەرکەوتن یا شکست هێنانی ببات، بە پێی ئەدگاری وردی و بڕیارەکانی.

پێدوایست بۆ ڕێکخستن کاتێك دەردەکەوێت، کە زیاتر لە کەسێك بەشداری لە ئەنجام دانی چالاکییەك دا بکەن، بەجۆرێك پێداویستیی هەر یەکێك بێت لە کەسەکان بۆ هاریکاری لەگەڵ ئەوەی تر لە پێناو بەدەست هێنانی ئامانجە هاوبەشەکانیان، بۆیە هەرچەندە قەبارەی ڕێکخراوەی کارگێری فراوان بێت و بەش و لقەکانی زیاد بکەن، گرنگیی ڕێکخستن زیاد دەکات[٢٨١]

شارەزایان لە خستنەڕوی پێناسەی ڕێکخستنی کارگێڕی، جەخت لەسەر پەیکەری ئەو دەستگەیە دەکەنەوە، کە کارگێڕی لە ڕێگایەوە هەوڵی بەدەست هێنانی ئامانجەکانی دەدات.

---

[٢٨١] إبراهيم عبد العزيز شيحا: الإدارة العامة، ص١٩٣.

دکتۆر ئبراهیم دەروێش ڕێکخستنی پێناسە کردوە بەوەی: "ئەو بنیاتەیە، کە لە میانی دا کاری کارگێری دادەمەزرێت لە پاشان فرمانەکانی کارگێڕیی گشتی لە هەڵ و مەرجی ژیان لە کۆمەڵ دا بەدی دێت"[٢٨٢]

هەروەها دکتۆر سلێمان تەماوی پێناسەی ڕێکخستن دەکات بەوەی: "شێوەیەکە تێی دا هەوڵە کۆمەڵەییەکان بۆ بەدەست هێنانی مەبەستی وێنا کراو تەرخان دەکرێت"[٢٨٣]

هەندێك شارەزا دووپات دەکەنەوە، کە مەبەست لە ڕێکخستنی کارگێری نەخشەسازیی پەیکەری ڕێکخراوە لەسەر ئەو ڕوەی، کە دەبێتە هۆی بەدەست هێنانێکی نموونەیی ئامانجەکانی[٢٨٤]

ئەگەر لە سۆنگەی پێناسەی ڕێکخستنەوە زۆرینەی شارەزایان بایەخ بە جەخت کردنە سەر دەستگەی کارگێری لە ڕووی پەیکەری یا نەخشەسازیی بدەن، ئەوا هەندێك لە شارەزایان بایەخ بە جەخت کردنەوە لەسەر کرداری ڕێکخستن و هەماهەنگی گرۆیی هەوڵی تاکەکان لە ناوەوەی دەستگەی کارگێری، دەدەن.

دوایت والدۆ "Dwight Waldo" دەڵێت ڕێکخستن: "ئەو پەیکەرەیە، کە تێی دا هەوڵە مرۆییەکان بە مەبەستی بەدەست هێنانی ئامانجە هاوبەشەکان کۆ دەکرێتەوە" هەروەها جێمس مۆنی ئاماژە دەکات بەوەی، کە ڕێکخستن: "ئەو وێنە یا ئەو شێوەیە، کە کۆمەڵێکی مرۆیی لە پێناو بەدەست هێنانی ئامانجێکی گشتی و هاوبەش دەیگرنەبەر" و، هەندێکیش پێیان وایە، کە ڕێکخستن ئەو لایەنە ڕەسمییە یا ئەو ئامرازەیە، کە لە ڕێگایەوە پیادەی بەڕێوەبردن دەکرێت، یا پێناوێکە بۆ کارا کردنی سیاسەت و ڕێوشوێنە کارگێرییەکان[٢٨٥]

---

[٢٨٢] إبراهيم درويش، الإدارة العامة في النظرية والممارسة، ١٩٧٥، ص١٩٧.

[٢٨٣] سليمان الطماوي: مبادئ علم الإدارة العامة، ص٥٨.

[٢٨٤] أحمد حافظ نجم: مبادئ لعم الإدارة العامة، ١٩٧٩، ص٤٨.

[٢٨٥] محمد سعيد أحمد: التنظيم وتطور أساليب العمل، ١٩٧١، ص٢٤.

هەروەها دکتۆر حەسەن ئەحمەد تۆفیق پێناسەی ڕێکخستن دەکات بەوەی: "هەماهەنگیی هەوڵە مرۆییەکانە لە ڕێکخراوەکی گشتی، بەمەبەستی بەدەست هێنانی ئامانجەکان و سیاسەتە وێنا کراوەکان بە گورجییەکی بەرز و بەکەمترین تێچوونی توانراو"[٢٨٦]

هەندێکیش پێیان وایە، کە ڕێکخستن کارێکی کۆمەڵایەتیی بەردەوامە، بە هۆشیاری و پەی بردن دەبێت بۆ هەماهەنگیی ڕوەکانی چالاکیی مرۆیی لە بوارێك دا، لەپێناو بەدەست ئامانجی ڕێککەوتن لەسەر کراو[٢٨٧]

دکتۆر ئبراهیم عەبدول عەزیز شیحا پێی وایە، کە چەمکی ڕێکخستن بۆ ڕێکخستنی پەیکەری ئەو دەستگەیە جێ دەهێڵدرێت، کە لە میانەی دا بەڕێوەبردن پیادە دەکرێت، واتە پەیکەری ڕێکخستنی کارگێری، هەروەها ئەو ڕێکخستن و هەماهەنگی کردنی ئەوەی تاکەکان لە چالاکییەکانی ناوەوەی دەستگە پیادەی دەکەن، لە ڕێگەی گرۆیی هەولی کارکەران لە ڕێکخستن دا[٢٨٨]

دکتۆر موحەمەد سەعید عەبدول فەتاحیش پێی وایە، کە هەر هەوڵێك بۆ تێخوێندنەوەی ڕێکخستن لە میانەی چارچێوەیەك، یا پەیکەری کارگێری بێ بایەخ دان بەو تاکانەی، کە تێی دا کاردەکەن و، هەماهەنگیی کردنی چالاکییەکانیان، کارێکە دوور لە تێگەیشتنێکی ساخی کرداری کارگێری و چارچێوەکەی، لەبەرئەوەی ڕێکخستن لە پێگەی یەکەم دا کارێکی مرۆییە[٢٨٩]

لەم ڕووەوە چەمکی ڕێکخستن دەستگە لە پەیکەر و چالاکییەکەیەوە دەگرێتەوە و، پێویست ناکات لە یەکێك لەم دوو لایەنە دا کورت بکرێنەوە بێ ئەوەی تر.

پرۆفیسۆران مارشاڵ ئەدوارد دیۆك و گلاویدز ئۆسدن دیۆك و لویس توینگ، دووپات لەسەر ئەوە دەکەنەوە، کە زارەوەی ڕێکخستن پەیکەری ڕێکخستن و،

---

[٢٨٦] حسن أحمد توفيق: الإدارة العامة، ص٥٨.

[٢٨٧] بكر القباني: الإدارة العامة، ج٢، ص٧٦.

[٢٨٨] إبراهيم عبد العزيز شيحا: الإدارة العامة، ص١٩٥.

[٢٨٩] محمد سعيد عبد الفتاح: الإدارة العامة، ١٩٧٨، ص٨٧.

چالاکیی کارکەران تێـی دا، بگرێتـەوە، هـەروەك دوای پێناسـەیان بـۆ ڕێکخسـتن بەوەی: "گرد بوونەوەی ژیرانەی بەشە پێکەوە بەستراوەکانە بۆ پێـك هێنـانی هـەر یەکەیەکی ڕێکخراو، کە لەمیانـەی دا دەسـەڵات و هەماهـەنگی و چـاودێری بـۆ بەدەست هێنانی ئاواتی دیاری کراو پیادە دەکرێـت و، ئامـاژە بـەوە دەکـەن، کـە ڕێکخستن هەریەك لە پێکهاتـە و تاکـەکان دەگرێتـەوە، چـونکە بەشـە بەیەکـەوە بەندەکانیش لە تاك گەلێك پێك دێن، کـە پێویسـتە یـەك بخـرێن و پـاڵ بنـرێن و کارەکانیان هەماهەنگ بکرێت، بۆ ئەوەی ئامانجەکانی ڕێکخسـتن بەدەسـت بـێن. هەروەها هەوڵ دان بۆ تێخوێندنەوەی ڕێکخسـتن بـە تـەنها گوزارشـت کردنـی بـە چارچێوەیەك بێ سەرنج دانە ئەو تاکانەی لێیان پێـك دێـت و، ئەوانـەی مەبەسـتە خزمەت بکرێن، شتێك نییە مەگەر دوور لە تەواوی ڕاستییەکان"[٢٩٠]

دکتۆر حەمـدی ئـەمین عەبـدول هـادی پێـی وایـە: "زاراوەی ڕێکخسـتن بـۆ گوزارشت کردن لەسەر سیسـتم یـا بەشـەکان بـەکاردێت، کـە بـە مانـای یەکـەم ناساندنێك لەگەڵ ڕێزبەندییە هەنووکەییەکانی بەشەکان بە گشتی پێویست دەکات، لە گوزارشتی دووەمی ڕێکخستنیش کرداری پێك هێنان یا دووبارە پێك هێنانـەوەی پەیوەندییەکانی نێوان بەشەکان پێویست دەکات، جا ئەگەر گوزارشتی یەکەم مانای ناساندنی سیستمێکی چەسپاو بێت، ئەوا گوزارشتی دوەم مانای خـودی چـالاکیی ڕێکخستنە، کە لایەنی بزاوتە و، زۆرجار زاراوەی ڕێکخسـتن چـەمکی دووەمـی بـۆ بەکاردێت، هەروەك پێناسەی (فیگینز) بۆی چوە، بەوەی پێك هێنـانی تاکـەکان و فرمانەکان لە پەیوەندییەکی بەرهەم هێنانی دایە"[٢٩١]

لەسـەر ئـەم بنەمایـەش دا، چـەمکی هونـەریی ڕێکخسـتن بـۆ پەیکـەرە کارگێڕییەکانی ڕێکخراوە یا دەستگەی کارگێڕی ڕێ دەکـات و، بـۆ ئـەو چـەمکە بابەتییەش ڕێ دەکات، کە بایەخ بە خودی چالاکییە ڕێکخستنییەکان دەدات[٢٩٢]

---

[٢٩٠] إبراهيم عبد العزيز شيحا: الإدارة العامة، ص١٩٥.

[٢٩١] حمدي أمين عبد الهادي: الإدارة العامة في الدول العربية، ١٩٧٥، ص٩٧.

[٢٩٢] بكر القباني: الإدارة العامة، ج٢، ص٧٦.

تێبینی دەكرێت، كە زاراوەی ڕێكخستن "Organization" كاتێك بەكار دێت مەبەست دەستگەی كارگێڕی لە پەیكەر و بنیاتەكەیەوەیە، بۆ گوزارشت كردن لەسەر ئەو سیستمەی، كە بە كردەنی دامەزراوە بەكاردێت، وەك دەڵێین وەزارەتی داد، مەبەستیش لەمە ئەو دەستگە كارگێڕییەیە، كە وەزارەتی دادی لێ پێك دێت، هەروەها زاراوەی ڕێكخستن بۆ گوزارشت كردن لە دامەزراندنی ڕێكخستە كارگێڕییە تازەكان بەكاردێت، وەك دامەزراندنی وەزارەتێكی تازە بۆ پلان دانان و، ڕەنگە مەبەست لە زاراوەی ڕێكخستن گوزارشت كردن بێت لەسەر كرداری دووبارە بنیات نان یا ڕێكخستنەوەی پەیوەندییەكانی نێوان بەشەكان و كارگێڕییەكان لە وەزارەتی دامەزراو.

بە پشت بەستن بەوەی پێشكەش كرا، ئەوا ڕێكخستن كردارێكی خێرا نییە، كە لەیەك كات دا ببێت، بەڵكو ڕێكخستن كردارێكی تازە بوەوە و بەردەوامە. چونكە ڕەنگە دوای كۆتا هاتنی بنیات نانی پەیكەری ڕێكخستن و بەگەڕخستنی، ڕەوشێك بێتە پێش، كە پێویست بە پێداچوونەوەی بكات، هەروەك ڕەنگە بەگەڕخستن چەندین چالاكیی بنەڕەتی و سەرەكی ئاشكرا بكات، كە لەكاتی داڕشتنی ڕێكخستنە ڕەسەنەكە، بەهەند وەرنەگیراوە یا بە پێچەوانەی ئەمە، چالاكی گەلێكی لە كاتی بنیات نان دا هەبن، پاشان گرنگییەكەی لە دەست بدات، كە ڕەنگە بە تەواوی هەڵ بوەشێتەوە[٢٩٣]، چارەسەریی ئەمەش ڕەنگە بە هەموار كردنی بەشەكی لە پەیكەری ڕێكخستنی دامەزراوی دەستگەی كارگێڕی ببێت، ڕەنگیشە پێویستی بێت بە تێك دان و سەر لە نوێ داڕشتنەوەی[٢٩٤].

دكتۆر سلێمان تەماوی لەم سۆنگەیەوە دەڵێت: "ڕەنگە كارگێڕی پەنا بۆ دووبارە پێداچوونەوەی ڕێكخستنە كۆنەكانی وەزارەتەكان و كارگێڕییەكان ببات، بۆ ڕووبەڕوو بوونەوەی گۆڕانی ڕەوشەكان، كە زۆرجار گرنگیی وەزارەتێك لە وەزارەتەكان بەگوێرەی زیاد بوونی خواست لەسەر ئەو خزمەتگوزارییەی، كە

---

[٢٩٣] إبراهيم عبد العزيز شيحا: الإدارة العامة، ص١٩٧.
[٢٩٤] عبد الفتاح حسن: مبادئ الإدارة العامة، ص٦٥.

پێشکەشی دەکات زیاد دەکات، کە پێویستی بە دووبارە پێداچوونەوە بە پێکهێنانەکەی دەبێت، بۆ ئەوەی لە کارەکانی دا بە توانستتر بێت و، دەکرێت پێچەوانەی ئەمەش ڕوو بدات، بەوەی کارگێری یا فەرمانگە زۆرێك لە گرنگییەکانی خۆی لە دەست بدات، جا دەبێت بە ڕێکخستنی بەرانبەر ڕووبەڕووی ئەمە ببێتەوە[٢٩٥].

زاراوەی ڕێکخستن کاتێك بایەخ بە چالاکیی تاك دەدات لە ڕێکخستن، ئەوا بۆ گوزارشت کردن لە پێویستیی دابەش کردنی کار لە نێو کارکەرانی ڕێکخستنەکە و هەماهەنگی لە نێوانیان دا و، پیادە کردنی بەرزەفتکاری و بنەماکانی بەدەست هێنانی ڕێبەریی کردنی کار و هەوڵ دان بە مەشق پێ کردنی ئەم کارکەرانە لەسەر هەڵس و کەوتی وەستایانە، بەکاردەهێنرێت[٢٩٦].

بۆیە ڕێکخستن لەو کردارە هونەرییە ورد و دژوارانە گوزارشت دەکرێت، کە پێویستە شارەزایانی هونەری بەشداریی تێ دا بکەن بۆ ئەوەی سوودە جێی هیوایەکان بەدەست بێن، وەك سوود بینین لە چاکییەکانی پسپۆری و، گۆڕینی فرمانەکانی هەماهەنگی و پەیوەندی کردن و چاودێری و، تێگەیشتنی ئامانج و پلان و بەرنامەکان و پەخش کردنیان لە تەواوی بەشەکانی ڕێکخراوە، کە هەستێکی بەشداری کردن و هاریکاری بە کارکەران ببەخشێت و، ئارەزوویەکی ڕاستگۆیان لە کار کردن و هەست کردن بە بەرپرسیاری لێیانەوە بروێنێت، لەبەرئەوەی ڕێکخستن بەشێوازەکانی کاری بەکارخراو لە ناوەوەی هەر وەزارەتێك بە پەڵاوێشتنی فرمانە هونەرییەکان تێی دا کاریگەر دەبێت، هەروەك بە مەودای ئەو جوگرافیایەش کاریگەریی دەکرێتە سەر، کە چالاکیی وەزارەتەکە دەیگرێتەوە[٢٩٧].

لە کۆتایی دا لە دومایی ئەم بەراییە دا ئاماژە بەوە دەکەین، کە ڕێکخستن خۆی لەخۆی دا ئاوات نییە، بەڵکو بریتییە لە یەکێك لەو کردارە پێکەوە

---

[٢٩٥] سليمان الطماوي: مبادئ علم الإدارة العامة، ص٥٩.

[٢٩٦] محمد سعيد عبد الفتاح: الإدارة العامة، ص٨٧.

[٢٩٧] إبراهيم عبد العزيز شيحا: الإدارة العامة، ص١٩٧.

بەستراوانەی، کارگێڕی، کە ئامانجیان بەدەست هێنـانی ئـەو ئامانجانـەی گەرەکـە بەرووەکی ڕەزامەند[٢٩٨]

لە سێ بەشی داهاتوو دا، باسی ڕەگەزەکانی ڕێکخستن، پاشان ئەو بنـەما یـا ئاراستە گشتییانەی، کە ڕکێفی بەڕێوەچوونی کارەکـان لـە نـاوەوەی ڕێکخسـتنی کارگێری دەکەن، دەگرینە ئەستۆ، پاشانیش هەڵدەستین بە باس کردنی ڕێکخستن لە بەڕێوەبردنی ئیسلامی دا.

بۆیەش پێویست دەکات بۆ تێخوێندنەوەی ئەمانە ئەم بەندە بۆ سێ بەشی یەك دوای یەك دابەش بکەین:

بەشی یەکەم: ڕەگەزەکانی ڕێکخستن.

بەشی دوەم: بنەماکانی ڕێکخستن.

بەشی سێیەم: ڕێکخستن لە بەڕێوەبردنی ئیسلامی دا.

---

[٢٩٨] عبد الفتاح حسن: مبادئ الإدارة العامة، ص٦٤.

# بەشی یەکەم

## ڕەگەزەکانی ڕێکخستن

بۆ دامەزراندنی هەر ڕێکخستنێکی کارگێڕیی ساغ و، بۆ ئەوەی بتوانرێت ئامانجە وێنا کراوەکانی بەدەست بێن، دەبێت کۆمەڵێك لە ڕەگەزە بنەڕەتییەکانی بۆ برەخسێت، کە بێ ئەوان هیچ ڕێکخستنێك دانامەزرێت، هەر کەم و کورییەکیش تێی دا، کار لە توانستەکانی بەدەست هێنانی ئامانجەکانی دەکات، ئەم ڕەگەزانەش لە دیاری کردنی فرمانەکان و، پێك هێنانی یەکە کارگێڕییەکان و، پلەپلەیی دەسەڵاتی کارگێڕی، دەردەکەون[٢٩٩]

کەواتە دەبێت ئەم بەشەش بۆ سێ توێژبەند دابەش بکەین، هەروەك ئەمانەی خوارەوە:

توێژبەندی یەکەم: دیاری کردنی فرمانەکان.

توێژبەندی دوەم: پێك هێنانی یەکە کارگێڕییەکان.

توێژبەندی سێیەم: پلەپلەیی دەسەڵاتی کارگێڕی.

---

[٢٩٩] إبراهيم عبد العزيز شيحا: الإدارة العامة، ص١٩٩.

# توێژبەندی یەکەم

## دیاری کردنی فرمانەکان

یەکە بنەڕەتییەکانی هەر ڕێکخستنێکی کارگێری لە کۆمەڵێك لە فرمان و فرمانبەر پێك دێت، شارەزایانی ڕیزبەند کردنی فرمانە گشتییەکانیش بەو گوزارشتەی شانەی یەکەمە لە هەر ڕێکخستنێکی کارگێری، فرمانیان پێناسە کردوە بەوەی، پایەیەکی شارستانییە یا کارێکە، پێویستە لەسەر پڕکەرەوەکەی، کە بە ئەرك گەلێك هەڵبستێت، بەرپرسیاری گەلێك هەڵ بگرێت، جا بە تەواوی تەرخانگیریی بۆ بکات یا تەرخانگیر نەبێت.

پاڵپشت بەمەی پێشکەشمان کرد، فرمان بە بنکەیەکی یاسایی گوزارشت دەکرێت، کە فرمانبەر پڕی دەکاتەوە و، فرمانیش بەر لەوەی یەکێك پڕی بکاتەوە بوونی هەیە، لەبەر ئەمە لە ماف و ئەرکەکانی سەربەخۆیە لەوەی، کە پڕی دەکاتەوە، کەواتە بە دامەزراوی دەمێنێتەوە و بە مردن یا واز هێنان یا لابردنی ئەو فرمانبەرەی، کە پڕی دەکاتەوە کۆتایی نایەت[٣٠٠]

فرمان بەو ئامرازە یاساییانە دروست دەبێت، کە یاسا دانەر دیارییان دەکات، بەڵام فرمانبەر ئەو کەسەیە، کە فرمانەکە بە ماف و ئەرکەکانی پڕ دەکاتەوە و، مەرجە پێویستەکانی، کە دەبێت لە فرمانبەر بڕەخسێن و، ئەوەی پێویستە بڕەخسێندرێت لە پڕکەرەوەکەی لە ئامادەباشی و شارەزاییەکان، جیاوازە، ئەمەش سروشتییە، چونکە هەرچەندە پێگەی فرمانەکە لە پلیکانەی کارگێڕی بەرز ببێتەوە، ئەوەندەش داوای ئامادەیی تایبەت و کارامەیی بەرز لە پڕکەرەوەکەی دەخوازرێت، لەگەڵ ئەو ئەرك و بەرپرسیارییانە بگونجێت، کە فرمانەکە لە خۆی دەگرێت[٣٠١]

[٣٠٠] إبراهيم عبد العزيز شيحا: الإدارة العامة، ص١٩٩.

[٣٠١] إبراهيم عبد العزيز شيحا: الإدارة العامة، ص٢٠٠.

پێك هێنانی کارگێڕی پێویست بە هەڵستان بە چەندین کردار دەکات[٣٠٢]:

## یەکەم: دەستەبەر کردنی فرمانەکان و ناساندنیان

واتا دیاری کردنی جۆر و ئاستەکان و پشت بەستن بە گوژمەی دارایی پێویست بۆی، مەبەست لە ناساندنیش هەڵستانە بە ناساندنێکی شیکاریی ئەو فرمانانە، کە ناو و پسپۆڕی و ئەو ئەرکانەی، کە لە خۆی دەگرێت و ئامادەباشییە پێویستەکان بۆ کردنی، دیاری بکرێت.

## دووەم: ڕیزبەند کردنی فرمانەکان و هەڵسەنگاندنیان:

واتا دابەش کردنیان بۆ کۆمەڵە گەلێکی جیاجیا بەگوێرەی گۆڕانی پسپۆڕی و ناساندنیان، ئەمەش بە گوێرەی ئەوەی فرمانەکان لە ماف و ئەرکەکان و، ئەو ئامادەکارییانەی پێویستییەتی لە خۆی دەگرێت، پاشان دابەش کردنی هەر کۆمەڵەیەك بۆ چەشن گەلێکی گشتیی خودان ناساندنێکی دیاری کراو، مەبەست لە هەڵسەنگاندنیش دیاری کردنی چین گەلێکی کرێ و مووچەی تایبەت بە هەر فرمانێك بەوجۆرەی لەگەڵی کۆکە و ئەو پسپۆڕی و بەرپرسیارییانەی، کە لە خۆی دەگرێت.

ڕیزبەند کردنی فرمانەکان و هەڵسەنگاندنیان چاکی گەلێکی زۆری هەیە، چونکە دەبێتە هۆی سەقامگیریی ئاستی فرمانبەران و چارەسەریی سەرجەم گرفتەکانیان لە ڕووی کرێ و مووچەیان و، لە ڕووی بەدەست هێنانی گورجی و ئاسان کردنی ڕێوشوێنەکان و ڕوون کردنەوەی پسپۆڕییەکانی فرمانەکە، هەروەها سیستمی ڕیزبەند کردن دەبێتە هۆی دانانی فرمانبەری شیاو لە فرمانی شیاو[٣٠٣]

---

[٣٠٢] بكر القباني: الإدارة العامة، ج٢، ص٨٠ وما يليها.
[٣٠٣] بكر القباني: الإدارة العامة، ج٢، ص٨٠ وما يليها.

## سێیەم: پڕ کردنەوەی فرمانەکان:

ئەم کـرداره بـە دامەزرانـدنی تاکـەکان لـە فرمانـەکان دەبێـت، کاتێـك ئـەو مەرجانەی هەر فرمانێك لە فرمانەکان، کە پێویستییەتی تێیان دا دەڕەخسێت.

ڕێسای بنەڕەتیی پەیڕەو کراویش، لە زۆربەی جاران دا، دامەزرانـدنی باشـترین پێشکەشکەرانە بۆ پڕ کردنەوەی فرمانە گشتییەکان و، دوورکەوتنـەوە لـە کەشـی پارتایەتی، جگە لەمەش لەو کاریگەرییانـەی، کـە دەسـتگەی کـارگێڕی گەنـدەڵ دەکەن و ڕێگەی بەدەست هێنانی ئامانجە وێنا کراوەکانی دەگرن[٣٠٤]

[٣٠٤] إبراهيم عبد العزيز شيحا: الإدارة العامة، ص٢٢.

# توێژبەندی دووەم

# پێکهێنانی یەکە کارگێرییەکان

## خواستی یەکەم: بنەماکانی دابەش کردنی یەکە کارگێرییەکان

دابەش کردنی یەکە کارگێرییەکان لە سیستمێکەوە بۆ یەکێکی تر جیاوازە، ئەمەش بە گوێرەی جیاوازیی بنەمای دابەش کردن، بەشێوەیەکی گشتیش دەکرێت ئەم دابەش کردنە بە گوێرەی کۆمەڵێك بنەما ئەنجام بدرێت، کە دەکرێت لە خوارەوە دا ڕوونیان بکەینەوە[٣٠٥]:

### یەکەم: دابەش کردنی ناوچەیی(هەرێمی)

واتە دابەش کردنی چالاکیی ڕێکخراوە بۆ یەکە گەلێکی کارگێری، کە هەر یەکەیەك ئەو پسپۆڕییە کارگێڕییانەی، کە پەیوەستن بە هەرێمێك یا ناوچەیەکی جوگرافیی دیار کراو، دەگرنە ئەستۆ، دەکرێت ئەم یەکە کارگێرییانەش پەیڕەوکەری ڕێکخستنی کارگێریی ناوەندی بن لە پایتەخت، نموونەی ئەمەش لقی وەزارەتە بڵاوبووەوەکانە لە هەرێمە جیاجیاکان، وەك لقەکانی وەزارەتی ناوخۆ، وەزارەتی کشتوکاڵ و، وەزارەتی پەروەردە ، دەبێت ئەم یەکانەش یەکەی هەرێمیی سەربەخۆ بن، ئەمەش وەك یەکە کارگێڕییە ناوخۆییەکان، کە بریتین لە پارێزگە و شار و شارۆچکەکان ئەمانیش بۆ بەڕێوەبردنی بەشە دیاری کراوەکان لە خاکی وڵات

---

[٣٠٥] إبراهيم عبد العزيز شيحا: الإدارة العامة، ص٢٠٣.

دروست دەبن و، لە دەسەلاتی ناوەندی لە پایتەخت سەربەخۆ دەبن، ئەمەش خۆی لە خۆی دا دەبێتە هۆی بیرۆکەی ڕاسپاردنی کارگێری لەلایەن دەسەلاتی ناوەندی، بۆیەش دەتوانین بڵێین، کە ئەم سیستمانە نابنە هۆی دوورکەوتنەوە لە چاودێریی ناوەندی[٣٠٦]

ئەم دابەش کردنەش چاکی گەلێکی جیاجیای هەیە، لە نێویان قورسایی دەسەلاتی ناوەندی کەم دەکاتەوە، پەیوەست بوونی نێوان دەسەلاتی ناوەندی و یەکە ناوخۆییەکان دەستەبەر دەکات و، خزمەتگوزاری بۆ ئەوانەی پێداویستییان پێیەتی نزیك دەکاتەوە و، لە کاتی وەرگرتنی بڕیار دا کار بۆ ڕەچاو کردنی تایبەتمەندییە ناوخۆییەکان دەکات، کە دەبێتە هۆی پێویستیی پێ قایل بوونی، هەروەك دەتوانێت هەڵسوڕاندنی خێرا لە پێگەکانی کار دا بکات و، یارمەتیی لە وەرگرتنی بڕیارە پێکەرەکان لە کاتی شیاو دا دەدات، هەروەها لە کاتی دیاری کردنی هێزی کارکەر لە لق یا لە یەکەیەك دەبێتە هۆی پشت بەستن بە ڕەگەزە ناوخۆییەکان. ئەم ڕەگەزانەش بە باشی بە داب و نەریتە کۆمەڵایەتییەکان و بەهاکانی هەرێمەکە ئاشنان، لە کۆتایی دا یەکە یا لقەکە بە کانگەیەك بۆ مەشق پێ کردنی نەوەی نوێ لە بەڕێوەبەرە ناوخۆییەکان گوزارشت دەکرێت و، یارمەتیی دۆزینەوەی ڕەگەزە سەرکردایەتییە نوێیەکان و گەیشتن پێیان بۆ پایە ناوەندییەکان لە پایتەخت، دەدات[٣٠٧]

## دووەم: دابەش کردن لەسەر بنەمای فرمان یا کار

ئەم دابەش کردنە لەسەر بنەمای کۆ کردنەوەی سەرجەم کار و چالاکییە تێك ئاڵۆزەکان دادەمەزرێت، بە پێی سروشتەکەیان بۆ ئەوەی ببنە پسپۆڕیی یەکەیەکی کارگێری، ئەویش لە بنەڕەت دا پشت بە بنەمای دابەش کردنی کار دەبەستێت، نموونەی ئەمەش کۆ کردنەوەی هەموو ئەوانەی پەیوەندیدارن بە چالاکیی ئابووری

---

[٣٠٦] إبراهيم درويش: الإدارة العامة في النظرية والممارسة، ١٩٧٥، ص٢٥٧.

[٣٠٧] إبراهيم عبد العزيز شيحا: الإدارة العامة، ص٢٠٤- ٢٠٥.

لەیــەك وەزارەت، کــە وەزارەتــی بازرگانییــە و، کۆکردنــەوەی هــەموو ئەوانــەی پەیوەندیدارن بە چالاکیی فێر کردن لەیــەك وەزارەت، کــە وەزارەتــی پەروەردەیــە، هەروەها کۆ کردنەوەی هەموو ئەوانەی پەیوەندیدارن بــە کــاری بــەرگریی پیــادە و ئاسمانی و دەریایی لە یەك وەزارەت، کە وەزارەتی بەرگرییە.

ئەوەی پێویستە لەم بارەوە تێبینی بکرێت، ئەوەیــە ئەگــەر پشــت بەســترا بــە پێوەری فرمان وەك بنەمـایەك بۆ دابەش کردن، دەبێت تەنها پشــت بــە فرمــان یــا کارە سەرەکییەکان ببەسترێت و، ئەگەر هاتوو ئەمە خۆی لە خۆی دا نەبوە ڕێگــر، لە هەڵستان بە دابەش کردنێکی لقیی تر لە ناوەوەی هەر یەکەیەك بە پێی قــەبارە و یا فراوانیی چالاکییەکان.

ئەم دابەش کردنە بە ئاسانی و ژیری دەناسرێت و، دووپــاتی گرنگیــی فرمانــە بنەڕەتییەکانی یەکەیەك دەکاتەوە و، بەڕێوەبەران(یا کارگێڕان) لە ئاستە بڵنــدەکان دا لە گرنگییــەکەی وریا دەکاتەوە، هەروەك ڕۆڵی کەسێتی لە ڕێکخستنی کارگێڕی لە میانەی دابەش کردنی کار دا زەق دەکاتــەوە و بیرۆکــەی بەشــدار کــردن بــەهێز دەکات و، ڕێ بە پیادە کردنی بنەمای پێ سپاردنی دەسەڵات دەدات، کــە دەبێتــە هۆی بەرز کردنەوەی تەواوێتیی یەکــەکان و کــار بــۆ چارەســەر کردنــی گرفتــەکان دەکات[٣٠٨]

## سێیەم: دابەش کردن لەسەر بنەمای سوودمەندان

ئەم دابەش کردنە بە ڕەچاو کردنی توێژەکانی ئەو جــەماوەرەی، کــە ســوود لــە خزمەتگوزارییەکانی کارگێڕی دەبینن، دادەمەزرێت، ئــەو چــالاکییانەی خزمــەتی تەنها چەند کەسێك دەکەن خۆی لە خۆی دا لە کارگێڕییەك یــا فەرمانگەیــەك کــۆ بکرێنەوە، تێی دا جەخت لە سەرجەم کارە پەیوەندیدارەکان بەم توێژە بکرێتەوە.

---

[٣٠٨] إبراهيم عبد العزيز شيحا: الإدارة العامة، ص٢٠٦.

بۆ نموونە لە ویلایەتە یەکگرتوەکانی ئەمەریکا کارگێری گەلێك هەیە بۆ خزمەت کردنی توێژێك لە مامەڵەکەران لەگەڵی لە کارگێڕی دا، هەروەك بەڕێوەبردنی کار و باری هندییە(سوورە)کان (Indian Service) هەیە، کە بە خزمەت کردنی کۆمەڵێکی دیار کراو لە سوود مەندان هەڵدەستێت.

سەرباری ئەو چاکییانەی، کە ئەم دابەش کردنە بەدەستی دەهێنێت لە لایەك بۆ ڕووبەڕوو بوونەوەی خواستە فرەکانی هەر کۆمەڵێك لە کۆمەڵە سوودمەندەکان لە خزمەتگوزارییە کارگێرییەکان و، لە لایەکی تر بۆ توانادار کردنی هەر یەکەیەك لە باش کردنی ئەو خزمەتگوزارییانەی، کە پێی هەڵدەستێت و بەرز کردنەوەی ئاست و پێ هەڵستانەوەیان، ئەوا ئەستەمە ئەم دابەش کردنە وەك پێوەرێکی کار کردن بگرینەبەر، بەڵکو تەنها بە ئەدگارێکی بەشەکی بگیردرێتەبەر[٣٠٩]

## چارەم: دابەش کردن لەسەر بنەمای بەرهەم

ئەم دابەش کردنە لەسەر بنەمای بەرهەمی چالاکیەکان دادەمەزرێت، واتا وەبەرهاتوەکانی، بە مانایەکی تر بەگوێرەی جۆری ئەو خزمەتە دەبێت، کە ڕێکخراوە پێشکەشی دەکات، نموونەی ئەمەش دابەش کردنی زانکۆیە بۆ کۆلێژەکانی ماف و، بەڕێوەبردن و ئابووری و، پزیشکی و هی تر، کە چالاکیی ئەم کۆلێژانە بەیەك چوون و، سروشتیشە، کە هەڵستانە بە خوێندن و بەردەوامی دان بە توێژینەوەی زانستی، بەڵام بەرهەمەکانیان جیاوازە، کە یەکەمیان مافپەروەران پێ دەگەیەنێت و، دوەمیان کارگێران و، بەمجۆرە...

لە چاکییەکانی ئەم دابەش کردنە ئەوەیە، کە دەتوانرێت بەکارهێنانی نموونەیی لە کارامەیی و گورجییە کەسەکییەکان بکرێت و، دەبێتە هۆی سوود بینین لە چالاکییە پسپۆڕییەکان تا ئەوپەڕی توانست و بە ڕوونی کار بۆ دیاری کردنی سەرجەم مەبەستە ویستراوەکان دەکات و، لە هەمان کات دا مسۆگەریی گرنگ بۆ

---

[٣٠٩] عبد الغني بسيوني عبد الله: أصول علم الإدارة العامة، ص١٦٩.

کارگێڕییـــەکی نایـــاب دەنوێنێــت، هــەروەك کــرداری چــاودێری و دیــاری کردنــی بەرپرسیاری لە ڕێگای پێوانە کردنی بەرهەمی تایبەت بە هەر پسپۆڕ یا بەرپرسێك لە هەریەکەیەك ئاسان دەکات[٣١٠]

## پێنجەم: دابەش کردن لەسەر بنەمای کردار

ئەم دابەش کردنە پشت بە کۆ کردنەوەی تەواوی ئەو چـالاکییانە دەبەسـتێت، کە بە تەواو بوونی جۆرێکی دیــار کــراو لــە کردارەکــان لەیــەك یەکــەی کــارگێڕی دەبێت، نموونەی ئەمە دامەزراندنی دەستگەیەکی گشتییە، کە کردارەکانی بنیـات نان بۆ هەر دەستگەیەکی کارگێڕی لە وڵات بگرێتە ئەستۆ.

## خواستی دوەم: جۆری یەکە کارگێڕییەکان

زۆرینەی پەرتووکەکانی بەڕێوەبردنی گشتی جیاکاریی نێوان سێ جـۆر یەکـەی کارگێڕییان دیاری کردوە و، ئەمەش بـەگوێرەی جـۆری ئـەو خزمەتـەی، کـە ئـەم یەکانە ڕایان دەپەڕێنن:

أ - یەکە جێبەجێ کردنییەکان یا ڕەسەنەکان.

ب - یەکە هونەرییە یاریدەدەرەکان یا هاریکارەکان.

ج - یەکە ڕاوێژکارییـەکان.

زۆربەی زانایانی بەڕێوەبردنی گشتی لە ویلایەتە یـەکگرتوەکانی ئەمــەریکاش پشتگیریی ئەم پۆلێنەیان کـردوە و، ژمارەیـەکیش لـە پرۆفیسـۆرانی بـەڕێوەبردنی گشتی لە فەرەنسا و لە میسر پەیڕەوییان کردوون و، ئاراستەیەکی تریش لە میسر هەیە[٣١١]، کـە یەکـە کارگێڕییــەکانی بـۆ تـەنها دوو جـۆر دابـەش کـردوە: یەکـە سەرەکییەکان و یەکـە یاریـدەدەرەکان، یەکـە کارگێڕییـە یاریـدەدەرەکان و یەکـە

---

[٣١٠] إبراهيم عبد العزيز شيحا: الإدارة العامة، ص٢٠٨.

[٣١١] عبد الغني بسيوني عبد الله: أصول علم الإدارة العامة، ص١٧٥.

یاریدەدەرە کارکەرەکان و یەکە ڕاوێژکارییەکان دەگرێتەوە. پاڵپشت بەمەی پێشکەشمان کرد هەڵدەستین بە چارە کردنی جۆرەکانی یەکە کارگێرییەکان وەك ئەمانەی خوارەوە:

**یەکەم:** یەکە کارگێرییە ڕەسەنەکان.

**دوەم:** یەکە کارگێرییە یاریدەدەرەکان.

**سێیەم:** جیاوازییە سەرەکییەکانی نێوان جۆرەکانی یەکە کارگێرییەکان.

## یەکەم: یەکە کارگێرییە ڕەسەنەکان

مەبەست لێی ئەو یەکە کارگێرییە سەرەکییانەن، کە جێبەجێ کردنی ئامانجە گشتییەکانی دەسەڵاتی جێبەجێ کردن دەگرنە ئەستۆ، ئەم یەکانەش بە هەڵستانیان بە ڕاپەڕاندنی پسپۆڕی و کردەکان جیا دەکرێنەوە، کە لە بنەڕەت دا پەیوەستن بەو ئامانج و ئاواتە بنەڕەتییانەی، کە ڕێکخراوە کارگێرییەکان ئامانجییانە.

دەسەڵاتی جێبەجێ کردنیش بۆ یەکە گەلێکی سەرەکی دابەش دەبن، کە هەر یەکەیەك تێی دا بەدەست هێنانی ئامانجێك یا ئامانج گەلێك دەگرێتە ئەستۆ، ئەم یەکانەش بە ناوی وەزارەتەکان دەناسرێن، ئەمەش بوەتە هۆی ئەوەی، وەزارەتێك تایبەت بکرێت بە ئەنجام دانی دادگەری لە نێوان خەڵکی لە ڕێگەی دەسەڵاتی دادوەری، واتا وەزارەتی داد و، بەمجۆرە...

هەڵبەت لە میانەی هەردوو سەدەی هەڤدەم و هەژدەمی زایینی، ژمارەی وەزارەتەکان لە وڵاتانی ئەوروپا سنووردار بوون، کە لە شەش وەزارەت تێپەڕی نەدەکرد مەگەر بە دەگمەن، بەڵام لەگەڵ دەستپێکی سەدەی نۆزدەم ژمارەی وەزارەتەکان ڕووی لە زیاد بوون کرد.

وەك ڕێسایەکی گشتیش، پێویستە ژمارەی وەزارەتەکان لە چەندایەتییەکی ئاوەزانە دا سنووردار بکرێت، بەجۆرێك هەر وەزارەتێك بە بەشێکی کارگێریی سەرەکی گوزارشت بکرێت، کە جێبەجێ کردنی ئامانجێك یا ئامانجەکانی دەسەڵاتی جێبەجێ کردنی وڵاتی گەرەك بێت و، بۆ ئەوەی هەماهەنگی لە نێوان کارەکانی

ئەم وەزارەتانە ئاسان بێت، هەندێك جار لە هەندێك ولآت دا ژمارەی وەزارەتەكان بە شێوەیەكی بەرچاو زیاد دەكات، ئەمەش پێچەوانەی ئەو بنەمایانەیە، كە زانایانی بەڕێوەبردن لەسەری كۆكن، هەروەك پرۆفیسۆر "Leon Bloom" دەڵێت پێویستە ژمارەی وەزارەتەكان لە دە زیاتر نەبێت، لە كاتێك دا هەندێك دەڵێن تەنها بە شەش وەزارەت تەواو بێت بەسە.

خۆی لەخۆی دا وەزارەتەكان بۆ چەندین بەش یا كارگێڕیی سەرەكی دابەش دەبن، هەر یەكێكیان كردەیەكی دیاری كراو دەگرێتە ئەستۆ. لە ئەنجامی ئەو پەرەسەندنە یەك لە دوای یەكانەشی لە كارگێڕیی گشتی و زیاد بوونی ڕادەی پسپۆڕی، دیاردەیەكی تازە لەم ساڵانەی دوایی دا سەری هەڵدا، كە بریتییە لە دامەزراندنی دەستەی كارگێڕیی سەربەخۆ، كە لە ویلایەتە یەكگرتوەكانی ئەمەریكا "Public Agency" پێ دەگوترێت[٣١٢]

## دوەم: یەكە كارگێڕییە هاریكارەكان

لە دەركەوتنی ڕێبازە ئابووری و كۆمەڵایەتییەكان و بڵاو بوونەوەیان لە ولآتانی جیهان دا، فراوان بوونی فرمانەكانی ولآتانی نوێی لە تەواوی بوارە سیاسی و ئابووری و كۆمەڵایەتییەكانی لێ كەوتەوە، لە ئەنجامی دەستوەردانی ولآت لە زۆرێك لەو چالاكیانەی، كە لە سایەی سیستمی ولآتی پاسەوانی دا دوور بوون لە كارەكانی[٣١٣] و، لە ئەنجامی ئەمەش دا كاری ڕێكخراوە و یەكە كارگێڕییە ڕەسەنەكان دوو هێندە بوون، چالاكییەكانیان بۆ كاری لقیی بڵاو بوونەوە و كارامەییەكانی لە هەڵستان بە كرەیە سەرەكییەكانی قورستر كرد، ئەم یەكەیانەش هانایان بردە بەر یەكە و دەستگەیە كارگێڕییە یاریدەدەرەكان، بۆ هاریكاری كردنیان لە بەدەست هێنانی ئەو چالاكییە كارگێڕییانەی، كە ڕاستەوخۆ پەیوەندیدار نەبوون بە ئامانجە سەرەكییەكانی، بە پێشكەش كردنی ئامۆژگاری و

---

[٣١٢] عبد الغني بسيوني عبد الله: أصول علم الإدارة العامة، ص١٨٠.

[٣١٣] عبد الغني بسيوني عبد الله: أصول علم الإدارة العامة، ص١٨٠.

ڕاوێژ پێ کردنی لە سۆنگەی ئەوەی، چین ئەو پێشەکییانەی لەسەرییەتی لە هەنگاوەکان بۆ گەیشتن بە ئاواتەکانی بە بەرزترین گورجیی توانراو، بەمجۆرەش یەکە گەلێکی کارگێڕیی یاریدەدەر لەجۆری: یەکە یاریدەدەرە کارکەرەکان و یەکە ڕاوێژکارییەکان، دەرکەوتن[٣١٤]

أ – **یەکە یاریدەدەرە کارکەرەکان:** لە دیارترینی ئەو کردانەی، کە یەکە کارگێڕییە یاریدەدەرەکان دەیانگرنە ئەستۆ، ئەمانەی خوارەوەن:

١) بەڕێوەبردنی کاروباری کارکەران و، هەموو ئەوانەی پەیوەستن پێیان لە کارە پەیوەندیدارەکان بە دامەزراندن و مووچە و سەرمووچەکانیان و، دڵنیا کردنی جێبەجێ کردنی بڕیارە پەیوەستەکان بە کاروباریان.

٢) یەکە کارگێڕییە یاریدەدەرەکان هەڵدەستن بە کارە دارایی و ژمێریارییەکانی یەکە کارگێڕییە ڕەسەنەکان.

٣) یەکە کارگێڕییە یاریدەدەرەکان هەڵدەستن بە دابین کردنی ئامرازە کەرەستەییەکانی کاری یەکە کارگێڕییە ڕەسەنەکان، ئەمەش کڕینی ئامێر و پارچە و ئامرازە پەڕاوی و کەرەستەییە پێویستەکان دەگرێتەوە.

٤) یەکە کارگێڕییە یاریدەدەرەکان لە کاروبارە بەڵگەنامەیی و، دۆسیە و کۆگەکان و، لە پرسەکانی چاپ و ئاگاداری و بڵاونامەکان هاریکاریی یەکە ڕەسەنەکان دەکەن.

جێی تێبینیشە ئەو کردانەی، کە یەکە کارگێڕییە یاریدەدەرە کارکەرەکان پێی هەڵدەستن، ناچنە نێو نەخشەسازیی فرمانە سەرەکییەکانی یەکە ڕەسەنەکان، بەڵام گرنگییەکی گەورە تایبەت بە جێبەجێ کردنی کاری ئەم یەکانە دەنوێنێت، لە کورترین کاتی توانراو و، بە کەمترین ڕەنج و بەمپەڕی تێچوونی دارایی[٣١٥]

ب – **یەکە ڕاوێژکارییەکان:** ئەم جۆرەی یەکە یاریدەدەرەکان وەك ئەنجامێکی ژێرانەی قەبە بوونی ڕێکخراوە کارگێڕییەکان و فراوان بوونی بواری

---

[٣١٤] عبد الغني بسيوني عبد الله: أصول علم الإدارة العامة، ص١٨١.

[٣١٥] عبد الغني بسيوني عبد الله: أصول علم الإدارة العامة، ص١٨٢.

چالاکییەکانیان، دەرکەوت و، کارەکانیان بەجۆرێك ئالۆز بوو، کە بوە هۆی پێداویست بوون بە هانا بردنە بەر دەستگە تایبەتەکان بۆ گرتنە ئەستۆی تێخوێندنەوە و توێژینەوەی ئەو گرفتانە و، پێشکەش کردنی چاکترین چارەسەری بۆیان و ئەنجام دانی ڕاوێژ لەبارەی ئەو بڕیارە گرنگانەی، کە ئەم ڕێکخراوانە دەریان دەکەن.

پەرەسەندنی زانستی و پێشکەوتنی تەکنەلۆژیاش لە زیاد بوونی پێداویست بە بوونی ئەم یەکە کارگێرییە ڕاوێژکارییانە دا پشکدارییان کرد، بۆ ئەوەی هاریکاریی کارگێرییە ڕەسەنەکان بکەن بە شارەزایی و پسپۆڕییان لە بەدەست هێنانی ئامانجەکانیان بە بەرزترین گورجیی توانراو.

کاری ئەم دەستە ڕاوێژکارییانە بە مۆرکی زەینی و هونەریی بنیات نراو لەسەر زانست و شارەزایی و پسپۆڕی، جیا دەکرێتەوە، کە کارێکی هزرییە ڕووەو دووپات کردنەوە لەسەر ئاواتێك ئاراستە کراوە، کە بریتییە لە بەدەست هێنانی چاکترین پێناوەکانی ڕێکخستن بۆ بەدەست هێنانی ئامانجەکانی لە باشترین ڕوو، بۆیەش ناوەڕۆکی کاری ڕاوێژکاری پێویستیی بوونی ڕاستییەکان بە شێوە جیاجیاکانی، جا ڕوون کردنەوەکان بن یا ئامارەکان یا زانیارییەکان و، ئەوەی بەدوایەوە دێت لە پۆلێن و شیکارەکان بۆی پابەند دەکات.[٣١٦]

لە گرنگترینی ئەو کردانەی، کە یەکە ڕاوێژکارییەکان پێی هەڵدەستن ئەمانەی خوارەوەن:

١) ئەنجام دانی سەرجەم توێژینەوە و تێخوێندنەوە پێویستەکان بۆ ئامادە کردنی سیاسەتی ڕێکخراوە، ئەگەریشی هەیە، کە ئەندامانی ئەم یەکە ڕاوێژکارییانە بەم شێوەیە ڕاسپێردرێن بە وتووێژ لەگەڵ کەسایەتی و ڕێکخراوەکان لە دەرەوەی کارگێڕی.

---

[٣١٦] عبد الغني بسيوني عبد الله: أصول علم الإدارة العامة، ص١٨٦. وإبراهيم درويش: الإدارة العامة، ص٢٢٦.

٢) ئامادە کردنی هەوڵدارییەکان، یا بەلانی کەم، دانانی گریمان لە پێشبینییە ئایندەییەکانی کارگێڕی.

٣) ئامادە کردنی پرۆژە و بەرنامەکان یا پلانی کار.

٤) چاودێریی جێبەجێ کردنی بڕیار و بەرنامەکان و، هەماهەنگیی کار کردن لە کارگێڕییە جێبەجێ کردنییەکان.

٥) ئامادە کردنی سەرجەم ڕێوشوێنەکان بە دووبارە ڕێکخستنەوە و گەشە پێ دانی ڕێگەکانی کار کردن و، چاودێری کردنی ئەنجامەکانی باش کردنی پەیوەندییە مرۆییەکان لە ناوەوە و دەرەوەی ڕێکخراوە دا[٢١٧]

## ج – جیاوازییە سەرەکییەکانی نێوان جۆرەکانی یەکە کارگێڕییەکان

١) **جیاوازیی نێوان یەکە ڕەسەنەکان و یەکە کارگێڕییە یاریدەدەرەکان:** یەکە کارگێڕییە ڕەسەنەکان لە بنەڕەت دا گرنگیدەرن بە جێبەجێ کردنی ئامانجەکان و، بەدەست هێنانی ئەو ئاواتانەی، کە لە پێناوی دا دامەزراوە، لە کاتێك دا یەکە یاریدەدەرەکان هەڵدەستن بە پێشکەش کردنی هاریکاریی کارگێڕی و هونەری، لە پێناو ئاسان کردنی کارەکان و بەدەست هێنانی ئامانجەکانی.

جیاکەرەوەی دوەم لە نێوان ئەم دوو جۆرە بریتییە لەوەی یەکە کارگێڕییە ڕەسەنەکان، یەکەی جێبەجێ کردنن، کە خزمەتەکانیان پێشکەشی جەماوەری هاوڵاتیان دەکەن، لە کاتێك دا دەبینین، کە پەیوەندییەکی دابڕاو لە نێوان یەکە ڕاوێژکارییەکان و جەماوەر دا هەیە.

لە ڕەسەنیش دا سەبارەت بە یەکە یاریدەدەرە کارکەرەکان ئەوەیە، کە خزمەتگوزارییەکانی پێشکەش بە جەماوەر ناکات، لەگەڵ ئەوەش دا دەبینین، کە هەندێکك لەم یەکانە مامەڵە لەگەڵ جەماوەر دا دەکەن[٢١٨]

---

[٢١٧] عبد الغني بسيوني عبد الله: أصول علم الإدارة العامة، ص١٨٦.

[٢١٨] عبد الغني بسيوني عبد الله: أصول علم الإدارة العامة، ص١٩٠.

بەڵام ڕێسای ڕەسەن لە بوونی ئەم یەکانە دا ئاوا دەمێنێتەوە، کە خزمەتگوزارییەکانی پێشکەشی جەماوەری هاوڵاتیان ناکات، بەڵکو چالاکییەکانی ڕووەو یارمەتیی یەکە کارگێڕییە ڕەسەنەکان ئاراستە دەکات.

لە لایەنی سێیەمیش دا دەبینین، کە ئاراستەیەك هەیە ڕووەو جەخت کردن سەبارەت بە یەکە کارگێڕییە یاریدەدەرەکان، بە جۆرێك دەستگە یا دەستە ناوەندییەکان لەسەر ئاستی ولآت دا، دادەمەزرێن، کە هەر یەکێکیان تایبەت دەکرێت بۆ پێشکەش کردنی جۆرێك لە هاریکاری و یارمەتیی یەکە کارگێڕییە سەرەکییەکان و، پەیڕەویی سەرۆك کۆمار یا سەرۆکی ئەنجوومەنی وەزیران دەکات.

ئەمە لەگەڵ بوونی یەکەی یاریدەدەر لە ناوەوەی وەزارەت و فەرمانگە حکومییەکان، لەکاتێك دا یەکەی کارگێڕیی ڕەسەن هەیە، کە لە ڕەسەن دا بۆ گرتنە ئەستۆی هەر یەکێکیان بۆ بەدەست هێنانی ئامانجێك یا ئامانجەکان دابەش کراون.

سەرباری بوونی ئەم جیاوازییە سەرەکییانە لە نێوان یەکە ڕەسەنەکان و یەکە کارگێڕییە یاریدەدەرەکان" ئەوا دەبینین، کە یەکە کارگێڕییەکان لە نێوان دوو ئەدگار دا کۆدەبنەوە، بە جۆرێك وەك یەکەیەکی ڕەسەن شەوڤخوونی بۆ بەدەست هێنانی ئامانجە سەرەکییەکانی دەکات و، لەهەمان کات دا پێشکەش کردنی هاریکاری و یارمەتی بۆ یەکە ڕەسەنەکانی تر دەگرێتە ئەستۆ[٣١٩]

٢) **جیاوازیی نێوان یەکە یاریدەدەرەکان و یەکە ڕاوێژکارییەکان:** سرووشتییە، کە کاری یەکە یاریدەدەرە کارکەرەکان بریتییە لە یارمەتی دانی یەکە کارگێڕییە ڕەسەنەکان لە بەدەست هێنانی ئامانجەکانی لە ڕێگەی ئەو خزمەتگوزاری و هاریکارییانەی، کە پێشکەشی دەکات، لە پرسە ژمێریارییەکان و کاروباری کارکەران و کردارەکانی کڕین و کۆگە کردن، لە کاتێك دا هاریکاریی دەستە

---

[٣١٩] عبد الغني بسيوني عبد الله: أصول علم الإدارة العامة، ص١٩٠.

ڕاوێژکارییەکانی یەکە ڕەسەنەکان لـە پێشـکەش کردنـی پێشـنیار و ڕای ڕاوێژکاری، دوای ئەنجام دانی توێژینەوە و تێخوێندنەوە پێویستەکان کورت دەبێتەوە.

کاری یەکە یاریدەدەرەکانیش بە سروشتێکی کەرەستەیی جیا دەکرێتەوە، کە هاریکاریی یەکە ڕەسەنەکان دەکات لە کاری ڕۆژانەی کارگێری بـێ پێشـکەش کردنی پێشنیار و ڕاوێژ کردن، بە پێچـەوانەوەش کـاری یەکـە ڕاوێژکارییـەکان ڕەنگێکی زەینیی هونەریی هەیە، کە جەخت کردنەوەکەی لە دەوری پێشـکەش کردنی ڕاوێژ و ئەو هەموار کردنانەی پێی باشە و پێشنیارەکان بـۆ هـان دانـی کاری ڕێکخراوە بۆ بەرزترین گورجیی توانراو.

هەروەها یەکە یاریدەدەرە کارکەرەکان بڕیـار و فـەرمانی پابەنـد بـوون لـە چارچـێوەی پسـپۆڕییەکانی دەردەکـات، بـەڵام یەکـە ڕاوێژکاریـیـەکان مـافی دەرکردنی بڕیارییان نییە، کە ئەدگارێکی پابەند بوونی هەبێت.

سەرباری ئەوەی یەکە ڕاوێژکارییەکان لە ڕووی یاساییەوە خاوەنی دەسـەڵاتی دەرکردنی بڕیاری پابەند بوون نین، بەڵام ڕەوشێکی ڕەوشتیی بایەخداریان هەیـە و، پێشنیار و ڕاوێژەکانیان بە ڕێز و بایەخێکی زۆرەوە لە لایەن ئەندامانی یەکە ڕەسەنەکان وەردەگیرێت، لەبەر ئەوەی لە کەسانێکەوە دەرچوون، کە شارەزایی و پسپۆڕییان هەیە.

ئاراسـتەیەك هەیـە ڕووەو ناوەنـدێتی سـەبارەت بـە یەکـە کارگێڕییـە یاریدەدەرەکان بە تایبەت، بـە جۆرێـك دەسـتگە گـەلێکی ناوەنـدیی تایبـەت دەرکەوتوون لـە پێشـکەش کردنـی هاریکـاری و ڕاوێـژ بـە یەکـە کارگێڕییـە ڕەسەنەکان.

بـەمجۆرە زۆر جـار دەبیـنین جیاوازییـەك و تێهەڵکیشـییەك، لـە نێـوان سـێ جۆرەکەی یەکە کارگێڕییەکان لە هەڵ و مەرجی کردەنی دا هەیـە، سـەرباری ئـەو جیاوازییـەی، کـە ڕێکخسـتنی کـارگێڕیی سـاخ لـە نێوانیـان و، دیـاری کردنـی

جیاکەرەوە و سنووری نێوان فرمانەکان و چالاکییەکانی هەر جۆرێك لەم یەکانە، دەخوازێت.

دەشێت وردترین نموونە بۆ جیا کردنەوەی نێوان یەکە ڕەسەنەکان و یەکە یاریدەدەرەکان جا کارکەرەکانی بێت یا ڕاوێژکارییەکانی، لە ڕێکخستنی کارگێرییە سەربازییە دامەزراوەکان لە زۆرینەی سووپاکانی جیهان دا ببینین.

هەڵبەت چەك و پلانی جەنگی (Formation Combattantes) جیاجیا هەن، بە جۆرە جیاوازەکانی لە زریپۆش و دوورهاوێژ و یەکەکانی هەڵ دانی مووشەك، کە ئەرکیان جێبەجێ کردنی کردارە جەنگییەکانە، کە بریتییە لە یەکە ڕەسەنەکانی جێبەجێ کردن لە کارگێریی سەربازی.

بەڵام دەبینین یەکە یاریدەدەرەکان بریتین لە کارگێرییە هاریکارەکان (Service d'appui)، کە هەڵدەستن بە کڕین و دابەش کردنی پێویستییەکانی ژیانی ڕۆژانە و خۆراکی هێزەکان لە هەموو لقە جیاجیاکانی پیادە و دەریایی و ئاسمانی. هەروەها یەکە یاریدەدەرە کارگێرییە ڕاسپێردراوەکانیش بە کڕین و ساز کردنی ئامێرە سەربازییەکان و کەلوپەلی هونەری و کارگێرییە پزیشکییەکان و هی تر لەو کارگێرییانەی، کە هەموو جۆرە پاڵپشتی و هاریکاری و یارمەتییەك پێشکەشی یەکە شەرکەرەکان دەکەن، دەگرێتە ئەستۆ، لە کۆتایش دا یەکە ڕاوێژکارییەکان لە ئاستە جیاجیاکان دا، ڕاسپێردراون بە ڕێکخستنی سەربازیی نەتەوەیی و هەرێمی و، لە گۆڕەپانی کردارەکان و، لە کۆ کردنەوە و قۆزتنەوەی زانیاری لە هێزەکانی دوژمن و، هەروەها لە دانانی ئەو پلانە ستراتیژی و کارگێرییانەی، کە کردارەکانی لەسەر بەڕێوەدەچێت[320]

[320] عبد الغني بسيوني عبد الله: أصول علم الإدارة العامة، ص١٩٢.

# توێژبەندی سێیەم

## پلە پلەیی دەسەڵاتی کارگێڕی

هەر ڕێکخستنێکی قەبارە گەورە جا ئایا گشتی بێت یا تایبەت، دەبێت لە شێوەیەکی قوچەکی یا پلەپلەیی پێك بهێنرێت، ئەم سیستەمەش لە یاسای کارگێڕی دا پێی دەڵێن سیستەمی پلیکانەی کارگێڕی، کە دەسەڵات و بەرپرسیارییەکان بەسەر پلە جیاجیاکان دا دابەش دەبێت، بەجۆرێك ئەم دەسەڵات و بەرپرسیاریيانە لە ناوەوەی ڕێکخستن لە بەرزترینەوە دێتە خوارووترین[٣٢١]

هەروەها سیستەمی پلەپلەیی یا قوچەکی لە یەکەم جار دا لە کارگێڕییە سەربازییەکان پەیڕەو کراوە، کە دەسەڵات لە ئاستە جیاجیاکان دا دابەش دەکرا و تا ئێستاش، هەروەك سەرکردەی بڵند هەیە، کە فەرمانی بۆ یاریدەدەرە ڕاستەوخۆکانی و گەورە ئەفسەران دەردەکات، پاشان ئەمانیش هەڵدەستن بە دەرکردنی ئەو فەرمانانەی، کە پابەندین بۆ جێبەجێ کردنی فەرمانە یەکەمەکان بۆ کارمەندانیان لە ئەفسەرانی پلە کەمتر لەوان و، بەوجۆرە تا دەگەینە کۆتایی بۆ شانەی ئەو سەربازانەی، کە کارەکانیان لە گوێڕایەلیی ئەو فەرمانانە و جێبەجێ کردنیان کورت دەبێتەوە[٣٢٢]

ئەمرۆش ئەم سیستەمە پلەپلەییە یا قوچەکییە لە کارگێڕییە شارستانییەکان دا پەیڕەو دەکرێت، کە کارەکان لەسەر دابەش کردنی فرمانبەران بۆ ئاست گەلێك ئەنجام دەدرێت، بەجۆرێك هەر چینێك لە دەسەڵات و بەرپرسیاری لەگەڵ ئەوی تر جیاوازە و، بەم شێوەیەش دەتوانین پەیکەری دەستگەی کارگێڕی وەك قوچەکێك، کە چینەکان فرە بکات، وێنە بکێشین و، لەسەر فرمانبەرانی هەر چینێك دەبێت،

---

[٣٢١] إبراهيم عبد العزيز شيحا: الإدارة العامة، ص٢٣٣.

[٣٢٢] إبراهيم عبد العزيز شيحا: الإدارة العامة، ص٢٣٤. وسليمان طماوي: مبادئ علم الإدارة العامة، ص٩٦.

کە فەرمانی لە فرمانبەرانی بەرزتر پێ بگات، تا لە کۆتایی دا دەگاتە لوتکەی قوچەك، کە بەرزترین سەرۆکی کارگێڕیی لێیە.

پلەپلەیی دەسەڵات و شۆڕبوونەوەی لە بەرزترینەوە بۆ نزمترین و، بەڕێوەچوونی لە دەستگەی کارگێری، بە گرنگترین کۆڵەگە و پایە بنەڕەتییەکانی سەرکەوتن و کارایی هەر ڕێکخستنێك گوزارشت دەکرێت، کە لەمیانەی ئەو زنجیرە سەرۆکایەتییەی، کە پشت بە پلەپلەیی دەسەڵات دبەستێت، ڕکێڤێکی کارا لەسەر بەدەست هێنانی کارەکان و بەدەست هێنانی ئامانجە ویستراوەکان بەدەست بێت[٣٢٣]

لە پلەپلەیی دەسەلاتی کارگێری بەو جۆرەی پێشوو و، زەق کردنەوەی پلەپلەییەکی تر دەردەکەوێت، لە ڕووی بەهای یاسایی هەڵسوکەوتە ئەنجام دراوەکانی فرمانبەرانی کارگێری، ئەمەش بە گوێرەی جیاوازیی ئەو بنکە یاساییانەی، کە پڕی دەکەنەوە لە پلیکانەی پلەپلەیی کارگێری و، یاسا و گەلاڵەنامەکانیش هەڵدەستن بە دیاری کردنی مەودای ئەو فەرمانانەی، کە لە هەر سەرۆکێکی ڕێکخستنەکە دەردەچن و، مەودای بەها یاساییەکەی[٣٢٤]

جا ئەگەر پلەپلەیی قوچەکی لە هەر ڕێکخستنێك پێویست بێت، ئەوا پێویستە ئەم پلەپلەییە، بەو ئاستانەی لەخۆی دەگرێت، لەگەڵ پەیکەری ڕێکخستن بشێت و، بەیەکەوە بەندبن، بەوەی کرداری پەیوەندی کردن و جێبەجێ کردنی ئامانجەکانی ڕێکخستن دەستەبەر بکات، بەجۆرێك، جۆرێك لە پەیوەندییە مرۆییەکان و هاریکاری وەبەرهێن لە نێوان تەواوی ئاستەکان دا هەبێت.

دەتوانین گرنگترین تایبەتمەندییەکانی پلەپلەیی کارگێری بۆ ئەمانەی خوارەوە پوخت بکەین[٣٢٥]:

١) ئەم سیستمە لە بنکەوە فراوان دەبێت و لە لوتکە دا تەسك دەبێت.

---

[٣٢٣] إبراهيم عبد العزيز شيحا: الإدارة العامة، ص٢٣٤.
[٣٢٤] إبراهيم عبد العزيز شيحا: الإدارة العامة، ص٢٣٤.
[٣٢٥] إبراهيم عبد العزيز شيحا: الإدارة العامة، ص٢٣٥.

٢) بۆ هەر تاکێك لە ڕێکخستن دا تەنها یەك سەرۆك هەیە، کە فەرمانی لێیەوە پێ دەگات.

٣) تاك هەمیشە فەرمانەکانی لە دواین ئاستی پلەی بەرزتر لەخۆی، لە پلەکانی پلیکانەی کارگێری پێ دەگات.

٤) پەیوەندیی ڕەسمی لە نێوان ئاستە کارگێرییە جیاجیاکان دا دەبێت و، بێ ستوون بوونی ئاستێك، جا پەیوەندییەکە لە خوارەوە بۆ سەروو بێت یا لە سەرەوە بۆ خواروو.

٥) بۆ هەر بەڕێوەبەرێك، لە ئاستێك دا، دەسەلاتی پێویست بۆ بەدەست هێنانی ئەرك و کردە پێ ڕاسپێردراوەکانی، هەیە، وێڕای بەرپرسیاریی سەرکەوتن لەم بەجێهێنانە.

## سیستمی پلەپلەیی کارگێری ئەم سوودانەی خوارەوە بەدەست دەهێنێت:

١) ئەم سیستمە دوورکەوتنەوە لە دوورایی بە سەرۆکایەتی دەبەخشێت و، هەرواش دوورایی لە فەرمان دوور دەخاتەوە، کە ڕوونیی پەیوەندییەکان بە سەرنج دانە دیاری کردنی بە وردیی هەر ئاستێك لە ئاستەکانی ڕێکخستن دەستەبەر دەکات.

٢) ئەم سیستمە کار بۆ ئاسان بوونی دیاری کردنی بەرپرسیاری و دەسەلات لە هەر ئاستێك لە ئاستەکانی ڕێکخستن دا دەکات.

٣) ڕێ لە ناوەند بوونی دەسەلات و، کەلەکە بوونی پسپۆڕییەکان لە لوتکە دا، دەگرێت، واتا کرداری نا ناوەندییەتیی وەرگرتنی بڕیارەکان ئاسان دەکات.

٤) ئاسانیی پەیوەندیکاریی نێوان یەکەکانی دەستگەی کارگێری لە بەرزترین قوچەکی کارگێری و لە خوارووترینی دا دەستەبەر دەکات، کە دەبێتە هۆی ئاسانیی ئاشکرا بوونی گرفتەکان و خێرایی چارەسەر کردنیان.

٥) ئەم سیستمە بـاڵا دەسـتیی دەسـەڵاتی ناوەنـدی لەسـەر کـارگێڕی و لقەکان لە سەرانسەری وڵات دا مسۆگەر دەکات و، کردەی هەڵستان بە فرمانـە سەرەکییەکان تێی دا ئاسان دەکات[٣٢٦]

بەڵام سەبارەت بە لایەنی مەودای ملکەچی و گوێڕایەلیی پێویستی کارمەندان لە هەمبەر سەرۆکەکانیان، ئەوا ڕێسایەکە لەم بارەوە ئەوەیە، کە لەسـەر کارمەنـد پێویستە گوێڕایەلیی فەرمان و، ئاراستە دەرچوەکان بێـت لـە سـەرۆکەکەی بـۆی، مـادەم ئـەم فـەرمان و ئـەو ئاراسـتە کراوانـە لـە چارچـێوەیەکی ڕەوا دان، واتـا سەرپێچیی یاسا نین و، شارەزایانیش لەم بارەوە جیاکارییەکانیان لەم سـێ بـارە دا هێناوەتەوە

## باری یەکەم: فەرمانە ڕەواکان

ئەگەر هاتوو فەرمانە دەرچوەکان لـە سـەرۆکەکەوە بـۆ کارمەنـد ڕەوا بـوو و، لەگەڵ دەقە یاساییەکان کۆك بوو، ئەوا لەم بارە دا لەسـەر کارمەنـد دەبێـت، کـە ملکەچیی فەرمانە دەرچوەکان لە سەرۆکەکەیەوە بۆی بێت و لێـی یـاخی نـەبێت، مادام ئەم فەرمانانە لەگەڵ دەقە یاساییەکان کۆکن.

بەڵام پابەند بوون بە گوێڕایەلی لە لایەن کارمەندەوە، خۆی لەخۆی دا ڕێـی لێ ناگرێت، لە مافی تاوتوێ کردنی مەودای گونجانی ئەم فەرمانانە لەگـەڵ سـەرۆك دا و، بۆ ئەمەش دوو مەرج دێنە پێش:

**یەکـەم:** کارمەند نیازی چاك بێت و، هاندەرەکەشی لە گفتوگۆ کردن بەدەسـت هێنانی بەرژەوەندیی گشتی بێت، نەك بەرژەوەندیی کەسەکی.

**دوەم:** گفتوگـۆ کردنـی سـەرۆکەکەی پـڕ بێـت لـە لێهـاتوویی و ڕەوشـتی فرمانی[٣٢٧]

---

[٣٢٦] إبراهيم عبد العزيز شيحا: الإدارة العامة، ص٢٣٦. سليمان الطماوي: مبادئ علم الإدارة العامة، ص٩٧.

[٣٢٧] إبراهيم عبد العزيز شيحا: الإدارة العامة، ص٢٣٧.

## باری دوەم: فەرمانە نا ڕەواکان

ئەگەر هاتوو فەرمانەکانی سەرۆکەکە سەرپێچی یاسا بوو، واتە نـا ڕەوا بـوو، ئەوا کارمەند خۆی لەم دوو خالە دا دەبینێتەوە:

- یا ئەوەتا ڕێز لـە یاسـا دەگرێـت، گوێڕایـەلیی فەرمانـەکانی سـەرۆکی نابێت.

- یا ئەوەتا گوێڕایەلیی ئەم فەرمانانـەی سـەرۆکەکەی دەبێـت، هەڵبـەت سەرپێچیی یاسا دەبێت.

هەڵبەت هەندێك شارەزا پێیان وایە، کە ڕێز گرتنی بڕیارە یاساییەکان پێویست دەکات، پاشان لەسەر کارمەند دەبێت گوێڕایەلیی فەرمانە نارەواکانی سەرۆکەکەی نەبێت لەبەر بەرهەڵستیی لەگەڵ دەقە یاساییەکان[٣٢٨]

هەنـدێك شـارەزاش بـۆ گوتـەی پێویسـت بـوونی ڕێـز گـرتنی کارمەنـد بـۆ فەرمانەکانی سەرۆکەکەی دەگەڕێنەوە، تەنانەت ئەگەر ئەم فەرمانانـە سەرپێچـیی دەقە یاساییەکانیش بـن، ئەمـەش بـۆ مسـۆگەریی بـاش بەڕێوەچـوونی کـار لـە دەستگەی کارگێری و مسۆگەریی ڕێك و پێکیی[٣٢٩]

هەندێکی تر بۆ گوتەی ئەوە دەگەڕێنەوە، کە پێویسـتە کارمەنـد گوێڕایـەلیی فەرمانەکانی سەرۆك ببێت، مەگەر نـا ڕەواییەکـەی ڕوون و زل بێـت و، جێبـەجێ کردنـی فەرمانــە دەرچـوەکان لـە سـەرۆکەکەوە زیـان بـە بەرژەوەنـدیی گشـتی بگەیەنێت[٣٣٠]

جا ئەگەر شارەزایانی یاسای کارگێری لە ڕوانگەی یاساییەوە بایەخ بە پابەنـد بوون بە گوێڕایەلیی سەرۆکەوە بـدەن، ئـەوا شـارەزایانی بـەڕێوەبردنی گشـتی لـە کاریگەرییـە گەورەکـەی ئـەم پابەنـد بوونـە دەنـاڵێنن، کـە سـەرکەوتنی هـەر

---

[٣٢٨] إبراهيم عبد العزيز شيحا: الإدارة العامة، ص٢٣٧.

[٣٢٩] إبراهيم عبد العزيز شيحا: الإدارة العامة، ص٢٣٧.

[٣٣٠] إبراهيم عبد العزيز شيحا: الإدارة العامة، ص٢٣٧.

ڕێکخستنێك دەوەستێتە سەر مەودای گوێڕایەڵی لە لایەن کارمەندانەوە و، چۆنییەتیی پێگەیشتنی فەرمانەکانی سەرۆك و مەودای جێبەجێ کردنی.

بنەماکانی بەڕێوەبردنی گشتی ئاماژە بەوە دەکەن، کە هەر ڕێکخستنێك بە تەواوی دڵنیاییەوە، بە چڵەپۆپی دەگات، ئەگەر کارمەند فەرمانەکانی سەرۆکی پێگەیشت و بە قایل بوونەوە هەڵستێت بە جێبەجێ کردنی، نەك لە ترس لە لێپرسینەوە و سزا.[٣٣١]

## باری سێیەم: باری جێبەجێ کردنی فەرمانە تاوان لە خۆ گرتوەکان

دەتوانین بڵێین، کارمەند پابەندی ئەو فەرمانانە نابێت، کە لە سەرۆکەوە بۆی دەرچوە ئەگەر جێبەجێ کردنی تاوانێك لەخۆ بگرێت.

---

[٣٣١] إبراهيم عبد العزيز شيحا: الإدارة العامة، ص٢٣٨.

# بەشی دووەم

# بنەماکانی ڕێکخستن

چەند بنەمایەکی زانستیی بنەڕەتی هەن، کە پێویستە ڕێکخستنێکی کارگێڕیی ساخی لە تەواوی ڕێکخستنە کارگێڕییە گشتییەکان لەسەر دابمەزرێت.

لە ڕێگەی ئەم بنەمایانەش ئەو بنەمایانەمان بۆ ڕوون دەبێتەوە، کە ڕێکخستنی کارگێڕی لە ڕووی سەرکردایەتیی بڵند لە وڵات و سەرۆکایەتی پابەندی دەبێت و، دەرکردنی بڕیار و فەرمان و دیاری کردنی پسپۆڕی و بەرپرسیارییەکان و، دابەش کردنی کار لە ناوەوەی ڕێکخراوەی کارگێڕی و، هی تریش لە لایەنە سەرەکییەکانی ڕێکخستنی کارگێڕی، هەروەها شارەزایانی بەڕێوەبەردنی گشتیش لە بارەی دیاری کردنی ژمارەی ئەم بنەمایانە بۆچوونی هەر یەکێکیان جیاوازە[٣٣٢]

تێخوێندنەوەی بنەماکانی ناوبراو وا دەخوازێت، کە ئەم بەشە بۆ ئەم هەشت توێژبەندەی خوارەوە دابەش بکەین:

توێژبەندی یەکەم: یەکێتیی دەسەڵاتی سەرکردایەتی لە وڵات.

توێژبەندی دووەم: یەکێتیی سەرۆکایەتی و فەرمان.

توێژبەندی سێیەم: پێویستیی هاوتایی چارچێوەی کردەنیی کارگێڕی و چارچێوەی ڕەسمیی کارگێڕی.

توێژبەندی چارەم: ناوەند نەبوونی دەسەڵات.

توێژبەندی پێنجەم: نەبوونی دەستڕۆیی لێژنەکان لە ئەنجام دانی فرمانە جێبەجێ کردنییەکانی کارگێڕی.

---

[٣٣٢] عبد الغني بسيوني عبد الله: أصول علم الإدارة العامة، ص١٩٥.

تویژیەندی شەشـــەم: پێویستیی پابەندی و یەکســانیی نێـوان دەســەڵات و بەرپرسیاری.

تویژیەندی هەفـتەم: پێویستیی دیاری کردنی ئەرك و بەرپرسیارییەکان بـە وردی.

تویژیەندی هەشتەم: بنەمای پسپۆڕی.

# توێژبەندی یەکەم

## یەکێتیی دەسەڵاتی سەرکردایەتی لە وڵات

کردەی سەرەکیی کارگێڕیی گشتی، لە هەڵستانی بە جێبەجێ کردنی ئامانجە گشتییەکانی وڵات پوخت دەبێت، هەڵبەت ڕێکخراوە کارگێڕییە گشتییەکان، بە تەواوی یەکە ڕەسەن و یاریدەدەرەکان و ڕاوێژکارییەکانی، دەبێت چالاکییەکانیان بە ئاراستەی بەدەست هێنانی ئەم ئامانجانە بەڕێوە بچێت.

لەبەر ئەوەی ڕێکخراوە کارگێڕییە گشتییەکان، کە دەستگەی کارگێڕیی وڵات لە جیاجیای و فرەیی و لقداری پێك دەهێنن، هەروەك لە وەزارەت گەلێکی جیاجیا و فەرمانگە و دەستەی گشتیی ناوەندی و نا ناوەندیی فرەیی پێك دێن، ئەوا پێویست دەکات، کە دەسەڵاتێکی بڵندی یەکگرتوو لە هەر وڵاتێك دا هەبێت، کردەی سەرکردایەتی و ئاراستە کردنی تایبەت بە سەرجەم ڕێکخراوە کارگێڕییەکان لە وڵات دا لە ئەستۆ بگرێت[٢٣٣]

بوونی سەرکردایەتییەکی گشتیی یەکگرتوو لە وڵات دا، بوەتە بنەمایەکی سەرەکیی ڕێکخستنی کارگێڕیی ساغ، هەروەك ئەم سەرکردایەتییە پابەندە بە ئاراستە کردنی تەواوی ڕێکخراوەکان ڕووەو بەدەست هێنانی ئامانجە گشتییەکانی وڵات و، بە هەماهەنگیی کار کردن لە نێوان ئەم فرە ڕێکخراوانە بە یەکە بەربڵاوەکانیانەوە بۆ مسۆگەر کردنی بەڕێوەچوونی سەرجەمیان ڕووەو ئاواتە گشتییەکانی وڵات بە هەماهەنگی و تەبایی و، بۆ ڕێ گرتن لە ڕوودانی ناکۆکی یا جیاوازی لە نێوانیان لە کاتی ئەنجام دانی پسپۆڕییەکانیان.

---

[٢٣٣] عبد الغني بسيوني عبد الله: أصول علم الإدارة العامة، ص١٩٦.

لە سیستمە دیموکراتییەکان دا دەسەڵاتی جێبەجێ کردن، ئەو کردەیە دەگرێتە ئەستۆ، کە گەل دیاریی دەکات لە ئامانج و سیاسەتە گشتیەکانی وڵات لە ڕێگای پەرلەمانتارانی[٣٣٤]

دەسەڵاتی سەرکردایەتیش لە سیستمی سەرۆکایەتی بریتییە لە کەسێتیی سەرۆك کۆمار، کە تایبەت دەبێت بە وێنا کردنی سیاسەتی گشتیی وڵات و دەسەڵاتی جێبەجێ کردنیش لە چاودێریی خۆی بۆ وەزیرەکانی لێدەگەڕێت، هەروەك کردەی هەماهەنگیش لە نێو سەرجەم وەزارەتەکان و هی تر لە دەستە کارگێرییە هەبوەکانی لە وڵات دا دەکەوێتە ئەستۆ.

جا ئەگەر دەسەڵاتی سەرکردایەتی لە سیستمی سەرۆکایەتی، بریتی بێت لە کەسێتیی سەرۆك کۆمار، ئەوا لە سیستمی پەرلەمانی لە دەست ئەنجوومەنی وەزیرانە، کە بۆ سەرۆك کۆمار نییە جگە لەدەسەڵاتە ناوییەکان، بەڵام دەسەڵاتە کردەنییەکان لە وێنا کردنی دەسەڵاتی گشتی و بەدواداچوونی جێبەجێ کردنییان و، هەروەها هەماهەنگیی نێوان سەرجەم یەکە کارگێرییەکان، بۆ ئەنجوومەنی وەزیران دەبێت[٣٣٥]

---

[٣٣٤] عبد الغني بسيوني عبد الله: أصول علم الإدارة العامة، ص١٩٦.

[٣٣٥] إبراهيم عبد العزيز شيحا: الإدارة العامة، ص٢٤٤ و، الدكتور بكر القباني: الإدارة العامة، الجزء الثاني، ص١١٨.

# توێژبەندی دووەم

## یەکێتیی سەرۆکایەتی و فەرمان

مانای یەکێتیی سەرۆکایەتی و فەرمان دان ئەوەیە، کە دەسەلاّتی دەرکردنی فەرمان و بڕیار دان لەیەك سەرچاوە دا دیاری بکرێت، چونکە کارمەند ملکەچ نابێت مەگەر لەیەك سەرۆکی ڕاستەوخۆیەوە فەرمان و ڕێنمایی پێ بگات.

ئەم بنەمایە ناوەند بوونی دەسەلاّتیش لە دەستی یەك کەس لەخۆ ناگرێت، بەلّکو بۆ هەر کۆمەلّەیەك لە کارکەران سەرۆکێکی ڕاستەوخۆی کارگێڕی هەیە، کە هەلّدەستێت بە ئاراستە کردنیان و دەرکردنی فەرمانی پێویست بۆ باش بەڕێوەچوونی کار.

هەلّبەت چەند ڕەوشێك هەن، کە هەڕەشە لەم بنەمایە دەکەن، هەروەك ئەگەر ڕێنمایی لە زیاتر لە سەرۆکێك بۆ یەك کارمەند دەربچێت، وەك ڕێنمایی لە سەرۆکە هونەرییەکەیەوە دەربچێت وێڕای بوونی سەرۆکێکی تری کارگێڕی، ئەوا لە شێوەی ئەم بارە دا، دەبێت سەرۆکایەتی یەك بخرێت بۆ ڕێ گرتن لە ڕوودانی دژبەری، یا بەرهەلّستی لە فەرمانە دەرچوەکان بۆ هەمان کارمەند[٣٣٦]

بنچینەی ئەم بنەمایەش بۆ ڕێسای چارچێوەی توانین، یا مەودای ئەو چاودێرییەی بڕیاری دیاری کردنی ئەو تاکە کارمەندانە دەدات، دەگەڕێتەوە، کە ملکەچیی چاودێری و سەرپەرشتیاریی سەرۆکێك دەبن بە چەندایەتییەکی دیاری کراو، چونکە ناتوانێت بەشداری ئەم سەرپەرشتی کردنە بکات بە کارایی و گورجی مەگەر لەم چارچێوەیە دا بێت.

ڕێز گرتنی بنەمای یەکێتیی سەرۆکایەتی و فەرمانیش پیادە کردنی بنەمای زنجیرەیی سەرکردایەتی دەخوازێت، بە مانای ئەوەی، سەرۆکی کارگێڕی فەرمانەکانی بۆ کارمەندە ڕاستەوخۆکانی دەربکات کەسی تر نا، ئەم فەرمانانەش

---

[٣٣٦] عبد الغني بسيوني عبد الله: أصول علم الإدارة العامة، ص١٩٩.

ئاراستەی دوورتر لەمە نەکرێت، چونکە دەرچوون لەم زنجیرەیە لە لایەن سەرۆکی بڵندەوە دەبێتە هۆی کەم و کوڕی و ئاشووب کەوتنەوەی کار و، هەرەس هێنانی بنەمای یەکێتیی سەرۆکایەتی و فەرمان، جا ئەگەر ڕەوشەکە پێویستی بە پەیوەندی کردن بوو بە زۆرینەی ئاستە کارگێڕییەکان، ئەوا دەبێت لە ڕێگای ڕەچاو کردنی بنەمای پلەپلەیی قوچەکی پلیکانەی فرمانی و، ڕێزگرتنی بنەمای زنجیرەیی لە سەرکردایەتی بێت.

ڕوونیشە، کە بنەمای یەکێتیی سەرۆکایەتی و فەرمان، لە ڕێکخراوە کارگێڕییەکان دا، مانای ئەوەیە، کە سەرۆکی کارگێری تاکێك بێت نەك دەستە یا ئەنجوومەنێك[٣٣٧]

ڕێسای گشتی جێگیری ئێستا لە زانستی بەڕێوەبردنی گشتی دا، نەبوونی دەستڕۆیی ئەنجوومەن و لیژنەکانە لە هەڵستان بە کاری جێبەجێ کردنی چالاکییە کارگێڕییە جیاجیاکان، بە پێچەوانەی ئەمەش ئەنجوومەن و لیژنەکان بۆ کاری پەیوەندیدار بە دانانی گەلاڵە نامە کارگێری و ڕێسا گشتییە ڕێکخستنییەکان، یا لێکۆڵینەوەکان و تاوتوێ کردنی ئەو خەوشانەی لە دەستگەی کارگێری دا هەن دەگونجێن، هەرواش سەبارەت بە پیادە کردنی دەسەڵاتی تەمبێ کردن و واژۆ کردنی سزاکان، ئەمەش گونجاوترین دەستەیە سەبارەت بە فرمانە ڕاوێژکارییەکان[٣٣٨]

بنەمای یەکێتیی سەرۆکایەتی و فەرمان سەقامگیری لە سیستمی کار لە ناوەوەی ڕێکخراوەی کارگێری بەدەست دەهێنێت و، بەڕێوەچوون یا ڕێ کردنی چالاکیی کارگێری بە ئاسانی و خۆشی مسۆگەر دەکات و، هەروەها خێرایی و وردی لە جێبەجێ کردنی ڕێنمایی و فەرمان و بڕیارە دەرچوەکان لە سەرۆکە کارگێڕییەکان بەدەست دەهێنێت[٣٣٩]

---

[٣٣٧] عبد الغني بسيوني عبد الله: أصول علم الإدارة العامة، ص٢٠٠.

[٣٣٨] عبد الغني بسيوني عبد الله: أصول علم الإدارة العامة، ص٢٠٠، سليمان الطماوي: مبادئ علم الإدارة العامة، ص٢٤.

[٣٣٩] عبد الغني بسيوني عبد الله: أصول علم الإدارة العامة، ص٢٠١.

# توێژبەندی سێیەم

## پێویستیی هاوتایی چارچێوەی کردەنیی کارگێڕی و چارچێوەی ڕەسمیی کارگێڕی

مەبەست لە چارچێوەی بەڕێوەبردن، یا چارچێوەی سەرپەرشتی کردن یا توانین، هەروەك هەندێك وا ناوی دەبەن، ڕوون کردنەوەی ژمارەی ئەو کارمەندانەیە، کە ڕاستەوخۆ بۆ بەڕێوەبەرێك یا سەرۆکێك دەگەڕێنەوە، بەجۆرێك بتوانێت بە گورجی بە بەرپرسیاریی کارگێڕی لە هەمبەریان دا هەڵبستێت و، دابەش کردنی کاتەکانی بەسەریان دا، بێ ئەوەی لە هێڵی سووری کارایی دەربچێت.[٢٤٠]

لە دوانیش لە بارەی چارچێوەی کارگێڕی، مەبەستمان چارچێوەی پەیوەندیی نێوان بەڕێوەبەر و تەواوی ئاست و یەکەکانی خوارووی ڕێکخستن نییە، بەڵکو تەنها مەبەست پەیوەندیی نێوان بەڕێوەبەری ڕاستەوخۆیە بە یەکەکانی خواروو و کارمەندە ڕاستەوخۆکانی لە هێڵی دەسەڵات دا.

چاکیی ڕێکخستن وا دەخوازێت، کە چارچێوەی کارگێڕیی کردەنیی بەڕێوەبەر هاوتای چارچێوەی کارگێڕیی ڕەسمی بێت، بە مانایەکی تر پێویستە ژمارەی کارمەندە دەست بەکارەکان ئاوەزدارانە بێت، بۆ ئەوەی بەڕێوەبەر بتوانێت سەرپەرشتی بەسەریان دا بکات و بە ئاراستەیەکی کاراش ئاراستەیان بکات[٢٤١]

بۆیە لەبارەی دیاری کردنی چارچێوەی کارگێڕی، پێویستە ڕەچاوی دوو نیار بکرێت:

**نیاری یەکەم:** چارچێوەی کارگێڕیی ڕەسمی لە چارچێوەی کارگێڕیی کردەنی فراوانتر نەبێت، واتا دەبێت ژمارەی کارمەندە دەست

---

[٢٤٠] عبد الفتاح حسن: مبادئ علم الإدارة العامة، ص٦٧.

[٢٤١] إبراهيم عبد العزيز شيحا: الإدارة العامة، ص٢٥٢.

بەکارەکان لە ڕووی زیادەی ژمارە، زێدەڕۆییان تێ دا نەکرێت، چونکە سەرۆکێك بە تەنیا نەتوانێت ڕکێفی دەسەڵات و بڕیارەکان و کارگێرییەکەی بەسەر ژمارەیەکی دیاری نەکراویان دا بکات.

- **نیاری دوەم:** چارچێوەی کارگێڕیی کردەنی لە چارچێوەی کارگێڕیی ڕەسمی فراوانتر نەبێت، واتا نابێت ژمارەی کارمەندە دەستبەکارەکان لە ڕووی کەمیی ژمارەوە، زێدەڕۆیی تێ دا بکرێت، ئەگەر نا بەڕێوەبەر خۆی لە بێ ئیشی دا دەبینێتەوە.

چۆن دەتوانین ژمارەیەکی ئاوەزانە لەو کارمەندانە دیاری بکەین، کە یەك سەرۆك بتوانێت بە گورجی و کارایی بەڕێوەیان ببات، بە گوزارشتێکی تر: چۆن چارچێوەی کارگێڕییەکی شیاو یا چارچێوەی سەرپەرشتیاری یا توانینێکی ئاوەزانە دیاری بکەین.

لەم سۆنگەوە ڕایەکان جیاوازن، لە ئەنجامی ئەمەش دا سێ ئاراستە دەرکەوتوون:

**ئاراستەی یەکەم:** قوتابخانەی کلاسیکی.

**ئاراستەی دوەم:** قوتابخانەی کرداری کارگێڕی.

**ئاراستەی سێیەم:** قوتابخانەی گریکۆناس.

**ئاراستەی یەکەم: قوتابخانەی کلاسیکی:** پشتیوانانی ئەم قوتابخانەیە لە بارەی دیاری کردنی ژمارەیەکی ئاوەزانە و شیاو لەو کارمەندانەی، کە بەڕێوەبەر بتوانێت بە کارایی و گورجی لە دیمەنێك دا بەڕێوەیان ببات، ئەمەش لە ڕێگای تێبینی و شی کردنەوە و تێخوێندنەوەی ڕەوشی بەڕێوەبەرەکان لە ڕێکخستنە لێك نزیك و بە کردەنی دامەزراوەکان دا پشت ئەستورن.[٣٤٢]

پشتیوانانی ئەم قوتابخانەیە لە بارەی دیاری کردنی ژمارەی ئەم کارمەندانە کۆك نین، کە هەندێکیان بە ژمارەیەك لە دەوری نێوان چار تا هەشتیان لە ئاستە بڵندەکان دیاری کردوە و، لە نێوان هەشت تا پازدەشیان لە ئاستەکانی خوارەوە و،

---

[٣٤٢] إبراهيم عبد العزيز شيحا: الإدارة العامة، ص٢٥٣.

هەندێکی تریشیان بە سێ یا چار لە ئاستە بڵندەکان و لە نێوان سێ و چلیش لە ئاستەکانی خواروو دا دیاریان کردوە.

بەجۆرە پشتیوانانی ئەم قوتابخانەیە هەوڵیان دا ژمارەیەکی دیاری کراو و چەسپاو لە کارمەندان دابنێن، کە لێیەوە چارچێوەی کارگێڕی کارا بێت، ئەمەش زۆربەی قوتابخانەی کرداری کارگێڕی ڕەتی دەکاتەوە لەبەر بەرهەڵستیی لەگەل بنەما زانستییەکانی ڕێکخستن[٣٤٣]

**ئاراستەی دوەم: قوتابخانەی کرداری کارگێڕی:** پشتیوانانی ئەم قوتابخانەیە پێیان وایە، کە ژمارەیەکی چەسپاو و دیاری کراو بۆ ژمارەی ئەو کارمەندانە نییە، کە یەك بەڕێوەبەر بتوانێت بە سەرپەرشتییەکی کارا، سەرپەرشتییان بکات، چونکە دیاری کردنی ئەم ژمارەیە دەوەستێتە سەر چەندین فاکتەر و گۆڕێنەر و هێزی ڕاستەقینە لەهەر بارێك دا بە تەنها، ئەم فاکتەر و گۆڕێنەرانەش هەندێکی بۆ بەڕێوەبەر خۆی دەگەڕێتەوە و، هەندێکی تریشی بۆ مەودای چارچێوەی پەیوەندیکارییەکانی نێوان بەڕێوەبەر و کارمەندانی، دەگەڕێتەوە.

١ – **ئەو فاکتەرانەی بۆ بەڕێوەبەر دەگەڕێنەوە:** ئەو فاکتەرانە لە مەودای ئەو توانستە کەسەکییانە دەردەکەوێت، کە بەڕێوەبەر پێیانەوە بەندە، کە بریتییە لە چارچێوەی کات و، چارچێوەی وریایی و، چارچێوەی کەسێتی و، چارچێوەی وزە و، چارچێوەی زانینگەرایی، گومانیش لەوە دا نییە، کە ئەو فاکتەرانە لە دیاری کردنی ژمارەی ئەو کەسانەی، کە بەڕێوەبەر بتوانێت سەرپەرشتییان بکات و ئاراستەیان بکات و چاودێرییان بکات، یەکلاکەرەوەن.

پشتیوانانی ئەم قوتابخانەیە دووپات دەکەنەوە، کە هەرچەندە چارچێوەی ئەم وزانە لای بەڕێوەبەر فراوان بێت، کە ناودەبرێن بە زیرەکی و ڕێبەری لە هەڵسوکەوت دا، چارچێوەی کارگێڕی فراوانتر دەبێت[٣٤٤]

---

[٣٤٣] عبد الفتاح حسن: الإدارة العامة، ص٦٧- ٦٨.

[٣٤٤] إبراهيم عبد العزيز شيحا: الإدارة العامة، ص٢٥٤- ٢٥٥.

**٢ – ئەو فاکتەرانەی بۆ مەودای پەیوەندیکارییەکانی نێوان بەڕێوەبەر و کارمەندان دەگەڕێنەوە:** بە پێی چەمکی ئەم قوتابخانەیە، هەرچەندە کارمەندان بە توانستتر بن لە ڕاپەڕاندنی کار و ئەرکەکانیان بێ پێداویست بە گەڕانەوە بۆ بەڕێوەبەر بە شێوەیەکی بەردەوام و، هەرچەندە پێداویستیان کەم بێت بۆ پەیوەندی پێ کردنی، چارچێوەی کارگێری فراوان دەبێت، هەرواش هەرچەندە پێداویستی کارمەندان زیاد بکات لە پەیوەندی کردن بە بەڕێوەبەر لە سەرجەم کارە گرنگ و سادەکان، چارچێوەی کارگێری تەسک دەبێتەوە، چونکە گورجی و پەی بردنی بەڕێوەبەر بە بەرپرسیارییەکانی کارگێری هەرچەندە بێت، ئەوا ناتوانێت هەڵستێت بە بەڕێوەبردنی ژمارەیەکی دیاری نەکراوی کارمەندان.

پشتیوانانی ئەم قوتابخانەیە ئەو فاکتەرانەی، لە ڕووی زیادی و کەمی کاریگەری لە مەودای پەیوەندییەکانی نێوان بەڕێوەبەر و کارمەندەکانی دەکەن، هەروەها لە دیاری کردنی چارچێوەی کارگێری، لە ڕووی فراوانیی یا تەسکیی، لەمانەی خوارەوەیان دیاری کردوە[٢٤٥]:

١) ئاستی تەیار کردن و مەشق پێ کردنی کارمەندان.
٢) ڕوونیی پێ سپاردن
٣) ساغیی پلان دانان.
٤) ساغی و ئاسانیی پەیوەندیکاری.
٥) ڕوونیی سیاسەت و ڕێسا و ڕێوشوێنەکان.
٦) تێکڕای گۆڕان
٧) نزیکیی شوێنی یەکەکان.
٨) سانایی کار کردن.
٩) پێك چویی ئەو فرمانانەی بەڕێوەبەر سەرپەرشتییان دەکات.
١٠) سروشتیی تێکڕاییەکانی چاودێری.

---

[٢٤٥] إبراهيم عبد العزيز شيحا: الإدارة العامة، ص٢٥٦- ٢٥٧.

پشتیوانانی ئەم قوتابخانەیە بەوە پوختی دەکەنەوە، کـە پۆزشـت بـۆ دانـانی ژمارەیەکی دیاری کراو و چەسپاو لە کارمەندان، کە چارچێوەی کارگێری لە لایەوە کارا بێت، دەهێننەوە، چونکە ناتوانرێت ئەمە بە پێی ڕێسایەکی چەسپاو و گشتی پیـادە کـردن دیـاری بکرێـت، بـەڵکو ئـەم چارچـێوەیە بـە گـۆڕانی هۆکـار و گۆڕانکارییەکانی پێشوو لە ڕێکخراوەکەوە بۆ یەکی تـر بـە گـوێرەی جیـایی ئـەو هۆکار و ئەو گۆڕانکارییانە، دەگۆڕێت.

**ئاراسـتەی سـێیەم: قوتابخانـەی گریکۆنـاس:** توێـژەری فەرەنسـی "گریکۆناس" پێی وایە، کە هەرچەندە ژمارەی کارمەنـدان زیـاد بکـات، دەبێتـە هۆی ئاڵۆز بوونی کارگێری لە تێك ئـاڵۆزانی ئـەو پەیوەندییانـەی، کـە لـە خـۆی دەگرێت، هەروەها "گریکۆناس" پێی وایە، کەوا لـە بەرژەوەنـدیی کـار دایـە لـە ڕێکخستن، کە بەڕێوەبەر تا پێی بکرێت کـار بـۆ کـەم کردنـەوەی بەردەسـتەکانی بکات، بۆ ئەوەی بتوانێت بـە باشـی ئاراسـتەیان بکـات و، بـە ڕێگەیـەکی کـارا سەرپەرشتی بەسەریان دا بکات.

بۆ ڕوون کردنەوەی ئەمەش "گریکۆناس" جیاوازی لە نێوان سێ کۆمەڵـە لـەو کۆمەڵە پەیوەندییانە دا کردوە، کە لە نێوان بەڕێوەبەر و کارمەنـدان، یـا لـە نێـو خودی کارمەندان دروست دەبێت[٣٤٦]

١ – **پەیوەندییە تاکییە ڕاستەوخۆکان:** ئەو پەیوەندییانەن، کە لە نێوان بەڕێوەبەر و هەر یەکێك لە کارمەندە ڕاستەوخۆکانی دا بە تەنها دروست دەبێت.

٢ – **پەیوەندییە کۆمەڵەییە ڕاستەوخۆکان:** ئەو پەیوەندییانەن، کـە لـە نێوان بەڕێوەبەر و هەر گردبوونەوەیەکی پێکهاتوو لە کارمەندان یا لەگـەڵ یـەکێك لەمان دروست دەبێت، بەڵام بە ئامادەیی کارمەندێك یا کارمەندانی تر.

٣ – **پەوەندییە پچڕ پچڕەکان یا تێك ئاڵۆزەکان:** ئـەو پەیوەندییانـەن، کە کاتێك کارمەندان ڕاوێژ لەگەڵ یەکتر دەکەن، دروست دەبێت، جا ئایا بە تـەنها بن یا لە شێوەی کۆمەڵەیی.

---

[٣٤٦] فريد راغب النجار: النظم والعمليات الإدارية والتنظيمية، ١٩٧٠، ص١٨٩.

"گریکۆناس" ئامۆژگاریی بایەخ دانیش لە لایەن سەرۆك بەم جۆرەی دوایی لـە پەیوەندییە پچڕپچڕەکان دەکات، ئەگەر بەڕێوەبەر وەك لایەنێك دەستی وەرنـەداتێ، چونکە گرنگییەکەی کاتێك دەردەکەوێت، کە بەڕێوەبەر کارێك دەداتە دەسـت تـاك گەلێك، هاریکارییەکی هاوبەش لە نێویان دەچەسپێنێت لە جێبەجێ کردنی ئەوەی پێیان دراوە لە پسپۆڕییەکان و، شارەزای فەڕەنسی ئاماژە بەوە دەکـات، کـە ئـەو پەیوەندییانەی لە ڕێکخستن دروست دەبن بە گۆڕانی ئەو هەڵوێست و دۆخانەی، کە تێی دا دروست دەبێت، دەگۆڕێن[٣٤٧]

[٣٤٧] إبراهيم عبد العزيز شيحا: الإدارة العامة، ص٢٦١.

# توێژبەندی چارەم

## ناوەند نەبوونی دەسەڵات

ئەوەی پەیوەندیدارە بە ڕێکخستنی دەسەڵاتی کارگێڕی لە ناوەوەی وڵات، چەسپاوە، کە یا پشت بە سیستمی ناوەندی دەبەستێت، یا پشت بە سیستمی نا ناوەندی دەبەستێت

لە چاکییەکانی سیستمی ناوەندیش ئەوەیە، کە یەکێتییەت و پارچە پارچە نەبوونی دەسەڵاتی کارگێڕی دەپارێزێت، چونکە دەسەڵاتی یەکلاکەرەوە و بڕیار تەنها تایبەت دەبێت بە حکومەتی ناوەندیی وڵات لە پایتەخت، ئەم حکومەتەش بۆی هەیە ڕکێفی بەسەر هەموو لقەکانی دا هەبێت.

سیستمی ناوەندیش لەسەر سێ ڕەگەزی سەرەکی دادەمەزرێت:

**ڕەگەزی یەکەم:** ناوەندیی فرمانی کارگێڕی لە دەستی حکومەتی ناوەندی لە پایتەخت، بەجۆرێك هیچ پسپۆڕییەکی سەربەخۆ بە یەکە کارگێڕییە کەرتییەکان و ناوخۆییەکان نادات.

**ڕەگەزی دوەم:** پلیکانەیەکی کارگێڕی بۆ فرمانبەرانی وڵات بوونی هەیە

**ڕەگەزی سێیەم:** دەسەڵاتی پلەپلەیی(Le Pouvoir Hierarchique).

سیستمی نا ناوەندیش هەڵدەستێت بە دابەش کردنی پسپۆڕییەکانی نێو دەستگەی ناوەندیی وڵات و یەکە کارگێڕییە پاشکۆییەکان و ناوخۆییەکان، هەروەك دەسەڵاتی کۆتایی هێنان و بڕیار دانی ئەوەی پەیوەندیدارە بەم پسپۆڕییانەی، کە یاسا بۆی سەرپشك کردوە، بەم یەکەیانە دەدات.

سەبارەت بە پرسی چۆنییەتیی پیادە کردنی دەسەڵاتی کارگێڕی، بنەمایەکی ڕێکخستنیی گرنگ هەیە، ئەویش بنەمای ناوەند نەبوونە، کە مانای هەڵستانی سەرۆکی کارگێڕییە بە گواستنەوەی دەسەڵاتی بڕیار دانی کۆتایی، بەشێك لە

پسپۆڕییەکانی، بۆ ئەندام و کارمەندەکانی بۆ تەرخانگیر بوون بۆ هەڵستان بە کردەی سەرپەرشتی و ئاراستە کردن و پلان دانانی ڕێکخراوەی کارگێڕییەکەی[٣٤٨]

ناوەند نەبوونی دەسەڵاتیش دوو جۆر لقی لێ دەبێتەوە:

**جۆری یەکەم: ناوەند نەبوونی ناوەخۆیی:** کاتێك ڕوودەدات، کە دەسەڵاتی بڕیار دان لە هەندێك پسپۆڕییەکان لە وەزیرەوە بۆ یەکێك لە گەورە فرمانبەرانی وەزارەت لە بڕیارگەی وەزارەت لە پایتەخت، دەگوازرێتەوە.

**جۆری دوەم: ناوەند نەیوونی دەرەوەیی:** لە باری گواستنەوەی دەسەڵاتی بڕیار دان لە هەندێك کاروباری کارگێڕی بۆ گەورە فرمانبەرانی کارگێڕی لە هەرێم، ڕوودەدات.

بەمجۆرە بە گوێرەی پیادە کردنی ناوەند نەبوونی دەسەڵات، بەشێکی پسۆرییەکانی سەرۆکی بەرزترینی ڕێکخراوەی کارگێڕی، جا وەزارەت بێت یا پارێزگە یا دەستە، بۆ ئەندام یا بریکارانی دەگوازرێتەوە بۆ کۆتاییهێنان بە ناوەندێتییەکی توند و، بۆ ئەوەی سەرۆکی کارگێڕی بتوانێت بەسەر سەرپەرشتی و ئاراستە کردن لە کارگێڕی دا زاڵ بێت[٣٤٩]

دەسەڵاتەکان بە پشت بەستن بە نەبوونی ناوەندێتی لە ناوەوەی هەمان کەسە واتاییەکە دەگوازرێتەوە، نەك بۆ کەسێکی واتایی تر و، نوێنەرانی هەمان کەسی واتایی چالاکییە کارگێڕییەکانی بەڕێوە دەبەن.

بۆیەش، جیاوازییەکی گەورە لە نێوان ناوەند نەبوون و نا ناوەندیی کارگێڕی دا هەیە.

- لە سیستمی نا ناوەندی دا، دەسەڵاتەکان فرە دەبن و، هەر دەسەڵاتێك تایبەت دەبێتت بە بەشێك لە فرمانەکانی دەسەڵاتی کارگێڕی.

---

[٣٤٨] عبد الغني بسيوني عبد الله: أصول علم الإدارة العامة، ص٢١٣.

[٣٤٩] عبد الغني بسيوني عبد الله: أصول علم الإدارة العامة، ص٢١٣- ٢١٤.

- لە ناوەند نەبوونی کارگێڕی دا، فرەیی لە دەسەلاتەکان دا نییە، بەڵکو تەنها دابەش کردنێکی پسپۆڕییەکان لە نێوان ئەندامانی یەك دەسەلاتی کارگێری دا هەیە.

لەمەی پێشوو دا ڕوون دەبێتەوە، کە سیستمی نا ناوەندیی کارگێری گشتی تر وگشتگر ترە، بە پێچەوانەی ئەو ناوەند نەبوونە کارگێرییەی، کە جارجار وەك هەنگاوێك ڕووەو پیادە کردنی نا ناوەندێتیی کارگێری بەکاردەخرێت.

ناوەندێتیی توندی دەسەلات دەبێتە هۆی شپرزەیی لە دەستگەی کارگێڕی و، لە نێوان خۆی و کردە پێ سپێردراوەکانی ئالوگۆڕ دەبێت، چونکە دەبێتە هۆی لاواز بوونی هەست کردن بە بەرپرسیاری و لەدەست دانی ڕەنج و کات و دارایی لە ڕێوشوێنە کارگێرییە ئالۆزەکان دا.

بەڵام کاتێك پەنا بۆ ناوەند نەبوون دەبردرێت، ئەو بنەمایانە لەناودەچن، کە کات و ڕەنج و دارایی دەڕەخسێنن و، گیانی پەروەشی و دڵسۆزی لە لای کارمەندەکان دا دروست دەکەن و، دەسەلاتی وەرگرتنی بڕیار لەدەستی ئەو کارمەندانە دا دەبێت، کە زۆر نزیك و پەیوەندیدارن بە هەڵ و مەرج و ڕەوشەکان.

شێوازی نموونەیی بۆ پەیڕەوی کردن، شێوازی پێ سپاردنی دەسەلاتی کارگێرییە.[٣٥٠]

ئەم بابەتەش بەم شێوەی خوارەوە باس دەکەین:

خواستی یەکەم: کرۆکی پێ سپاردن و مەرج و چاکییەکانی.

خواستی دوەم: ناستەنگییە کردارییەکانی پێ سپاردن و چارە کردنیان.

خواستی سێیەم: پێ سپاردن لە فەرەنسا.

خواستی چارەم: پێ سپاردن لە لوبنان.

---

[٣٥٠] عبد الغني بسيوني عبد الله: أصول علم الإدارة العامة، ص٢١٤.

# خواستی یەکەم: کرۆکی پێ سپاردن و مەرج و چاکییەکانی

## یەکەم: کرۆکی پێ سپاردن

پێ سپاردنی دەسەڵات، مانای گواستنەوەی هەندێك لە پسپۆڕییەکانی سەرۆکی کارگێڕییە بۆ هەندێك لە کارمەندانی، بۆ هەڵستان بە پیادە کردنیان بێ گەڕانەوە بۆ لای، لەگەڵ مانەوەی بەرپرسیاریی لەم پسپۆڕییە پێ سپێردراوانە.

زۆرجاران سەرۆکی کارگێڕی هەڵدەستێت بە پێ سپاردنی گرنگی کەمترینەکان، وەك کارە کارگێڕییەکانی ڕۆژانە، بۆ ئەوەی خەریکی ئەو پسپۆڕییە گرنگانە بێت، کە لە ڕێکخراوەی کارگێڕی کاریگەرییەکی ڕاستەوخۆیان بەسەر بەڕێوەچوونی کار دا هەیە[٣٥١]

جا ئەگەر کرداری پێ سپاردن مانای پێدانی دەسەڵاتی پێویستی وەرگرتنی بڕیارە کارگێڕییەکان بێت، ئەوا چەندین پێوەر هەن، کە لەسەری کۆکن، بۆ پێوانە کردنی ڕادەی ناوەند نەبوونی کارگێڕی لە ڕێکخراوەی کارگێڕی، کە بریتییە لە مانەی خوارەوە:

١) زۆریی ژمارەی ئەو بڕیارانەی، کە لە ئاستێکی کەمتر لە ئاستی بەرزترین دەردەچن.

٢) زۆریی گرنگیی بڕیار و کارەکان لە ئاستی خواروو.

٣) زۆریی ژمارەی فرمان و کارەکان لە ئاستی خواروو.

٤) کەمیی کردارەکانی پێداچوونەوەی سەبارەت بە بڕیارە دەرچوەکان لە ئاستی خوارووتر.

وەهاش باوە، کە پێ سپاردن لەسەر بنەمای شیکاری تەواوی فرمانە کارگێڕییەکان لە ڕێکخستنی بەڕێوەچوونی کار و، دانانی دسەلاتەکان لە تەواوی

---

[٣٥١] عبد الغني بسيوني عبد الله: أصول علم الإدارة العامة، ص٢١٥.

دەستگەی کارگێری و، بەخشینی ئازادیی پێویست لە وەرگرتنی بڕیارە پێویستەکان بێ تەگەرە خستنەوە، دەبێت

هەروەها چەندین فاکتەر هەن، کە کار لە ڕادەی پێ سپاردنی دەسەلات دەکەن، لە گرنگترینیان: مەترسیی بڕیار و مەودای ئەو بەرپرسیارییە داراییەی، کە دەکەوێتە سەری و، ئارەزووی گرتنەبەری سیاسەتێکی یەکگرتوو بۆ سەرجەمی ڕێکخراوەی کارگێڕی و، مەودای ڕەخسانی سەرکردە کارگێرەکان و، ڕێگەکانی چاودێریی بەکارخهاو[٣٥٢]

بەلام سەرباری ئەمەش، هەندێك کاروبار هەن، کە ڕێ بە پێ سپاردنیان نەدراوە و، لەسەر سەرۆکی کارگێرییە، کە خۆی پێیان هەڵستێت بە سەرنج دانە گرنگییەکەی، وەك دۆزە دارایی و، دۆزە پەیوەندیدارەکان بە ڕێکخستنی ناوخۆیی ڕێکخراوە یا لە پەیوەندیی بە ڕێکخراوە کارگێرییەکانی تر، وەك پرسی هەموار کردن یا گۆڕانکاری لە سیاسەتی گشتیی ڕێکخراوەی کارگێری و، گۆڕانکارییە گەورەکان لە ڕێگەی کار کردن و شێواز و ڕێوشوێنەکانی و، دامەزراندنەکان لە پایە سەرەکییەکان[٣٥٣]

## دوەم: مەرجە گشتییەکانی پێ سپاردنی دەسەلات

چەندین مەرج هەن بۆ دروستی و سەرکەوتنی کرداری پێ سپاردن، ئەمانیش:

**مەرجی یەکەم: پێ سپاردن بەشەکی دەبێت:** واتا پێویستە پێ سپاردن هەموو پسپۆڕییەکانی پێ سپێر نەگرێتەوە، ئەمەش سەبارەت بە هەندێك لە دەسەلاتی سەرۆکی کارگێری دەبێت نەك سەرجەمی.

**مەرجی دوەم: پێ سپاردن لە دەسەلاتە نەك لە بەرپرسیاری:** پێ سپاردن تەنها لە دەسەلات دەبێت بێ بەرپرسیاری، واتا سەرۆکی کارگێری

[٣٥٢] عبد الغني بسيوني عبد الله: أصول علم الإدارة العامة، ص٢١٦- ٢١٧.

[٣٥٣] عبد الغني بسيوني عبد الله: أصول علم الإدارة العامة، ص٢١٧ و، سليمان الطماوي: مبادئ علم الإدارة العامة، ص١٠١.

هەڵدەستێت بە پێ سپاردنی بەشێك لە دەسەڵاتەکانی بە شێوەیەکی کاتی، لەگەڵ مانەوەی تەواوی بەرپرسیارییەکەی.

بەرپرسیاریی سەرۆکی کارگێری لەبەردەم ئەو سەرۆکایەتییە بڵندانەی، کە پاشکۆیانە، ناکرێت لەگەڵ پێ سپاردنی هەندێك لە پسپۆڕییەکانی بۆ ئەوانەی، کە لەم کەمترن لە پلیکانەی کارگێری، بگوازرێتەوە.

لە لایەنی کارمەندی پێ سپێردراویش، ئەوا تەنها لە بەردەم سەرۆکە ڕاستەوخۆکەی دا لێپرسینەوە لە کارەکانی دا دەکرێت، ئەم بەرپرسیارییەش بۆ هیچ سەرۆکێکی لەم بەرزتر، درێژ نابێتە.

بە پیادەی بنەمای شیانیی دەسەڵات لەگەڵ بەرپرسیاری، ئەوا پێ سپێردراو بەرپرس دەبێت لەبەردەم سەرۆکە ڕاستەوخۆکەی بە قەد ئەو دەسەڵاتەی، کە لە ڕێگەی پێ سپاردن بۆی گواستراوەتەوە، بۆ ئەوەی کارەکانی بە پەرۆشی و چالاکانە بەرەو پێش بڕوات، بێ ترس لە بەرپرسیارییەکی زل، لە سەرووی ئەو دەسەڵاتانە بێت، کە بە کردەنی پیادەیان دەکات.[٢٥٤]

**مەرجی سێیەم: پێ نەسپاردنی پسپۆڕییە پێ سپێردراوەکان:** واتە بۆ کارمەندی پێ سپێردراو ناشێت هەڵستێت بە پێ سپاردنەوەی ئەو دەسەڵاتانەی بۆی گواستراوەتەوە بۆ ئەوانەی لە خوارووتری ئەمن لە پلیکانەی فرمانی.

**مەرجی چارەم: پێ سپاردن نابێت مەگەر لە بەرزترەوە بۆ خوارووتر:** چونکە پێشبینی ئەوە ناکرێت پێ سپاردن لە کارمەندەوە بۆ سەرۆکەکەی بێت.

**مەرجی پێنجەم: ڕوونیی سنووری پێ سپاردن:** واتە پێویستە لە لایەنی یاساییەوە ساغ بێت و، بەو جۆرە بێت، کە یاسا ناساندویەتی و، لەسەر پێ سپێر و پێ سپێردراوە، کە ڕێز لەم ڕەوشە و سنوورانە بگرن.

---

[٢٥٤] عبد الغني بسيوني عبد الله: أصول علم الإدارة العامة، ص٢١٨.

**مەرجی شەشەم: مافی سەرۆکە لە هەموار کردنەوەی دەسەڵاتە پێ سپێردراوەکان یا لێ سەندنەوەی:** پێ سپاردن رێ لە سەرۆك ناگرێت لە چاودێری کردنی کارمەندەکەی و، ئاراستە کردنی و رێبەری کردنی بۆ ئەو چۆنییەتەی پێیانەوە پیادەی ئەو دەسەڵاتانە دەکات، جا ئەگەر سەرۆك ویستی لە چارچێوە و سنووری دەسەڵاتە پێ سپێردراوەکان دا هەموار کردنێك بکات بە پشت بەستن بەم چاودێرییە ئەوا بۆی هەیە، هەروەها بۆشی هەیە، کە دەسەڵاتە پێ سپێردراوەکان بکێشێتەوە، هەروەك بۆی هەیە پێ سپاردن هەڵبوەشێنێتەوە ئەگەر پێی باش بوو[355]

## سێیەم: چاکییەکانی پێ سپاردنی دەسەڵات

١) خێرایی لە دەرکردنی بڕیارەکان و کۆتایی هێنان بە سستی لە رێوشوێنەکان.

٢) تەرخانگیریی سەرۆکی کارگێڕی و کردە سەرکردایەتییەکان.

٣) دابەزینی تێچوونی دارایی بڕیارە کارگێڕییەکان.

٤) بەدەست هێنانی سەرکردایەتیی تازە بە توانست لە هەڵگرتنی بەرپرسیاری.

---

[355] عبد الغني بسيوني عبد الله: أصول علم الإدارة العامة، ص٢٢٠.

## خواستی دوەم: ئاستەنگییە کردارییەکانی پێ سپاردن و چارە کردنیان

### یەکەم: ئاستەنگییە کردارییەکانی پێ سپاردنی دەسەڵاتی کارگێڕی

ئاستەنگی گەلێك هەن ڕووبەڕوی پیادە کردنی پێ سپاردن وەك شێوازێك بۆ نەبوونی ناوەندێتیی دەسەڵات، دەبنەوە، کە بۆ ئەم فاکتەرانەی خوارەوە دەگەڕێنەوە:

١) ئاستەگی گەلێك بۆ فاکتەری سەرۆکەکان دەگەڕێنەوە: چونکە گیانی خستنە ژێر ڕکێف و بایەخ بە خۆدان لە لایەن هەندێك سەرۆك و ئارەزووی خۆیەستنەوە بە دەسەڵات و فراوان کردنی هەژموون، دبێتە هۆی شکست هێنانی کرداری پێ سپاردن، هەروەك نەمانی متمانە بە کارمەندانیش وایان لێ دەکات، لەبەردەم سەرۆك بە دیمەنێکی ڕاڕایی و تێ نەگەیشتن لە خواستەکانی کار، دەربکەون، هەروەها ترسی کارمەندان لە پیادە کردنی کاری کارگێڕی و نەبوونی پابەندیی تەواو بە سروشتی پێ سپاردن، هەموو ئەمانە هۆکاری دروست بوونی ئاستەنگی گەلێکن لە بەردەم کرداری پێ سپاردن.

٢) **ئاستەنگی گەلێك بۆ کارمەندان دەگەڕێنەوە:** بریتییە لە لاوازیی کارمەندان و نەبوونی متمانەیان بە خۆیان لە کاتی وەرگرتنی بەرپرسیاری و، ترسیان لە ڕوودانی هەڵە و هەندێك جار ڕەت کردنەوەی ئەو دەسەڵاتەی، کە بریکارێتیی دەسەڵات لە ڕێگەی پێ سپاردن دەیسەپێنێت.

٣) **ئاستەنگییە زانستی و سیاسییەکان:** وەك پەی نەبردن بە بنەما بنەڕەتییەکانی ڕێکخستن و بەڕێوەبردنی گشتی و، قایل نەبوون بە سوودەکانی ڕێکخستن و گوزارشتە سیاسییەکان و، مەودای کاریگەرییان لەسەر بەڕێوەچوونی کارگێڕیی گشتی.

## دووەم: چارە کردنی ئاستەنگییەکانی پێ سپاردن

١) **سەبارەت بە سەرۆکەکان:** کار کردن بۆ گۆڕینی باوەڕ و ڕەفتار و بۆچوونە هەڵەکانیان لە هەمبەر پێ سپاردن و، هۆشیار کردنەوە و ڕووناکبیر کردنیان و، ڕوون کردنەوەی چاکییەکانی پێ سپاردن و، کار کردن بۆ گۆڕینی بۆچوونی سەرۆکەکان بۆ کارمەندانیان و مەودای توانستیان لە هەڵستان بەو بەرپرسیارییانەی، کە پێیان دەسپێردرێ و، دەستەبەر کردنی چاودێرییەکی ئامانجدار و ڕێبەر لە لایەن سەرۆکەکان، کە بە ئاواتی بەرژەوەندیی گشتی و ئاشکرا کردنی ئەو خەوش و خراپییانەی کارگێری بێت، کە تەگەرە دەخەنە بەردەم بەڕێوەچوونێکی سەرکەوتوانەی کرداری پێ سپاردن و، دەستنیشان کردنی سەرۆکە خودان توانستەکان لە پیادە کردنی کارە سەرکردایەتییەکان و، ڕەخساندنی ئەدگارەکانی سەرکردەی کارگێڕ لە هەر سەرۆکێکیان و، لە گرنگترینی ئەم ئەدگارانەش توانست لە پێ سپاردنی بەشێك لە دەسەڵاتەکانیان بە کارمەندانیان[٣٥٦]

٢) **سەبارەت بە کارمەند:** کار کردن بۆ مەشق پێ کردنی فرمانبەران لەسەر چۆنیەتیی بەدەست هێنانی کارە کارگێڕییە پێ سپێردراوەکانیان بە ساناترین ڕێگە و خێراترینیان و، مەشق پێ کردنی کارمەندان لە هەڵگرتنی بەرپرسیاری لە ڕووبەڕوو بوونەوەی سەرۆکە ڕاستەوخۆکانیان.

٣) **چارە کردنی ئاستەنگەکان بە ڕوەکی گشتی:** ئەمەش بە زێدە کردنی هۆشیاری و پەی بردن بە گرنگیی بەدەست هێنانی ئامانجەکانی ڕێکخراوە دەبێت، کە دەبێتە هۆی بەدەست هێنانی بەرژەوەندییە گشتییەکان و، بە پیادە کردنی بنەماکانی ڕێکخستن و کارگێڕییەکی گشتیی ساخ لە ڕێکخراوە و کارگێڕییە جیاجیاکانی میری و، بە دەستەبەر کردنی هێڵەکانی پەیوەندیکاریی خێرا و ئاسان لە نێوان ڕێکخراوە و لقە تێك ئاڵۆزەکانی دەبێت، چونکە بەمەوە

---

[٣٥٦] عبد الغني بسيوني عبد الله: أصول علم الإدارة العامة، ص٢٢٩.

دەتوانێت ڕووبەڕوی ئەو ئاستەنگییانە ببێتەوە، کە لە کرداری پیادە کردنی پێ سپاردن، دروست دەبن[٣٥٧]

## خواستی سێیەم: پێ سپاردن لە فەڕەنسا

### یەکەم: بنچینەی پێ سپاردن

ڕێسای گشتی لە سیستمی فەڕەنسی گرتنە ئەستۆی سەرجەم دەسەلاتە پێ دراوەکانە لە لایەن خودی سەرۆکی کارگێری، چونکە فرمانبەری گشتی لە سیستمی یاسای فەڕەنسی پسپۆڕی گەلێك ڕادەپەڕێنێت بە پشت بەستن بە دەقە یاساییەکان و ناتوانێت بیان سپێرێت[٣٥٨]

هۆی ئەمەش ئەوەیە، کە فرمانبەری گشتی لە فەڕەنسا مافێکی نووساو بەفرمانەکری پیادەناکات، بەجۆرێ مافی هەبێت، کە هەڵبستێت بە پێ سپاردن لە بەشێك لە دەسەلاتەکانی لە خۆیەوە، بەڵکو دەبێت ئەمە پشت بەستوو بێت بە یاسا.

لە نموونەی پێ سپاردن لەسەر بنەمای مەرسومی ١٩٤٧/١/٢٣ هەموارکراو بە مەرسومی ١٩٦٨/٠٧/١٩، کە ڕێی داوە بە وەزیرەکان لە پێ سپاردن لە ڕێگەی بڕیارەکان لەمانەوە بۆ یاریدەدەرەکانیان.

لە ڕەسەنیش دا ئەوەیە، کە فرمانبەری گشتی بە سەرجەم کردەکانی فرمانەکەی هەڵبستێت و، ڕێی نادرێت بەشێك لە دەسەلاتەکانی بسپێرێ مەگەر دەقێکی یاسایی بوونی هەبێت ڕێ بەمە بدات.

---

[٣٥٧] عبد الغني بسيوني عبد الله: أصول علم الإدارة العامة، ص٢٣٠- ٢٣١.

[٣٥٨] جورج فيدل: القانون الإداري، المطابع الجامعية، باريس ١٩٧٦، ص١٩١.

## دوەم: مەرجەکانی پێ سپاردن

وێرای مەرجی گشتی پێ سپاردن، کە ئەویش هەڵستانە لەسەر بنەمای دەقی یاسایی، چەند مەرجێك هەن بەشێوەیەکی گشتی کۆنترۆڵی پێ سپاردن دەکەن، گرنگترینیان ئەوەیە، کە پێ سپاردن دەبێت بەشەکی بێت و ئاشکرا بێت[٣٥٩]

## سێیەم: جۆرەکانی پێ سپاردن

یاسازانیی گشتی فەڕەنسی جیاوازی لە نێوان دوو جۆر لە پێ سپاردن دا دەکات:

أ- پێ سپاردن لە پسپۆڕی.

ب- پێ سپاردن لە واژۆ.

جیاوازی نێوان ئەم دوو جۆرەش لە پێ سپاردن بریتییە لەمانەی خوارەوە:

١) پێ سپاردن لە پسپۆڕی سەرجەم دەسەڵاتە پەیوەندیدارەکان بەم پسپۆڕییە بۆ پێ سپێردراو دەگوازرێتەوە و، ڕێ لەو کەسەی، کە بە پێ سپاردن هەڵستاوە دەگیردرێت لە پیادە کردنی ئەو پسپۆڕییانەی، کە سپاردوونی، لە کاتێك دا پێ سپاردن لە واژۆ شتێك نییە تەنها گواستنەوەی کارێکی مادی نەبێت لە واژۆ کردن بۆ پێ سپێردراو بەبێ بێ بەش بوونی کەسی ڕەسەن لە پیادە کردنی دەسەڵاتەکانی[٣٦٠]

٢) ئەو بڕیارەی، کە بە پشت بەستن بە پێ سپاردنی پسپۆڕی دەردەکرێت لەسەر پێ سپێردراو دەچەسپێت و، هێزەکەی پشت ئەستوورە بە پێگەکەی لە پلیکانەی کارگێڕی، لە کاتێك دا بڕیاری دەرچوو لە چارچێوەی پێ سپاردنی واژۆ

---

[٣٥٩] جورج فيدل: القانون الإداري، المطابع الجامعية، باريس ١٩٧٦، ص١٩١

[٣٦٠] جورج فيدل: القانون الإداري، ص١٩١وما يليها.

بۆ پێ سپێر خۆی دەمێنێتەوە و، هێزی بڕیارەکانی تر لەو وەردەگیرێن کە دەرچوون[٣٦١]

٣) پێ سپاردن لە پسپۆڕی ڕووبەڕوی کەسەکە دەکرێت بە لێکدانەوەی ئەدگارییەکەی نەك بە لێکدانەوەی کەسێتییەکەی، لە کاتێکدا پێ سپاردن لە واژۆ و کەسێتییە و، لە ئەنجامی ئەمەش دا، پێ سپاردن لە پسپۆڕی بە گۆڕانی شوێنی پایەی پێ سپێردراو ناگۆڕێت، لە کاتێك دا پێ سپاردنی واژۆ لەناودەچێت ئەگەر گۆڕان لە کەسێتی پێ سپێر یا پێ سپێردراو ڕوو بدات[٣٦٢]

## خواستی چارەم: پێ سپاردن لە لوبنان

پێ سپاردن لە لوبنان ڕێسا و بنەمای گشتی ڕەچاوی دەکات، کە کۆنترۆلی پێ سپاردن دەکەن بە شێوەیەکی گشتی و، وێنای یاسا دانانی ژمارە ١١١ مێژوی ١٢/ ٠٦/ ١٩٥٩ شێوازی پێ سپاردنی دەسترۆییەکان لە وەزیرەوە بۆ بەڕێوەبەری گشتی لە خۆ دەگرێت، ئەم وێنا کراوە چۆنیەتی ڕاپەڕاندنی پێ سپاردنی لە دەسەلات سەبارەت بە ئاستەکانی خوارەوی وەزیر جێهێشتوە، بەلام دەبێت ڕاپەڕاندنی پێ سپاردن لەم ئاستانە دا پشت بە بڕیاری ئەو دەسەلاتە ببەستێت، کە بە کرداری پێ سپاردن هەلسێت.

بە پشت بستن بەوەی پێشکەش کرا، ئەوا وەزیر دەتوانێت بەشێك لە دەسەلاتەکانی بە سەرۆکە کارگێرییەکانی خوارەوی لە بەڕێوەبەری گشتی و، پێوەبەندانی و بە پێوەبەندییەکی ڕاستەوخۆ و، هەروەها لە توانای بەڕێوەبەری گشتی دایە، کە لایەنێك لە دەسترۆییەکانی بە بەڕێوەبەر و سەرۆکی فەرمانگە بسپێرێ و، هەروەها بەڕێوەبەر و سەرۆکی فەرمانگە، بۆیان هەیە هەندێك لە دەسترۆییە تایبەتەکان بە خۆیان بسپێرن بە سەرۆکی بەڕێوەبەرایەتی و بەشەکان.

---

[٣٦١] جورج فيدل: القانون الإداري، ص١٩١وما يليها.

[٣٦٢] جورج فيدل: القانون الإداري، ص١٩١وما يليها.

پێ سپاردن لـە لوبنـان ناکرێـت هـەموو دەسـتڕۆییە بنەڕەتییـەکانی سـەرۆکی کارگێری بگرێتەوە. لەسەر ئەمـەش ئـەو دەسـتڕۆییانەی دەسـتووری لوبنـانی بـۆ وەزیری سەرپشك کردوە ڕێی پێ نادرێت هەڵسێت بە پێ سپێردنیان بە بەڕێوەبـەری گشتی و، ئەم ڕێسایەش لە ئاسـتەکانی خـواروو پیـادە دەبێـت، کـە ڕێ نادرێـت بەڕێوەبەری گشتی ئەو دەستڕۆییانە بسپێرێ، کە وەزیر پێی سپاردوە بە بەڕێوەبـەر یا سەرۆك فەرمانگە و، ڕێنادرێت بە سـەرۆك فەرمانگـە، ئـەو دەسـتڕۆییانەی لـە ڕێگەی بەڕێوەبەری گشتییەوە پێی سپێردراوە بیان سپێرێت.

وێنای یاسادانانی پەیوەندیدار بە پێ سپاردن لە بارەی پرسی کۆتایی هاتنی پێ سپاردن بێ دەنگە، لەم بارەش دا دەبێت پیادەی ڕێسای گشتی بکرێـت ، واتـا ڕێ بەسەرۆکی کارگێری دەدرێت لە پێ سپاردنی ئەو دەستڕۆیانەی لێی سەرپشك کراوە بۆ کارمەندەکانی بۆ ئەم ڕێگە بگەڕێتەوە کە پێـی کـراوە، هـەروەك پـێ سـپاردن کۆتایی دێت بە کۆتایی هاتنی فرمـانی سـەرۆکی کـارگێڕی، یـا خسـتنەوەی بـە خانەنشینی یا مردنی و بەمەش کۆتایی دێت کە لە ڕەسـەن دا ماوەیـەکی دیـاری کراوی بۆ دانراوە[٣٦٣]

---

[٣٦٣] عبد الغني بسيوني عبد الله: أصول علم الإدارة العامة، ص٢٤٨.

## توێژبەندی پێنجەم

## نەبوونی دەستڕۆیی لیژنەکان لە

## ئەنجام دانی فرمانە جێبەجێ کردنییەکانی کارگێری

لە کاتی ئێستا دا پشت بەستن بە لیژنەکان بۆ هەڵستان بە زۆرێك لە فرمانەکانی کارگێری لە زیاد بوون دایە، ئەویش بە سەرکەوتنی ڕای ئەو کۆمەڵەیەی، کە لیژنەی لێ پێك دێت، بەسەر ڕای تاك و، بە ئاواتی ڕێ گرتن لە قۆستنەوەی دەسەڵات یا خراپە کردن پێی، ئەمەش بە هۆی ئەوەی، کە سیستمی لیژنەکان بەدەستی دەهێنێت لە توانای دەستنیشان کردنی بڕیاری ساغ لە ئەنجامی ئەوەی ئەم سیستمە بەدەستی دەهێنێت لە هەلی تاوتوێ کردنی ڕاستییەکان و دەرخستنیان[٣٦٤]

بەڵام بەشێك لە شارەزایانی بەڕێوەبردنی گشتی پێیان وایە، کە لیژنەکان ناگونجێن بۆ هەڵستان بە فرمانە جێبەجێ کردنییەکانی کارگێری، چونکە ئەم کارانە دەسەڵاتی دەرکردنی بڕیارەکانی، کە ئەرکە جێبەجێ بکرێن، لەخۆ دەگرێت، ئەمەش یەکلا کردنەوە و خێرایی لە جێبەجێ کردن دەخوازێت، لەبەر ئەم هۆیەش ئەو شارەزایانە ڕایان سپاردوە، کە "کارگێڕێکی تاك" بەم کارانە هەڵبستێت، بۆیەش لە زۆربەی وڵاتان دا وابوە، کە لەسەروی هەر یەکەیەکی کارگێری تاکێکی سەرۆك کاری هەڵستان بەم کارانە، دەگرێتە ئەستۆ[٣٦٥]

لە لایەکی تر هەندێك شارەزا پێیان وایە، کە سیستمی لیژنەکان بەردەوام بە شێوازێکی "گرنگ" دەمێنێتەوە لە شێوازەکانی ڕێکخستنی کارگێری، هەروەها

---

[٣٦٤] إبراهيم عبد العزيز شيحا: الإدارة العامة، ص٢٩١ و، حسن أحمد توفيق: الإدارة العامة، ١٩٧٢، ص٤٦.

[٣٦٥] بكر القباني: الإدارة العامة، الجزء الثاني، ص٢٣٤.

خەوشەکانی لێژنەکانیش خەوشی خۆیی نین، کە لە خودی سیستمەکە دەبن، بەڵکو خەوشـەکان پەیوەسـتن بـە پیـادە کردنـی زانسـتییانەی ئـەم سیسـتمە و خراپیـی بەکارخستنیان، بۆیە ئەم شارەزایانە وای دەبینن، کە سیستمی لێژنەکان دەتوانێـت ئەنجام و سوودی گرنگ، بەدەست بهێنێت[٣٦٦]

## توێژبەندی شەشەم

## ئەرکی پابەندی و یەکسانیی نێوان دەسەڵات و بەرپرسیاری

"فایۆڵ" دەسەڵاتی پێناسە کردوە بەوەی: "مافە لە دەرکردنی فەرمانـەکان و، توانسـتە لـە سـەپاندنی گوێڕایـەڵی" و، هـی تـریش پێناسـەیان کـردوە بـەوەی: "ئەدگارێکی جیاکەرەوەی فەرمانە لە کەسێکی تایبەت بە دەرکردنی، دەردەچـێت و، جیاکەرەوەی پابەند بوونیشی پێ دەدرێت"[٣٦٧]

شـارەزایانی بـەڕێوەبردنی گشـتیش بەرپرسـیارییان پێناسـە کـردوە بـەوەی: "لێپێچینەوەی تاکەکانە لە ڕاپەڕاندنی ئەرکەکان، یا هێزێکە بۆ چەمکە ئاکارییـە تایبەتەکان، کە لە کاتی بـوونی ئـارەزوی دژبـەر ڕکێفـی هەڵسـوکەوتەکانی تـاك دەکات، بۆیە ڕەگەزی بنەڕەتی لە بەرپرسیاری، پابەند بوونە بە ڕاپەڕاندنی کارێـك و لێپێچینەوە لەسەری"[٣٦٨]

هەروەها شارەزایانی بەڕێوەبردن جێگیرن لەسەر ئەوەی، کـە بـۆ بەڕێوەچـوونی باشی کار لە کارگێڕیی گشتی و تایبەت، پێویستە پابەندییەك لە نێوان دەسـەڵات و بەرپرسیاری دا هەبێت، بۆیە بەدەست هێنانی ئەم خواستـەش، لەگـەڵ بیرۆکـەی

---

[٣٦٦] حسن أحمد توفيق: الإدارة العامة، ص٤٧.
[٣٦٧] إبراهيم عبد العزيز شيحا: الإدارة العامة، ص٢٩٥.
[٣٦٨] إبراهيم عبد العزيز شيحا: الإدارة العامة، ص٢٩٥.

ئەو دادگەرییە پیادە دەبێت، کە دەبێتە هۆی بڕیار دانی بەرپرسیاریی مرۆڤ بێ پشت بەستنی دەسەلاّت، هەروەك دەسبێتە هۆی لێبووردن لە بەرپرسیاری لەگەڵ کەوتنەخۆ بۆ بەرپرسیاری[٣٦٩]

ئەگەر پێویست بوو، دەسەلاّت و بەرپرسیاری بەیەکەوە پابەند بن، ئەوا دەبێت، یەکسان و شیاویش بن، چونکە نابێت فرمانبەر لە بەدەست هێنانی کارەکان دا لێپرسینەوەی لەگەڵ دا بکرێت، کە ڕاسپێردراوە ئەگەر هێندەی ژێرانەی ئەو ئامراز و دەسەلاّتە پێویستانەی، کە پێویستن بۆ بەدەست هێنانی ئەوەی بۆی ڕاسپێردراوە، پێی نەدرێت[٣٧٠]

---

[٣٦٩] إبراهيم عبد العزيز شيحا: الإدارة العامة، ص٢٩٦.

[٣٧٠] سليمان الطماوي: مبادئ علم الإدارة العامة، ص١٣١.

# تویژبەندی هەفتەم

## پێویستیی بە وردی دیاری کردنی ئەرك و بەرپرسیارییەكان

مەبەست لەم بنەمایە ئەوەیە، كە هەر ئەندامێك لە ئەندامەكانی ڕێكخراوە دەبێت بە وردی فرمانەكەی و سنووری دەسەڵات و بەرپرسیارییەكانی بزانێت[٣٧١] و، نەزانینیش بەم خواستانە دەبێتە، هۆی پشێوی و شپرزەیی لە كار دا، هەروەك دەبێتە هۆی تێك ئاڵۆزانی نێوان فرمانبەران و، كەوتنەوەی جۆرێك لە ناكۆكیی ئەرینی و نەرینی لە پسپۆڕییەكان، هەروەك دەبێتە هۆی ئاڵۆز كردنی كارگێری و، یارمەتی دان لە هەڵاتن لە بەرپرسیاری.

جێی تێبینیشیە، كە دیاری كردنی پێویستییەكانی فرمان ئاسان دەبێتت هەرچەندە ڕوەو خواروو بچین، واتا بۆ بنكەی قوچەكی كارگێری، بەڵام كارێكی گران دەبێت هەرچەندە بۆ بەرزتر سەركەوین، واتە بۆ لوتكەی قوچەك، ئەویش لەبەر ئەو تێك ئاڵۆزاییەی، كە فرمانە بڵندەكان پێی دەناسرێن و، بوێریی گەورە فرمانبەران لە دەستدرێژی كردنە سەر دەسترۆییەكانی ژێرەوەیان لەو ئارەزوەی هەیانە لە زاڵ بوون و خۆ دەرخستن، ئەمەش بە پێچەوانەی فرمانبەرە تاساییەكان، كە لە بەرپرسیاری دەترسن[٣٧٢]

---

[٣٧١] بكر القباني: الإدارة العامة، الجزء الثاني، ص١٢٣.

[٣٧٢] إبراهيم عبد العزيز شيحا: الإدارة العامة، ص٢٩٨.

# توێژبەندی هەشتەم

## بنەمای پسپۆڕی

مەبەست لەم بنەمایە ئەوەیە، کە پشت بە کەسێك ببەسترێت لە هەڵستان بە تاکە کارێك یا کار گەلێکی لە سروشت دا بەیەك چوو، بەجۆرێك بتوانێت زیاتر لە هەر تاکێکی تر خۆی بۆ یەکلا بکاتەوە، بۆ ڕاپەڕاندنی ئەم کارانە بەشێوەیەکی بەردەوام لە پێناو بەدەست هێنانیشیان تەرخانگیری بکات.

بە پشت بەستن بەمە، بنەمای پسپۆڕی بەش بەش کردنی کار و دابەش کردنی لە نێوان کارکەران لە ڕێکخستن دا دەخوازێت، بە مەبەستی توانادار کردنی هەر یەکێکیان لە دەستبەکار بوونی ئەو کارەی پێی دەدرێت، کە پێی وایە بە توانست و زۆر شارەزا و پەی پێبەرترە لە کەسانی تر[٣٧٣]

هەرچەندە ڕادەی گەشەسەندن و ژیاری لە کۆمەڵگە دا زیاد بکات و، هەرچەندەش قەبارەی دەستگەی هەڵستەر بە بەڕێوەبردن فراوانتر ببێت، پێداویست بۆ پیادە کردنی بنەمای پسپۆڕی، زیاد دەکات، دەرکەوتنی ئەم بنەمایەش بۆ سەرهەڵدانی شۆڕشی پیشەسازی و پێشکەوتنی دۆزینەوە زانستی و تەکنۆلۆژییەکان، دەگەڕێتەوە[٣٧٤]

شارەزایانی بەڕێوەبردنی گشتی لەم سۆنگەیەوە ڕایانگەیاندوە، کە تەواوێتیی کارگێری زیاد دەکات هەرچەندە پسپۆڕی لە بواری کار کردن لە بەڕێوەبردنی گشتی زیاد بکات، ئەم ڕێسایەش لە ڕاستی دا بە شتێك دانانرێت، جگە لە پیادە کردنی ڕێسایەکی تر، کە پێویستیی هەڵسەنگاندنی کار لە ناوەوەی ڕێکخراوە کارگێرییەکان دەکاتە ئەرك، ئەمەش لەبەر ئەوەی کاری کارگێری بە کارێکی کۆمەڵەیی دادەنرێت، وەك پارێزی لە بەرژەوەندیی گشتی، کە پێویستە هەر

---

[٣٧٣] بكر القباني: الإدارة العامة، الجزء الثاني، ص١٢٠.

[٣٧٤] إبراهيم عبد العزيز شيحا: الإدارة العامة، ص٢٩٨.

فرمانبەرێك کردەیەکی ڕاپەڕاندنی یەك کاری پێ بدرێت بۆی تەرخانگیر بێت و بە باشی پێی هەڵستێت[٣٧٥]

شارەزایانی بەڕێوەبردنی گشتی ئەوەش زیاد دەکەن، کە کار کردن بە بنەمانی پسپۆڕی ئەم چاکییانەی خوارەوە بەدەست دەهێنێت:

١) کارایی بەرهەم هێنان لە ڕێکخراوە کارگێرییەکان زیاد دەکات.

٢) توانا بە بەکارخستنی گورجییە زۆر گونجاوەکان لە لایەنە جیاجیاکانی ڕێکخراوە، دەدات.

٣) شارەزایی بۆ هەر ڕێکخراوێك و کارکەرانی زیاد دەکات و هەلی زۆر لەبار ئامادە دەکات.

٤) کۆتایی بە بێ کاریی داپۆشراو لە دەستگەی کارگێری دەهێنێت.

٥) یارمەتیی بەکارهێنانی ئامرازە نوێیەکان لە کارە نووسراوەیی و ژمێرکارییەکان دەدات و، بەمەش پێداویست بۆ بەکارخستنی دەستی کارکەر کەم دەکاتەوە.

٦) توانا بە سەپاندنی چاودێری و دیاری کردنی بەرپرسیاری دەدات[٣٧٦]

---

[٣٧٥] سليمان الطماوي: مبادئ علم الإدارة العامة، ص١٣٤

[٣٧٦] بكر القباني: الإدارة العامة، الجزء الثاني، ص١٢١ و، سليمان الطماوي: مبادئ علم الإدارة العامة، ص١٣٤ و، إبراهيم عبد العزيز شيحا: الإدارة العامة، ص٢٩٩، ٣٠٠.

# بەشی سێیەم

# ڕێکخستن لە بەڕێوەبردنی ئیسلامی

## بەرایی

ڕێکخستنی کارگێڕی لە وڵاتی ئیسلامی لە دوای گەیشتنی پەیامبەر ﷺ بۆ مەدینە دەستی پێ کرد، هەروەك مزگەوتی قوبای دروست کرد و، مزگەوتێکیشی لە مەدینە دروست کرد، پاشان ئەو نووسراوەی مەدینەی، کە چەندین بنەمای ڕێکخستن لەخۆ دەگرێت، نووسی.

هەڵبەت پەیامبەری خوا ﷺ بنەمای ڕێکخستنی کۆمەڵایەتی و پەیوەندییە مرۆییەکانی لە ڕێکخستن و بەڕێوەبردنی وڵاتی ئیسلامی دا، داناوە، ئەمەشی لە باش کردنی پەیوەندییەکانی تاك و هێنانە کایەی پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکانی نێوانیانی کورت نەکردوەتەوە، بەڵکو زۆر لەمە دوورتر گەیشت، هەروەك هەماهەنگیی ڕەفتاریی لە نێوان هۆزەکانی گەلی لێکەوتەوە، لەمەش دا یەکێتیی کۆمەڵایەتی و، برایەتیی باوەڕیی لێ بەرهەم هات، ئەمەش دوای ئەوەی، پەیامبەری خوا ﷺ برایەتیی خستە نێوان پشتیوان و کۆچکەران[٣٧٧].

بەمجۆرە ڕێکخستنی کارگێڕیی ئیسلامی بەهاندانی گیانی واتایی و باوەڕی تاکەکان و هەماهەنگی لە نێوانیان دا دەستی پێ کرد، پاشان بە ئامانجێکی باوەڕیی پتەو پێکەوەی بەستن، کە هەمویان ئاراستەیان بۆ ئامانجێکە، کە ڕەزامەندیی خوای شکۆمەند و، جێبەجێ کردنی فەرمانەکانی و، گوێڕایەڵیی پەیامبەری خوا ﷺ کە ئەو برایەکەی خۆی پێش خۆی دەخست و، ئەویتر قوربانی بەخۆی دەدا و، سێیەمیان قوربانی بە داراییەکەی دەدا و، چارەمیشیان بە

---

[٣٧٧] فرناس عبد الباسط البنا: التنظيم، ١٤٠٥ه/١٩٨٥م، ص١٠٠.

کارەکەی تێدەکۆشا و، سەرجەم لە ناو بنیاتی ڕێکخستنێك ڕێکدەخران و بۆ بەدەست هێنانی ئامانجەکە، کۆششیان دەکرد[٣٧٨]

لێرە دا پێمان وایە، کە ڕێکخستنی کارگێڕیی ئیسلامی پشت بە پێڕۆیەکی باوەڕی دەبەستێت، ئەمەش هێزی گورجیی ئەم ڕێکخستنە و سەرکەوتنییەتی، بۆیە لە بەدواداچوونی کارە ڕێکخستنییەکان لە وڵاتی ئیسلامی دا، خۆمان لەبەردەم بنیاتێکی ڕێکخستنی تۆکمە دا دەبینینەوە، ئەم پێڕۆیە باوەڕییەش لە ڕێکخستنی ئیسلامی دا ئەو بنەچە باوەڕییەیە، کە ڕێکخستن لە هاندانی کارکەران بۆ بەدەست هێنانی ئامانجە باوەڕییەکە پشتی پێ دەبەستێت[٣٧٩]

لایەنە باوەڕییەکانیش لە ڕێکخستن ئەمانەن:

## یەکەم: هاندەری باوەڕیی کارکەران

هاندەری باوەڕی هەڵدەستێت بە برەودانی هەستی ئاینی، ئەم هەستەش خۆی لە خۆی دا دڵسۆزی لە کار کردن بەدەست دەهێنێت و، چاودێریی خودی لە ویژدانی مرۆڤ دەبزوێنێت، کە لە سەرەنجام دا دەبێتە هۆی ڕێکی لە کار کردن و، لە هەمان کات دا سرەوتنی دەروونی مرۆڤ بەدەست دەهێنێت.

## دوەم: ئامانجی باوەڕی

هەر ڕێکخستنێك بۆ بەدەست هێنانی ئامانجێکی ڕوون هەنگاو دەنێت و، هەڵوێستی ڕەسمیی کارکەرانیش لەم ئامانجە دا کۆشش کردنە بۆ بەدەست هێنانی، بەڵام هەڵوێستی ڕاستەقینە لێی پێچەوانەی ئەمە دەبێت، لێرەش دا ناکۆکی لە نێوان ئامانجی تایبەت بە تاك لەگەڵ ئامانجی ڕێکخستن دا ڕوودەدات، ڕەنگە تاك

---

[٣٧٨] فرناس عبد الباسط البنا: التنظيم، ١٤٠٥هـ/١٩٨٥م، ص١٠١- ١٠٢.

[٣٧٩] فرناس عبد الباسط البنا: التنظيم، ص١٠٢.

نەتوانێت ئامادە بێت بۆ وەرگرتنی ئامانجەکە و پێیّ قایل بوونی، بەمەش ئەو ئامانجەی، کە لە بەردەمییەتی تەنها لە ڕازی کردنی سەرۆکەکەی دەبێتەوە.

بەلاّم ئەگەر تاك ئامانجەکەی وەریش گرت پێی ڕازی نابێت، یا هەڵوێستی لەبارەوە دەگۆڕێت، چونکە سرۆشتی مرۆڤ لە ڕوانگەی دونیاییەوە دەڕوانێتە ئامانجە کەرەستەییەکان، ئەمەش بە پێچەوانەی بۆچوونی لە هەمبەر ئامانجە باوەڕییەکان، وێرای ئەوەی، ئامانجی باوەڕی وەرگرتنی سانایە، لە ڕازی بوون پێی ئاسانە و زیاتر لە ناخی مرۆڤەوە چەسپاو و جێگیرە.

لە لایەکی تریشەوە، ئامانجی باوەڕی ئامانجە تایبەتەکان وەردەگرێت و ململانێی لەگەڵ دا ناکات، جا بەدەست بێت یا نا، لێرە دا تایبەتمەندیی ئامانجی باوەڕیان بەسەر ئامانجی کەرەستەیی و ئاسانیی بەدەست هاتنیمان بۆ ڕوون دەبێتەوە[380]

لە سەروبەندی ئەم بەرایییە دا، دەبێت بەراوردێکی پێرۆزی باوەڕی بە قوتابخانەکانی ڕێکخستنی نویّ بکەین. گومان لەوە دا نییە، کە سەرجەم قوتابخانە ڕێکخستنیەکان بایەخ بە ڕەگەزی مرۆڤ دەدەن، ئەوەتا تیۆریای ماکس ویبەر بەدەست هاتنی تەواوێتیی ڕەگەزی مرۆڤ لە ڕێگەی ڕێکخستنەکەی لە ناوەوەی بنیاتێکی نووسینگەیی ڕوون دەکاتەوە، کە دەسەڵاتی ڕەسمی بەڕێوەی دەبات.

بەلاّم تیۆریای تایلەر بەدەست هێنانی تەواوێتیی بەرهەمداریی ڕەگەزی مرۆڤ لە ڕێگەی تێخوێندنەوەی کات و جووڵە و گەڕان بەدوای ڕێگەی نموونەیی لە کار کردن دا بەدەست هات، ئەم ڕەگەزەش بە پاڵنەری کەرەستەیی ڕوون دەکاتەوە.

لە کاتێك دا تیۆریای فایۆڵ بەدەست هێنانی تەواوێتیی ڕەگەزی مرۆڤ لە ڕێگەی گەشە پێدانی کارامەییە کارگێرییەکان ڕوون دەکاتەوە[381]

دەشبینین، کە قوتابخانەی ڕەفتاری بایەخەکانی بە ڕەگەزی مرۆڤ زێدە دەکات و، تەواوێتیی ڕەگەزی مرۆیی لە ڕێگەی بوونی پەیوەندییە کۆمەڵایەتییە زۆرە بیّ

---

[380] فرناس عبد الباسط البنا: التنظیم، ص١٠٣.

[381] فرناس عبد الباسط البنا: التنظیم، ص١٠٣

سنوورەکان و، ڕەچاو کردنی پەیوەندییە مرۆییەکان و هاندەرە ڕەفتارییەکان بۆ ئەم ڕەگەزە لەگەڵ بایەخ دان بە پاڵنەری مرۆیی، ڕوون دەکاتەوە.

بەڵام قوتابخانە نوێیەکان لە ڕێکخستن پێیان وایە، کە تەواوێتیی ڕەگەزی مرۆیی لە ڕێگەی بەشداری کردنی نێوانی و نێوان ڕێکخستن بەدەست دێت، ئەمەش بۆ گەیشتن بە ئەوەی ناو دەبرێت بە هاوسەنگیی ڕێکخستن.

تیۆریا ڕەفتارییە شیکارییەکانیش پێیان وایە، کە تەواوێتیی مرۆیی بە کەم کردنەوەی زێدەڕۆیی لە ئاراستەی مرۆیی و، لە بەدەست هێنانی هاوسەنگیی نێوان ئەم ئاراستە و ئاراستەی زانستی بەدەست دێت[٣٨٢]

جێی تێبینیشیە، کە قۆناغی یەکەم قۆناغی هزریی ڕێکخستنی زانستییە و، قۆناغی دوەم قۆناغی هزریی ڕێکخستنی کۆمەڵایەتی و ڕەفتارییە و، قۆناغی سێیەمیش قۆناغی گەڕانە بەدوای جێگرەوەیەك بۆ دوورکەوتنەوە لە نەرێنییەکانی ئەم دوو هزرەی پێشوو.

دکتۆر فەرناس عەبدول باست بەنا پێی وایە و ئێمەش لەگەڵ ئەم، کە هزری کۆمەڵایەتی و ڕەفتاری لە بۆ پڕ کردنەوەی ئەو بۆشاییەی جیهان لە دوورکەوتنەوەی لە ئایین وەك باوەڕێك، کە مرۆڤ پێیەوە بەندە، بە نقووم بوونی لە مادەوە هاتویە، بە سەرنج دانە نەبوونی ئەوەی جێی باوەڕ بگرێتەوە لە لای مرۆڤ، ئەوا قوتابخانەی کۆمەڵایەتی و ڕەفتاری شکستی هێناوە لە تێر کردنی ئەو لایەنانەی، کە باوەڕی ئایینی لە دەروونی مرۆڤ دا تێری دەکات، کە بیرمەندانی ناچار کرد هەڵستن بە گونجاندنی نێوانی هزری زانستی و کۆمەڵایەتی و ڕەفتاری، یا گەڕان بە دوای جێگرەوە.

لە ڕاستیش دا ئەمە مانای ئەوە نییە، کە ناکۆکی لە نێوان قوتابخانەی زانستی و کۆمەڵایەتی و، ڕەفتاری لە لایەك و، لەنێوان پیرۆزی باوەڕی لە لایەکی تر، بوونی هەیە، چونکە شتێك نییە ڕێگر بێت لە پشت بەستن بە بنەما زانستییە ساغەکان، هەروەك قوتابخانەی کۆمەڵایەتی و ڕەفتاری کۆکن لەگەڵ پیرۆزی باوەڕی لە تێر

---

[٣٨٢] فرناس عبد الباسط البنا: التنظيم، ص١٠٤.

کردنــی هەنــدێك لــە پێداویســتییە مرۆییــەکان، بــەڵام نــەیتوانیوە هــەموو ئــەو پێداویستییانە تێر بکات، کە لە تەواوێتیی ڕەگەزی مرۆیی زیاد دەکەن[٣٨٣]

دوای ئەم بەراییە، دەچینە سەر تێخوێندنەوەی ڕێکخستنی کارگێڕیی ئیسلامی لە چار توێژبەند دا:

توێژبەندی یەکەم: تایبەتمەندییەکانی ڕێکخستنی کارگێڕیی ئیسلامی.

توێژبەندی دوەم: بنەماکانی ڕێکخستنی کارگێڕیی ئیسلامی.

توێژبەندی سێیەم: بەرزەفتکارییەکانی ڕێکخستنی کارگێڕیی ئیسلامی.

توێژبەندی چارەم: نموونەی پیــادە کــراو: ڕێکخســتنی کــارگێڕی لــە ســەردەمی عومەری کوڕی خەتاب خوا لێی ڕازی بێت.

---

[٣٨٣] فرناس عبد الباسط البنا: التنظیم، ص١٠٤.

# توێژبەندی یەکەم

# تایبەتمەندییەکانی ڕێکخستنی کارگێڕیی ئیسلامی

## بەرایی

بەر لەوەی تایبەتمەندییەکانی ڕێکخستنی کارگێری بخەینە ڕوو، دەبێت هەوڵ بدەین پێناسەی ئەم ڕێکخستنەی کارگێڕیی ئیسلامی بکەین.

ڕێکخستنی کارگێری ئیسلامی بنیاتێکی ڕێکخستنیی پیادە کراوە، لە وڵاتی ئیسلامی و، لەسەر ئاراستەکانی قورئانی پیرۆز و سوننەت دامەزراوە، کە مەبەستی بەدەست هێنانی ئامانجێکی ڕەوایە لە سایەی ڕەوشێکی مرۆیی.

کەواتە ڕێکخستنی کارگێریی ئیسلامی بنیاتێکی ڕێکخستنییە لە ناوەوەی وڵاتی ئیسلامی، لەسەر بنەچە هاتوەکان لە قورئان و سوننەت دامەزراوە و، ئامانجی بەدەست هێنانی بەرژەوەندییەکی ڕەوایە و، ڕەچاوی پەیوەندییە مرۆییەکان دەکات[٣٨٤]

لە میانەی پێناسەکەوە جیاکەرەوەکانی ڕێکخستنی کارگێریی ئیسلامی پوخت دەکەین، کە ئەمانەن:

## تایبەتمەندیی یەکەم: ڕێکخستنی کارگێریی ئیسلامی بنیاتێکی ڕێکخستنییە

ڕێکخستنی کارگێریی ئیسلامی بنیاتێکی ڕێکخستنییە لە جۆرێکی تایبەت و، ئەم بنیاتە ڕێکخستنیەش چەندین فرمان لە ناوەوەی چەندین ئاست لە خۆ

---

[٣٨٤] فرناس عبد الباسط البنا: التنظيم، ص١٠٦.

دەگرێت وەك: فرمانی جێنشینی و، وەزارەت و، ویلایەت و، سەرۆك دیوانەکان و نووسەران، سەرباری شارەزا و ڕاوێژکاران.

سەبارەت بە هەماهەنگیش لە نێوان ئەم ئاست و فرمانانە، ئەوا لەڕێگەی هێڵەکانی دەسەڵات و بەرپرسیاری دەبێت، هەروەك کەناڵ گەلێکی پەیوەندیکاری لە ناوەوەی ئەم بنیاتە ڕێکخستنییە دا، بوونی هەیە[٣٨٥]

گرنگترینی ئەوەی ئەم بنیاتە ڕێکخستنییە جیا دەکاتەوە ئەوەیە، کە بە چەشنێکی دیاری کراو، یا بە پەیکەرێکی ڕێکخستن بەند نییە، بەڵکو بنیاتێکی ڕێکخستنیی نیانە بەجۆرێك دەتوانیت لەگەڵ گۆڕانی ڕەوشەکان، بگۆڕێت.

بەڵام ئەم نیانییە مانای دەرباز بوون لە بەرزەفتکارییەکان نییە، بەڵکو مەرجدارە بە تێ نەپەڕاندن یا بەرهەڵستی نەبوونی لەگەڵ بنەما و بنەچە گشتییەکانی ئیسلامی[٣٨٦]

بۆ ئەمەش نموونەیەك دێنینەوە: بنیاتی ڕێکخستنی وڵاتی ئیسلامی لە سەردەمی پەیامبەری خوا ﷺ بە دیوانی نەزانی بوو لە کاتێك دا بنیاتی ڕێکخستن لەسەردەمی عومەری کوڕی خەتاب خوا لێی ڕازی بێت، دیوانی دانا، کە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی گۆڕانێك لە بنیاتی ڕێکخستنی وڵاتی ئیسلامی دا، ڕوی داوە.

دکتۆر فەڕناس عەبدول باست بەنا پێی وایە، کە بایەخ دانی ئیسلام بە بنیاتی ڕێکخستن و ئاستەکانی، گەیشتۆتە ئاستێکی دوور، ئەمەش لەوەی نوێژ بەدەستی هێناوە، ڕوون دەبێتەوە، کە ئیسلام بە بنەچەی بڕوایی داناوە[٣٨٧]

هەروەك نوێژی بە کۆمەڵ شێوەیەکی ڕێکخستنی و دیاری کراوی هەیە، کە پێشەوا دەکەوێتە پێشەوە، پیاوانیش لە پشتییەوە دەوەستن ، پاشان مێرمنداڵان، پاشان ئافرەتان، سوننەتیشە، پێشەوا بکەوێتە ناوەڕاستی ڕیزەکە، بۆ ئەوەی پێگەی پێشەوا بەرزتر نەبێت لە پێگەی نوێژکەران، جا ئەگەر ڕەچاوی ئەم

---

[٣٨٥] فرناس عبد الباسط البنا: التنظيم، ص١٠٦.
[٣٨٦] فرناس عبد الباسط البنا: التنظيم، ص١٠٦.
[٣٨٧] فرناس عبد الباسط البنا: التنظيم، ص١٠٦- ١٠٧.

ڕێکخستنە لە نوێژ دا نەکرا، بەوەی نوێژکەران پـێش پێشـەوا بوەسـتن، لـە لایـەن جەماوەری شارەزایانەوە دروست نییە[٣٨٨]

ئەم بنیاتەی ڕێکخستن، دەسەڵاتی بلند، کـە خـۆی لـە پەیامبـەری خـوا ﷺ و جێنشینەکانی دا دەبینێتەوە، لەخۆ دەگرێت.

هەروەك پەیامبەری خوا ﷺ بایەخی بە کارگێڕیی ناوەڕاستیش داوە، کە بڕیاری دانـانی پێشـەوای دەدا و والیـی دادەمەزرانـد، ئـەم بایەخـەش لـە ڕاسـپاردەی پەیامبەری خوا ﷺ بـۆ گەشـتیاران دەردەکـەوێت، کـە یـەکێکیان پێشـەوا بێـت ئەگەرچی سێیانیش بوون.

هەروەها پەیامبەری خوا ﷺ بایەخی بە کـارگێڕیی جێبـەجێ کـردن داوە، کـە کارکەرانی لەسەر خێر و نووسراو و جگە لەمانەش، دادەمەزراند.

جێی تێبینییە، کـە پەیامبـەری خـوا ﷺ ڕاوێـژی بـە هـاوەڵانی دەکـرد، کـە هاوشێوەی دەستگەیەکی ڕاوێژکاری بوون لە بنیاتی ڕێکخستنی وڵات دا، هەروەها پەیامبەری خوا ﷺ زۆر ڕاوێژی بە هاوەڵانی دەکرد.

## تایبەتمەندیی دوەم: ڕێکخستنی کارگێڕیی ئیسلامی بەشێکە لە سیستمی ئیسلامی

ڕێکخسـتنی کـارگێڕیی ئیسـلامی بـە بەسـتنەوەیەکی پتـەو، بـە ڕێبـازی ئیسلامییەوە بەندە، کە بەشێکە لـە سیسـتمی ئیسـلامی و ناکرێـت لـە ڕێبـازی ئیسلامی یا ژینگەی ئیسلامی جیا بکرێتەوە.

سـەبارەت بـەو پێوەرانەشـی، کـە لـە سـەر بنەمایانـەوە دەتوانرێـت پـۆلێنی ڕێکخستنی کارگێڕی بکرێت، بەوەی ڕێکخستنی ئیسلامییە، ئەمانەی خوارەوەن:

---

[٣٨٨] ابن قدامة المقدسي: الكافي في فقه الإمام أحمد بن حنبل، جزء أول- باب موقف الصلاة، طبعة المكتب الإسلامي، ص٢٤٧- ٢٥١.

**پێوەری یەکەم:** پێوەری پەیوەستیی ڕێکخستنی کارگێرییە بە ڕێبازی ئیسلامی، لێرە دا پرسیارێك دێتە پێشەوە: ئایا ڕێکخستنی کارگێریی دانراوی بە ڕێکخستنێکی کارگێریی ئیسلامی گوزارشت دەکرێت، ئەگەر ڕێکخستنەکانی پێچەوانەی ئیسلام نەبن؟

لێرەوە هەندێك هەن لە ڕۆشنایی ئەم پێوەرەوە پێیان وایە، کە ڕێکخستنی کارگێریی ئیسلامی بەشێکە لە سیستمی کارگێریی ئیسلامی بەند بە سیستمەکانی تری ئیسلامی، لە سیاسی و ئابووری و دارایی، بۆیەش ڕێکخستنی کارگێریی دانراوی بە ڕێکخستنێکی کارگێریی ئیسلامی گوزارشت ناکرێت.

**پێوەری دووەم:** پێوەری پەیوەستیی بنیاتی ڕێکخستن بە ژینگەی ئیسلامی، کەواتە ڕێکخستنی پیادەکراو لە وڵاتانی نا ئیسلامی دا بە ڕێکخستنێکی ئیسلامی گوزارشت ناکرێت، چونکە زۆرێك لەو بنەما و بەها و بەرزەفتکارییانەی، کە کاریگەری لە ڕێکخستنی کارگێری دەکەن، بە ژینگەی ئیسلامییەوە بەندن[٣٨٩]

## تایبەتمەندیی سێیەم: ڕێکخستنی کارگێریی ئیسلامی پشت بە قورئان و سونەت دەبەستێت

بنیاتی ڕێکخستنی ئیسلامی پیادەی بنەما بنەڕەتییە هاتوەکانە لە پەرتووکی خوای شکۆمەند و، لە سونەتی پەیامبەری خوا ﷺ.

بۆ نموونە بنەمای گوێڕایەلی لە قورئانی پیرۆز وەرگیراوە: ﴿أَطِيعُواْ اللّهَ وَأَطِيعُواْ الرَّسُولَ وَأُوْلِي الأَمْرِ مِنكُمْ﴾[٣٩٠]. واتا: "گوێڕایەلیی خوا و گوێڕایەلی پەیامبەر و کاربەدەستەکانی لە خۆتانن بکەن"، هەروەها بنەمای ڕاوێژیش لە قورئانی پیرۆز وەرگیراوە: ﴿فَاعْفُ عَنْهُمْ وَاسْتَغْفِرْ لَهُمْ وَشَاوِرْهُمْ فِي الأَمْرِ﴾[٣٩١]. واتا: "بۆیە

---

[٣٨٩] فرناس عبد الباسط البنا: التنظيم، ص١٠٨.
[٣٩٠] سورة النساء: الآية ٥٩.
[٣٩١] سورة آل عمران: الآية ١٥٩.

لێبوردە ببە بۆیان و داوای لێخۆشبونیان بۆ بکەو لە کاروباریش دا راوێژیان پێ بکە".

هەروەك بنەمای بەرپرسیاریش لە فەرموودەی پەیامبەرەوە ﷺ وەرگیراوە: (کلکم راع، وکلکم مسؤول عن رعیته)[٣٩٢]. واتا: (هەر یەکێك لە ئێوە سەردەستەیە و، هەریەکێکیشتان بەرپرسە لە ژێردەستەکەی).

هەروەها بنەمای پەیوەستیی دەسەڵاتیش بە بەرپرسیاری و، لێپێچینەوەی بەرپرسان، لە فەرموودەی پەیامبەرەوە ﷺ وەرگیراوە: (ما من عبد یسترعه الله رعیة، یموت یوم یموت وهو غاش لرعیته، إلاّ حرم الله علیه الجنة)[٣٩٣]. واتا: "بەندەیەك نییە، کە خوا ژێردەستەی پێ سپاردوە، رۆژێك دەمرێت، ساختەی لە ژێردەستەکەی کردوە، خوا هەر بەهەشتی لێ یاساغ دەکات"

هەموو ئەم بنەما ئیسلامییانە بنەمای چەسپاون ناگۆڕێن و، ناتوانرێت سەرپێچییان بکرێت، بەڵام هونەرگەری لە شێوەی بنیاتی رێکخستن و دابەش کردنەکانی، ئەوا شتێکی نیانە و چەسپاو نییە، ئەویش تێکۆشانی پێویستە و، دەکرێت لە شوێنێکەوە بۆ شوێنێکی تر و، لە کاتێکەوە بۆ کاتێکی تر بگۆڕێت، ئەمەش بە پێی پێویستییەکانی بەرژەوەندیی گشتیی ئیسلامی[٣٩٤]

## تایبەتمەندیی چارەم: ڕێکخستنی کارگێڕیی ئیسلامی مەبەستی بەدەست هێنانی ئامانجێکی ڕەوایە

مرۆڤ جێنشینی خوایە لەسەر زەوی و، چاکسازی زەویش لە میانەی ئاوەدانکردنەوەیەوە دەبێت، ئاوەدان کردنەوەش رێکخستنی پێویستە.

---

[٣٩٢] متفق علیه.
[٣٩٣] متفق علیه.
[٣٩٤] فرناس عبد الباسط البنا: التنظیم، ص١٠٩.

ئامانجی ڕەوا بۆ هەر ئامانجێك درێژ دەبێتەوە، كە پاراستنی ئایین، یا گیان یا نەوە یا دارایی یا ژیریی تێ دا بێت، كەوا پێنج پێویستین، ڕێبازی ئیسلام فەرمانی بە پاراستنیان داوە.

بەڵام ئەدگاری ئامانجی ڕەوا فراوان دەبێت بۆ گرتنەوەی هەموو بەرژەوەندییەك، كە لەگەڵ مەبەستەكانی ئیسلام لە هێنانە دیی كەڵك و بەلانانی زیانبەخشی ڕێ بكات، تەنانەت ئەگەر فەرمانڕەواییەكی ڕەواش نەبوو بۆ بەدەست هێنانی، یا بەڵگەی ڕەوا لە ئەنجام دانی یا هەڵوەشاندنەوە، هەر ئەوەشە، كە زانایان زاراوەی ﴿مصلحة مرسلة﴾ یان بۆ داناوە.

ئامانجی ڕێكخستنی كارگێڕیی ئیسلامی لە ئامانجی ڕێكخستنی كارگێڕیی دانراوی لەوە دا جیا دەكرێتەوە، كە یەكەم بە تایبەتمەند دەناسرێت و دوورە لە تەنها بەدەست هێنانی قازانجی كەرەستەیی، بەڵكو ئەم قازانجە ئەگەر سەرچاوەكەی یاساخ كراو بێت بە شێوەیەكی یەكلاكەرەوە ڕەت دەكاتەوە ، لە كاتێك دا نموونەی ئەم شتانە لە پەسەند كراوەكانی ڕێكخستنی كارگێڕیی دانراوین.

## تایبەتمەندیی پێنجەم: ڕێكخستنی كارگێڕیی ئیسلامی ڕێكخستنێكی مرۆییە

مەبەستمان لەمەش ئەوەیە، كە ڕێكخستنی ئیسلامی ڕێكخستنێكی ئاكاری و ڕەفتارییە، ڕەچاوی پەیوەندییە مرۆییەكان دەكات، كە بریتین لە میهر و لێبووردەیی و نەرمی، خوای شكۆمەند دەفەرموێت: ﴿فَبِمَا رَحْمَةٍ مِّنَ اللّهِ لِنتَ لَهُمْ وَلَوْ كُنتَ فَظًّا غَلِيظَ الْقَلْبِ لاَنفَضُّواْ مِنْ حَوْلِكَ فَاعْفُ عَنْهُمْ وَاسْتَغْفِرْ لَهُمْ وَشَاوِرْهُمْ فِي الأَمْرِ﴾[٣٩٥]. واتا: "بە هۆی بەزەیی خوا لەگەڵیان نەرم بویت، ئەگەر تووڕە و دڵڕەق بایت، خەڵكی لە دەورەت پەرت دەبوون، بۆیە لێبوردە ببە بۆیان و داوای لێخۆشبوونیان بۆ بكە و لە كاروبارەكانیش دا ڕاوێژیان پێ بكە". هەروەها

---

[٣٩٥] سورة آل عمران: الآية ١٥٩.

دەفەرمویێت: ﴿إِنَّمَا الْمُؤْمِنُونَ إِخْوَةٌ فَأَصْلِحُوا بَيْنَ أَخَوَيْكُمْ﴾[٢٩٦]. واتا: "بێگومان بڕواداران بران، دەسا نێوانی برایەتییەکەتان چاك بکەن".

ئەم برایەتییە بڕواییە لە سەرووی ئەوەیە، کە پەیوەندییە مرۆییەکان بەدەستی دەهێنێت، چونکە وێڕای بەدەست هێنانی هێندەیەك لە پەیوەندیی باشی نێوان کارگێڕی و تاکەکان و تێر کردنی پێداویستییە بە ئامانجەکان، هۆکارێکە بۆ بوونی پەیوەندیی برایەتیی نێوان کارگێڕی و تاکەکان و، نێوان سەرۆك و کارمەند، واتا نێوان تاکەکانی بنیاتی ڕێکخستن بە تەواوی ئاستەکانییەوە.

بۆچوونی سەرۆك بۆ کارمەند بۆچوونێکی برایانەیە بۆ برایەکی، بەمجۆرەش شوێنێك بۆ بوونی ململانێکان یا ناکۆکی لە ناوەوەی بنیاتی ڕێکخستن نامێنێتەوە.

ئەم پەیوەندییانەش لە پێشکەش کردنی هاریکاری ناوەستێت، بەڵکو درێژ دەبێتەوە و دەگاتە ڕادەی پێشخستنی خەڵکی دی ئەگەرجی خۆیشی پێویستی پێی بێت، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَيُؤْثِرُونَ عَلَى أَنفُسِهِمْ وَلَوْ كَانَ بِهِمْ خَصَاصَةٌ﴾[٢٩٧] واتا: "خۆنەویستن بۆ خەڵکی دی ئەگەر چی پێویستیشیان پێ هەبێت".

---

[٢٩٦] سورة الحجرات: الآية ١٠.

[٢٩٧] سورة الحشر: الآية ٩.

# توێژبەندی دووەم

# بنەما گشتییەکان لە ڕێکخستنی کارگێڕیی ئیسلامی

## بەرایی

ئیسلام لە مەیدانی ڕێکخستنی کارگێڕی دا، بە بنەما گەلێکی گشتیی بنەڕەتی هاتوە، کە ناتوانرێت سەرپێچی بکرێن، ئەم بنەمایانەش ناوەرۆکی ڕێکخستنێکی کارگێڕیی چاك دەنوێنن، کە لە هەر کات و شوێنێك بۆ پیادە کردن گونجاون و، وەك ئەوەی لە پەرتووکی خوای شکۆمەند و لە سوننەتی پەیامبەری خوا ﷺ وەرگیراون.

سەبارەت بە پرسە بەشەکییەکان و وردەکارییەکانیش، ئەوا دەقێك لە بارەیانەوە نەهاتوە، نە لە پەرتووك و نە لە سوننەتیش، بەڵکو ئەو پرسانە بۆ گەلی ئیسلام جێهێڵدراون، هەروەك بۆیان هەیە بە گوێرەی ئەو پێوەرانە ڕێکیان بخەن، کە لەگەڵ گۆڕانکارییە کاتی و شوێنییەکان دا بشێت[٢٩٨].

دەکرێت ئەم بنەمایانە لە چاران دا کۆ بدەینەوە، ئەمانیش:

## یەکەم: بنەمای یەکسانی

خوای گەورە لە قورئانی پیرۆز دا دەفەرموێت: ﴿يَا أَيُّهَا النَّاسُ إِنَّا خَلَقْنَاكُم مِّن ذَكَرٍ وَأُنثَى وَجَعَلْنَاكُمْ شُعُوبًا وَقَبَائِلَ لِتَعَارَفُوا إِنَّ أَكْرَمَكُمْ عِندَ اللَّهِ أَتْقَاكُمْ﴾[٢٩٩] واتا: "خەڵکینە ئێمە لە نێر و مێ بەدیمان هێناون و کردوومانن بە گەڵ و خێڵ گەلێك، بۆ یەکتر ناسین، هەڵبەتە ڕێزدارترینتان لە خواترسترین(خۆپارێزترین)تانە".

---

[٢٩٨] فرناس عبد الباسط البنا: التنظيم، ص١١١.

[٢٩٩] سورة الحجرات: الآية ١٣.

لێرە دا دەبینین، کە ئیسلام بڕیاری بنەمای یەکسانیی داوە، ئەم بنەمایەش لەسەر بنەمایەکی تر دامەزراون، کە بنەمای برایەتییە، هەڵبەت ئیسلام ڕوونیشی کردوەتەوە، کە جیاوازیی نێوان مرۆڤەکان خۆپارێزییانە.

پەیامبەری خواش ﷺ نموونەی زۆری هەیە، کە دووپات و پاڵپشتیی بنەمای یەکسانی دەکەنەوە، لە نێویان باسی ڕەت کردنەوەی تکای ئوسامەی کوڕی زەید لە پەیامبەری خوا ﷺ دەکەین، بۆ ژنە مەخزومییەکە و، هەڵستانی بە جێبەجێ کردنی سزا لە سەری و، گوتەکەی گوت درورد و سەلامی خوای لەسەر بێت: (وإيم الله لو أن فاطمة بنت محمد سرقت لقطعت يدها). واتا: "سوێند بەخوا ئەگەر فاتیمەی کچی موحەمەد دزی بکات دەستی دەبڕم".

جێنشینەکانی ڕاشیدینیش لەسەر ئەم ڕێنماییەی پەیامبەری خوا ﷺ مکوڕ بوون لە پشت بەستن و پیادە کردنی بنەمای یەکسانی، بۆ ئەمە نموونەیەك لەوەی ئەبوبەکری سدیق خوا لێی ڕازی بێت دێنینەوە، کە لە گوتاری وەرگرتنی ویلایەتەکەی دا گوتویەتی: "بێ هێزتان لای من بەهێزە تا مافەکەی بۆ دەگەڕێنمەوە ئەگەر خوا ویستی و، بەهێزیشتان لام بێ هێزە تا مافەکەی لێ وەردەگرمەوە ئەگەر خوا ویستی"[٤٠٠]

پیادە کردنی بنەمای یەکسانی مرۆڤایەتی لە زۆرێك لە چەپەڵیی ڕەفتاری پاك دەکاتەوە، کە بەو ڕەفتارەوە نووساون، کە گوێ بە پیادە کردنی ئەم بنەمایە نادەن.

ئەوەشی پەیوەندیدارە بە کاریگەریی پیادە کردنی بنەمای یەکسانی لەسەر ڕێکخستنی کارگێری، ئەوا ڕوونە، کە یەکسانی دڵنیای ئاسان کردنی پەیوەندییەکانی لە نێو ئاستە جیاجیاکانی ناو بنیاتی ڕێکخستن دەکات، ئەمەش کرداری کۆ کردنەوەی تاکەکان و ئاراستە کردنیان بە کارایی ڕووەو دەستکەوتنی ئامانجە ویستراوەکان بەدەست دەهێنێت.

---

[٤٠٠] جلال الدين السيوطي: تاريخ الخلفاء، دار النهضة، القاهرة، ص١١٤.

## دوەم: بنەمای دادگەری

خوای گەورە لە پەرتووکە پیرۆزەکەی دەفەرموێت: ﴿وَإِذَا حَكَمْتُم بَيْنَ النَّاسِ أَن تَحْكُمُواْ بِالْعَدْلِ﴾[٤٠١]. واتا: "ئەگەر(کاتێك)یش فەرمانڕەواییتان لە نێو خەڵکی دا کرد، ئەوا بە دادگەری بیکەن"، هەروەك پەیامبەری خواش ﷺ نموونەی زۆری هێناوەتەوە لە ئەرك بوونی پیادە کردنی دادگەری، هەروەك لە پەیامبەری خواوە ﷺ دەگێڕنەوە، کە فەرمویەتی: (إن المقسطين عند الله على منابر من نور، الذين يعدلون في حكمهم و، أهليهم وما ولوا)[٤٠٢]. واتا "ڕاستگەران(یەکسانگەران) لەلای خوا لەسەر مینبەرانێکی ڕووناکن، ئەوانەی، کە لە فەرمانڕەوایيەکەیان و، ماڵ و کەسیان و ئەوەی لە ئەستۆیانە، دادگەری دەکەن).

قوتابخانەی زانستیش بەم دواییە پەی بە بەهای دادگەری بردوە، کە فایۆڵ بنەمای دادگەریی لە چەند بنەماکەی ئەم قوتابخانەیە دا، داناوە.

هەروەها، قوتابخانەی ڕەفتاریش بایەخی بە بنەمای دادگەری داوە و، بە تایبەت لە بواری ڕەچاو کردنی هەستی کارکەران[٤٠٣]

بەڵام قوتابخانەی ئیسلامی لە ڕێکخستنی کارگێری دا ئەم بنەمایەی لە ئاستی تیۆریاوە پەسەند کردوە، وێڕای پیادە کردنیشی لە لایەنی کردەنی.

قوتابخانەی ئیسلامی لە ڕێکخستنی کارگێڕیش دا لە سنووری پەسەند کردنی بناماکە و پیادە کردنی دا نەوەستاوە، بەڵکو ئەم قوتابخانەیە گەیشتوەتە سنوورێکی دوورتر لەمە، هەروەك سەرپێچیی بنەمای دادگەری بە ستەمێك داناوە، کە دەبێت لە کەوتنەوەی دا خۆ لادرێت، هەروەك خوای گەورەش بەڵێنی بە ستەمکەران داوە بە خراپترین سزا، کە دەفەرموێت: ﴿وَسَيَعْلَمُ الَّذِينَ ظَلَمُوا أَيَّ

---

[٤٠١] سورة النساء: الآية ٥٨.

[٤٠٢] رواه مسلم.

[٤٠٣] فرناس عبد الباسط البنا: التنظيم، ص١١٥.

مُنقَلَبٍ يَنقَلِبُونَ﴾[٤٠٤]. واتا: "جا ستەمکەرەکان دەزانن تووشی چ سزایەك دەبن و سەرەوژێر دەبن".

## سێیەم: بنەمای ڕاوێژ

خوای گەورە لە پەرتووکە پیرۆزەکەی دا دەفەرموێت: ﴿وَشَاوِرْهُمْ فِي الأَمْرِ﴾[٤٠٥] واتا: "لە کاروبارەکانیش دا ڕاوێژیان پێ بکە"، ئەوەتا پەیامبەری خوا ﷺ لە زۆرێك لە هەڵوێستەکان دا ڕاوێژی بە هاوەڵانی دەکرد، نموونەیەکیش لەم بارەوە دەهێنینەوە، کە ڕاوێژ کردنی بوو درووود و سەلامی خوای لەسەر بێت بە هاوەڵانی ڕۆژی بەدر و ڕۆژی ئوحود و ڕۆژی خەندەق[٤٠٦].

ئێمە پێمان وایە، کە بنەمای ڕاوێژ لە پێشەوەی سەرجەم بنەما دەستووری و کارگێڕییەکانی وڵاتی ئیسلامی دایە.

جا ئەگەر بەڕێوەبردنی نوێ بەهای دەستگەی ڕاوێژ لە ڕێکخستنی کارگێڕیی هاوچەرخ دا ناشناش بوو بێت، ئەوا ڕێکخستنی کارگێڕیی ئیسلامی لەوەتەی سەرەتای سەردەمی وڵاتی ئیسلامییەوە، کە پەیامبەری خوا ﷺ گەیاندویەتی ئاشنا بوە و پیادەی کردوە[٤٠٧].

بەڵام جیاوازییەك لە نێو ڕایەکان دا هەیە دەربارەی پرسی مەودای پابەندیی ڕای ڕاوێژکاران، هەروەك چەند زانایەك هەن پێیان وایە، کە ڕاوێژ فەرمانڕەوا پابەند ناکات[٤٠٨] (واتا ناچاری ناکات)، لە کاتێك دا بەشێك لە زانایان پێیان وایە، کە ڕاوێژ ناچاکەری فەرمانڕەوایە[٤٠٩].

---

[٤٠٤] سورة الشعراء: الآية ٢٢٧.

[٤٠٥] سورة آل عمران: الآية ١٥٩.

[٤٠٦] محمد سليم العوا: في النظام السياسي للدولة الإسلامية، ص١٨٣.

[٤٠٧] فرناس عبد الباسط البنا: التنظيم، ص١١٣.

[٤٠٨] محمد متولي الشعراوي: الشورى والتشريع في الإسلام، دار ثابت، القاهرة، ص١٧.

[٤٠٩] محمد سليم العوا: في النظام السياسي للدولة الإسلامية، ص١٨٨ وما يليها.

دەشبینین ئیبن تەیمیە ڕای دووەمی وەرگرتوە، کە پێی وایە ئەرکە فەرمانڕەوا پابەندی ڕاوێژی ڕاوێژکاران بێت ئەگەر پشت بەستوو بێت بە دەقی پەرتووکی خوای شکۆمەند، یا سونەتی پەیامبەرەکەی ﷺ.

دکتۆر فەرناس عەبدول باست بەنا پێی وایە، کە ڕای ڕاوێژکاران ناچارکەری فەرمانڕەوا و دەستگە کارگێرییەکەین، بەمەش ڕێکخستنی کارگێریی ئیسلامی بەسەر ڕێکخستنی کارگێریی دانراوی دا سەر دەکەوێت، کە تەنها دەسەڵاتی پێشکەش کردنی ڕاسپاردە و ئامۆژگاری بە دەسەڵاتی ڕاوێژکاری دەدات و، ڕەنگە چارەنووسی فەرامۆش کردن بێت و، بەوجۆرەش کەمترین بەهای دەبێت.

هەروەها دکتۆر بەنا پێی وایە، کە ڕۆلی ئەنجوومەنە ڕاوێژکارییەکان لە بنیاتی ڕێکخستنی ئیسلامی دا، تەنها لە پێشکەش کردنی ڕاوێژی پابەند، کورت نابێتەوە، بەڵکو لە هەمان کات دا ئەم ئەنجوومەنانە بە دەستگەی چاودێریی گەلیش گوزارشت دەکات، کە کارایی دەستگەی چاودێری لە بنیاتی ڕێکخستن بەهێز دەکات، بۆ ئەوەی کارەکان لە باشترین شێوە ئەنجام بدرێن، بەمەش قوتابخانەی بەڕێوەبردنی نوێ بنەمای بەشدار کردنی ڕای لە قوتابخانەی ئیسلامی لە ڕێکخستنی کارگێڕی دا وەرگرتوە[٤١٠].

## چارەم: بنەمای فەرمان بە چاکە و بەرگرتن لە خراپە

بنەمای فەرمان بە چاکە کردن و بەرگرتن لە خراپە بە گرنگترین بنەماکانی ئیسلامی گوزارشت دەکرێن و، لە زۆرترینیان کاراترە لە بواری سیستم و بەڕێوەبردن و، ئەم بنەمایە بەوە گوزارشت دەکرێت، کە لە بنەما بنەڕەتییەکانە، ئەو فەرمان کردنەی، کە خوای شکۆمەند پەیامبەرەکەی ﷺ ی بۆ ناردوە فەرمان کردنە بە چاکە و، ئەو بەرگرتنەشی، کە خوای شکۆمەند پەیامبەرەکەی ﷺ ی بۆ ناردوە بەرگرتنە لە خراپە، کە لەسەر تەواوی نەتەوەی ئیسلام ئەرکە[٤١١].

---

[٤١٠] فرناس عبد الباسط البنا: التنظيم، ص١١٤.

[٤١١] ابن تيمية: الحسبة ومسؤولية الحكومات الإسلامية، ص٧٧.

چاکە ئەوانە دەگرێتەوە، کە خوا لە ئاراستە ڕەفتارییەکان فەرمانی پێ کـردوون و، هەندێك لە زانایان ئاخافتەی "نەتەوە" بەوە دادەنێن، کە لە ئایـەتی: ﴿وَلْتَكُن مِّنكُمْ أُمَّةٌ يَدْعُونَ إِلَى الْخَيْرِ وَيَأْمُرُونَ بِالْمَعْرُوفِ وَيَنْهَوْنَ عَنِ الْمُنكَرِ وَأُوْلَـئِكَ هُمُ الْمُفْلِحُونَ﴾[٤١٢]. واتا: "با لە ئێوە کۆمەڵێك پێك بێـت بانگەشـەی باشـە بکـەن و فەرمان بە چاکە بکەن و بەر لـە خراپـە بگـرن و هـەر ئەمانەیشـن سـەرفرازان"، ئەوەشی لەسەر ولات پیادە دەبێت، ئەوا بۆ بانگەواز کردن بۆ باشە ڕاسپێردراوە و، فەرمان کردن بە چاکە و بەرگرتن لە خراپە[٤١٣]

سەبارەت بە ئایەتی پیرۆزی: ﴿كُنتُمْ خَيْرَ أُمَّةٍ أُخْرِجَتْ لِلنَّاسِ تَـأْمُرُونَ بِـالْمَعْرُوفِ وَتَنْهَوْنَ عَنِ الْمُنكَرِ وَتُؤْمِنُونَ بِاللّهِ﴾[٤١٤] واتا: "ئێوە باشترین کۆمەڵەن بۆ خـەڵکی کەتوونەتەخۆ فەرمان بە چاکە دەکـەن و بـەر لـە خراپـە دەگـرن و بـڕوا بـە خـوا دەهێنن"، ئەوا وتارەکە ئاراستەی نەتەوەی ئیسـلام کـراوە ڕایـان دەسـپێرێت بـە هەڵستان بە کاری ئەرینی، کە فـەرمان بـە چـاکە و بـەرگرتن لـە خراپەیـە، ئـەم بنەمایەش ڕۆڵێکی گەورە لە چاودێریی ئەرینی دەگێڕێت، کە پارێزگـاری لـە لادان بەدەست دەهێنێت و، ڕێ لە تەشەنە کردنی دەگرێت[٤١٥].

لەوەی پێشکەشمان کرد، مەودای گرنگیی ئەم بنەمایە بەرهەم دێنین، بـەجۆرێك دەتوانرێت سـەرجەم بنەما ئیسلامییەکانی بۆ بگێڕینەوە.

کۆمـەڵگەی ئیسلامی کۆمەڵگەیەکی بڕواییە لە هەر بوونێـك و دەسـتگەیەکی دا، بنیاتی کارگێڕیش بەشێکە لەم، جا ئەگـەر تاکـەکانی بـەم بنەمایـەوە پابەنـد بوون، کارەکانیان چاك دەبێت و ئامانجـەکانیان و، ئامانجـەکانی نەتـەوەی ئیسـلام بەدەست دێن، ئەمـەش بە باش ڕاپەڕاندنی کار ناو دەبرێت[٤١٦].

---

[٤١٢] سورة آل عمران: الآية ١٠٤.

[٤١٣] فرناس عبد الباسط البنا: التنظيم، ص١١١- ١١٢.

[٤١٤] سورة آل عمران: الآية ١١٠.

[٤١٥] فرناس عبد الباسط البنا: التنظيم، ص١١٢.

[٤١٦] فرناس عبد الباسط البنا: التنظيم، ص١١٣.

# توێژبەندی سێیەم

## بەرزەفتکارییەکانی ڕێکخستنی کارگێڕیی ئیسلامی

### بەرایی

هەڵبەت موسوڵمانان چەندین بەرزەفتکارییان بۆ ڕێکخستنی کارگێڕیی ئیسلامی ڕوون کردوەتەوە، کە بەدەست هێنانی ئامانج بە گورجییەکی تەواو دەستەبەر دەکەن، ئەم بەرزەفتکارییانەش ناگەنە ڕادەی ئەو بنەمایانەی، کە ناکرێت سەرپێچی بکرێن، بەڵکو بەشەکینە، نە لە پەرتووکی خوای شکۆمەند و، نە سونەتی پەیامبەرەکەی ﷺ دەقیان لەسەر نییە، مەبەستیش لێی بەدەست هێنانی باش ڕاپەڕاندنی کارە و، بەگوێرەی ڕەوشە هەنووکەییەکان دەتوانرێت پابەندیی پێوە بکرێت بە سەرجەمی یا هەندێکی و، بە ڕەچاو کردنی کات و شوێن، ئەمەش مانای نەبوونی گرنگیی ئەو بەرزەفتکارییانە نییە، بەڵکو هەندێکیی لە پلەی بنەما نزیك دەکەونەوە، بەجۆرێك ناکرێت فەرامۆش بکرێن، هەروەك ناشکرێك فەرامۆشی ئەم بەرزەفتکارییانە بە گشتی بکرێت.

لە خوارەوەش خستنەڕوی ئەم بەرزەفتکارییانە وەك نموونە دەگرینە ئەستۆ، نەك بۆ کورت کردنەوەی، چونکە دۆخی کار پێویستیی بە زیاتر لە بەرزەفتکاریی تر هەیە و، پێداویست بۆ بەرزەفتکاری نوێش لە دووبارە ڕێکخستنەوە دەردەکەوێت[٤١٧]

### یەکەم: بەرزەفتکاریی پسپۆڕی و دابەش کردنی کار

هەڵبەت پەیامبەری خوا ﷺ بایەخی بە دابەش کردنی کار داوە و، جێبەجێ کردنی ئەم بەرزەفتکارییەشی درورد و سەلامی خوای لەسەر بێت لە کاتی کۆچ

---

[٤١٧] فرناس عبد الباسط البنا: التنظيم، ص١١٨

کردنی لە مەکەوە بۆ مەدینە و، دوای گەیشتنی بە مەدینەی ڕووناکراو(منورە) دەرکەوت، هەروەك ئەم بنەمایە لە میانەی نووسراوی مەدینە ڕوون کراوەتەوە، کە بەڵێنەکانی پەیامبەری خوا ﷺ گوزارشتن لە دابەش کردنی کار لە نێو مووسوڵمانان و هاوپەیمانانیان[٤١٨].

هەروەها دوای پەیامبەریش ﷺ مووسوڵمانان بایەخیان بە دابەش کردنی کار داوە و، نموونەیەك لەسەر ئەمە دەهێنینەوە، کۆبوونەوەی پشتیوانان لە سەقیفەی بەنی سەعد، دوای کۆچی دوایی پەیامبەر ﷺ بە مەبەستی باس کردنی کاروباری جێنشینی و، ئەبوبەکر و عومەر و ئەبو عوبەیدەی کوڕی جەڕاح گەیشتنە لایان، جا سەعدی کوڕی عەبادەی ئەنساری گوتی: "ئێمە وەزیر و ئێوەش فەرماندە"[٤١٩]

لە میانەی ئەم نموونەیەوە دابەش کردنی کار لە نێوان کۆچکەر و پشتیوانان دا بە ڕوونی دەبینین، کە کۆچکەران ڕاسپێردران بە فەرماندەیی و پشتیوانانیش ڕاسپێردران بە وەزیری و هاریکاری، هەروەها بنەمای پسپۆڕی و دابەش کردنی کار بەندە بە بنەمایەکی تر ئەویش دانانی پیاوی شیاوە لە شوێنی شیاو، چونکە دابەش کردنی کار لە نێو نا پسپۆڕان بەهای نییە[٤٢٠].

سەرکردەی کارگێر عومەری کوڕی خەتاب خوا لێی ڕازی بێت بە یەکەمی ئەوانە گوزارشت دەکرێت، کە بەم بنەمایانە ئاشنا بوونە و پیادەیان کردوە، ئەمەش چەند سەدەیەك بەر لە هەڵستانی قوتابخانەی بەڕێوەبردنی زانستیی نوێ بە بانگەشە بۆ کردنی.

لەمەی پێشکەشمان کرد ڕوون دەبێتەوە، کە بنیاتی کارگێڕیی ئیسلامی لەسەر بنەمانی پسپۆڕی و دابەش کردنی کار دامەزراوە.

---

[٤١٨] فرناس عبد الباسط البنا: التنظيم، ص١١٨.
[٤١٩] جلال الدين السيوطي: تاريخ الخلفاء، ص١١٦.
[٤٢٠] فرناس عبد الباسط البنا: التنظيم، ص١١٩.

## دووەم: بەرزەفتكاریی هاوتایی دەسەڵات و بەرپرسیاری

خوای گەورە لە پەرتووكە پیرۆزەكەیەوە دەفەرموێت: ﴿إِنَّ اللّهَ يَأْمُرُكُمْ أَن تُؤدُّواْ الأَمَانَاتِ إِلَى أَهْلِهَا وَإِذَا حَكَمْتُم بَيْنَ النَّاسِ أَن تَحْكُمُواْ بِالْعَدْلِ﴾[٤٢١]. واتا: "هەڵبەتە خوا(ی گەورە) فەرمانتان پێ دەكات، كە سپاردەكان(ئەگەر پێتان درا) بۆ خاوەنەكانیان بگێڕنەوە و ئەگەر(كاتێك)یش فەرمانڕەواییتان لە نێو خەڵكی دا كرد، ئەوا بە دادگەری بیكەن).

لێرە دا دەبینین، كە ئیسلام دەسەڵات بە سپاردە گوزارشت دەكات، كە خوای گەورە بە هەندێك لە خەڵكیی دەدات، لە كاتێك دا سیستمی دانراوی بە تێڕوانینێكی تر دەڕوانێتە دەسەڵات، كە لە مانای زمانەوانیی دەسەڵاتەوە وەرگیراوە.

سپاردە بەرپرسیاریی ڕاپەڕاندن دەخوازێت، ئەگەر چی بەهای سپاردەكە كەمیش بوو، ئەوەتا پەیامبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: (كلكم راع، وكلكم مسؤول عن رعيته، فالإمام الذي على الناس راع، وهو مسؤول عن رعيته، والمرأة راعية في بيت زوجها، وهي مسؤولة عن رعيتها، والولد راع في مال أبيه، وهو مسؤول عن رعيته، والعبد راعٍ في مال سيده و، هو مسؤول عن رعيته، ألا كلكم راعٍ وكلكم مسؤول عن رعيته). واتا: "هەمووتان سەردەستەن(شوانن) و هەمووشتان بەرپرسن لە ژێردەستەكەتان(ڕانەكەتان)، جا ئەو فەرماندەیەی لەسەر خەڵكە سەردەستەیە و، بەرپرسیشە لە ژێردەستەكەی و، ژن سەردەستەی ماڵی پیاوەكەیەتی و، بەرپرسیشە لە ژێردەستەكەی و، كوڕ سەردەستەی ماڵی بابیتی و، بەرپرسیشە لە ژێردەستەكەی و، بەندە سەردەستەی ماڵی گەورەكەیەتی و، بەرپرسیشە لە ژێردەستەكەی، كەواتە هەمووتان سەردەستەن(شوانن) و هەمووشتان بەرپرسن لە ژێردەستەكەتان(ڕانەكەتان)).

---

[٤٢١] سورة النساء: الآية ٥٨.

لە دیدی ئیسلامییەوە بۆ دەسەڵات دیدێکی هاو شێوەی ئەو کەسەی دیگرێتە دەست، دەردەکەوێت، هەروەك پێی ناگوترێت خاوەن دەسەڵات، بەڵکو پێی دەگوترێت: کاربەدەست.

بەرپرسیاریش لە ئیسلام دا بەرپرسیارییەکی تاکییە، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَلَا تَزِرُ وَازِرَةٌ وِزْرَ أُخْرَى﴾[٤٢٢] واتا: "کەس تاوانی کەسێکی تر هەڵ ناگرێت"، بەڵام تاکیی بەرپرسیاری مانای وەلانانی کاری کۆمەڵەیی نییە، بەڵکو ئەم تاکییە ئاواتی بەدەست هێنانی دادگەری و، ئاراستە کردنی کاری کۆمەڵەییە بە ئاراستەیەکی ساغ بۆ بەدەست هێنانی ئامانجەکان، چونکە کارە تاکییە ساغەکان دەبنە کاری کۆمەڵەیی، کە بە باشی و هێز دانەسرێن و دەبنە هۆی بەدەست هێنانی ئامانجی خواستراو بە گورجییەکی بەرز و سەرکەوتنێکی تەواو[٤٢٣].

هەروەها شیانی بەرپرسیاری لەگەڵ دەسەڵات شیانێکی ڕاستەوخۆیە، بۆیە فەرمانڕەوا لە زۆرترین خەڵك بەرپرسیارترە تەنانەت لەبەردەم خوا دا لە شت گەلێك، کە زۆر کەمن لێپرسینەوەی لەگەڵ دا دەکرێت، هەروەك سەرکردەی کارگێڕ عومەری کوڕی خەتابیش خوالێی ڕازی بێت پەی بە شیانیی نێوان دەسەڵات و بەرپرسیاری بردوە، کە لە ڕۆژێکی هاوین دا بە دوای وشترێکی هەڵاتوو لە وشترەکانی زەکات، دا کەوت بوو، بۆ ئەوەی بیگێڕێتەوە، کاتێکیش پێشەوا ئەلیی کوڕی ئەبی تالیب خوا لێی ڕازی بێت پێی گوت "جێنشینەکانی دوای خۆت شەکەت کرد" عومەر خوا لێی ڕازی بێت وەڵامی دایەوە: "لۆمەم مەکە باوکی حەسەن، سوێند بەو خوایەی، کە موحەممەدی بە پەیامبەری ناردوە، ئەگەر بەرخێك بڕواتە کەناری فوڕات، لە ڕۆژی دوایی دا عومەر لەسەری سزا دەدرێت"[٤٢٤]

---

[٤٢٢] سورة فاطر: الآية ١٨.

[٤٢٣] فرناس عبد الباسط البنا: التنظيم، ص١٢٠.

[٤٢٤] ابن الجوزي: أخبار عمر، طبعة السلام، ص١٨٥.

لەمەی پێشکەشمان کرد دەردەکەوێت، کە خەملاندنی عومەری کوڕی خەتاب خوا لێی ڕازی بێت بۆ بەرپرسیاری، سەرباری ئەوەی سپاردەکە بەهای کەمیش بێت، نموونەیەکی پیادە کراوی پێ داوین لە دەست گرتنی ئەم سەرکردە کارگێڕە مەزنە بە بناماکە، بێ تێڕوانینێکی کەم یا زۆری ئەو شتەی، کە لێی بەرپرسیارە. ئەم ڕووداوەش بە بنامەیەك بۆ بەرپرسیارییەتیی سەرکردە لە کردەوەکانی ژێردەستەکەی گوزارشت دەکرێت[٤٢٥]

بەمجۆرە، بە ڕوونی ڕاستیی تێڕوانینی ئیسلام بۆ دەسەڵات و بۆ سپاردە دەبینین.

## سێیەم: بەرزەفتکاریی چاودێری

بنیاتی کارگێڕیی ئیسلامی چاودێرییەکی خودان مۆرکێکی تایبەت لەخۆ دەگرێت، کە لە کارایی و بەدەست هێنانی مەبەستی لە پێناو هاتنە ئارای، لە سەرووی سیستمە دانراوییەکانە. چاودێریی ئیسلامی یەکەم شت چاودێرییەکی بڵندە، واتا چاودێریی بەدیهێنەری شکۆمەندە لەسەر بەدیهاتوەکانی، کە چاودێریی بنەڕەتییە لە بنیاتی ڕێکخستنی وڵاتی ئیسلامی و، هەرچەندەش بڕوا لە دەروونی خەڵکی دا زیاد بکات، گرنگیی هەست کردن بەم چاودێرییە زیاد دەکات.

چاودێریی ئیسلامی چاودێرییەکی خودییە لە ناوەوەی مرۆڤی موسوڵمان هەڵ قوڵاوە، گومانیش لەوە دا نییە، کە هەر بنیاتێکی ڕێکخستنی لەسەر چاودێریی خۆدی دابمەزرێت ئەوا بنیاتێکی چاك و سەرکەوتوە و، ئەو ئامانجەشی، کە هەوڵی بەدەست هێنانی دەدات، ئامانجێکە بە ڕادەیەکی بەرز گورجیی توانای بەدەست هێنانی هەیە.

چاودێریی ئیسلامی لە سێیەم دا چاودێرییەکی گەلیی (هاوڵاتیان)ە، واتا چاودێریی گەلی ئیسلامییە لەسەر کارگێڕی و، بنەڕەتی ئەم چاودێرییەش فەرمانی خوای شکۆمەندە، کە لە قورئانی پیرۆز وەرگیراوە: ﴿وَلْتَكُن مِّنكُمْ أُمَّةٌ يَدْعُونَ إِلَى

---

[٤٢٥] فرناس عبد الباسط البنا: التنظيم، ص١٢١.

الْخَيْرِ وَيَأْمُرُونَ بِالْمَعْرُوفِ وَيَنْهَوْنَ عَنِ الْمُنكَرِ وَأُوْلَـئِكَ هُمُ الْمُفْلِحُونَ﴾[٤٢٦] واتا: "با لە ئێوە دا کۆمەڵێك پێك بێت بانگەشەی باشە بکەن و فەرمان بە چاکە بکەن و بەر لە خراپە بگرن و هەر ئەمانەیشن سەرفرازان"، ئەم بەشداری کردنە گەلییەش لە چاودێری و لە دەستگەی کارگێری دا بانگمان دەکات بۆ دڵنیا بوون لەوەی، کە ڕێکخستنی بنیاتی کارگێریی ئیسلامی، ڕێکخستنێکی گەلی لەخۆ دەگرێت، باشترین نموونەش لەسەر کار کردن بە بنەمای چاودێریی گەل ، گوتەکەی ئەبو بەکرە خوا لێی ڕازی بێت کاتێك جێنشینیی گرتە دەست: "خەڵکینە والییاتیم لەسەرتان گرتە دەست و لە باشترینتان نیم، جا ئەگەر باش بووم هاریکاریم بکەن، ئەگەر خراپیش بووم ڕاستم بکەنەوە"[٤٢٧]

## چارەم: بەرزەفتکاریی پێ سپاردن

هەڵبەت پەیامبەری خوا ﷺ خالدی کوڕی وەلیدی ڕاسپارد بە ڕزگار کردنی مەکە، ئەم ڕاسپاردنەش بە پێ سپاردنی دەسەڵات گوزارشت دەکرا و، پیادەکاریی پێ سپاردن لە بنیاتی ڕێکخستنی ئیسلامی دا زۆرن، لە نێویان دا بە نموونە نەك بۆ کورت کردنەوە دەهێنینەوە، پێ سپاردنی پەیامبەر ﷺ بۆ موسوڵمانان لە پێدانی پەنا و ئارامی بە شەڕکەران، هەروەك بوخاری لە ئوم هانیئی کچی ئەبی تالیب گێڕاوییەتییەوە، گوتویەتی: "گوتم ئەی پەیامبەری خوا: کوڕی ئوم هانی دەیەوێت پیاوێك بکوژێت من پەنام داوە، کە فلانە، ئیبن هورەیرە، جا پەیامبەری خوا فەرموی پەنای ئەو کەسەمان داوە، کە ئوم هانی پەنای داوە".

---

[٤٢٦] سورة آل عمران: الآية ١٠٤.

[٤٢٧] ابن هشام: السيرة النبوية، جزء رابع، ص١٠٧٥.

## پێنجەم: بەرزەفتکاریی نیانی

ڕێکخستنی کارگێڕیی ئیسلامی ڕێکخستنێکی نیان و پەرەسەندوە، هەروەك ئەم ڕێکخستنە بنیاتێکە فەرمانڕەوا و ئەنجوومەنی ڕاوێژ لە دەوری دادەنرێن، بۆ ئەوەی خەڵك خۆیان و، هەندێك جاریش ڕاسپاردەی فەرمانڕەوا بە کارە پێویستەکان هەڵسەن، پاشان ئەم بنیاتە پەرەی سەند و وەزیرەکان جێی ڕاوێژکارانیان گرتەوە و، کارەکانیش پەرەیان سەند لە دیوان گەلێك دا کۆ کرانەوە.

نموونەیەك لەسەر نیانی و پەرەسەندویی ڕێکخستنی کارگێڕیی ئیسلامی دەهێنینەوە، کە لە سەرکردە عومەری کوڕی خەتابەوە خوا لێی ڕازی بێت ڕوی داوە، کاتێك گوتی: "من بازرگانێك بووم و، خوا بە بازرگانییەکە کەس و کاری بێ نیاز کردم، ئێوەش بەم کاروبارەتان سەرقاڵتان کردم، جا پێتان وایە لەم ماڵە چیی بۆ من حەلاڵە؟ پێیان گوت: ئەوەی بۆ خۆت و کەس و کارت دەگونجێت، جگە لەمەت بۆ نییە"[٤٢٨]

لە لایەکی ترەوە مزگەفت ڕۆڵێکی گەورەی هەبوو لە بنیاتی ڕێکخستنی وڵاتی ئیسلامی و، ئەم ڕۆڵە مەزنە پەرەی سەند هەتا وای لێهات ئەو بڕیارانەی گرنگ بوون و پەیوەندیدار بوون بە بەرژەوەندیی گەلی ئیسلامی، لە ناوەوەی مزگەفت بڕیاری لەسەر دەدرا، دکتۆر فەڕناس عەبدول باست بەنا پێی وایە و ئێمەش لەگەڵی، کە نەمانی ڕۆڵی مزگەفت لە کاتی ئێستا دا، لە گرنگترینی هۆکارەکانی ئەو دوا کەوتنەیە، کە گەلی ئیسلامیی پێچاندوەتەوە[٤٢٩].

---

[٤٢٨] ابن الجوزي: أخبار عمر، ص١٢٤.

[٤٢٩] فرناس عبد الباسط البنا: التنظيم، ص١٢٨.

# توێژبەندی چارەم

# نموونەی پڕاکتیکی

## ڕێکخستنی کارگێری لە سەردەمی عومەری کوڕی خەتاب خوا لێی ڕازی بێت

هەڵبەت یەکەم گوتار، کە عومەری کوڕی خەتاب خوا لێی ڕازی بێت دوای وەرگرتنی ویلایەتەکەی دای، بنەماکانی ڕێکخستنی کار و دەستبەکار بوونی لەخۆ گرت بوو، کە بەرپرسیاریی یەکەم لە دەستبەکار بوون دەکەوێتە سەر ئەو سەرۆکەی کردەی تێڕوانینی پرسە گرنگەکان، دەگرێتە ئەستۆ.

لە لایەکی تر ئەم گوتارە بنەمای پێ سپاردنیشی لەخۆ گرت بوو، هەروەك ئەو مەرجانەشی لەخۆ گرت بوو، کە ئەرکە لەو فرمانبەرە گشتییە بڕەخسێن، کە بە سپاردەیی بەرژەوەندیی مووسوڵمانان ڕاپەڕێنێت، ئەو مەرجانەش ئەمانەن:

١) هێز.
٢) شارەزایی.
٣) دامەزراوی.
٤) دەستپۆیی.

ئەم گوتارە پشتگیری کردنی بنەمای پاداشت و سزاشی لەخۆ گرت بوو، پاداشت لە کاتی چاکی لە کار دا، سزاش لە کاتی فەرامۆش کردنی کار، ناوەڕۆکی ئەوەی ئەم گوتارە لەخۆی گرت بوو، ڕوون کردنەوەی سروشتی ویلایەت و کارگێڕی بوو، کە هەڵسەنگاندن و تاقی کردنەوەی سەردەستە و ژێردەستەیە، تاقی کردنەوەی سەردەستە لە مەودای هەڵستانییەتی بە دادگەری و جێبەجێ کردنی فەرمانەکانی خوای شکۆمەند و، گرتنە ئەستۆی سەرپەرشتیی بەرژەوەندیی

مووسوڵمانان، هەروەك تاقی کردنەوەش بوو بۆ ژێردەستە لە مـەودای گوێڕایـەڵیی کاربەدەست و ئارامییان لەسەری[٤٣٠].

لەم گوتارە دا هاتوە: "پاشان، هەڵبەت من بە ئێوە تاقی کراومەتەوە و ئێوەش بە من تاقی کراونەتەوە و، من لە دوای هاوەڵم لە ناو ئێـوەم و، ئەوەشـی لـە لای ئێمە ئامادە بێت بە خۆمان کارەکانی جێبەجێ دەکەین و ئەوەیشی لە ئێمە دوورە و ونە، کەسانی خودان هێز و دەست پاك دەکەینە لێپرسراویان، کەسێك چاك بێـت چاکیی بۆ زیاد دەکەین، کەسێکیش خراپە بکات، سزای دەدەین"[٤٣١]

هەروەها سەرکردەی کارگێر عومەری کوڕی خەتاب خوا لێی ڕازی بێت بایەخی بـە ڕێکخسـتنی کـارگێریی ولاّتـی ئیسـلامی داوە، هـەروەك سیسـتم گـەلێکی کارگێریی داهێنا، کە پێشتر ولاّتـی ئیسـلامی پێـی نـەدەزانی، گـرنگترینی ئـەم سیستمانەش:

١) تۆماری دیوانەکان.
٢) دابەش کردنی ولاّت بۆ بەش گەلێکی کارگێڕی.
٣) دابەش کردنی کار لە ویلایەت گەلێکی ئیسلامی.
٤) دامەزراندنی ماڵی دارایی.
٥) دامەزراندنی دادوەر و فرمانبەران.

لە خوارەوەش تاوتوێی گرنگترینی ئەم سیستمانە دەگرینە ئەستۆ.

## یەکەم: تۆماری دیوانەکان

دیـوانیش: "جێگەیەکـە بـۆ پاراسـتنی، ئـەوەی پەیوەندیـدارە بـە مافـەکانی دەسـەڵات لـە کـار و پـارە و پوولـەکان و ئەوانـەی سـووپا و کارگـەرانی پـێ دادەمەزرێت"[٤٣٢]

---

[٤٣٠] فرناس عبد الباسط البنا: التنظيم، ص١٣٩.
[٤٣١] جلال الدين السيوطي: تاريخ الخلفاء، ص٢٣٠- ٢٣١.
[٤٣٢] الماوردي: الأحكام السلطانية، ص٢٤٩.

یەکەم کەسی، کە لە ئیسلام دا دیوانی دانا عومەری کوڕی خەتابە، عومەری کوڕی خەتاب خوا لێی ڕازی بێت یەکەم کەس بوو تۆماری دیوانەکانی دانا و، مانای دانانی دیوانیش، واتا لەسەر نموونەی دیوانی فارس و ڕۆم دایمەزراند و، عوقەیلی کوڕی ئەبی تالیب و ئەوانی تریش تۆماری دیوانیان بۆ دەکرد[٤٣٣].

لە ڕۆشنایی ئەوەی هێنامانەوە دەتوانین بڵێین، کە دیوان تۆمارێکە تێی دا ئامار و ناو و مووچە و ڕێنماییە کارگێڕییەکان و پەیامە ئاڵ و گۆڕ کراوەکانی تێ دا تۆمار دەکرا، هەروەك دەتوانین بشڵێین، ئەو شوێنە بوو، کە تێی دا پەیام و پەیمان نامە و بەڵگەنامەکانی تێ دا دادەنرا[٤٣٤].

سەبارەت بە لایەنی جۆرەکانی دیوانیش، دیوانێك هەبوو بۆ پارە و دارایی، بە دیوانی پێدان(بەخشین) و، دیوانێك هەبوو بۆ پەیامەکان ناودەبرا بە دیوانی بیناسازی و، دیوانێك بۆ سەرباز کردن و، دیوانێك بۆ سەرانە.

دکتۆر سلێمان تەماوی پێی وایە، کە ئەم دیوانانە بنەچەی وەزارەتەکانی ئیسلام بوون و، ڕیشەیەك بوو، کە دیوانی تری لێ بوەوە و، لە سەردەمی ئەمەوی و عەباسییەکان دا بەشی لێ بوەوە[٤٣٥].

## دوەم: دابەش کردنی وڵات بۆ بەش گەلێکی کارگێڕی

کاتێك سنووری وڵاتی ئیسلام لە سەردەمی سەرکردەی کارگێڕ عومەری کوڕی خەتاب خوا لێی ڕازی بێت فراوان بوو، ئەم سەرکردە مەزنە هەڵستا بە دابەش کردنی وڵات بۆ بەش گەلێکی کارگێڕیی گەورە، بۆ ئەوەی فەرمانڕەوایەتییەکەی و سەرپەرشتی بەسەر دەرامەتەکانی دا ئاسان بکات، هەروەها ڕزگارگەرییەکانیش

---

[٤٣٣] علي علي منصور: الأحكام السلطانية، ص٢٤٩.

[٤٣٤] فاروق مجدلاوي: الإدارة العامة في عهد عمر بن الخطاب، دار النهضة العربية، بيروت ١٩٩١م، ص١٦٠.

[٤٣٥] سليمان الطماوي: عمر بن الخطاب وأصول السياسة والإدارة العامة، ص٢١١.

هۆکارێکی سەرەکی بوون لەوەی وا لە عومەر خوای لێی ڕازی بێت ،بکەن، کە ڕێکخەری یەکەم بێت لە ولاتی ئیسلامی[٤٣٦]

دابەش کردنی جوگرافیایی لە سەردەمی عومەر خوا لێی ڕازی بێت، لە ناوچە و هەرێمەکان وەك ئەمەی خوارەوە بوو:

أ- لە دوورگەی عەرەبی: وەك ئەوە مایەوە، کە لەسەردەمی ئەبوبەکر خوا لێی ڕازی بێت، وابوو.

ب- لە هەرێمە ڕزگار کراوەکان:

١) لە ولاتی مەزوپۆتامیا: ویلایەتی ئەهواز و، ویلایەتی کووفە و، ویلایەتی بەسرە.

٢) لە ولاتی فارس: ویلایەتی سەجستان و موکریان و کەرمان و، ویلایەتی تەبەرستان و، ویلایەتی خوراسان.

٣) لە ولاتی شام: بەشێکی بنکەکەی حەمس بوو، بەشێکیشی بنکەکەی دیمەشق.

٤) لە فەلەستین: ویلایەتی فەلەستین، بەشێك پایتەختەکەی ئەیلە بوو، بەشێکیشی پایتەختەکەی ڕملە.

٥) لە ئەفەریقا: ویلایەتی میسری گەورە و، ویلایەتی میسری بچووك و، ویلایەتی ڕۆژاوای میسر و، بیابانی لیبیا[٤٣٧].

## سێیەم: دابەش کردنی کار لە ویلایەتەکان

پێش عومەری کوڕی خەتاب خوا لێی ڕازی بێت والی ویلایەتی گشتی و ویلایەتی دادوەری و ویلایەتی باج بەیەکەوە کۆ دەکرایەوە و، دوای ئەوەی ڕزگار کردنەکان کران و، ولات و ویلایەتەکان فراوان بوون، سەرکردە عومەر خوا لێی ڕازی بێت پێی وابوو، بۆ ئەوەی دابەش کردنی کار لە نێو والییەکان و دادوەران و

---

[٤٣٦] فاروق الجدلاوي: الإدارة الإسلامية في عهد عمر بن الخطاب، ص١٥٠.

[٤٣٧] فاروق مجدلاوي: الإدارة الإسلامية في عهد عمر بن الخطاب، ص١٥٠- ١٥١.

باج وەرگران بۆ کارگێڕی باش بێت، والی ویلایەتی گشتی بگرێتە ئەستۆ و، دادوەریش، دادوەرێك عومەر دای بمەزرێنێت یا ئەم دامەزراندنە بۆ والی جێ بهێڵێت و، کۆ کردنەوەی باجیش ئەو کارکەری باجە بیگرێتە ئەستۆ، کە جێنشین سەربەخۆ بوو لە دامەزراندنی[٤٣٨].

لەم دابەش کردنە دا سەربەخۆیی فرمانی والی لە فرمانی دادوەر و، فرمانی کارکەری باج تێبینی دەکەین.

سەبارەت بە شێوازی عومەر لە بەڕێوەبردن دا، ئەوا لە میانەی دیار کردنی فرمانبەران و ئاراستە کردنیان و چاودێری لەسەریان دەردەکەوێت.

هەروەها عومەر خوا لێی ڕازی بێت لە کاتی دامەزراندنی فرمانبەری ویلایەت، مەرجی لێخوڕینی ماینێکی یەخت و، نەخواردنی ڕۆن و، نەپۆشینی بەرگی نەرم و، دانەخستنی دەرگە لە هەمبەر خودان پێداویستانی دانا، ئەوەشی ئەمەی بکرد بوایە، مافی سزای لەسەر پیادە دەبوو[٤٣٩].

لە لایەنی دوەمیش عومەری کوڕی خەتاب خوا لێی ڕازی بێت، ڕێنمایی گەلێکی بەم شێوەی خوارەوە بە والییەکانی دەدا:

١) والی زۆردار نییە و، بۆشی نییە زۆری بەسەر خەڵکی دا بکات.
٢) والی بۆی نییە، لە ژێردەستەکەی بدات.
٣) والی بۆی نییە، ژێردەستەکەی ڕیسوا بکات
٤) والی بۆی نییە بە ژێردەستەکەی دا هەڵ بدا لە ترسی ئاژاوە.

هەروەها عومەر خوا لێی ڕازی بێت باشترینی ئەوەی ڕوون کردوەتەوە، کە بۆ ویلایەتی گشتی چاکە و، هەر فرمانێکی گشتیی بەشێوەیەکی گشتی و ئەو نموونەیەی، کە عومەری کوڕی خەتاب دیاریی کردوە نموونەی فرمانبەرێکی موسوڵمانی بەهێزی ڕازگرە[٤٤٠]

---

[٤٣٨] فرناس عبد الباسط البنا: التنظيم، ص١٤١.
[٤٣٩] فرناس عبد الباسط البنا: التنظيم، ص١٤١.
[٤٤٠] فرناس عبد الباسط البنا: التنظيم، ص١٤٢.

عومەری کوڕی خەتاب لە بەڕێوەبردنی ولاَتی ئیسلامی دا شێوازێکی پەیڕەو دەکرد، کە مەیلی بۆ ناوەندییەتی دەچوو، هەروەك زۆرینەی فرمانە کارگێڕییەکانی لە دەستی حکومەتی ناوەندی لە پایتەخت کۆ کردبووەوە، بەلاّم عومەری کوڕی خەتاب خوا لێی ڕازی بێت هەندێك جار کاری بە نا ناوەندێتیی کارگێڕیش دەکرد، کاتێك فرمانە کارگێڕییەکانی بەسەر ئەو فرمانبەرانەی هەرێمەکان دابەش دەکرد، کە زۆرجار بە زانیاریی خەلّکی هەرێمەکان دەسنیشان دەکران، بۆیەش ناکرێت شێوازی کارگێڕیی عومەر خوا لێی ڕازی بێت بە ناوەندییەتیی ڕەها بناسێنین[٤٤١]

لە کۆتاییش دا عومەری کوڕی خەتاب خوا لێی ڕازی بێت بایەخی بە چاودێری و بەدواداچوونی والییەکان داوە، ئەم چاودێرییەش لە گرنگترینی ئەو هۆکارانە بوو، کە ببوون بە هۆی چاکسازی و سەرکەوتنی سیستمی کارگێڕی و گورجییەکەی لە سەردەمی عومەر خوا لێی ڕازی بێت، وێرای هۆکارەکانی تری وەك پرسی دینداری.

وردیی چاودێرییەکەی عومەر خوا لێی ڕازی بێت گەیشتە ئەوەی، کە لەسەر هەر کارکەرێك لە کارگەرانی چاودێرێکی شاراوە دابنێت لێی جیا نەبێتەوە، بۆ ئەوەی کارکەر باوەڕی وابێت، کە نزیکترین کەس لێی ئەوەیە، کە جێنشین لەسەری دیار کردوە، بۆیە لە هەر کاروبارێکی گشتی و تایبەت دا، ڕاست دەڕۆیشت[٤٤٢].

عومەر خوا لێی ڕازی بێت بۆ والییەکانی ڕوون دەکردەوە، کە چیان پێ دەکات ئەگەر ستەم لە ژێردەستەکەیان بکەن و، دەیگوت: "لە مووسولّمانان مەدەن، کە ڕیسوایان بکەن و، لە مافەکانیان ڕێیان لێ مەگرن، کە بێ برِوایان بکەن"[٤٤٣]

بەمجۆرە سەرکردەی کارگێڕی مەزن عومەری کوڕی خەتاب خوا لێی ڕازی بێت بۆمان ڕوون دەکاتەوە، کە ویلایەت سپاردەیەکی مەزنە و، بەرپرسیارییەکی

---

[٤٤١] علي الطنطاوي وناجي الطنطاوي: أخبار عمر، دار الفكر بدمشق، طبعة أولى، ١٩٥٩م، ص١٧٦.

[٤٤٢] محمد كرد علي: الإسلام والحضارة العربية، طبعة لجنة الترجمة والنشر، الطبعة الثالثة، ١٩٦٨م، جزء ثان، ص١١١.

[٤٤٣] أبو يوسف: الخراج، ص١٢٥.

گرنگە، نەك سەرچاوەیەكی خۆشگوزەرانی و زۆرداری و قۆستنەوەی خەڵكی و ستەم لێ كردنیان، لە هەمان كات دا دەرماڵەیەكی بۆ والییەكان بڕی بووەوە، كە بەشی خۆیان بكات و پێویستییان پڕ بكاتەوە و پێویستییان بە ژێردەستەكانیان نەبێت.

لە كۆتاییش دا و دوای خەریك بوونی خستنەڕوی ئەم نموونە مەزنەی عومەر، پێتان وا نییە، كە داهێنانەكانی عومەر خوا لێی ڕازی بێت لە ڕێكخستنی كاگێڕیی ولاتی ئیسلامی، بە یەكەم جۆر گوزارشت دەكرێن؟ پاشانیش ڕاتان وانییە، كە عومەری كوڕی خەتاب خوا لێی ڕازی بێت یەكەم كەسە، كە سیستمی كارگێڕیی داناوە؟ هەڵبەت لەگەڵ دڵنیا بوون لەوەی، كە پەیامبەری خوا ﷺ، بناخەی سیستمی كارگێڕیی دانا، بەڵام سیستمەكە لە سەردەمی عومەر خوا لێی ڕازی بێت پەرەی سەند و ڕەنگی دایەوە و بڵاو بوەوە.

# بەندی سێیەم

## سەرکردایەتی و وەرگرتنی بڕیارەکان

گومان لەوە دا نییە، کە هەموو ڕێکخراوە تایبەت و گشتییەکان پێداویستییان بە سەرکردایەتییەکی چەلەنگ و هۆشیاری خودان توانست لە ئاراستە کردن و بەڕێوەبردن، بە گورجییەکی بەرز، هەیە، بۆ بەدەست هێنانی ئەو ئامانجانەی، کە هەوڵیان بۆ دەدات.

پێداویستی بە سەرکردەی کارگێڕی هۆشیار، سەبارەت بەو ڕێکخراوە کارگێڕییە گشتییانەی، کە هەڵدەستن بە جێبەجێ کردنی سیاسەتی گشتی و، بەدەست هێنانی ئەو پلان و بەرنامە نەتەوەییانەی، کە ئامانجیان بەدەست هێنانی پێشکەوتن و گەشە پێدانە لە سەرجەم بوارە ئابووری و کۆمەڵایەتییەکان، زەق بوەتەوە[٤٤٤]

سەرکردایەتیی کارگێڕیش بە ئامراز گەلێکی جیاجیا بۆ هەڵستان بە کارەکەی دەردەکەوێت و، لە سەروی ئەم ئامرازانەش، ئامرازی وەرگرتنی بڕیارە.

بۆیە ئەم بابەتە لە سێ بەشی لە دوای یەك دەخوێنین:

بەشی یەکەم: سەرکردایەتیی کارگێڕی لە سیستمە دانراوییەکان.

بەشی دوەم: وەرگرتنی بڕیارەکان لە سیستمە دانراوییەکان.

بەشی سێیەم: سەرکردایەتیی کارگێڕی و وەرگرتنی بڕیارەکان لە سیستمی ئیسلامی دا.

---

[٤٤٤] عبد الغني بسيوني عبد الله: أصول علم الإدارة العامة، ص٢٥٥.

# بەشی یەکەم

## سەرکردایەتیی کارگێڕی لە سیستمی دانراوی

سەرکردایەتی کلیلی بەڕێوەبردنە، کە هەڵدەستێت بە ڕۆڵی بنەڕەتی لە ئاراستە کردنی کاری کارگێڕی، بە ئاراستەی بەدەست هێنانی ئامانجەکانی ڕێکخراوەی کارگێڕی، لێرە دا گرنگیی تێخوێندنەوەی تایبەتمەندییەکانی سەرکردەی کارگێڕ و هەموو ئەوانەی پەیوەندییان پێیەوە هەیە لە کردەکان، دەردەکەوێت:

باسی ئەم بابەتەش بەم شێوەی خوارەوە لە ئەستۆ دەگرین:

تویژبەندی یەکەم: پێناسە و تایبەتمەندییەکانی سەرکردەی کارگێڕ.

تویژبەندی دوەم: کردەکانی سەرکردەی کارگێڕ.

تویژبەندی سێیەم: دەستنیشان کردنی سەرکردە کارگێڕەکان.

# توێژبەندی یەکەم

## پێناسەی سەرکردایەتی و تایبەتمەندییەکانی سەرکردەی کارگێڕ

لە (خواستی یەکەم)دا هەڵدەستین بە تێخوێندنەوەی بابەتی پێناسەی سەرکردایەتیی کارگێڕی و، پاشان لە خواستی دوەمیش هەڵدەستین بە خستنەڕوی تایبەتمەندییەکانی سەرکردەی کارگێڕ.

### خواستی یەکەم: پێناسەی سەرکردایەتیی کارگێڕی

سەرکردایەتی دیاردەیەکی کۆمەڵایەتییە، بە بوونی هاوبەشی دوو کەس یا زیاترەوە بەندە، بۆیە پێویستییەکی کۆمەڵایەتییە بۆ ڕێکخستنی پەیوەندییەکانی تاکەکانی کۆمەڵگەیەکی خودان یەك ئامانج و هاوبەشی نێوان تاکەکانی ئەو کۆمەڵگەیە.

ئیسلام مکوڕە لەسەر سیستمی کۆمەڵە و، هەمیشە بانگەشەی دیاری کردنی سەرکردایەتیی کۆمەڵە دەکات، لە ڕێگەی ڕێککەوتنی خودی کۆمەڵە لەسەر کەسێك لە نێویان، کە بە باش سەرکردایەتی کردن و ئاراستەکردن بۆیان و بۆ کاروباریان، جیا بکرێتەوە.

بوونی سەرکردایەتی وەك پێویستییەکی کۆمەڵە لە میانەی فەرمایشتێکی پەیامبەر ﷺ دوویات دەبێتەوە: (لا يحل لثلاثة يكونون بفلاة من الأرض إلا أمروا عليهم أحدهم) واتە: (ڕێنەدراوە بە سێ کەس لە هەر شوێنێك، مەگەر یەکێکیان فەرمانیان لەسەر بکات) و، لە میانەی فەرمایشتێکی تری پەیامبەر ﷺ هاتوە: (إذا خرج ثلاثة في سفر فليؤمروا عليهم أحدهم) واتا: (ئەگەر سێ کەس بۆ گوزەر دەرچوون، با یەکێکیان فەرمانیان بەسەر دا بکات).

لە میانەی ئەم دوو فەرموودەیە تێبینی دەکرێت، کە مافی دەستنیشان کردنی سەرکردایەتی بۆ کۆمەڵە، کە پێویست نییە کەسێك تاکڕەو بێت و، سەرکردایەتییەکەی بەسەر کۆمەڵە دا بسەپێنێت، بەڵکو سەرکردەی ڕاستەقینە ئەوەیە، کە کۆمەڵە دەستنیشانی دەکات و پێی ڕازی دەبێت، کە بە ئەدگار و جیاکاری گەلێك دەتوانێت ڕەزامەندییان چنگ بخات یا ڕەزامەندیی زۆرینەیان، ئەگەر کۆ دەنگی تەواویشی بۆ نەڕەخسا[٤٤٥]

زۆربەی پێناسەکانی سەرکردایەتی، ڕەگەزە بنەڕەتییەکانی سەرکردایەتی کە: **کۆمەڵە و ئامانج و، کەسایەتیی** سەرکردەن، بۆ گەیشتن بەم ئامانجە، دەگرنەوە.

هەندێك پێناسەی سەرکردایەتییان کردوە بەوەی: "هونەری هەماهەنگیی نێوان تاکەکان و کۆمەڵەکان و هان دانیانە بۆ گەیشتن بە ئاواتی ویستراو"[٤٤٦]

قوتابخانەی پیادەی ئەمەریکی پێناسەی کردوە بەوەی: "هونەری کاریگەری کردنە سەر کەسەکان و ئاراستە کردنیانە بە ڕێگەیەك لەگەڵی دا دەستگیر بوونی گوێڕایەلی و ڕێز و هەواداری و هاریکارییان، سانا بکات، لە پێناو گەیشتن بە ئامانجێکی دیار کراو"[٤٤٧]

لیژنەی خزمەتگوزاریی شارستانیش لە ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا پێناسەی کردوە بەوەی: "تایبەتە بە کاریگەریی کارا لەسەر چالاکیی کۆمەڵە و ئاراستە کردنی ڕووەو ئامانج و کۆشش کردن بۆ گەیشتن بە ئامانجەکە"

هەندێکیش پێناسەیان کردوە بەوەی: "توانستە لە کاریگەری کردنە سەر خەڵکی، بۆ هاریکاری لە بەدەست هێنانی ئەو ئامانجانەی ئارەزوویانە"[٤٤٨]

---

[٤٤٥] أحمد إبراهيم أبو سن: الإدارة في الإسلام، ص٩٦.

[٤٤٦] جون فيفنر ورريرت برستس: الإدارة العامة، مطبعة دونالد – نيورك، ص٦٥.

[٤٤٧] مدرسة المشاة الأمريكية: كتب القيادة، ص١٢، نقلاً عن أحمد إبراهيم ابو سن: الإدارة في الإسلام، ص٩٧.

[٤٤٨] أحمد إبراهيم أبو سن: الإدارة في الإسلام، ص٩٧.

هەندێکیش پێناسەی دەکەن بەوەی: "کردارێکی کاریگەریی ئاڵوگۆڕە، لە ڕێگەی هاریکاریی تاکەکان لەگەڵ بوونی جیاوازی لە نێوانیان دا، ئەنجام دەدرێت، بۆ ئاراستە کردنی چالاکیی مرۆڤ بۆ هەوڵی پرسێکی هاوبەش"[٤٤٩]

ئێمەش لە میانەی ئەم پێناسەیەی دواییان تێبینی دەکەین، کە کردارێکی کاریگەری ئاڵوگۆڕە لە نێوان سەرکردە و کۆمەڵە، بەجۆرێك هەریەکێکیان کاریگەری لە ئەوەی تر دەکات، واتا سەرکردە تاکە ڕەگەزی کاریگەر نییە، بەڵکو بە کۆمەڵە کاریگەر دەبێت و، لەگەڵ ئارەزوو و باوەڕەکانی کارلێك دەکات، کە دووپات کردنی ڕەگەزی بەشداری کردن لەگەڵ کۆمەڵ و وەرگرتنی ڕای و بەدەست هێنانی ئامانج و ئارەزوو و دڵنیایی، ڕەگەزێکی بنەڕەتیی سەرکرادایەتییە[٤٥٠]

لەم پێناسانەوە ئەوە پوخت دەکەینەوە، کە سەرکردایەتیی کارگێری، توانستە لەسەر هەماهەنگی و ئاراستە کردنی هەوڵەکانی دوو کەس یا زیاتر بە ئاواتی بەدەست هێنانی ئامانجە داواکراوەکان بە بەرزترین هێندەی تەواوێتی و بەشداری لەگەڵ تاکەکانی کۆمەڵە.

لەم سەروبەندە دا، پێویستە ئاماژە بە پەیوەندیی دروست بوی نێوان سەرکردایەتی و سەرۆکایەتی بکەین، چونکە هەردووکیان لە ئەدگار و تایبەتمەندی دا هاوبەشن، هەروەك سەرکردە و سەرۆك لە ڕێکخراوەی کارگێری دا بنکەیەکی بڵند داگیر دەکەن و، دەسەڵاتیان بەسەر ئەندامانی کۆمەڵە دا هەیە.

سەرکردایەتی و سەرۆکایەتی لە خاڵ گەلێك دا هاوبەشن، بۆ نموونەش، سەرکردە و سەرۆك بەرزترین پایەی ڕێکخراوە دەگرن و، دەسەڵات گەلێکی فراوانیان بەسەر ئەندامانی ئەو کۆمەڵەیە دا هەیە، کە ملکەچی سەرکردایەتی و سەرۆکایەتییانن.

هەڵبەت سەرکردایەتی لە کۆمەڵە دا بەشێوەیەکی ئوتوماتیکی هەڵدەقوڵێت، لە کاتێك دا سەرۆکایەتی بە گوێرەی ڕەوشی ڕێکخستن و، بەگوێرەی کار و پسپۆڕییەکان، بەسەر کۆمەڵە دا دەسەپێت، هەروەها سەرۆك کەسێکە،

---

[٤٤٩] أحمد إبراهيم أبو سن: الإدارة في الإسلام، ص٩٧.
[٤٥٠] أحمد إبراهيم أبو سن: الإدارة في الإسلام، ص٩٧.

هەڵدەستێت بە سەرپەرشتی کردن بەسەر ڕاپەڕاندنی کاری کەسانی تر بە پێی ئەو ڕێنماییانەی لەسەری ڕێککەوتوون و لە پێشوو دا دانراون، هەروەك پەیوەندیی سەرۆك لەگەڵ کۆمەڵە دا لەسەر بنەمای پسپۆڕی و بەرپرسیارییە پێ دراوەکان و ئەو دەسەڵاتە ڕەسمییە پێدراوەی، کە پیادەی دەکات، بنیات نراوە، کە بۆشی هەیە فەرمان بەسەر ئەو کارمەندانە دا دەربکات، کە جێبەجێ کردنی ئەم فەرمانانە لە چارچێوەی یاسا دەرچوەکان لە ئەستۆیانە، لەژێر درێژە پێدانی هەڵگرتنی بەرپرسیارییان لە هەر کورتییەك لە ڕاپەڕاندنی ئەم فەرمانانە.

بەڵام سەرکردە دەسەڵاتی لە توانستەکانی لە کاریگەری کردنە سەر ڕەفتاری کەسانی تر، وەردەگرێت، بەشێوەیەك وای لێ بکات، بتوانێت گوێڕایەڵییانی و، بە دەنگەوە هاتنی فرمانەکانی بە قایل کردن و پەسەند کردنی ویستی ڕەها، دەست بکەوێت.

لە ڕاستیش دا، سەرکردە لە ئاستێکی بەرزتر لە ئاستی سەرۆك دا کاردەکات، ئەم بەرزیەش لەوە دا دروست بوە، کە سەرکردە دەسەڵاتەکەی بەسەر کۆمەڵ دا لەو دەسەڵاتی ڕەسمییە وەرناگرێت، کە یاسا دەیسەپێنێت، بەڵکو ئەم دەسەڵاتە لە پەسەند کردن و خۆبەدەستەوەدانی کۆمەڵ وەردەگرێت، کە کۆمەڵ بە سەرکردایەتییەکەییان داوە، لێرە دا بە ڕوونی ئەو پەسەند و خۆبەدەستەوە دان و ڕەزامەندییەی، کە پەیامبەر و ئەو جێنشینانەی، کە مەبەستیان بوو شوێنکەوتەی پیرۆزیەکەی بوون دەستمان دەکەوێت.

جێی باسە، مەرج نییە هەموو سەرۆکێك سەرکردە بێت، بەڵام ئەمە ئەوەش ڕەت دەکاتەوە، کە زۆرێك لە سەرۆکەکان دەسەڵاتەکانیان بە ڕێگەی سەرکردایەتی بەکاردەهێنن ئەگەر لە دەروونی ئەو کۆمەڵە تێگەیشت، کە سەرکردایەتییەکەیان دەگرێتە ئەستۆ و، بەدەنگییەوە دێن و کاریگەر دەبن پێی و کاریگەر دەبێت تێی دا و، خۆیان لێیان جیا ناکەنەوە بە دەسەڵاتی ڕەسمی و، شوێنیان لێ جیا ناکاتەوە[451]

---

[451] أحمد إبراهيم أبو سن: الإدارة في الإسلام، ص٨٩.

لەم بارە دا سەرۆك دەبێتە سەرکردەیەکی کردەنی، ئەگەر بە پێشەنگی کۆمەڵی شوێنکەوتەی مایەوە لە ڕەفتار بەرەو ڕویان و، لە بە هیوا گەیشتنی و پڕکردنەوەی پێداویستییەکانی.

سەرۆك لە سەرکردایەتییەکەی کەم دەبێتەوە ئەگەر پێی وابوو، کە پایە، خۆی لە خۆی دا، دەروازەی سەرکردایەتییە و، ئەگەر باوەڕی وابوو، کە کۆمەڵ بەخۆیان هەڵدەستن بە پەیڕەوی کردنی بە پاڵپشت بە دەسەڵاتی ڕەسمی بڕیار دراو بۆ پایەکەی، بێ ئەوەی لە لایەن خۆیەوە، کار بۆ قایل کردنی کۆمەڵ بە توانستی لە سەرکردایەتی کردنیان، بکات.

لە کۆتایی دا لەم سۆنگەیەوە ئاماژە بەوە دەکەین، کە شارەزایانی بەڕێوەبردنی گشتی جیاوازی لە نێوان دوو جۆر لە سەرکردایەتی دا دەکەن:

**جۆری یەکەم:** سەرکردایەتیی دەسەڵاتخوازی.

**جۆری دوەم:** سەرکردایەتیی دیموکراتی.

سەرکردایەتیی دەسەڵاتخوازی بایەخ بە زانینی بۆچوونی کارکەران لەگەڵی دا نادات و، لە کردارەکانی وەرگرتنی بڕیار بەشدارییان ناکات، هەروەك گرنگی بە ڕایەکانیشیان نادات و، لە بارەی بەڕێوەچوونی کاری کارگێری دا بەدەنگ ئارەزووەکانیان ناچێت.[٤٥٢]

بەڵام سەرکردایەتیی دیموکراتی، بە شێوەیەکی بنەڕەتی پشت بە گەشە پێدانی پەیوەندییە مرۆییەکان و بەشداری کردن لەتەك کارکەران لە ڕێکخراوەی کارگێری دا، دەبەستێت[٤٥٣]

سەبارەت بە پرسی سەرکردایەتیی ئیسلامی و تیۆریای ئیسلامیش لەم سۆنگەیەوە، ئەوا لە بەشی سێیەم دا دەیخەینە ڕوو، کە پەیوەندیدارە بە سەرکردایەتیی کارگێری و وەرگرتنی بڕیارەکان لە سیستمی ئیسلامی دا.

---

[٤٥٢] إبراهيم عبد العزيز شيحا: الإدارة العامة، ص١٩١- ١٩٢.

[٤٥٣] عبد الغني بسيوني عبد الله: أصول علم الإدارة العامة، ص٢٦٢.

## خواستی دووەم: تایبەتمەندییەکانی سەرکردەی کارگێڕ

چەندین تیۆریا دەرکەوتوون، کە هەوڵیان داوە بۆ جەخت کردنە سەر ئەو تایبەتمەندی و ئەدگار و جیاکارییانەی، کە سەرکردەی کارگێڕییان پێ جیا دەکرێتەوە.

تیۆریای خود پێی وایە، چەندین ئەدگاری گشتی هەن، کە پێویستە لە سەرکردەی کارگێڕ دا ڕەخساو بن، ئەم ئەدگارانەش لە لایەنی تایبەتمەندیی جەستەییەوە لقیان لێ دەبێتەوە، وەك دروستییەکی باش و وزە لە کارکردن و توانست لە هەڵگرتن، لە لایەنی دووەمیش، ئەدگارە سروشتییەکان دەگرێتەوە، وەك زیرەکی و توانستە زەینییەکان و، هەروەها چەندین ئەدگاری دەستکەوتوی لێ پێك دێت، کە دەکرێت گەشەیان پێ بدرێت، وەك هەڵگرتنی بەرپرسیاری و کارامەییە هونەرییەکان و، توانست لە پەیوەندیکاری و دەست پێشخەری و باش هەڵسەنگاندنی کاروبارەکان و، بڕیاری دروست لەسەر شتەکان[٤٥٤]

تیۆریای هەڵوێستیش پێی وایە، کە دیاری کردنی تایبەتمەندییەکانی سەرکردایەتی لەسەر بنەمای دەستڕۆیە پێویستەکان دەبێت، بۆ ڕووبەڕوو بوونەوەی هەڵوێستێك، ئەمەش لەبەر ئەوەی هەر هەڵوێستێك تایبەتمەندی گەلێك یا ئەدگار گەلێك لەو سەرکردەی کارگێڕە دەخوازێت، کە هەڵدەستێت بە چارە کردنی.

لەسەر ئەم بنەمایەش ئەم تیۆریایە دووپاتی ئەوە دەکات، کە جیاکارییە خواستراوەکانی سەرکردایەتی بەگۆڕانی ئەو پێگەیەی، کە سەرکردەی کارگێڕ دەیگرێت، دەگۆڕێت، بۆیە ئەو ئەدگارانەی، کە سەرکردایەتی ڕاستەوخۆ دەیخوازێت جیاوازە لەوانەی، کە سەرکردایەتیی ناوەڕاست پێداویستی پێیان هەیە و، هەروەها لەوەشی، کە سەرکردایەتی بڵند پێویستییەتی[٤٥٥]

---

[٤٥٤] عبد الغني بسيوني عبد الله: أصول علم الإدارة العامة، ص٢٦٣.

[٤٥٥] عبد الغني بسيوني عبد الله: أصول علم الإدارة العامة، ص٢٦٤.

هەروەك سەركردايەتيى ڕاستەوخۆ پێداويستى بە كارامەيى هونەرى و، توانست لە ئاراستە كردن و، سەرپەرشتيارى و كاريگەرى كردنە سەر كاركەران هەيە، لە كاتێك دا سەركردايەتيى ناوەڕاست تايبەتمەنديى ڕووناكبيريى گشتى و، توانست لە وەرگرتنى بڕيارە جێبەجێ كردنييەكان بۆ جێبەجێ كردنى سياسەتى گشتى، هەيە. سەبارەت بە سەركردايەتيى بڵنديش، پێويستى بە تێڕوانينێكى گشتگرانەيە بۆ كاروبارەكان و، پلان دانان و هەماهەنگى و، گەيشتن بە چارەسەريى ئەو گرفتانەى، كە ڕووبەڕوى بەدەست هێنانى ئامانجە نەتەوەييەكان و، جێبەجێ كردنى سياسەتى گشتيى وڵات دەبنەوە[٤٥٦]

لە لايەنى دوەم، تايبەتمەندييەكانى سەركردە بە پێى سروشتى كار دەگۆڕێن، هەروەك تايبەتمەندييەكانى سەركردەيەكى سەربازى جياوازە لە تايبەتمەندييەكانى سەركردەيەكى كارگێرى يا سەركردەيەكى سياسى.

پوختەى ئەم تيۆريايە ئەوەيە، كە ئەدگارە خواستراوەكان لە سەركردەيەكى كارگێرى سەركەوتوو، ئەدگارى گشتى نين، بەڵكو تايبەتمەندى گەلێكى ڕێژەيين و، بە هەڵوێستێك لە هەڵوێستەكانى سەركردايەتييەوە بەندن[٤٥٧]

سەبارەت بە تيۆرياى كارلێكيش، ئەوا واى دەبينێت، كە سەركردايەتى لە پێگەى يەكەمەوە كردارێكى كارلێكى كۆمەڵايەتييە، واتا سەركردەى سەركەوتوو ئەوەيە، كە ڕێز لە كارلێكى لەگەڵ كۆمەڵە دا دەگرێت و، پەيوەندى بە تاكەكانى پتەو دەكات و، كار بۆ بەدەست هێنانى ئامانجەكانيان و چارەسەر كردنى ئەو گرفتانەى، كە ڕووبەڕويان دەبێتەوە، دەكات.

هەروەها ئەم تيۆرياية تەواوكاريى نێوان ئەدگارەكانى سەركردە و پێويستييەكانى هەڵوێست دەخوازێت، واتا نێوانى تيۆرياى ئەدگارە خودييەكان و تيۆرياى هەڵوێست دەسازێنێت، چونكە لەسەر سەركردەيە، كە كارلێك لەگەڵ سەرجەم ئەو گۆڕێنەرانە دا بكات، كە لە نێوەندى كار دا ڕووبەڕووى دەبنەوە، جا

[٤٥٦] سليمان الطماوي: مبادئ علم الإدارة العامة، ص١٤٠.
[٤٥٧] عبد الغني بسيوني عبد الله: أصول علم الإدارة العامة، ص٢٦٥.

سروشتی ئەم گۆڕینەرانە هەرچەندە بێت، بۆیە توانست لە کارلێک کردن تەوەری ئەم تیۆرییایە.

دکتۆر عەبدول خەنی بەسیۆنی عەبدوڵلا پێی وایە، کە تایبەتمەندییە دیارەکانی سەرکردەی کارگێری سەرکەوتوو لەمانەی خوارەوە پوخت دەبێتەوە:

أ - بەلانی کەم ئەدگارە خودییەکانی هەبێت، وەك تەندروستی و زیرەکی و توانست لە بەرگە گرتن.

ب- بڕێك تایبەتمەندییە دەستکەوتوەکانی هەبێت، وەك توانست لە قایل کردن و پەیوەندیکاری و ئاگامەند بوون بە لایەنەکانی کاروبارەکانی بەر لە کۆتایی پێ هێنانی و، توانست لە بەدەست هێنانی چارەسەر بۆ گرفتەکان و چەسپاوی لە ڕووبەڕوو بوونەوەی تەنگەژەکان.

ج - لایەنی ڕەوشتی لە سەرکردەی کارگێر دا ڕەخساو بێت، ئەمەش بە ناوبانگیی لە ئارامگری و سپاردە و ڕێزداری و دەست پاکی و دڵسۆزی و خۆ یەکلا کردنەوە لە کار کردن دا، بۆ ئەوەی ببێتە پێشەنگێکی چاکی سەرجەم کارکەران لە ڕێکخراوە دا.

د - تێگەیشتنی ئامانجە گشتییەکان و، کار کردن بۆ بەدەست هێنانی بەرژەوەندیی گشتی و، جێبەجێ کردنی سیاسەتی گشتیی وڵات.

هـ - هێندەیەکی دیار لە کارامەیی و شارەزایی تایبەتیی پەیوەندیدار بەو کارەی، کە دەیگرێتە ئەستۆ لە بواری سەرکردایەتییەکەی، تێ دا ڕەخساو بێت[٤٥٨]

[٤٥٨] عبد الغني بسيوني عبد الله: أصول علم الإدارة العامة، ص٢٦٧.

# توێژبەندی دووەم

## کردەکانی سەرکردەی کارگێڕ

سەرکردەی کارگێڕ چەندین بەرپرسیاریی زۆری دەکەوێتە سەر شان، کە بە گۆڕانی ئاست و پێگە و توانستەکان، دەگۆڕێن. بۆیەش گلدانەوەی فرمانەکانی سەرکردایەتی کارگێڕ و دیاری کردنی کردەکانی بە پێی نموونەیەکی دیار کراو ئەستەمە، بەڵام ئەگەر دیاری کردنی تەواوی ئەم فرمان و کردانە بە دیاری کردنێکی پوخت ئەستەمیش بێت، ئەوا بەلانی کەم دەتوانرێت ئەم فرمانە گشتییانە دیاری بکرێن، کە پشکێکی هاوبەش لە نێو سەرجەم سەرکردەکان دا، دەنوێنن.

فرمانە هاوبەشەکانی سەرکردە کارگێڕەکان لەوەی، کە کرداره کارگێڕییەکان رێکی دەخەن، لە هەڵستان بە پلان دانان و رێکخستن و ئاراستە کردن و هەماهەنگی و پەیوەندیکاری و چاودێری دا کورت دەبێتەوە.

ئەمانە فرمانەکانی سەرکردەی کارگێڕن، هەروەك "هێنری فایۆل" دیاریی کردوون، بەو گوزارشتەی، کردە گەلێکی هاوبەشی سەرکردە کارگێڕەکانن لە سەرجەم ئاست و پێگەکانیان و، سروشتی ئەو رێکخراوانەی، کە هەڵدەستن بە بەڕێوەبردنیان[٤٥٩]، جا لە خوارەوە ڕوون کردنەوەی چۆنیەتیی بەجێهێنانی سەرکردەی کارگێڕ بۆ ئەم کردانە دەگرینە ئەستۆ.

### یەکەم: پلان دانان

دەسەڵاتی سەرکردایەتی وڵات ئەو دەسەڵاتەیە، کە هەڵدەستێت بە دیاری کردنی ئامانجە گشتییەکان و، سەرکردایەتیی سیاسیش بریتییە لە حکومەت و

---

[٤٥٩] إبراهيم عبد العزيز شيحا: الإدارة العامة، ص٣٢٢.

دەسەڵاتی یاسا دانان، پاشان دەگوازرێتەوە بۆ هەموو یەکە کارگێڕییەکان لە دەستگەی کارگێڕی، وەك وەزیرەکان، بۆ نموونە بەدەست هێنانی بەشێکی تایبەت پێیان لە پلانی گشتی، لێرە دا ڕۆڵی سەرکردەی کارگێڕ لە هەر یەکەیەك یا ڕێکخراویەکی کارگێڕی دەست پێ دەکات و، لە ڕۆشنای پێشبینییە ئایندەییەکان و، بە گوێرەی ئامرازە کەرەستەیی و مرۆییە بە کردەنی هەبوەکان لە چارچێوەی یەکەکەی، کە لەسەری دەبێت وێنای سیاسەتی تایبەت بە یەکەکەی لە چارچێوەی سیاسەتی گشتی دا بکات.

لەسەر سەرکردەیە، ئامانجە ویستراوەکان ڕوون بکاتەوە و، سروشتەکەی بۆ کارکەران لە ڕێکخستن ڕوون بکاتەوە بۆ ئەوەی هەریەکێکیان لە سنوورەکەی دا کاربکات و پابەند بێت پێی، هەروەها سەرکردە ڕاکانیان بزانێت لە بارەی چۆنیەتیی جێبەجێ کردنی ئەم ئامانجانە، هەروەك پێویستە بەڕێوەبەر ئاسۆیەکی فراوانی هەبێت و، بە پێی توانا لە شێوازی دەسەڵاتخوازی دوور بکەوێتەوە، لە دیاری کردنی ئامانجە هەندەکییەکان لە هەر یەکەیەك لە یەکەکانی پاشکۆی ڕێکخراوەکەی و لە ئامرازەکانی جێبەجێ کردن، کە هاوبەشی مسۆگەری پێك دەهێنن لە هەڵستان بە جێبەجێ کردنی پلانەکە و بەدەست هێنانی ئامانجەکانی بە سەرکەوتوویی.

## دوەم: ڕێکخستن

لە سەر شانی سەرکردەی کارگێڕە، کە بە بەرپرسیاریی ڕێکخستنی یەکە کارگێڕییەکەی هەڵ بستێت، جا لە لایەنی پەیکەری بێت یا مرۆیی، بە گوێرەی بنەچەیە زانستییە ناشنایەکان لە زانستی بەڕێوەبردن و، بەدەست هێنانی کارەکان بە ڕێگەیەکی تەواوتر و بەشێوەیەکی باشتر، بۆیە لەسەریەتی، کە ئەوەندەی لە وزەی دایە لە شێوازی ناوەند بوونی دەسەڵات دوور بکەوێتەوە و، پەنا بۆ شێوازی پێ سپاردنی پسپۆڕییەکان بۆ ئەوانەی خوارووی خۆی، ببات، لە سەرۆکی یەکە پاشکۆیەکان، ئەگەر لەمە دا کاروبارەکان ئاسان بوون.

هەروەك لەسەر سەرکردەیە، کاتێك هەڵ دەستێت بە دابەش کردنی بەرپرسیاریی کار بەسەر یەکە پاشکۆکانی، ڕەچاوی توانستەکانی کارکەران بۆی و مەودای ئامادەباشییان لە هەڵستان بەوەی پەیمانیان لێ وەرگیراوە لە کردەکان، بکات و، دەبێت گرنگییەکی دیار بە ژینگەی دەرەکیی دەورەی ڕێکخستن بدرێت، هەروەك ئەگەر هەستی بە نا پتەوی یا نا ساغیی بنیاتەکەی کرد لەسەر سەرکردەی کارگێر دەبێت، کە پێداچوونەوە بە ڕێکخستن دا بکات، و، ئەو چاکسازییانەش ئەنجام بدات، کە لەم بارەوە دەخوازرێن، سەرکردایەتی گرنگی بە بەڕێوەچوونی کاتیی کاری ئاسایی نادات، بەڵکو گرنگی بە ڕەنجی هۆشیارانە دەدات، لە پەی بردنێکی تەواو و تایبەتمەندیی تازە بوەوە و پەرە سەندن و چاکسازی.

پێویستە ئەو چارەسەرییانەی، کە سەرکردە بۆ ئەنجام دانی پەرە سەندن و چاکسازی دای دەنێت، هەڵقوڵاوی ناوەوەی ڕێکخستن بن، بۆ ئەوەی ڕاستەقینە بن و گوزارشت لە پێداویستییەکانیان بێت و، لەگەڵ خواستەکانی کار و بەدەست هێنانی ئامانجەکان، بگونجێت، هەروەك دەبێت، بڕیارە دەرچوەکان لەم بارەوە ئەنجامی بەشداریی بەشێکی ئەندامانی ڕێکخستن بێت و، بە شێوەیەکی تایبەتیش سەبارەت بەوانەی، کە ئەم بڕیارانە کاریگەری لە کاروبار یا ناوەندەکانیان دەکات، چونکە کە کار لە ئاراستەی پەرەسەندن و چاکسازیی قایل کردنی کەسانی تر بە سوودەکەی و هەست کردنیان بە پێویست بوونی، دەخوازێت[٤٦٠]

## سێیەم: ئەنجام دانی هەماهەنگی

کرداری هەماهەنگی لە توانست لە سازانی نێوان چالاکییەکانی یەکە پاشکۆکانی ڕێکخراوە دەردەکەوێت، بە جۆرێك ئامانجە گشتییەکانی ڕێکخراوە بە ئاسانی و گورجییەکی بەرز بەدەست بێت، پاشان لەسەر سەرکردە دەبێت، کە هەوڵی هەماهەنگیی نێوان ڕەنجی کارکەران لە ڕێکخستن دا بدات و، وەك

---

[٤٦٠] إبراهيم عبد العزيز شيحا: الإدارة العامة، ص٣٢٣- ٣٢٤.

هاوکارێکی بەشدار نەك وەك سەرۆکێکی ڕێکخستن لەگەڵیان دا کار بکات، بۆ ئەوەی چۆك بەو ئاڵۆزییانە بدرێت، کە بەدەست هێنانی ئامانجەکان دووچاریان دەبێتەوە[٤٦١]

## چارەم: گەشە پێدانی پەیوەندیکاری

لەسەر سەرکردەی کارگێرە، کار بۆ دەستخستنی تۆڕێکی باش و گشتگری پەیوەندیکاریی نێوان یەکەکانی ڕێکخستن و لقەکانی بکات، هەروەك پێویستە لەسەری، کار بۆ ڕوونی و ڕاستگۆیانەی ئەو کەناڵانەی پەیوەندیکاری بکات، کە یەکەکانی ڕێکخستن بە پێگەکەی، واتا بە ناوەندی سەرکردایەتییەکەی، دەبەستێتەوە، بۆ ئەوەی، ئەوەی لە ڕێکسختن دا دەوران دەکات، لەسەری ئاسان بێت، کە بە خێرایی کار بکات بۆ چۆك پێدانی ئەو ئاڵۆزییانەی دووچاری جێبەجێ کردن دەبنەوە و، سەقامگیریی ڕێکخستنەکە دڵنیا بکات، هەروەك لەسەر سەرکردەیە، کە درێژە بە کەناڵەکانی پەیوەندیکاری بدات، بۆ دەرەوەی ڕێکخراوە، واتا بە ڕێکخراوەکانی تر، جا لە ئاستی بلند بێت یا لە ئاستێکی هاوشان یا ئاستی خواروو لە ئاستی یەکەکەی دا بێت، گەر ئامانجەکانی ئەم ڕێکخراوە بەند بوون بە ئامانجەکانی ئەو ڕێکخستنەی، کە سەرپەرشتیی سەرکردایەتییەکەی دەکات[٤٦٢]

## پێنجەم: چاودێری

لەسەر سەرکردەیە لەکاتی چاودێری دا، بە بەکارخستنی پێوەرە بابەتییە نا کەسەکییەکانەوە پابەند بێت و، کاتێکیش بە ئەنجام دانی چاودێری هەڵدەستێت، ئامانجی ئاشکرا کردنی ئەو چەوتییانە بێت، کە ڕەنگە لە ڕێکخستن دا ڕوو بدەن و،

---

[٤٦١] إبراهيم عبد العزيز شيحا: الإدارة العامة، ص٣٢٤- ٣٢٥.

[٤٦٢] إبراهيم درويش، الإدارة العامة في النظرية والممارسة، ص١١٥- ١١٦.

بەسەر ئەو تەگەرانەش دا سەربکەوێت، کە ئەگـەری کەوتنــەوەیان لــە ئارادایــە و، کاریگەرییان لەسەر جێبەجێ کردنی ئامانجەکانی ڕێکخستن دا هەیە، کۆتـایی پــێ بهێنێت.

هەروەها لەســەر ســەرکردەیە، کــە پیــادەی چـاودێری بکـات لەســەر بنــەمای گوزارشت کردنی بــەوەی ئــامرازێکی هەڵســەنگاندن و چاکســازییە، نــەك لەســەر بنەمای گوزارشت کردنی بەوەی، کە ئامرازێکە بۆ واژۆ کردنی سزا و تۆڵە[٤٦٣].

[٤٦٣] إبراهيم عبد العزيز شيحا: الإدارة العامة، ص٣٢٥- ٣٢٦.

# توێژبەندی سێیەم

## دەستنیشان کردنی سەرکردە کارگێڕەکان

دەکرێت باشترین شێوازەکان و شیاوترینیان بۆ دەسنیشان کردنی سەرکردە کارگێڕەکان بە شێوەیەکی گشتی لەم پێنج ئەدگارە دا کۆ بکەینەوە:

### یەکەم: ئازادیی ڕەها لە دەسنیشان کردن دا

ئەم شێوازە لەسەر بنەمای دەسەڵاتی ڕەهای هەڵسەنگاندنی فەرمانڕەوا لە دەستنیشان کردنی سەرکردەکان دامەزراوە، بێ پابەند بوون بە پێوەرە بابەتییە دیاری کراوەکان، نموونەی ئەمەش ئەوەیە، کە فەرمانڕەوا هەڵستێت بە دەستنیشان کردنی گەورە یاریدەدەرە کارگێڕەکانی لە نێو پشتیوانانی[٤٦٤]

ڕوونیشە، کە ئەم شێوازە لە دەسنیشان کردنی سەرکردەکان پشت بە پەیوەندییە کەسێتییەکان دەبەستێت، کە دەبنە هۆی کەم و کوڕی و گەندەڵی لە دەستگەی کارگێری، وێرای بڵاو بوونەوەی لایەنگری و بەرتیل.

ئەم شێوازە بۆ دەستنیشان کردنی سەرکردەکان ناگونجێت، بە شێوەیەکی تایبەتیش سەبارەت بەو سەرکردایەتییە جێبەجێ کردنییانەی، کە مۆرکێکی هونەری بەسەریان دا زاڵە[٤٦٥]، لە کاتێك دا دەکرێت ئەم شێوازە پشت ڕاست بکرێت لەوەی پەیوەندیدارە بە دەسنیشان کردنی ئەو سەرکردە کارگێڕانەی، کە سروشتی سیاسی بەسەریان دا زاڵە[٤٦٦]، بەجۆرە وای دەبینین، کە سەرۆك کۆمار، لە چارچێوەی سیستمی سەرۆکایەتییەکەی، سەربەخۆیە لە دەسنیشان کردنی وەزیرەکان و گەورە یاریدەدەرەکانی.

---

[٤٦٤] سليمان الطماوي: مبادئ علم الإدارة العامة، ص١٤٢.

[٤٦٥] إبراهيم عبد العزيز شيحا: الإدارة العامة، ص٣٢٧.

[٤٦٦] سليمان الطماوي: مبادئ علم الإدارة العامة، ص١٤٣.

## دوەم: پێگەی کۆمەڵایەتی

ئەم شێوازە لەسەر دەستنیشان کردنی سەرکردە کارگێڕەکان لەو کەسانەی، کە وابەستەی چینێکی کۆمەڵایەتیی بەرزی خودان ڕیشەیەکی خانەوادەیی و ڕەسەنێتی و خزمایەتی، دامەزراوە و، ئێستاشی لەگەڵ دا بێت لە هەندێك لەو وڵاتانەی، کە هێشتا نەگەیشتوونەتە گەشەی شارستانی، پەیڕەو دەکرێت و، ئەگەر سەرنجێکی دەستنیشان کردنی سەرکردە کارگێڕەکان لە وڵاتی ئێراق بدەین، بیرۆکەیەکی ڕوونمان لە شێوازی دەستنیشان کردنی سەرکردەکان لەسەر بنەمای پێگەی کۆمەڵایەتی یا پارتایەتی، پێ دەدات.

## سێیەم: هەڵبژاردن

ئەم شێوازە لەسەر بنەمای دەستنیشان کردنی سەرکردەکان بە ڕێگەی هەڵبژاردن، دامەزراوە، بەڵام ئەم شێوازە تێکەڵە لە چەندین خەوش، گرنگترینیان:

١) خۆی لەخۆی دا بردنەوە لە هەڵبژاردنەکان پشت نابەستێت بە لێهاتوویی و کارامەیی و شارەزایی، بەڵکو پشت بە کاریگەری کردنە سەر دەنگدەران دەبەستێت، یا بە پشتگیریی ئەو کەسانەی، کە بەرژەوەندییە تایبەتەکانیان سەرکەوتنی هەندێك لە پالێوراوانی پێویستە.

٢) سەرکردە براوەکان لە هەڵبژاردنەکان کار بۆ ئارەزووی پشتگیرانیان دەکەن و، دژایەتیی بەرهەڵستکارانیان دەکەن.

٣) ڕەنگە خۆشەویستیی سەرکردە ببێتە هۆی زیان گەیاندن بە بەرژەوەندیی گشتی، ئەگەر ئەم سەرکردە هەڵستا بە پشتگیری کردنی کۆمەڵەیەك بە ناحەق، بە هەڵپە کردنی بردنەوەی لە هەڵبژاردنەکانی داهاتوو.

٤) هەڵبژاردن دەبێتە هۆی لەدەستدانی ڕەگەزی سەقامگیری یا بەردەوامیی پێویست، بۆ سەرکەوتنی سەرکردە، چونکە هەڵبژاردنەکان بە خولانەوە و تازە

بوەوە، جیا دەکرێنەوە[٤٦٧]

## چارەم: فێر کردن و ئامادە کردنی ئەکادیمی(زانستیانە)

ولأتە پێشکەوتوکان لە کاتی ئێستا دا، بە پشت بەستن بەم شێوازە دامەزراون و، پشت دەبەستن بە ئامادە کردنی سەرکردە کارگێرەکان لە پەیمانگە تایبەتەکان بەم مەبەستە و، بنەما کارگێڕییە سەرکەوتوەکان بە سەرکردە کارگێڕەکان دەگەیەندرێت و، تاك گەلێك لەسەر ئاستێکی بەرز لە ئامادەباشییە زانستی و رووناکبیرییەکان لەگەڵ شارەزا بوونی زمانەکان، پەیوەندی بەم پەیمانگایانە دەکەن، بە ئامانجی پڕ کردنەوەی فرمانە سەرکردایەتییەکان لە ولأت دا[٤٦٨]

## پێنجەم: لێوەشاوەیی

ئەم شێوازە دەسنیشان کردنی دەستەبژێرێك لەوانەی ڕەگەزەکانی هەڵستان بە کردەی کارگێڕییان تێ دا دەستەبەرە، دووپات دەکاتەوە و، هاوتایی و یەکسانیی نێوان داواکەرانی پڕ کردنەوەی ناوەندە سەرکردایەتییەکان لە ولأت دا، بەدەست دەهێنێت.

سیستمی لێوەشاوەیی، وەك شێوازێك بۆ دەسنیشان کردنی سەرکردە کارگێرەکان، لە چەمکی دا لە فەرەنسا جیاوازە لەگەڵ ئەوەی ویلایەتە یەکگرتوەکانی ئەمەریکا.

سیستمی فەرەنسی وەك ڕێسایەکی گشتی، سەبارەت بە دامەزراندن لە فرمانە گشتییەکان پشت بە ڕێگەی کێبڕکێی گشتی دەبەستێت، بەڵام ئەوەی پەیوەندیدارە بە پلەپێدان بۆ فرمانە سەرکردایەتییەکان ئەوا بە گوێرەی دوو ڕێگە دەبێت:

ڕێگەی یەکەم: بریتییە لە پلەپێدانی بە کۆنتریني.

---

[٤٦٧] سليمان الطماوي: مبادئ علم الإدارة العامة، ص١٤٥.

[٤٦٨] إبراهيم عبد العزيز شيحا: الإدارة العامة، ص٣٣١.

ڕێگەی دووەم: بریتییە لە پلەپێدانی بە دەستنیشان کردن.

پێشبڕکێیە گشتییەکان لە فرمانە گشتییەکان لە فەڕەنسا بە ڕێگەیەکی سەرەکی گوزارشت دەکرێن، هەروەك پێشبڕکێ گەلێك بە گوێرەی ڕێسا گەلێکی یاسایی دیاری کراو ئەنجام دەدرێت، بۆ بەدەست هێنانی یەکسانی و هاوتایی هەلەکانی نێوان سەرجەم پالێوراوان بۆ دامەزراندن لە فرمانە گشتییەکان.

بەڵام سەبارەت بە پلەپێدانی لە پایەیە سەرکردایەتییەکان، ئەوا شێوازێکی پلەپێدانی بە کۆنێتیی ڕەها هەیە و، ئەم شێوازە بە شێوەیەکی ئوتۆماتیکی دەبێت، بەجۆرێك هیچ دەسەڵاتێکی هەڵسەنگاندنی کارگێریی بڵند ناهێڵدرێت، هەروەك شێوازی پلەپێدانی بە دەستنیشان کردنیش هەیە، ئەم شێوازە ڕێ دەدات بە دەسەڵاتی هەڵسەنگاندن بۆ دەستنیشان کردنی سەرکردە کارگێڕەکان لەسەر بنەمای لێهاتوویی و دەستڕۆیی پایە بەرزەکان، ئەمەش لە ڕێگەی ئەنجام دانی تاقی کردنەوە گەلێك دەبێت، کە لە شێوەی تاقی کردنەوە یا پێشبڕکێ، کە بۆ پالێوراوان بۆ ئەم پایە سەرکردایەتییانە، ئەنجام دەدرێت.

بەڵام سەبارەت بە سیستمی ئەمەریکی، ئەوا جیاوازە لە سیستمی فەڕەنسی لە دامەزرانی لەسەر تیۆریای بابەتی لە ڕیزبەند کردنی فرمانە گشتییەکان، بۆیەش فرمانە گشتییەکان بە کۆمەڵێك لەو ئەرك و بەرپرسیارییانە گوزارشت دەکرێن، کە مەرج گەلێك دەخوازن، هەروەك هیچ کەسێك دەستنیشان ناکرێت بۆ گرتنە دەستی یەکێك لە فرمانە سەرکردایەتییەکان مەگەر ئامادەباشیی بۆ پڕ کردنەوەی بەگوێرەی تایبەتمەندییە دیاری کراوەکان بۆی، هەبێت.

سیستمی ئەمەریکی ڕێگەی پێشبڕکێی گشتی وەك بنەمایەکی گشتی سەبارەت بە سەرجەم فرمانەکان دەگرێتەبەر، واتا ئەو جیاوازییە بوونی نییە، کە لە سیستمە فەڕەنسییەکە لە نێو دامەزراندن و پلەپێدانی دا جێبەجێ دەکرێت، هەروەك پلەپێدانی لە سیستمی ئەمەریکی بە مەبەستی دامەزراندنی نوێ دادەنرێت، دوایی پێشبڕکێ کردنەکە دەکرێت[٤٦٩]

[٤٦٩] عبد الغني بسيوني عبد الله: أصول علم الإدارة العامة، ص٢٨٢-٢٨٣.

سیستمی ئەمەریکی هەل بۆهەڵبژاردنی زۆرترین ڕەگەزەکانی لێوەشاوەیی بۆ پڕ کردنەوەی پایە سەرکردایەتییەکان دەڕەخسێنێت و، ڕێگە بە دامەزراندنی هیچ کەسێك لە پایەکی سەرکردایەتی نادات، مەگەر لێوەشاوە بێت بۆ ئەم پایە، واتا لێهاتوویی و توانستە سەرکردایەتییەکانی تێ دا هەبێت

هەروەها لە لایەکی تریش، سیستمی ئەمەریکی ڕێگە نادات بە دامەزراندنی هیچ پایەکی سەرکردایەتی مەگەر لە کاتی پێداویست پێی، ئەم ڕەوشەش مسۆگەرییەکی گەورەی نەبوونی پایەی سەرکردایەتی زیادە دەنوێنێت لەو سنووره ژیرانەیەی، کە بنەما گشتییەکانی ڕێکخستنی کارگێڕیی گشتی دەیانخوازێت، بەجۆرێك پەیکەری فرمانە کارگێڕییەکان لاواز بێت، لەسەر ئەو بنەچە ڕێکخستنییانە بنیات نەنرا بن، کە لەگەڵ پلەپلەیی قوچەکی یا پێداویستیی کارە کردەنییەکان، دەسازێن[٤٧٠]

---

[٤٧٠] عبد الغني بسيوني عبد الله: أصول علم الإدارة العامة، ص٢٨٤.

# بەشی دوەم

## وەرگرتنی بڕیارەکان

کرداری بڕیار ساز کردن لە بەڕێوەبردنی گشتی و تایبەت بەیەکەوە، بە کارێکی هەردەبیی گوزارشت دەکرێت.

ڕاستەقینەش هەیە، ئەوەیە، کە سەرکەوتنی سەرکردەی کارگێر هەمیشە بە توانستی لە دەکردنی بڕیارە کارا و دروستەکان لە ژیانی ڕێکخستن دا پێوانە دەکرێت، کە دەتوانێت پێیەوە سیاسەتەکانی ڕێکخستن و ئامانجەکانی بۆ هەڵ و مەرجی بەرجەستە بگۆڕێت و، بۆیەش تێخوێندنەوەی ئەم بەشە لەم سێ توێژبەندەی خوارەوە دا لە ئەستۆ دەگرین:

توێژبەندی یەکەم: مانای بڕیار لە زانستی بەڕێوەبردنی گشتی دا.

توێژبەندی دوەم: جۆرەکانی بڕیارەکان.

توێژبەندی سێیەم: قۆناغەکانی بڕیار ساز کردن.

# توێژبەندی یەکەم

## مانای بڕیار لە زانستی بەڕێوەبردنی گشتی دا

بڕیار لە زانستی بەڕێوەبردنی گشتی دا مانـای دەستنیشـان کردنـی پـەی پـێ بردراوە لە نێو زیاتر لە جێگرەوەیەکی لەبار بۆ ڕوویەڕوو بوونەوەی هەڵوێستێك یـا گرفتێك[٤٧١]

لەم پێناسەوە ئەوە ڕوون دەبێتەوە، کە بڕیار لە زانسـتی بـەڕێوەبردنی گشـتی دوو پایەی هەیە:

### پایەی یەکەم: زیاتر لە جێگرەوەیەکی دابین کراو لە بەرانبەر هەڵوێستێکی دیار کراو دا هەبێت

جێگرەوەکان بە شوێن پێ یا ڕێگـەش نـاودەبرێن و، بـۆ ئـەوەی لـە سـۆنگەی بڕیارەوە بین دەبێت بەلانی کەم دوو جێگرەوە هەبێت و، کەسـەکە پابەنـد بێـت بـە دەستنیشان کردنی نێوانیان، نموونەی ئەمەش، ئەو فرمانبـەرەی، کـە سەرپێچـیی پێویستییەکانی فرمانەکەی دەکات، بەڕێوەبەر لە نێو واز هێنان یـا هەڵپەسـاردنی بۆ بەردەم ئەنجوومەنی تەمبێ کردنی، بۆ بژار دەکات.

بەسیش نییە، کە زیاتر لە جێگرەوە یا شوێن پێیەك هەبێت، بەڵکو دەبێت، کە جێگرەوە یا شوێن پێیە خراوە ڕوەکان فەراهەم بن، واتا بەرجەستە بوونی لـە توانـا دا بێت.

---

[٤٧١] عبد الفتاح حسن: الإدارة العامة، ص١٤٦.

## پایەی دوەم: کەسەکە لە نێو جێگرەوە فەراهەمەکان بۆ ڕووبەڕوو بوونەوەی هەڵوێستەکە و، بە پەی پیٚ بردنەکە دەستنیشان بکرێت

بڕیارەکـان هەمیشـە مەبەسـتدار و ویسـتراون، بۆیـە هـەڵس و کەوتـە نـا هەستیارییەکان، یا هاوشێوەی نـا هەسـتیاری، لـە تێخوێندنـەوە و بـیر کردنـەوە دەرناچن و، بەوجۆرەش ناکرێت بە بڕیار، گوزارشت بکرێت.

هەروەها ناشبێتە بڕیار تەنانەت ئەگەر جێگرەوەکان زۆریش بن و، دەستنیشـان کردنی نێوانیان هەستیاریش بێت ئەگەر دەسنیشان کردنەکە لەژێر فشار یـا ناچـار کردنی کەرەستەیی یا ئـەدەبی بێـت، وەك ئـەو سـەرۆکەی، کـە هەڵدەسـتێت بـە پلەپێدانی یەکێك لە فرمانبـەران لەسـەر بنـەمای فشـاری یـەکێك لـە دەسـەڵاتە بڵندەکان لە وڵات دا، بیٚ ئەوەی شایستەیی پلەپێدان بێت بـە هـەر شـێوەیەك لـە شێوەکان[٤٧٢]

[٤٧٢] إبراهيم عبد العزيز شيحا: الإدارة العامة، ص٣٤١ وما يليها.

# توێژبەندی دووەم

## جۆرەکانی بڕیارەکان

شارەزایانی بەڕێوەبردنی گشتی ئەو بڕیارانەی، کە سەرۆکی کارگێڕی دەریان دەکات، بۆ بڕیارە فرمانی یا ڕێکخستنی و بڕیارە کەسەکییەکان و، بڕیارە ڕاشکاوەکان و بڕیارە لەخۆ گرتوەکان و بڕیارە نووسراوەکان و، بڕیارە زارەکی و بڕیارە کارگێڕییەکان و بڕیارە کۆمەڵەییەکان و، بڕیارە بنەڕەتییەکان یا بنیاتنەرەکان و، بڕیارە ڕۆتینییەکان، دابەش دەکەن[٤٧٣]

### یەکەم: بڕیارە فرمانییەکان یا ڕێکسختنییەکان و بڕیارە کەسەکییەکان

بڕیارە فرمانییەکان ئەمانەن، کە بەڕێوەبەر بەو گوزارشتەی، کە ئەندامێکە لە ڕێکخستن، وەریان دەگرێت، واتا کاتێك بە شێوەیەکی ڕەسمی لە کاتی هەڵستانی بە فرمانەکەی بەو گوزاشتەی بەرپرسێکە لە ڕێکخستن، وەك بڕیاری دەرچوو بە دامەزراندن، یا گواستنەوەی فرمانبەرێك یا تەمبێ کردنی.

سەبارەت بە بڕیارە کەسەکییەکان ئەوانەن، کە بەڕێوەبەر بە شێوەیەکی کەسەکی دەریان دەکات، نەك بەو گوزارشتەی ئەندامێکی بەرپرسە لە ڕێکخستن، واتا ئەم بڕیارانە پەیوەستن بە هەڵسوکەوتە کەسەکییەکانی، وەك بڕیاری دەرچوو بە تەرخان کردنی ماوەی مانگێك لە مۆڵەتی ساڵانەی و بەسەر بردنی لە دەرەوە[٤٧٤]

---

[٤٧٣] عبد الفتاح حسن: الإدارة العامة، ص١٥٠.

[٤٧٤] إبراهيم عبد العزيز شيحا: الإدارة العامة، ص٣٤٤.

## دوەم: بڕیارە ڕاشکاوەکان و بڕیارە لەخۆ گرتوەکان

بڕیاری ڕاشکاوانە ئەو بڕیارەیە، کە سەرۆکی کارگێری لە دەربڕینی هەڵوێستێکی دا ڕاشکاوانەیە بە ڕازی بوونی یا نەبوونی.
بەڵام بڕیاری لەخۆ گرتوو ئەو بڕیارانەن، کە سوود لە بڕیارێکی پەیوەست بە بابەتێکی تر دەبینن، یا ئەو بڕیارەی، کە ڕێگەی بەڕێوەبەر سوودی لێ دەبینێت، ئەگەر بە ڕاشکاویش دەرنەبڕدرا.

## سێیەم: بڕیارە نووسراوەکان و بڕیارە زارەکییەکان

بڕیارە نووسراوەکان لە شێوەی دارشتنێکی دەستنووسی دەردەچن، بەڵام بڕیارە زارەکییەکان بڕیاری بێژەیین نەك نووسراو.

## چارەم: بڕیارە تاکە کەسییەکان یا بڕیارە کۆمەڵەییەکان

بڕیاری تاکەکەسی ئەو بڕیارەیە، کە بەڕێوەبەر لە ساز کردنی دا تەنیایە بێ بەشدار کردنی لایەنی پەیوەندیدار بە بڕیار
بەڵام بڕیاری کۆمەڵەیی ئەو بڕیارەیە، کە بەرهەمی ڕەنج و بەشداریی کۆمەڵەیی دەبێت.

## پێنجەم: بڕیارە بنەڕەتییەکان یا بنیاتنەرەکان و بڕیارە ڕۆتینییەکان

بە بڕیارە دووبارە نەبوەوەکانیش ناودەبرێن و، بڕیار گەلێکن، کە لە ژیانی ڕێکخستن دا دووبارە نابن، ئەگەر دووبارەش ببنەوە، ئەوا نابێت مەگەر لە ماوە گەلێکی لێك دوور. ئەم بڕیارانەش بەزۆری پەیوەندیدارن بە سیستمی بنەڕەتی، جا بە بنیات نان بێت یا هەموار کردن یا لادان و، ئەو بڕیارانەشن، کە بایەخ نادەن مەگەر بە گرفتە ئاڵۆز و گرنگەکان لە ڕێکخستن و، نموونەشیان بڕیارە دەرچوەکانە

بە پەیڕەوی کردنی شێوازێکی پلان دانانی گشتگر، یا بە گۆڕینی جـۆری سیاسـەتە پەیڕەو کراوەکان لە ڕێکخستن، یا بە هەموار کردنی یا بنیات نـانی کارگێڕییـەکی لقیی نویێ بۆی[٤٧٥]

بەڵام بڕیارە ڕۆتینییەکان ئـەو بڕیارانـەن، کـە دووبـارە بـوەوەن و، بـەزۆریش پەیوەندیدارن بە کارەکانی ڕۆژانە و ڕام بوەکان، کاریگەرییەکی ڕاستەوخۆش ناکەنە سەر ڕێکخستن و، دەتوانرێت بە پشت بەستن بە ئەزموون و شـارەزاییە پێشـینەکان کۆتاییان پێ بهێنرێت، لە نموونەی ئەم بڕیارانەش، بڕیاری پێدانی مۆڵەتە بە یەکێك لە کارکەران لە ڕێکخستن[٤٧٦]

## شەشەم: بڕیارە ڕێساییەکان و بڕیارە تاکییەکان

بڕیارە ڕێساییەکان ئەمانەن، کە لە هەمبەر چـەند تاکێـك یـا تـاك گـەلێکی دیاری نەکراو دەردەچن، بە جۆرێك ناوەڕۆکی ئەم بڕیارانە لەسەر هەر تاکێکە، کـە ئەو مەرجە دیاری کراوانەی تێ دا بڕەخسێت.

بەڵام بڕیارە تاکییەکان ئەو بڕیارانەن، کە لە هەمبەر تاکێك یا چەند تـاکێکی دیاری کراو دەردەچن[٤٧٧]

---

[٤٧٥] إبراهيم عبد العزيز شيحا: الإدارة العامة، ص٣٤٥.

[٤٧٦] إبراهيم عبد العزيز شيحا: الإدارة العامة، ص٣٤٦.

[٤٧٧] إبراهيم عبد العزيز شيحا: الإدارة العامة، ص٣٤٦.

# توێژبەندی سێیەم

## ئەو قۆناغانەی کرداری بڕیار سازکردنی پیٚ دا ڕەت دەبێت

لە بوونی چەند قۆناغانێك بۆ کرداری وەرگرتنی بڕیارەکان کۆدەنگییەك لەنێو زانایانی بەڕێوەبردنی گشتی دا هەیە، دەبێت بەر لە دەرچوونی بڕیارەکە لەبەرچاو بگیرێن، بەلاّم جیاوازییەك لە نێو ئەم زانایانە دا هەیە لە بارەی دیاری کردنی ژمارەی ئەم قۆناغانە[٤٧٨]

دکتۆر عەبدول غەنی بەسیۆنی عەبدوڵلا پێی وایە لە لایەنی زانستییەوە هەنگاوەکانی بڕیار ساز کردن و وەرگرتنی لە سیٚ قۆناغی بنەڕەتی دا گلیٚ دەبنەوە، کە بە دیاری کردنی گرفت دەست پیٚ دەکات، پاشان دەستەبەر کردنی چارەسەری گەلێکی جێگرەوەی لەبار بۆ پیادە کردنیان و، لە دواییش دا دەستنیشان کردنی چاکترین چارەسەری یا جێگرەوە و دانانی بۆ جێبەجیٚ کردن[٤٧٩]

### - قۆناغی یەکەم: قۆناغی دیاری کردنی گرفتەکە

ئەم قۆناغە بە بنچینەیەك گوزارشت دەکرێت، کە کرداری وەرگرتنی بڕیاری لەسەر دادەمەزرێت، چونکە بڕیارەکە یا ئەوەتا بۆ چارەسەریی گرفتێك دەردەچێت یا بۆ ڕاست کردنەوەی ڕەوشێك لە ڕەوشەکان.

لەسەر هەر سەرۆکێکی کارگێریش پێویستە، بۆ دیاری کردنی چۆنایەتیی ئەو گرفتانەی، کە ڕەوتی کار لە ڕێکخراوەی کارگێرییەکەی دووچاری دەبێتەوە لە لایەك و، بۆ ڕێزبەند کردنی ئەم گرفتانە لە ڕووی یەکەمییەوە لە لایەکی تر، شارەزای پەیبەری دەست بکەوێت.

---

[٤٧٨] إبراهيم درويش، الإدارة العامة في النظرية والممارسة، ص١٤٦، ومحمد سعيد عبد الفتاح: الإدارة العامة، ص٢٢٥، وحمدي أمين عبد الهادي: الإدارة العامة، في الدول العربية.

[٤٧٩] عبد الغني بسيوني عبد الله: أصول علم الإدارة العامة، ص٢٩٨.

## - قۆناغی دوەم: دەستەبەر کردنی چارەسەرییە جێگرەوەکان

دوای دیاری کردنی گرفتەکە، قۆناغی گەڕان لە چارەسەرییە لەبارەکان بۆی، دێت، هەروەك سەرۆکی کارگێری ژمارەیەك لە یاریدەدەران و شارەزایان لە ڕێکخراوەی کارگێری ڕادەسپێرێت، بۆ گەڕان بەدوای چارەسەری گەلێکی لەبار و، هەڵسەنگاندنی هەر جێگرەوەیەکیان، واتا قۆناغەکە دوو هەنگاو لەخۆ دەگرێت:

**هەنگاوی یەکەم:** بریتییە لە گەڕان لە چارەسەری و دیاری کردنییان.

**هەنگاوی دوەم:** بریتییە لە هەڵسەنگاندنی ئەم چارەسەرییە جێگرەوانە.

هەنگاوی یەکەم پێداویستیی هەیە بە گەڕانی پسپۆڕان یا شارەزایان لە چارەسەریی لەبار بۆ پیادە کردنیان، لەسەر گرفتە دروست بوەکە، بەجۆرێك بە وردی چارەسەرێکی دیاری کراو بدۆزنەوە، لەم بوارەوەش دا پێویستە ڕەچاوی دوورکەوتنەوە لە چەندین جێگرەوە بکرێت، وەك ئەو جێگرەوەیەی، کە لە چارەسەر کردنی گرفتێکی هاوشێوەی پێشتر دا شکستی هێناوە، لێرەش دا لە دوور کەوتنە لە جێگرەوە نا باشەکان لە بواری توێژینەوە و تێخوێندنەوە و، جەخت کردنە سەر ئەو چارەسەرییانەی، کە دەتوانرێت لە ڕێگایانەوە چارەسەریی گرفتی دروست بوو بکرێت، شارەزایی و کارزانیی سەرۆکی کارگێر دەردەکەوێت.

لە هەنگاوی دوەم دا دەبێت ڕەچاوی چەند گوزارشتێك بکرێت:

١) مەودای توانستی هەر چارەسەرییەك لە کۆتایی هێنان بە گرفتەکە.

٢) تێچوە داراییەکانی جێگرەوەکە دەیخوازێت

٣) ئەو ماوە کاتییەی جێگرەوەکە لە چارەسەر کردنی گرفتەکە دا دەیخایەنێت.

٤) توانا لەبارە مرۆیی و هونەرییەکانی جێگرەوەکە دەیخوازێت و، مەودای فەراهەم بوونیان.

٥) شوێنەوار و کاردانەوەیە پێشبینی کراوەکان، دوای پیادە کردنی جێگرەوەکە.

٦) مەودای بەدەنگەوە هاتنی کارکەران لە ڕێکخراوەی کارگێری بۆ جێگرەوەکە[٤٨٠]

## – قۆناغی سێیەم: دەستنیشان کردنی چاکترین چارەسەرییەکان و دیاری کردنی پلانی جێبەجێ کردن

ئەم قۆناغە بە وردترینی سەرجەم قۆناغەکان گوزارشت دەکرێت، چونکە دەستنیشان کردن لە ڕاستی دا مانای یەکلا کردنەوەی هەڵوێستەکە و گەیشتنە بە وێستگەی کۆتایی ڕەنجە دراوەکان لە قۆناغەکانی پێشوو، ئەمەش پێویستیی بە بڕێکی زۆر لە گورجی و کارزانی و، شارەزایی و توانستە خودییەکانی سەرۆکی کارگێری لە بەدەست هێنانی دەسنیشان کردنێکی ساغ هەیە.

دوای وەرگرتنی بڕیار دەبێت پلان یا بەرنامەی جێبەجێ کردنی دیاری بکرێن و شێوازی جێبەجێ کردنی و هەنگاوەکانی ڕوون بکرێنەوە[٤٨١]

لە ڕاستیش دا، چەندین فاکتەر هەن کاریگەری لە کرداری وەرگرتنی بڕیار دەکەن، لە میانەی قۆناغە جیاجیاکانی دا، ئەمانیش:

یەکەم: فاکتەرە دەروونی و کەسەکییەکان.

دوەم: کاتی کردنی وەرگرتنی بڕیار.

سێیەم: بەشدار کردن لە وەرگرتنی بڕیار.

## یەکەم: فاکتەرە دەروونی و کەسەکییەکان

ئەم فاکتەرانە لە پلەی یەکەم دا پەیوەستن بە سەرۆکی کارگێری لە ڕێکخراوە، هەروەك پەیوەستن بە کۆمەڵێك ڕاوێژکەر و یاریدەدەر و کارمەند، کە لە ئامادە کردن و تێخوێندنەوەی تایبەت بە بڕیارەکان پشکداریی لەگەڵ دا دەکەن.

---

[٤٨٠] عبد الغني بسيوني عبد الله: أصول علم الإدارة العامة، ص٢٩٨.

[٤٨١] عبد الغني بسيوني عبد الله: أصول علم الإدارة العامة، ص٢٩٨.

أ - **فاكتەرە دەروونییەكان:** چاكی بۆ پرۆفیسۆر "هاربەرت سایمۆن"ە لە زەق كردنەوەی گرنگیی لایەنە دەروونییەكان و شوێنەواریان لەسەر كرداری وەرگرتنی بڕیارەكان لە ڕێكخراوە كارگێرییەكان، كە لایەنی دەروونیی بە كۆنترۆڵی ڕەفتاری ئەو تاكە دانا، كە بڕیار وەردەگرێت لە كاتی وەرگرتنی بڕیار دا.

ئەم لایەنە دەروونییانەش بۆ دەرهاوێشتەی دەروونیی تر لای ئەو تاكەی، كە بڕیار وەردەگرێت و، بۆ دەورووبەرە دەروونییە پەیوەستەكە بەم و، كاریگەریی لە كرداری دەستنیشان كردنی بڕیار، لە نێو جێگرەوە خراوە ڕووەكان بۆی تەشەنە دەكات و، لە دوایش دا ڕۆڵی ڕێكخستنەكەیە لە پێك هێنانی ئەم دەورووبەرە دەروونییە و بڕی ئەو دەسەڵاتەی، كە پێی داوە.

ئەگەر كاریگەریی ئەم فاكتەرانە ئەرێنی بوون، ئەوا شێوازی ئەو كەسەی بڕیار وەردەرگرێت، دەبێت بگاتە ئاستێكی گەورەی ساخی و ژیری، بەڵام ئەگەر فاكتەرە دەروونییەكان كاریگەرییەكی نەرێنیان كرد لەسەری ئەوا مانای وایە، كە كەم و كوڕی و نەبوونی چەلەنگی دەبێتە مۆركی زۆرینە لەسەر بڕیارە دەرچووەكان[٤٨٢]

هەروەها، بارە دەروونی و ئەندامێتییە زاڵەكان لەسەر یاریدەدەران و هاریكاران لە كرداری بڕیار ساز كردن، بە جیاوازیی قۆناغەكانیشییەوە، گرنگییەكی گەورەی هەیە، بە تایبەتیش لەسەر ئەو ڕوون كراوە و زانیارییانەی، كە پێشكەشی دەكەن و، هەروەها سەبارەت بە بڕی ڕەنجە دراوەكان بۆ لێكۆڵینەوە لەم زانیارییانە و، پێشكەش كردنی جێگرەوەی لەبار بۆ چارەسەر كردنی گرفتە دانراوەكە بۆ تێخوێندنەوە[٤٨٣]

هەڵبەت ئەم بارە دەروونییانە لەدایكبووی فاكتەر و ڕەوش گەلێكی فرەن، وەك كەشی گشتیی باڵا دەست و، ڕێگەی مامەڵەی سەرۆكی كارگێری و، پاڵنەرە هاندەرەكان و وابەستەیی و هی تریش[٤٨٤]

---

[٤٨٢] عبد الغني بسيوني عبد الله: أصول علم الإدارة العامة، ص٣٠٠.

[٤٨٣] عبد الغني بسيوني عبد الله: أصول علم الإدارة العامة، ص٣٠٠.

[٤٨٤] عبد الغني بسيوني عبد الله: أصول علم الإدارة العامة، ص٣٠٠.

ب - **لایەنە کەسەکییەکان:** ئەگەر ئەدگارەکانی سەرکردەی کارگێر لای سەرۆکی کارگێر کۆبوەوە، مانای وایە، کە توانست و، دوور بینی و توانستی ئاوەزیی بۆ بڕیار دان بەسەر نیارەکان بە وردی و چاودێری، لا ڕەخساوە، هەروەك ئەگەر لە تەك ئەدگارە سەرکردایەتییە ناوبراوەکان، شارەزایی و کارزانی و ئەزموون لە لای سەرۆکی کارگێڕی دا هەبوون، ئەوا سوود لە ئەزموونی ڕابردوویی وەردەگرێت لە دوور خستنەوەی ئەو چارەسەرییانەی، کە پێشتر شکستیان هێنا، لە کۆتایی هێنان بە گرفتێکی هاوشێوەی گرفتی خراوە ڕوو بۆ توێژینەوە.

جا ئەگەر ڕەگەزەکانی پێشوو لە ئەدگارە سەرکردایەتییەکان و شارەزایی و ئەزموونی کەسێتی ڕەخسا، ئەوا مانای وایە، کە کەسێتیی سەرۆکی کارگێر ڕەگەزە بنەڕەتییە پێویستەکانی بۆ دەرکردنی بڕیارە درووستەکان، بۆ ڕەخساوە[٤٨٥]

## دووەم: کاتی کردنی وەرگرتنی بڕیار

فاکتەری کات گرنگییەکی تایبەت لە کرداری وەرگرتنی بڕیار دا دەنوێنێت، بۆ ئەم گرنگییەش لایەنی فرە هەیە.

لە لایەنێك کاتی کردن، ئاشکرا کردنی گرفتەکە و دیاری کردنی بە وردی، گرنگییەکی گەورە بۆ قۆناغەکانی بڕیار ساز کردن پێك دەهێنن، کە دەردەچن، چونکە خێرایی هەڵسوکەوت ڕووەو گرفتەکە و، ڕوون کردنەوەی ڕەهەندەکانی هەلێك بە تێخوێندنەوەیەکی لەسەرخۆ لە پێناو گەیشتن بە چارەسەریی گونجاو، دەدات.

هەروەها دیاری کردنی کاتی پێویست بۆ کۆ کردنەوەی ڕوون کردنەوە ئامارییەکان و زانیارییە پەیوەندیدارەکان بە گرفتەکە و، بەوەی پەیوەندیدارە بە دیاری کردنی چارەسەریی لەبار و ئەنجام دانی تێخوێندنەوەی تایبەت پێی، شتێکی پێویستە، بۆ ئەوەی کارەکە کاتێکی درێژتر لەوە نەخایەنێت، کە پێویستە، پێیەوە

---

[٤٨٥] عبد الغني بسيوني عبد الله: أصول علم الإدارة العامة، ص٣٠١.

گرفتەکە ئاڵۆزیی زیاتر بکات لە میانەی دا، لەگەڵ ئاماژە دان بەوەی، کە پەلە کردن لەمە دا دەبێتە هۆی کەموکوڕی و بێ هێزی لە زانیارییەکان.

لە لایەکی تریش، گرنگیی ڕەگەزی کات لە چارەسەر کردنی ئەو گرفتە بەپەلانە، کە ڕووبەڕوی ڕێکخراوەی کارگێری دەبنەوە، زۆرجار بڕیارە پەیوەندیدارەکان پێی لە ژێر فشاری ڕەوشەکان و ڕووداوەکان دەردەچن، دەردەکەوێت.

لێرە دا ڕۆلی سەرۆکی کارگێری سەرکەوتوو دێت، کە توانستی لە هەواڵداری هەبێت لە گرفت گەلێك، کە ڕەنگە پلانی کاری ڕێکخراوە دووچاری ببێتەوە، هەروەها توانست لە چارەسەر کردنی گرفتەکە بەخێرایی بەو کارزانی و پەی پێ بردنەی هەیەتی.

لە کۆتاییش دا، دوای وەرگرتنی بڕیار، پێویستە، کە ئەو سەرۆکە کارگێرییەی بڕیار وەردەگرێت کاتێکی شیاو بۆ ڕاگەیاندنی بڕیارەکە دەستنیشان بکات بەسەر کارکەران لە ڕێکخراوەی کارگێری و، بەتایبەتیش ئەو بڕیارانەی، کە بۆ گۆڕین یا هەموار کردنی بڕیارەکانی پێشوو دەردەچن، بۆ ئەوەی کارکەران لە ئامادەباشی دا بن بۆ ئەم هەموار کردنە یا گۆڕانە[٤٨٦]

## سێیەم: بەشدار کردن لە وەرگرتنی بڕیارەکان

ئەگەر سەرۆکە کارگێرەکان ئەو سەرۆکانە بوون، کە لە قۆناغی کۆتایی دا بڕیار وەردەگرن، ئەوا ئەم بڕیارانە لە ئەنجامی ڕەنجی هاوبەشی ژمارەیەکی زۆر لە پسپۆڕان و کارمەندان گوزارشت دەکرێت لە میانی قۆناغەکانی کرداری بڕیار ساز کردن.

لە ڕاستیش دا، ئەمانە لە خواستەکانی کرداری وەرگرتنی بڕیارن لە شێوە تەواوکارەکەی دا، هەروەك، بەشدار کردن لە وەرگرتنی بڕیار لە خواستەکانی دیموکراتییەتی کارگێری و سەرکردایەتییە.

---

[٤٨٦] عبد الغني بسيوني عبد الله: أصول علم الإدارة العامة، ص٣٠٢.

بۆ ئەم بەشدار کردنەش لە لایەنی کارمەندان چەندین چاکی و سوود هەن، لە لایەك بریتین لە هەست کردنیان بە گرنکییان لە ناوەوەی ڕێکخراوە دا، بەتیابەتیش دوای پیادە کردنی بڕیارەکان و سەرکەوتنیان لە کۆتایی هێنان بەو گرفتانەی، کە ڕێڕەوی ڕێکخراوە دووچاری بوەتەوە، لە لایەکی تر بەشدار کردنی چینی پسپۆڕان لە کارکەران لە ڕێکخراوە و لە کرداری بڕیار ساز کردن، مسۆگەریی جێبەجێ کردنیان بە شێوەیەکی ورد و ساخ پێك دەهێنێت، چونکە ئەمان بۆی بە پەرۆش دەبن و کار بۆ سەرکەوتنی پیادە کردنی دەکەن، ئەمەش دەبێتە هۆی بەرز بوونەوەی ڕادەی تەواوێتی لە کار کردن دا.

سوودی بەشدار کردن سەبارەت بەو بڕیارانەی، کە گۆڕانێك یا هەموار کردنێك لە پەیکەری ڕێکخستن، یا لە شێوەی کار کردن و وادەکانی دروست دەکەن، زەق دەبنەوە، چونکە لە ئەزموون دا سەلمێنراوە بەشدار کردنی کارکەران، لە کرداری ئامادە کردن و تێخوێندنەوەی ئەم بڕیارانە پێش وەرگرتنیان و ڕاگەیاندنیان، وایان لێ دەکات، کە بە هەمان ڕەزامەندی پەسەندی گۆڕانکاری تێ دا کردن و هەموار کردنی بکەن.

ڕوونیشە، کە ئەم چاکییانە پەیوەندیدارن بە شێوازی سەرەکی لە بەشدار کردن، واتا بەشدار کردنی کارکەران لە هەمان ڕێکخراوە لە کرداری بڕیار ساز کردن.

بەڵام بەشدار کردن لە وەرگرتنی بڕیارەکان لە لایەن جۆر گەلێکی تر دا دەبێت، بە پێی شێوازی پەیڕەو کراو لە دەرکردنی بڕیار، بەڵام مەودای ئەم بەشدار کردنە و چۆنایەتیی بەشدارکراوان دەوەستێتە سەر ئەو شێوازەی، کە لە وەرگرتنی بڕیار دا پەیڕەو دەکرێت[٤٨٧]

---

[٤٨٧] عبد الغني بسيوني عبد الله: أصول علم الإدارة العامة، ص٣٠٣.

# بەشی سێیەم

## سەرکردایەتیی کارگێری و وەرگرتنی بڕیارەکان لە سیستمی ئیسلامی دا

**بەرایی:**

کاتێك بەسەر کۆمەڵگەی مرۆیی دا بەسەرچوو، کە بۆ کۆمەڵگەیەك قەوارەیەك نەبوو، جگە لە قەوارەی تاکە خانەوادەیەك و، ڕەنگە خێڵێکیشی بگرتبایەوە، هەروەها باوك لە خانەوادەکە ، یا سەرۆکی خێڵەکە بە تەنها فەرماندەری کۆتایی و بێ ناکۆکی بوو.

کاتێك لە کۆمەڵگە دا پەرەسەندن ڕوویدا و، ولاتان بەدەرکەوتن، سەرجەم تایبەتمەندییەکانی دەسەڵات بۆ سەرۆکی وڵات گواسترایەوە، کە ئەمەی دواییان فەرمانڕەوای ڕەها بوو و، لە سایەی ئەم فەرمانڕەواییە ڕەهایە دا توێژی نزیکانی خانەدانەکان دەرکەوتن و، جگە لەمان خەڵکی ئاسایی و جەماوەر بوون و، کۆمەڵگە بۆ چینی لە ماف و سەربەرزی جیاواز دابەش بوو و، هیچ گوزارشتێك یا مافێك لەبەردەم دەسەڵاتی ڕەهای فەرمانڕەوا دا بۆ گەل نەبوو، تەنانەت یاساش نەبوو، ئەگەر هەبوویێتیش ئەوا لەمیانەی ئەم بڕیارە دەرچوانەی، کە لە ویستی ئەو فەرمانڕەوا ڕەهایە بوون بێ هیچ گوزارشتێك بۆ بەها تایبەتەکانی کۆمەڵایەتی یا بەرژەوەندییە مرۆییەکان، لەگەڵ جیاوازیی توێژ و چینەکانیشی لە ماف و گوزارشتە کەسەکییەکان.

ئەم چەمکەش بۆ سەرکردایەتی لە کۆن دا، لە کاتێکەوە بۆ کاتێکی تر گەلەکانی بۆ شەڕ کردن لە دژی سەرکردەکانیان دەوروژاند، هەر ئەوەش بوو، هانی فەیلەسووفەکانی دا لەم سەردەمانە لە هزر کردن لەوەی بگەن بە دانانی نموونەیەکی جوانی شار، بۆ ئەوەی سەرکردایەتیی کۆمەڵگە بیخاتە ئەستۆی، هەروەك ئەفلاتوون لە پڕۆژە جوانە مەدەنییەکەی دا کردی، ئەمیش بۆ ڕزگار کردنی مرۆڤ

لە تەنگوچەڵەمەکانی، سەرباری ئەو هەڵپەیەی، کە ئیمپراتۆرییەتە دواییەکانی پێش ئیسلام لەسەری بوون، وەك فارس و ڕۆم[٤٨٨]

لە سایەی ئەم چەمکانەی سەرکردایەتیش و، لە جیا کردنەوەی نێوانی توێژەکانی گەلەکان بە گوێرەی چین و نەژاد و ڕەگەزەکان و، لە سایەی ئەم نەزانییە گشتگرییە و ئاژاوانەی، کە لەبەر کەمترین هۆکار لە نێوان خێڵەکان لە ناوەوەی نیمچە دوورگەی عەرەبی دا هەڵ دەگیرسا، لەبەر تەنگیی ژیان و کەمیی سەرچاوەکانی دەرامەتەکان، کە وای لە هەندێك لە هۆزەکان کرد، زۆرێك لە لەدایکبوەکان لە کچان لە ترسی برسێتی و قاتی بوون و، هۆکاری تر لە هۆکارەکان زیندەبەچاڵ بکەن.

لە سایەی ئەم نەزانییە جیهانییەش دا، بانگەوازی جیهانیی پەیامبەری ئیسلام، موحەمەد ﷺ دەرکەوت.

پەیامبەری خوا ﷺ بە بانگەوازەکەیەوە ڕوەو دوورگەی عەرەبیی دابڕاو لە جیهان، بە بیابانیی و نەخوێندەواریی ڕۆلەکانی هات، کە بانگەوازێکی جیهانی بوو، گشت خەڵکیی بۆ بانگ کرد، پاشان لە مێژوو دا بۆ یەکەم جار بە ئاشکرا بۆ سەرجەم ڕۆلەکانی مرۆڤایەتی بانگەوازی یەکێتیی خانەوادەیی مرۆڤایەتی و یەکێتیی سەربەرزییان لای خوای شکۆمەند کرد، کە درووود و سەلامی خوای لەسەر بێ دەیفەرموو: (الخلق كلهم عيال الله، وأحبهم إليه أنفعهم لعياله)[٤٨٩]. واتا: (خەڵکی هەمویان کەس و کاری خوان، خۆشەویسترینیشیان لە لای بە کەڵکترینیانە بۆ کەس و کاری)

لە سایەی ئەم بانگەواز و بەها بەرز و تازانە، لەسەر ئەو کۆمەڵگە کۆنانە و، لە سایەی بانگەواز بۆ بڕوا هێنان بە خوای شکۆمەند، زۆری پێ نەچوو، ئیسلام ڕێسا ئیسلامییەکانی لەسەر چەمکی تازە دا دامەوزراند و چەسپاند.

---

[٤٨٨] محمد صابر البرديسي: القيادة الإدارية في الإسلام، سلسلة البحوث الإسلامية، مطبعة الأزهر، القاهرة، ١٤٠٩ه/ ١٩٨٩م، ص١٤.

[٤٨٩] رواه الطبراني في الكبير.

لەم سەرویەندە دا ئاماژە دەکەین بەوەی، کە سەرکردایەتی لە ئیسلام دا ڕەها نییە، بە بڕیارەکانی ڕێبازی ئیسلام و، بە بڕیارەکانی مافی مرۆڤ و ئازادییە بنەڕەتییەکانی، لە سەرجەم ئەو شتانەی، کە پەیوەستن بە مافەکانی مرۆڤ لە سیاسی و کەلتووری و ئابووری و کۆمەڵایەتییەوە، بەندە، ئەمەش بە فراوانتر لەوەی ئەمڕۆ جاڕنامەکانی مافی مرۆڤی جیهان ئاشنای بوونە.

ئەم سەرکردایەتییەش بەستراوەتەوە بە ئەرکی ئەو ڕاوێژەی، کە قورئانی پیرۆز سەپاندویەتی و، گرتنەبەری ڕێوشوێنی باش و بەرژەوەندیی تاك و کۆمەڵی کردوەتە ئەرك بە پێی خواستە ڕەوشی و کاتییەکان و، دەستنیشان کردنی ئەوەی پێی وایە چاکترە بۆ بەرژەوەندییە تێڕوانراوەکانی لە سەرجەم لقەکانی خودان تێکۆشانی لەبەرچاوگری کاتی ڕێبازی ئیسلام، بە کار کردن بەوەی پێشەوایانی ئیسلام لەبارەی تێکۆشان لەسەری کۆکن: "بەرژەوەندی لە کوێ بێت ڕێبازی خواش لەوێ دایە"، ئەمەش لەوەی نیگای بۆ دانەبەزیوە، یا پەیامبەری خوا درود و سەلامی خوای لەسەر بێت باسی نەکردبێت.

بۆیە سەرکردایەتیی ئیسلامی سەرکردایەتییەکی بەرپرسە لە بەردەم ڕێبازی ئیسلام، کە بۆ هەر کەسێك لەسایەی ئەم سەرکردایەتییە ئازادیی تەواو هەیە لە ڕەخنە و تێبینی، لەگەڵ مسۆگەریی دادوەریی ئیسلامی، ئەمەش شتێکی تازە بوو و، هیچ نەتەوەیەك بەر لە ئیسلام پێی نەزانی بوو.

سەرکردایەتی لە ئیسلام دا بەوە جیا دەکرێتەوە، کە سەرکردایەتییەکی گیانی و سیاسیشە لەیەك کات دا.

سەرکردە لە ئیسلام دا نموونەی وەك نموونەی باوکێکی میهرەبانە، چاودێریی خانەوادە و ڕۆڵەکانی دەکات و، بنەچەکانی سرەوتن و ئاسوودەییان بۆ دەستەبەر دەکات و، بە نەرمی و ئارامییەوە ڕابەرییان دەکات و، سامی لێ دەکەن و لێی ناترسن، کۆششی بۆ دەکەن و لێی جیا نابنەوە و، بەهێزە بێ توند و تیژی و بەزەییە بێ بێ هێزی [٤٩٠].

---

[٤٩٠] محمد صابر البرديسي: القيادة الإدارية في الإسلام، ص١٧.

ئیسلام دووپاتی سەرکردایەتی وەك پێویستییەکی کۆمەڵایەتی دەکاتەوە، لەم سۆنگەیەوەش پەیامبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: (لا يحل لثلاثة يكونون بفلاة من الأرض إلاّ أمّروا عليهم أحدهم)[٤٩١]. واتا: (ڕێنادرێت بە سێ کەس لە شوێنێکی زەوی دابن مەگەر یەکێکیان فەرمانیان بەسەر دا بکات). هەروەها ﷺ دەفەرموێت: (إذا خرج ثلاثة في سفر فليؤمروا أحدهم)[٤٩٢]. واتا: (ئەگەر سێ کەس بۆ گەشتێك دەرچوون با یەکێکیان فەرمانیان بەسەر دا بکات).

ئەم سەرکردایەتییەش شتێکی ئاسان نییە، بەڵکو چەند کۆڵەگەیەك هەن، دەبێت لەو کەسە دا بڕەخسێن، کە کارگێڕی دەگرێتە ئەستۆ و، کاربەدەستیش بە تەنیا بەرپرس نییە لە چاودێریی گەل، بەڵکو هەرکەسێك لە پێگەی خۆی دا بەرپرسێکە، ﷺ دەفەرموێت: (كلكم راع وكل راع مسؤول عن رعيته)[٤٩٣]. واتا: (هەر هەمووتان سەردەستەن و هەر سەردەستەیەکیش بەرپرسە لە ژێردەستەکەی).

پێویستە سەرکردە بڕێك ئامادەیی کاریگەریی کەسێتیی لەسەر چەند تاکێك دا هەبێت، کە توانستی پێ بدات لە ئاراستە کردنی ڕەفتاری ئەم تاکانە.

ئێستاش دوای ئەوەی لەم بەرابیە بوینەوە، وا باشە بچینە سەر باسی بابەتی سەرکردایەتی لە ئیسلام لە سێ توێژبەند دا:

توێژبەندی یەکەم: کۆڵەگەکانی سەرکردایەتی لە ئیسلام دا.

توێژبەندی دوەم: مەرجەکانی سەرکردایەتی لە ئیسلام دا.

توێژبەندی سێیەم: پێڕۆییەتیی سەرکردایەتی لە ئیسلام دا.

---

[٤٩١] رواه الإمام أحمد.

[٤٩٢] رواه أبو داود بإسناد حسن عن أبي هريرة رضي الله عنه.

[٤٩٣] عن أبي عمر أخرجه البخاري، جزء ٣ ص١٧٥.

# توێژبەندی یەکەم

## کۆڵەگەکانی سەرکردایەتی لە ئیسلام دا

### یەکەم: بڕوابوون

بڕوا بوون لە زمان دا پشت ڕاستکردنەوە و ئاسوودەیی و ئارامیی دڵە.

مرۆڤی بڕوا بەهێز ئەوەی بڕوای پـێ هێنـاوە لـە زەیـنی دا جـێگیر دەبێـت و، هەرگیز لە خۆی ناترسێت لەوەی شتێك بتکێتە زەینی پێچەوانەی پێویسـتییەکانی ئەم بڕوایەی بێت.

بەڵام مرۆڤی بڕوا بێ هێز، بڕوایەکەی لە زەینـی دا دەشـلەژێت و، ڕووداوەکـان کاریگەری لە بڕوای دەکەن، یا ورەی دادەبەزێنن و، لە کاتێکەوە بۆ کاتێکی تریش ڕووبەڕوی کەم و کوڕی دەبێت[494]

بڕواش سەبارەت بە سـەرکردە، بڕوایـە بـە سـەرکردایەتی بڵنـد و ئاسـوودەیی تەواوی و متمانە پێ بوونی تیێ دا و پەسەند کردنی، هەروەها بڕوای بـەو پێـڕۆ و ئامانج و ئاواتانەی، کە ئەم پێڕۆیە کۆششیان بۆ دەکات.

ئـەم بڕوایـەش بـە ڕوونتریـن ماناکـانی لـە هەڵوێسـتی پەیامبـەری خـوا ﷺ دەردەکەوێت، کاتێك بۆ تائیف ڕۆیشت و هەڵوێستی خراپی گـەورە شـارەزاکانیان، هەروەك هانی شێت و بەندەکانیان دا، کە بەرد بارانیان کـرد هـەتا خـوێن بـە دوو پاژنەکانی دادەتکا، پاشان چیشی لێ بەدەر نەکەوت درورد وسەلامی خوای لەسەر بێت ئەوە نەبێت بانگی پەروەردگەری کرد: (ئەگەر تۆ لێم تووڕەنەبیت من قەینا).

نموونە بڕواییەکانی پەیامبەر ﷺ زۆرن، بـەهێزترین کاریگـەرییان لـە دەروونـی بڕواداران دا هەبوو و، لە بڕوا بە پەیامەکەی و وەستانیان لەگەڵی لە بانگەوازەکەی و، قوربانی دان بە گیان و ماڵ لە پێناوی خوا دا.

---

[494] محمد صابر البرديسي: القيادة الإدارية في الإسلام، ص١٤٥.

بەمەش مەودای کاریگەریی بڕوامان بۆ دەردەکەوێت، بەوەی بڕوای سەرکردە بە سەرکردایەتی و بەرنامەکەی، چۆن لە کۆڵەگە بنەڕەتییەکانی سەرکردەی کارگێڕن و بۆ سەرکردایەتی ئامادەی دەکەن، هەروەها بڕوای بە بەها و ئامانجەکانی ئەو کۆمەڵگەیەی، کە تێی دا دەژێت و، ئەو ڕێکخراوە یا کۆمەڵەی، کە واباستەیەتی و سەرکردایەتیی دەگرێتە ئەستۆ و، بڕوا و متمانەیی بە هەریەك لە سەرۆك و کارمەندان و بە خۆی هەبێت.

## دووەم: زانست

زانست مانای دەستکەوتنی زانینگەرایی و زانیارییەکان و ئەو شارەزایی و کارامەیی و توانستانەی مرۆڤن، کە وای لێ دەکەن لە ژیانی دەوروبەری خۆی بگات و، سوود لە توانا ڕەخساوە کەرەستەیی و مرۆییەکان وەربگرێت و، وەبەریان بهێنێت و بەو شێوەی خۆشی و بەختەوەری بۆ خۆی و کۆمەڵگەکەی تێ دایە، ئاراستەیان بکات[٤٩٥].

زانست بۆ سەرکەوتنی سەرکردەی کارگێر و، بۆ توانینی پیادە کردنی بەرپرسیارییە سەرکردایەتییەکەی، پێویستە، سەرکردە چۆن بتوانێت سەرکردایەتیی کەسانی تر لە تاکەکانی کۆمەڵەکەی بکات، لە کاتێك دا خۆی نەزان بێت چەکی زانستی هەڵ نەگرت بێت؟

مەبەست لە زانستیش، زانستێکی بەکەڵکی سوودمەندە، نەك تەنها خوێندنەوە و نووسین، بەڵکو تەگبیری کاروبارەکان و تێگەیشتنی ڕووداوەکان، هەروەها هەڵوەستە کردن سەر ڕاستەقینەی ئەو کۆمەڵگەیەی، کە دەورەی داوە و ڕێنموونیی حەق، هەموو ئەمانە لە زانستی کەڵکدارن.

[٤٩٥] محمد صابر البرديسي: القيادة الإدارية في الإسلام، ص١٤٨.

هەڵبەت ئیسلام مکوڕە لەسەر دووپات کردنەوەی گرنگیی زانست، وەك کۆڵەگەیەك لە کۆڵەگەکانی سەرکردایەتی، کەوا ئەرکە لە سەرکردەی کارگێر دا، ڕەخساو بن.

لەم سۆنگەیەوە پەیامبەر ﷺ دەفەرموێت: (من سلك طريقاً يلتمس فيه علماً سهّل الله له طريقاً إلى الجنة)[٤٩٦]. واتا: "هەر کەسێك ڕێگەیەك بۆ بەدەست هێنانی هێنانی زانست بگرێتەبەر، خوا ڕێگەیەکی بەهەشتی بۆ ئاسان دەکات"، هەروەها درووود و سەلامی خوای لەسەر بێت دەفەرموێت: (طلب العلم فريضة على كل مسلم و مسلمة). واتا: "داوا کردنی زانست لەسەر هەر پیاو و ژنێکی مووسوڵمان، سەپاوە" و، (من خرج في طلب العلم فهو في سبيل الله حتى يرجع)[٤٩٧] واتا: "هەرکەسێك بۆ داواکردنی زانست دەربچێت ئەوا لە پێناوی خوایە هەتا دەگەڕێتەوە"

دەتوانین بڵێین، کە زانست وەك کۆڵەگەیەکی سەرکردایەتی، دەستکەوتێکە و بەردەوامی پێدەری گەشە پێدانی سەرکردەی کارگێرە لەو زانینگەرایی و زانیاری و کارامەیی و ئاراستە گشتی و تایبەتییانەی، کە یارمەتیی دەدەن لە هەڵستانی بە بەرپرسیاریی سەرکردایەتییەکەی بە لێهاتوویی و لێوەشاوەیی.

## سێیەم: پاراوی

پاراوی ڕوونی و ڕەوانییە و، ئەگەر پیاوێك ئەوەی لە ویژدانیەتی پاراوی کرد، ئەوا ڕوونی دەکاتەوە.

پاراوی بەهرەیەکە وا لەخاوەنەکەی دەکات، کە باش مەبەستەکەی بە سادە و ئاسانی گوزارشت بکات.

پاراوی لە گرنگترینی ئەو کۆڵەگانەیە، کە پێویستە لە سەرکردە دا بڕەخسێت، بۆ ئەوەی تەواو بۆ سەرکردایەتیی کارگێری، ئامادە بێت، چونکە پێیەوە کارمەند

---

[٤٩٦] صحيح مسلم – كتاب العلم.
[٤٩٧] رواه الترمذي – كتاب العلم.

قایل دەبێت و، چەندەی سەرکردە پاراو بێت و دەربڕینی باش بێت، هێندەش سەرکردایەتییەکەی سانا بەدەست دێت.

هەڵبەت پەیامبەری خوا ﷺ نموونەی بەرزی پاراوی و دەربڕین بوو، چونکە کارەکەی ﷺ لەسەر ڕوون کردنەوە بۆ خەڵکی و ڕوون کردنەوەی ئەو پەیامەی، کە بۆی هاتوە دامەزراوە.

بەڵام کاتێك سەرکردە هەستی بە کەموکوڕی لە بەهرەیەك لە بەهرەکان، یا توانستێك لە توانستەکان یا کۆڵەگەیەك لە کۆڵەگەکان کرد و، لەکاتی پێویست، لەم توانست و کۆڵەگەیە دا بۆی هەیە لە ڕێگەی پەنا بردنەبەر هاریکاران یا ڕاوێژکارانی یا یاریدەدەرە گورج و زیرەکەکانی تەواوی بکات، ئەگەر لە دڵسۆزان بوون، ئەوەتا موسا سڵاوی خوای لەسەر بێت، داوای لە خوای پاك و بڵند کرد، کە بە هاروونی برای پشتگیری و پاڵپشتیی بکات، کە زمانی لەم پاراوتر بوو، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَأَخِي هَارُونُ هُوَ أَفْصَحُ مِنِّي لِساً فَأَرْسِلْهُ مَعِي رِدْءًا يُصَدِّقُنِي إِنِّي أَخَافُ أَن يُكَذِّبُونِ﴾[٤٩٨]. واتا: "هاروونی براشم زمانی لەمن پاراوترە، جا لەگەڵم دا بینێرە بۆ پشت ڕاستکردنەوەم، دەترسم بەدرۆم بخەنەوە".

کەواتە پاراوی و توانست لە دەربڕین دا لە گرنگترین کۆڵەگەکانی سەرکردایەتیی کارگێڕین لە ئیسلام دا، بۆ ڕەخساندنی سەرکردایەتییەکی کارگێڕیی چەلەنگ.

## چارەم: ئاکاری جوان

ئاکاری جوان کۆمەڵێك لە ڕەفتاری جوانن، کە لە خوارسك دا یا خوی چاك و ستایشگەری کاران، لە ڕەسەنی مرۆڤ دا هەن، بە گۆڕانی ڕەوشەکان ناگۆڕێن و، ئاکار بە دەستکەوت گەشە دەسێنێت، هەروەك خودان ئاکاری جوان، ئاکارە جوانەکانی زیاد دەبێت بە دانیشتنی لەگەڵ خودان ئاکارە جوانەکان.

---

[٤٩٨] سورة القصص: الآية ٣٤.

پەیامبەری خوا ﷺ لەسەر خوارسکی ئاکاری جوان پێ گەیشت، هەڵبەت چاکترینی جوامێرەکان و چاکترین خوی هەبوو، تەنانەت بەر لە پەیامدار کردنیش دروود و سەلامی خوای لەسەر بێت، چونکە خوای پاك و بڵند ئامادەی کرد بوو بۆ سەرکردایەتیی کردنی خەڵکی، کە چاوگێك بوو بۆ هەموو ئاکارێکی سەربەرزانە.

ئەم ئاکارەش لە گرنگترینی ئەو پاڵنەر و کۆڵەگە بنەڕەتییانەن، کە وای لە پەیامبەری خوا ﷺ کرد، ئامادە بێت بۆ سەرکردایەتیی مرۆڤایەتی و، سەرکردایەتییەکەی نموونەیەکی چاو لێکراو بێت تا ڕۆژی دوایی.

قورئانی پیرۆزیش باس دەکات و، بۆمان ڕوون دەکاتەوە، کە ئاکاری جوان بە هاندەرێك و کۆڵەگەیەکی بنەڕەتیی سەرکردایەتی لە ئیسلام گوزارشت دەکرێت، هەروەك خوای گەورە بە پەیامبەرەکەی ﷺ دەفەرموێت: ﴿وَلَوْ كُنتَ فَظًّا غَلِيظَ الْقَلْبِ لاَنفَضُّواْ مِنْ حَوْلِكَ﴾[٤٩٩]. واتا: "ئەگەر تووڕە و دڵڕەق بایت، لە دەورت دا پەرتەیان دەکرد"، هەروەها دەفەرموێت: ﴿وَمَا أَنتَ عَلَيْهِم بِجَبَّارٍ﴾[٥٠٠]. واتا: "تۆ زۆردارنیت بەسەریان دا"

دەتوانین لەوەی پێشکەشمان کرد پوختی بکەین، کە ئاکاری جوان، وەك کۆڵەگەیەکی سەرکردایەتیی کارگێری لە ئیسلام دا، مانای نەبوونی بێ مانایییە لە ئاخاوتن، یا کردەوە لە مامەڵەی سەرکردە لەگەڵ کارمەندەکەی و، سەرجەم ئەدگارە ستایشییەکان دەگرێتەوە.

## پێنجەم: وابەستەیی

مەبەست لە وابەستەیی، وابەستەیی زمانەوانی و کۆمەڵایەتی و هزری و باوەڕییە و، لە ئیسلام دا بایەخێکی گەورە بە وابەستەیی هزری و باوەڕی دەبینین، چونکە ئایین بە تۆکمەترین پەیوەستی لە پەیوەستییەکان دادەنرێت، کە

---

[٤٩٩] سورة آل عمران: الآية ١٥٩.

[٥٠٠] سورة ق: الآية ٤٥.

پەیوەستییەکە هەستی مرۆڤ دەبزوێنێت و ئاوەزی ئاراستە دەکات و بەسەر هەڵسوکەوتەکانی دا زاڵ دەبێت.

پەیوەستیی ئایینی لەهەر ئایینێك دا بنچینەی سەرکەوتن و رزگارییەکانە، ئەوەتا جەنگە خاچییەکان و گردبوونەوەی کریستینییەکان لە دژایەتیی کردنی ئیسلام، لەسەر جیاوازیی زمان و جیاوازیی خوێن و هەرێم و هەڵپە سیاسییەکان و هی تر شتێك نەبوون، مەگەر بۆ گەواهی دان لەسەر هێزی باوەڕی ئایینی لە بەستنەوەی کۆمەڵایەتی و یەکخستنەوەی سەرکردایەتی.

ئیسلامیش بە تایبەتمەندییە چاکەکانی و باوەڕە چەسپاو بڕوا بەتینەکەی، پتەوترین ئایینە لە چاو ئایینەکانی تر لە پتەو کردنی پەیوەستیی کۆمەڵایەتی و، بەدەست هێنانی ئامانجی سەرکردایەتی و بەستنەوەی خەڵکی بە تەنها یەك لیوادا.

هەڵبەت پەیامبەری خوا ﷺ یەکەم ئیشی لە ساتەکانی جێگیر بوونی لە مەدینە دانانی ئەو پاڵپشتییانە بوو، کە دەبوایە هەبن بۆ بنیات نانی وڵاتی ئیسلامی و، مەشخەڵەکانیشی لەمانەی خوارەوە دا ڕوون دەبنەوە:

١) پەیوەستیی گەل بە خوا.
٢) پەیوەستیی گەل بە یەکتری.
٣) پەیوەستیی گەل بە ئەوانەی پەیڕەویی ئایینی گەل ناکەن.

هەواداریی هزری و باوەڕیش لە ئیسلام دا لەسەر بڕوا هێنان بە خوا و پەیامبەرەکەی و پەرتووکەکەی دامەزراوە.

هەواداریی ڕاستەقینە ئەوەیە، کە پشت بەستوە بە بڕوا بوون بە خوا و بە باوەڕێکی ساغ.

ئیسلام لە ڕێگەی برایەتیی مرۆڤایەتی، خەڵکیی کۆ کردوەتەوە بە گرتنەخۆی سەرجەم خەڵکی لە ژێر یەك بەیداخ و، ئاگادار کردنیان لەوەی ڕوی یەك شتن، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿يَا أَيُّهَا النَّاسُ إِنَّا خَلَقْنَاكُم مِّن ذَكَرٍ وَأُنثَى وَجَعَلْنَاكُمْ شُعُوبًا وَقَبَائِلَ لِتَعَارَفُوا إِنَّ أَكْرَمَكُمْ عِندَ اللَّهِ أَتْقَاكُمْ﴾[٥٠١]. واتا: "خەڵکینە ئێمە لە

---

[٥٠١] سورة الحجرات: الآية ١٣.

نێر و مێ بەدیمان هێناون و کردوومانن بە گەلّ و خێلّ گەلێك بۆ ئەوەی یەکتر بناسن، بێگومان ڕێزدارترینتان لە خواترسترین (خۆپارێزترین)تانە".

ئیسلام بانگەوازی خۆی بە زمانی عەرەبی ڕاگەیاند، مووسوڵمانانی ناچار کرد، کە بە پەرتووکی خوا و سوونەتی پەیامبەرکەی ﷺ ئاشنا بن و، جوانیی ئەم زانیارییەش بەدەست نایەت، مەگەر بە فێر بوونی زمانی قورئان، ئەمەش دووپاتی پەیوەست بوونی نێوان ئەندامانی کۆمەڵگەی مرۆڤایەتی دەکاتەوە.

گومانیش لەوە دا نییە، کە واباستەیی زیاتر سەرکردە و سەرکردایەتی پەسەند دەکات و، سەرکردە زۆر بە توانست دەکات لە سەرکردایەتی کردن، چونکە سەرکردەی واباستە زۆر باشتر لە هەستی کۆمەڵەکەی دەگات و، زۆرتر توانای هەڵسەنگاندن و تێگەیشتنی هەیە بۆ نەریت و شتە باوەکانی و، بە توانسترینە لە سۆزداری و مامەڵە کردن لەگەڵیان دا و، زۆر بە میهر و ئارامگرترە لە یەکێکی تر بەسەریان دا.

## شەشەم: جوامێری

مەبەستمان لە جوامێری نێرینەیی و پێگەیشتوییە، واتا پێگەیشتنی تەواوی هێزی ئاوەزی لە تەمەنی چل ساڵی دا.

جوامێری لە ئیسلام دا بە یەکێك لەو کۆڵەگە بنەڕەتییانە گوزارشت دەکرێت، کە ئەرکە لەو کەسە دا بڕەخسێت، بۆ ئەوەی ئامادەباش بێت بۆ سەرکردایەتیی کارگێری.

گەیشتن بە تەمەنی چلیش یا نزیك بوونەوە لێی سەبارەت بە سەرکردە بە تەمەنێکی چاك گوزارشت دەکرێت[٥٠٢]

جوامێری بە مانای نێرینەیی، وەك کۆڵەگەیەکی سەرکردایەتی، کە پێویستە لە سەرکردەی کارگێر لە ئیسلام دا بڕەخسێت، ڕێسایەکی بنەڕەتییە نابێت لێی

---

[٥٠٢] محمد صابر البرديسي: القيادة الإدارية في الإسلام، ص١٦٩.

لابدرێت، مەگەر لە ڕەوشێکی هەڵاوێردن، ژنی زۆر ئامادەباش بۆ سەرکردایەتیی کارگێری لەم بوارە دا هەبێت.

ئافرەت دەتوانێت هەندێك پایەی سەرکردایەتی لە ڕەوش گەلێکی هەڵاوێردنی دا، کە پاساوی ئیسلامانەی هەبێت، بگرێتە ئەستۆ، وەك سەرکردایەتی کردنی ژن لە بواری فێر کردنی ئافرەتان و، وەك سەرکردایەتی ژن لە مەیدانی چاودێریی تەندروستیی منداڵان و ئافرەتان و، هی تریش لە بوارە تایبەتەکان بە کاری ئافرەتان.

پێشەوایان لە بابەتی ژن لە لایەن گەلێك دا جیا ڕان، ڕێبازی ئیسلامیش هێندەی ماف و بەشی ئافرەتی داوە، کە لە کەس ون نییە و، زانایان دووپاتی دەکەنەوە پەیامبەری خوا ﷺ ڕاوێژی بە ژن کردوە، کە ئاماژەی بە شتێك دەکرد و دەیگرتەبەر، کاتێك گەیشتینە ئەوەی، کە ئافرەت مافەکانی لە کارگێڕی و ڕاسپاردن پێ درایە، دەبینین نووسەرەکان ڕای جیاوازیان هەیە، ئەوانەی دەڵێن مافی نییە لەم بوارانە، بیر لە ئەوە ناکەنەوە، کە ئافرەتە هاوەڵی پەیامبەر درود و سەلامی خوای لەسەر بێت، سەمرائی کچی نوحەیکی ئەسەدیی بەرپرسیاریی (لێپێچینەوە)ی لە شاری مەکە لە سەردەمی پەیامبەر درود و سەلامی خوای لەسەر بێت وەرگرت و، قامچییەکی هەبوو بە توندی بە کاری دەهێنا بۆ ساختەچییان، هەروەها بیر لەوەش ناکەنەوە، کە سەرکردەی کارگێر عومەری کوڕی خەتاب خوا لێی ڕازی بێت، شیفائی کچی سلیمانی کردە بەرپرسیاری بازاڕی مەدینە.[٥٠٣]،

لێرە دا دەبینین، کە بنەماکە لە جوامێری دایە، بەڵام ئەمە لە سەرکردایەتیی ژن بە هەڵاوێردن ڕێگر نییە، ئەگەر کۆڵەگەکانی تری تێ دا ڕەخسا.

---

[٥٠٣] ظافر القاسمي: نظام الحكم في الشريعة والتاريخ الإسلامي، الكتاب الثاني – السلطة القضائية، دار النفائس- ١٤٠٣هـ/ ١٩٨٣م، طبعة ثانية، ص٢٤٩.

# توێژبەندی دووەم

## مەرجەکانی سەرکردایەتی لە ئیسلام

ئەم مەرجانەش ڕاستەوخۆ پەیوەندیدارن بە خودی سەرکردە، بەلآم ئەمانە هەمووی بە مەرجێك دادەنرێن بۆ سەرکردایەتیی ئیسلامی، ئەمانیش:

### یەکەم: دەستنیشان کردن

واتا دەستنیشان کردنی سەرکردەیە بۆ کەسێك یا کەسانێك، کە لە ژێر فەرمانڕەوایەتییەکەی دا کار دەکەن و، دەستنیشان کردنیش دەبێت لەسەر جیاکاری و تایبەتمەندی لە توانست یا کارامەیی یا بەهرە دا بنیات نراو بێت، ئەو کەسەی، کە دەستنیشان دەکرێت لە برایەکانی تری پێی جیا بکرێتەوە.

دەستنیشان کردن، یا هەڵبژاردن ڕێسایەکە لەو ڕێسایانەی، کە مەردووم بۆ گرتنە ئەستۆی سەرکردایەتی لە ئیسلام ئامادە دەکەن، بەلآم خۆ یەکلا کردنەوەی مەردووم بۆ گرتنە ئەستۆی سەرکردایەتی، ئەوا لەوانە نییە، کە لەگەڵ ڕێبازی ئیسلام دا کۆکە، کە داوا لە گشتی خەڵکی دەکات، لە پاکانەی خۆ کردن دوور بکەونەوە، هەروەك خوای پاك و بێگەرد دەفەرموێت: ﴿أَلَمْ تَرَ إِلَى الَّذِينَ يُزَكُّونَ أَنفُسَهُمْ بَلِ اللَّهُ يُزَكِّي مَن يَشَاءُ﴾[٥٠٤]. واتا: "ئایا سەیری ئەوانە ناکەیت، پاکانەی خۆیان دەکەن، بەڵکو هەر کەس خوا بیەوێت پاکی دەکات"، پاکانەی مەردووم بۆ خۆی و، مکوڕ بوونی لەسەر گرتنە دەستی پایەی سەرکردایەتی و مانەوە لەسەری، لە ڕێبازی ئیسلام دا نییە، ئەگەر بۆی ڕانەسپێردرێت و، خۆی توانستی خۆی دڵنیا بکات، ئەو کاتە پەسەندی بکات و بە تێکۆشانەوە کار بکات لەسەر بەرگە گرتنی بەرپرسیاری و ئاکامەکانی.

---

[٥٠٤] سورة النساء: الآية ٤٩.

## دووەم: ئامادە کردن

ئامادە کردنی سەرکردەکان لە ئیسلام دا بە سوونەتێکی چەسپاو گوزارشت دەکرێت، ئەوەتا پەیامبەر ﷺ بە تەواوی ئامادەکارییەوە ئامادە کرا بوو بۆ هەڵستان بە پەیامەکە.

کرداری ئامادە کردن لە بێژکەوە تا کۆتایی بەردەوام دەبێت، کە کردارێکی بەردەوامە، ئەم بەردەوامییەش پێویستە بۆ بەردەوامی سەرکەوتنی سەکردەی کارگێر، هەرچەندە کردەی سەرکردە مەزنتر و گشتگر تر بێت، پێداویست بۆ ئامادە کردن زیاتر و پێویست تر دەبێت. دەستنیشان کردن و، مەشق پێ کردنیان لەسەر کردەی سەرکردایەتی لە ناوەوەی کۆمەڵگەی ئیسلامی و، بەر لە ڕاگەیاندنی ئەو بنەمایانەی، کە کۆمەڵ پەیڕەوییان دەکات، ئەو بنەمایە بنەڕەتییانە بوون، کە پەیامبەر ﷺ لە خانووی ئەرقەم بڕیاری لەسەریان دا، هەروەك پەیامبەری خۆشەویست ﷺ ئەو کەسانەی دەستنیشان دەکرد، کە ئامادەییان هەبوو بۆ بەدەنگەوە هاتنی بانگەواز.

یەکەم کەسانێکیش، کە پەیامبەر ﷺ دەسنیشانی کردن، نزیکترین خەڵکی بوو لەماڵی و دۆستانی، هەروەك خەدیجە خوا لێی ڕازی بێت و زەیدی کوڕی سابیت و، عەلیی کوڕی ئەبی تالیب و، دۆستە نزیکەکەی ئەبو بەکری سدیق و وەرەقەی کوڕی نەوفەل بڕوایان هێنا. ئەم قۆناغەش ڕۆڵێکی نهێنیی گرتەبەر بۆ ئەوەی ئامادە کردنی سەرکردایەتی تەواو بێت و دوور لە ڕاکێشیی ئەو کۆمەڵگەیەی، کە هەمیشە فشاری دەخستە سەر بنەماکان لە سەرەتاوە بۆ ئەوەی لەناو بچێت، بۆیەش پەیامبەری خۆشەویست ﷺ سەرەتا کەسەکانی دەستنیشان دەکرد، پاشان دوور لە فشاری کۆمەڵایەتی ئامادەی دەکردن تا بنەماکانی ئیسلام خۆیان خزاندە ناو کۆمەڵگە، وەك ڕووناکییەك تاریکی لەناو ببات[٥٠٥].

---

[٥٠٥] محمد صابر البرديسي: القيادة الإدارية في الإسلام، ص١٨٥.

ئاستی پەروەردەی سەرکردە لە ئیسلام پێش هەموو شتێك ئاستێکی ویژدانییە، کە پاڵێوراوی سەرکردایەتی بە بەرگە گرتنی بەرپرسیارییەکانی سەرکردە پەسەند دەکات، ئەگەر چی بەهای ئەمە دەست بەرداربوونیش بێت لە کەس و کار و دارایی و نیشتیمان.

ئاستێکی تریش هەیە، ئەویش ئامادە کردنی هزرییە، ئەوەتا پەیامبەر ﷺ نیگای بە خەڵك گەیاند و، بە خوارسك بە توانسترین خەڵك بوون لە تێگەیەشتنی شێوازی قورئان و، ئاوەزیان لە ڕوی تێگەیشتنەوە پاك و فراوان و قووڵ لە پەی پێ بردن.

هەڵبەت ئامادە کردن، دانایی خواوەند پێویستی کردوە، بۆیە دەست بەرداربوونی ئامادە کردن وەك مەرجێکی بنەڕەتی لە سەرکردەی کارگێری لە ئیسلام دا، نییە.

## سێیەم: پێڕۆ

بەرنامە ئەو ڕێگەیەیە، کە کاروبارەکان ڕوون دەکاتەوە و، دەگات بە ئاواتی خواستراو[٥٠٦].

دەبێت بەرنامەکە درووست و ساغ و شیاو بێت بۆ ڕەوشی کار کردن و، ئەو کۆمەڵەیەی، کە هەڵدەستێت بە جێبەجێ کردنی، هەروەها لەگەڵ هەل و مەرجەکان دا بگونجێت و ملکەچی ئەندێشە نەبێت.

ئیسلام بە پێڕۆیەکی ڕوونیش جیا دەکرێتەوە، کە لە ڕاستی دا لەبارە و، لەگەڵ سروشت دەسازێت و، بەدەنگ گۆڕانکارییەکان دەچێت.

ئیسلام دوا وێنەی ئایینی خوایە و، دوا سەرچاوەیە لە سەرکردایەتی کردنی مرۆڤایەتی و، بۆ بەرنامەی ژیانی خەڵکی و، سیستمی ژیانیان هاتوە، کە پێڕۆیەکی گونجاوە بۆ هەر کات و شوێنێك.

---

[٥٠٦] محمد صابر البرديسي: القيادة الإدارية في الإسلام، ص١٨٨

پاشان هەر جیاوازییەکی نێوان خەڵکی و هەر کاروبارێك لە کاروبارەکانی ئایینیان یا دونیایان، بۆ پێڕۆی خوا لە پەرتووك و سونەتی پەیامبەرەکەی دەگەڕێتەوە، ئەوەتا دەفەرموێت: ﴿فَإِن تَنَازَعْتُمْ فِي شَيْءٍ فَرُدُّوهُ إِلَى اللَّهِ وَالرَّسُولِ إِن كُنتُمْ تُؤْمِنُونَ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الآخِرِ ذَٰلِكَ خَيْرٌ وَأَحْسَنُ تَأْوِيلاً﴾[٥٠٧]. واتا: "ئەگەر لە شتێك دا ناکۆکیتان بوو، ئەوا بۆ خوا و پەیامبەرەکەی بگەڕێننەوە(پشتی پێ ببەستن) ئەگەر ئێوە بڕواتان بە خوا و ڕۆژی دوایی هەیە ئەمە باشترین و چاکترین لێك دانەوەیە"

لێرە دا دەبینین، کە بەها بۆ ڕای پیاوێك نییە ئەگەر پێشینەیەکی نەبێت لە پشت بەستن بە پێڕۆی خوای شکۆمەند.

بە گوێرەی ئەوەی پێشکەش کرا ڕوون دەبێتەوە، کە پێڕۆیی بە یەکێك لەو پاڵپشتییە بنەڕەتییانە گوزارشت دەکرێت، کە سەرکردایەتیی ئیسلامیی لەسەر دادەمەزرێت.

پێڕۆی ئیسلامی، کە بانگەوازی ئیسلامیی پێ هاتوە بە بەرنامەی ڕابەری سەرجەم پێڕۆیەکان گوزارشت دەکرێت، کە پێڕۆیەکە ڕێز لە ئاوەزی مرۆڤ و سەربەرزیی کۆمەڵ دەگرێت و، بنەچە گەلێکی چەسپاوی هەن، لەم بنەچانەش:

أ- **متمانە**: واتا متمانەی سەرکردە بەخۆی و، متمانەی کۆمەڵ پێی، جا متمانەی سەرکردە بە خۆی لەو پێوەرە نەمرە دا دەردەکەوێت، کە ئاستی بەرزی لە دەروون بەرزی و لە متمانە بە خوای پێ وێنە دەکرێت، ئەمیش لە پەیامبەر ﷺ ڕوی داوە کاتێك ئەبو تالیبی مامی پێ گوت: "ئەی کوڕی برام، نەتەوەکەت هاتوون بۆلام، کە واو وا دەڵێن، جا خۆت و منیش لەناو مەبە، شتێکم مەخە سەرشان کە لە توانام دا نەبێت"، پەیامبەری خوا ﷺ وای هەست کرد، کە دەست بەرداری بوە و بەدەستەوەی داوە و، لە سەرخستنی و چەسپانی دا بێ هێز بوە ، جا پەیامبەری خواش ﷺ فەرموی: (واللە یا عم، لو وضعوا الشمس في يميني و القمر في يساري

---

[٥٠٧] سورة النساء: الآية ٥٩.

على أن أترك هذا الأمر، حتى يظهره الله أو أهلك فيه ما تركتـه)[٥٠٨] واتا: (مامە سوێند بەخوا، ئەگەر خۆر لە ڕاستەم و مانگیش لە چەپەم دابنـێن بـۆ واز هێنـانم لەمە، هەتا خوا سەری دەخات یا پێی تیا دەچم وازی لێناهێنم).

ئەو کەشەی، کە ئەم گوزارشتە پیرۆزییەی تێ دا گوترا، کەشـێکی تاریـك بـوو، هێزێکی گەورە، کە هەوڵی لەناوبردنیان دەدا، تێی دا کۆبوو بوونەوە، تەنانەت زۆر بە ئاسانی وای هەست کرد، کە مامی دەست بەرداری بوە و بۆ دوژمنـەکانی لێـی گەڕاوە، هەروەك کەسایەتیی سەکردە موحەمەد ﷺ دەرکەوت، تاکە و بێ وێنەیـە، لە گوزارشتەکانی وەڵامێکی پێ بە مامی دایەوە پێوەرێکی نەمر بوو، کـە وێنـای ئاستی بڵندی لە متمانە بە خوا و بە خۆدی پێ دەکرێت.

سەبارەت بە متمانەی کۆمەڵگەش بـە سـەرکردە، ئـەوا پەیامبـەری ڕێـز دار، خەڵکی لە کۆمەڵگەکەی دا سەرجەمیان کۆك بوون لەسەر بە ناو و بانگ کردنی بە ڕازگر، پێمان وا نییە، کە ئەم پرسە درێژە پێدانی بوێ، چونکە یەکەم شت پرسێکی زانراوە و پێویستی بە دووبارە کردنەوە نییە.

ب- **دیاری کردنی ئامانج:** هەڵبەت پەیامبەر ﷺ ئامـانجی بانگەوازەکـەی بە ڕوونییەکی تەواوەوە دیاری کرد و، هیچ گومانێکی نەهێشـتەوە و، ڕووبـەڕووی هەر هەوڵێك بوەوە، ویستی لادان بوایە لەم بانگەوازە.

هەڵبەت پەیامبەر ﷺ لە کۆنگرەیەکی خانەوادەیی دا خەڵکی کۆ کردەوە و پێی فەرموون: (والله الذي لا إلـه إلاّ هـو، إنـي رسـول الله إلـيكم خاصـة، وإلى النـاس عـامة، والله لتموتن كما تنامون، ولتبعثن كما تستيقظون، ولتحاسبن بما تعملـون، وإنها لجنة أبداً أو لنار أبداً)[٥٠٩]. واتا: "سوێند بەو خوایەی، کە خواوەنـدێك جگـە لەم نییە، من پەیامبەری خوام بۆ لای ئێوە بە تایبەت و، بۆ خەڵکی بە گشـتی و، سوێند بەخوا دەمرن هەروەك دەنوون و، زیندووش دەبنەوە هەروەك بە ئاگادێنـەوە،

---

[٥٠٨] سيرة ابن هشام: جزء أول، ص٢٦٦.

[٥٠٩] ابن الأثير: الكامل في التاريخ، جزء ٢، ص٦١.

لێپرسینەوەشتان لەگەڵ دا دەکرێت لەسەر ئەوەی دەیکەن، ئەویش یا بەهەشتە بۆ هەمیشە یا ئاگرە بۆ هەمیشە"

پەیامبەر ﷺ ڕوونی کردوەتەوە، کە ئەم پەیامبەری خوایە بۆ گشت خەڵکی، پاشان بۆ بڕوا هێنان بە خوا و پەیامبەرەکەی و زیندوو بوونەوە و لێپێچینەوە و بەهەشت و ئاگر، بانگەوازی کرد.

ئەمە ئەو ئامانجە بوو، کە پێویست بوو پەیامبەر ﷺ ڕوونی بکاتەوە، ئەمەش ئەو پێڕۆیە ساغ و، ڕێگە دروستە بوو، کە سروشتی بانگەواز ڕوون دەکاتەوە.

ج- **ئاشنا بوونی سروشتی کۆمەڵگە**: بۆ ئەوەی سەرکردە سەرکەوتوو بێت لە سەرکردایەتییەکەی بۆ ئەو کۆمەڵگەیەی، کە سەرکردایەتیی دەگرێتە ئەستۆ، پێویستە و دەبێت ئاشنای سروشتی ئەم کۆمەڵگە و داب و نەریتی و، جۆری کەلتوورەکەیان بێت.

لێرە دا ڕۆڵی پێڕۆی ئیسلامی لە کار کردن لەگەڵ کۆمەڵ، بە شێوەیەکی گشتگرتر و فراوانتر زەق دەبێتەوە، چونکە لە چەمکەکەیەوە ئاشنا بوونی کۆمەڵگە وەردەگیردرێت.

هەڵبەت پەیامبەر ﷺ ئاشنای سروشتی ئەو کۆمەڵگەیە بوو، کە بانگەوازی ئیسلامیی ئاراستە کرد، ئەویش بە شێوازی پیادە کردن و بەشدار بوون تێی دا.

پەیامبەر ﷺ لەگەڵ ئەو کۆمەڵگەیە دا ژیاوە، کە بانگەوازی بۆ دەگواستەوە، ژیانێك، کە لە ناخی کەلتوورەکەی دا بە تەواوی شارەزا بوو بوو و بێ ئەوەی لە ناوی دا نقوم بێت، بێ تێکەڵ بوونی ڕەفتاری ئەم کۆمەڵگەیە، بەڵکو ژیانێکی جوان ژیاوە لە کۆمەڵگەکەی و وازیشی لە جگە لەم ژیانە هێنا بوو.

هەڵبەت پیادەیەکی تەواوی لە لایەنی بەرزیی کەلتووری کۆمەڵگەکەی لا بوو و، قەڵابەندییەکی خورسکیشی هەبوو، هەروەك لە شتێك نزیك نەدەبوو، کە لەگەڵ ئەو سروشت و خوەی کۆك نەبێت بۆ بوونی بە ترسێنەری جیهانیان.

هەڵبەت پەیامبەر ﷺ لەگەڵ ژیانە جوانەکەی دا ئەرینی بوو و، لەگەڵ ڕەوشتە جوانەکان و کاروبارە مەزنەکان دا بەشداری دەکرد و، بە خواڕسکیش لەگەڵ ئەو

ژیانەی، کە لەگەڵ سروشتەکەی دا کۆك نەبوو، نەرینی بوو، لە ڕیسوایی دوور دەکەوتەوە و، دوور بوو لە هاوبەش دانان و بت بەرستی و هەر خراپەیەکی مرۆییش.

پەیامبەر ﷺ نەیارانیشی گەواهییان بۆ دەدا لەلای خەڵکی بە تەواوی و تایبەتمەندی بەرزی و پاکی، ئەوەتا ئەبو جەهل گوتویەتی: "سوێند بەخوا موحەمەد ڕاستگۆیە و، موحەمەد هەرگیز درۆی نەکردوە"[٥١٠]

**چ - ڕەفتاری هاوتای بنەماکان:** لە بنەماکانی ئیسلام چاوپۆشی و لێبوردەیی لە خراپی و وەڵام دانەوەیان بەوەی باشترینە و، لێبوردەیی لە نا بێ هێزی.

پەیامبەریش ﷺ ئەمەی بە کردەنی پیادە کردوە و، ڕەفتاری لەگەڵ دوژمنانی بانگەواز، لەم ڕەوشتە بەرزانە گەواهیی بۆ دەدەن، هەروەك کاتێك عوتبەی کوڕی ڕەبیعە ئاشتەوایی خستە بەردەم و، داوای لێ کرد واز بهێنێت لەوەی بانگەوازی بۆ دەکات و، عوتبە پێی وت: "ئەی پیاو ئەگەر پێداویستیت هەیە ئەوا بۆت کۆدەکەینەوە هەتاکو دەبیتە زەنگینترین پیاوی قورەیش و، ئەگەر ئارەزووت لە هەر ئافرەتێکی قورەیش هەیە بە ئارەزوی خۆت دەیانکەین بە خێزانت" و، دوای ئەوەی عوتبەی کوڕی وەلید لە وتەکانی بوەوە، پەیامبەری خوا ﷺ پێی فەرموو: (تەواو ئەی ئەبا وەلید؟)

بەم ڕەوشتە جوانە و بەکارهێنانی نازناو لە ئاخاوتنی عوتبەی کوڕی ڕەبیعەی کوڕی عەبد شمس و، بە بانگێکی لەسەرەخۆ، پەیامبەری خوا ﷺ بۆ عوتبە دەدوێت بە وەڵام دانەوەی دوای ماوەیەکی زۆر لە دوان، لە ئاخاوتنێك، کە بەخشندەی دەخرۆشاند و، ئازادی تووڕە دەکرد.

وەڵام دانەوەی پەیامبەریش ﷺ بە هێمنی و لەسەرخۆیی ڕاگەیەنەری ئەوەن، کە بنەمای کار کردن لەگەڵ کۆمەڵە لە تێڕوانینی ئیسلام دا، هاوتا بوونی ڕەفتاری

---

[٥١٠] الواحدي: أسباب النزول، ص٢١١.

سەرکردەیە لەگەڵ ئەو بنەمایانەی، کە بانگـەوازی بـۆ دەکـات، بنەمایـە بـاش و بەرزەکانی ئیسلام، لێرە دا بوو.

دوای ئـەوە پێـی فـەرموو، گـوێم لـێ بگـرە، پاشـان قورئـانی لـە سـورەتی "فوصیلەت" خوێندەوە هەتا گەیشتە فەرمایشتی خوا گەورە: ﴿فَإِنْ أَعْرَضُوا فَقُلْ أَنذَرْتُكُمْ صَاعِقَةً مِّثْلَ صَاعِقَةِ عَادٍ وَثَمُودَ﴾[511]. واتا: "(جـا) ئەگـەر بەرهەڵسـتیان کردیـت بڵـێ بـە سـزایەکی سـەخت وەکـو سـزای عـاد و سـەموود ئاگادارتـان دەکەمەوە".

جا عوتبە دەمی پەیامبەری ﷺ گرت لە ترسـی دابـەزینی بـەڵا، کـە دەیزانـی موحەمەد ڕاستگۆیە و، بۆ لای نەتەوەکەی گەڕایەوە پێی گوتن: "هەڵبەت دەزانن، کە ئەو هەرگیز درۆ ناکات، جا بزانن لە دابەزاندنی سزای بەسەرتان دا ترسام، بۆیە گوێڕایەلیم بکەن و لێی گەڕێن".

ئەو وەڵامەی پەیامبەر ﷺ بۆ عوتبە بەم وەڵام دانـەوە جوانـە، گەواهیـدانێکی جوانە، گوزارشت لەسەر ئەوە دەکات، کە ئیسلام هیچـی بـۆ مرۆڤایـەتی ناوێـت، مەگەر چاکەیەك بەختەوەری و دڵنیایی و سەربەرزیی بۆ بەدەست بهێنێت.

ئەو لێبوردەیی و لەسەرخۆییە بۆ یەکەم جـار نـەبوو، بـەڵکو ئەمـە پێڕۆیـەکی ئیسلامیی هەمیشەییە و بەردەوامە.

دەشگێڕنەوە، کە پەیامبـەری خـوا ﷺ، لـە ڕۆژی ئوحـود ددانـی شـکا و ڕوی پیرۆزی بریندار بوو، ئەمە کاریگەریی لـە هـاوەڵانی کـرد، گوتیـان: ئەگـەر داوای خوایان بەسەر دا بکەیت، جا ﷺ فەرموی: (إني لم أبعث لعاناً، ولكن بعثت داعياً ورحمة، اللهم اهد قومي فإنهم لا يعلمون)[512]. واتـا: (مـن بـۆ نـەفرەت کـردن نەنێردراوم، بەڵکو وەك بانگەوازکەرێك و میهرێـك نـاردراوم، ئـەی پەروەردەگـەرم ڕێنوێنی نەتەوەکەم بکە، چونکە نازانن).

---

[511] سورة فصلت: الآية ١٣.
[512] الشفاء: جزء ١، ص١٤٠.

هەڵبەت بانگەوازی موحەممەد ﷺ بۆ نەتەوەکەی میهر بوو و، چاوپۆشیی لە سووکایەتییەکانیان دەکرد، چاکەی لەگەڵ دەکردن، ئەوەش ڕەفتارێکە هاوتای بەرنامەی زانستیی ئیسلامییە، کە پەیامبەری خوای ڕاسپارد بەو سەرکردایەتییەی بەرپرسیاریی کاری لەگەڵ دا هەڵ دەگرت، کە لە دوایەوە بەیداخ هەڵدەگرێت بۆ بوون بە پێشەنگێکی چاك لە ڕەفتاری لەگەڵ خەڵکی دا.

هەڵبەت پەیامبەری خوا ﷺ نموونەیەك و سەرمەشقێك بوو بۆ پیادە کردنی بنەماکانی بانگەواز بە ڕەفتار و، سەرکردەکانی مووسوڵمانانی لەسەر ئەم بنەمایە پەروەردە دەکرد، هەڵبەت ڕاستیی ئەوەشی، کە پەیامبەر ﷺ بۆ مووسوڵمانانی کردە نموونەی بەرز. مووسوڵمان مرۆڤێکە بە سوودەکانی بۆ تەواوی خەڵکی دەچێت، نەك مرۆڤێکی تەنگ و داخراو بێت لەسەر خۆی.

بێگومان موحەممەد ﷺ بە تەنها ئەو کەسە بوو، کە بۆ ئاسۆیەکی فراوان لە مەزنێتی بەرز دەبوەوە، بە تەنهاش ئەو سەرمەشقە چاکە بوو، کە هەموو خەڵك و بانگخوازان لە هەر سەردەمێك و هەر کاتێك دەیکەنە سەرمەشق، لێرە دا ئەو کەسەی بیر لە سەرکردایەتی بەسەر گەلی ئیسلام دا دەکاتەوە، لەسەریەتی پەیامبەری خوا ﷺ بکات بە سەرمەشق: ﴿لَقَدْ كَانَ لَكُمْ فِي رَسُولِ اللَّهِ أُسْوَةٌ حَسَنَةٌ﴾[٥١٣] واتا: "هەڵبەت لە پەیامبەری خواوە بۆ ئێوە سەرمەشقییەکی چاك هەیە".

لە جوانترین بەسەرهاتەکانی ﷺ دوای ئەوەی نیگای بۆ دەهات، فەرمانی بە شوێنکەوتە و هاوەڵانی نە دەکرد مەگەر خۆی لە پێشیان دا کاری پێ بکرد بوایە.

بەمجۆرە پەیامبەری خوا ﷺ بەمە ڕێسایەکی لە ڕێساکانی پێڕۆیەکی کردەنیی لەگەڵ کۆمەڵ دیاری کرد، ئەویش یەکێتیی ڕەفتار لەگەڵ ئەو بنەمایانەی، کە سەرکردە بانگەوازی بۆ دەکات، هەروەك سەرکردە دەبێت پێشەنگێکی چاکی کەسانی تر بێت، بە هزر و ڕەفتاریش، هەروەها لە ڕووی هزریشەوە دەبێت زانا بێت بە سەرجەم وردەکارییەکانی کار و، بۆ ئەوەی پێشەنگیش بێت لە ڕەفتاری دا،

---

[٥١٣] سورة الأحزاب: الآية ٢١.

پێویستە زانایەکی دانا و ئارامگرێکی لەسەرەخۆ بێت و، بەدەم پێداویستانیان بچێت و، بایەخ بە کاروباریان بدات و، بە سۆز بێت بۆیان و، لێیان بپرسێت، نەك ڕووگرژ بێت و لێیان ڕابکات، بەڵکو ڕاستگۆ و ڕازگر و دادگەر بێت و بە پشی بێت.

هەرواش پەیامبەر ﷺ لە ڕاستی دا ئەدگارەکانی سەرکردایەتیی تێ دا کۆ بوو بووەوە، هەروەك پەیامبەر ﷺ گوێگرێکی باشی ئەو کەسە بوو، کە قسەی دەکرد و، ڕوی لە هیچ کەسێك وەرنەدەگێڕا و، وازی لە گوێ گرتن نەدەهێنا هەتا قسەی بکرد بوایە، بەڵکو بە هەموو هەستەکانییەوە ڕوی تێ دەکرد و، قسەی کەمی دەکرد زۆر گوێگر بوو و، کە هەوەسی گوتەی باشی دەبوو، جگە لە حەقی نەدەگوت، تەنانەت گاڵتە کردنیشی ڕاستی بوو، پیرە ژنێك داوای لێ کرد، کە خوا بەهەشتی پێ ببەخشێت، جا پێی فەرمووی: (إن الجنە لا یدخلها عجوز). واتا: (بەهەشت پیری ناچێتێ)، جا بە گریانەوە ڕۆیشت، فەرمووی، هێمن و ئاسوودە بە، چونکە خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿إِنَّا أَنشَأْنَاهُنَّ إِنشَاءً (٣٥) فَجَعَلْنَاهُنَّ أَبْكَارًا (٣٦) عُرُبًا أَتْرَابًا﴾[٥١٤]. واتا: "سەر لەنوێ دروستمان کردونەتەوە{٣٥} کردومانن بە پاکیزە {٣٦} بەناز و شەنگ، جا پیرەژنەکە پێکەنی و مژدەبەخش بوو.

پەیامبەری خوا ﷺ لەسەرەخۆ بوو تووڕە نەدەبوو، ئەگەر تووڕەش بوایە تووڕەییەکەی دەرنەدەکەوت، مەگەر گرژیی دەماری نێوان برۆکانی، هەر کەسێك چاوی بە پەیامبەر بکەوت بوایە، سامی لێ دەکرد[٥١٥].

هەروەها پەیامبەر ﷺ پێشەنگێکیش بوو بۆ ئەو سەرکردانەی، کە لە دوایەوە دێن.

هەروەك ئەبوبەکری سدیق خوا لێی ڕازی بێت یەکەم کەس بوو لە هاوەڵانی، کە بڕوای پێ هێنا، پابەندی پەیامبەر ﷺ بوو و بە ئاکاری ئەم ئاکاری دەکرد و، چاکەی خۆش دەویست و بەسۆز بوو بۆ خەڵکی و بۆ چاکی و باشی سەرکردایەتیی

---

[٥١٤] سورة الواقعة: الآيات ٣٥، ٣٦، و٣٧. ومعنى عرباً أترابا: محبات إلى أزواجهن.

[٥١٥] محمد صابر البرديسي: القيادة الإدارية في الإسلام، ص٢٠٨.

گەلی کرد.

پاشان لە دوایەوە سەرکردە عومەری کوڕی خەتاب خوا لێی ڕازی بێت هات، کە هەڵستا بە کاروباری سەرکردایەتیی مووسوڵمانان لە باشترین ڕوو دا، بەوەی لە کەسایەتییەکەی ناسراوە و، ئەوەی پێی دەناسرێتەوە لە بەجەرگی و هێمنی، بەخۆی بە دوای باری ژێردەستەی دا دەچوو، ستەم لێ کراوی سەردەخست و بەزەیی بە بێ هێز دا دەهات و، بە پێداویستانی دەبەخشی، خەڵکی سامیان لە کەسایەتییەکەی دەکرد و لەبەر دادگەری خۆشیان دەویست.

پاشان عوسمانی کوڕی عەفان خوا لێی ڕازی بێت جێی سەرکردایەتییەکەی گرتەوە، کە پیرێکی خۆپارێز و لەخوا ترس بوو، هەروەك بینراوە بە لێزمە دەیبەخشی، لێخۆش بوو و دڵ فراوان بوو بۆ خەڵکی، ئەوانەی بە ماڵی دارایی هەڵدەستان پێی کاریگەر بوو بوون، کە دیگوت: "عومەر بۆ خوا دەیگرتەوە و، منیش بۆ خوا دەیبەخشم"، لێرە دا عومەری بە گیرەوە تاوانبار نەدەکر و، خۆیشی بە زێدەڕۆ تاوانبار نەدەکرد.

بەمجۆرە دەبینین، کە ئەدگاری سەرکردەیەك بۆ سەرکردەیەکی تر جیاوازە، ڕەنگە ئەدگارە خودییەکان بەسەر ئەدگارە دەستکەوتوەکان زاڵ بن و، بە پێچەوانەوەش، کەسێتیی سەرکردە پێك دێت و، هەریەك لە چارچێوەی هەڵسەنگاندنی نیارەکان دەبێت، لە بڕوای تەواوی بە دروستیی کار و ساخیی هەڵس و کەوتییەوە، شتێك لەبەرچاو ناگرێت، مەگەر خوا و، شتێکیشی نەدەکرد مەگەر باوەڕی بە دروستی و ساغییەکەی هەبوایە و کۆك بوایە لەگەڵ پێرۆی خوا[٥١٦].

د- **تەوەر و گفتوگۆ:** لەسەر سەرکردەیە، کە دڵی خۆی لە بەردەم کارکەران لەگەڵی دا بکاتەوە و، بێ گفتوگۆ یا ڕا وەرگرتن فەرمانیان بۆ نەنێرێت و، فەرمانیان بەسەر دا نەسەپێنێت، بەڵکو دەبێت لە هەندێك لەو کاروبارانەی، کە ڕوون نین یا ئەگەری زیاتر لە ڕوەکیان هەیە، بیخاتە بەر تەوەر و گفتوگۆی پشت بەستوو بە قایل کردنێکی چاك.

---

[٥١٦] محمد صابر البرديسي: القيادة الإدارية في الإسلام، ص٢٠٩.

سەرکردەی سەرکەوتوو کاتێکی بۆ کۆبوونەوە بەو کارکەرانەی، کە لەگەڵی دا کار دەکەن، تەرخان دەکات، لەو کاروبارانەی، کە پێی وایە پەیوەندیی بە کار و کارکەران هەیە، تاوتوێیان دەکات، لایان دادەنیشێت و گوێیان لێ دەگرێت و، گوێی لێ دەگرن، لە تەوەرەیەکی کراوە دا گفتوگۆیان دەکات و، لەسەر ڕایەخی تەبایی دادەنیشن و، سەرجەمیان بە دوای چارەسەرییەکی نموونەیی و باشترین ڕا دەگەڕێن بێ سەرنج دانە خاوەنەکەی، هەروەك دانایی ئەو شتەیە، کە بڕوادار بە دوای دا دەگەڕێت، لە هەر شوێنێك دەستی بکەوێت داوای دەکات.

هەروەها سەرکردە ڕایەکی دیاری کراو ناسەپێنێت و، چاردەوری خۆی دووچاری ترس ناکات و، گفتوگۆی بۆ مشتومڕ یا دەمەقاڵە ناگۆڕێت، چونکە ئەمە بۆ ڕادان خراپە و بەفیڕۆدەری ڕاستییە و، ڕای ئازاد دوور دەخاتەوە[٥١٧]

ئەو سەرکردەی ئەم ئەدگارانەی تێ دا دەرەخسێت مافی گوێڕایەڵیی لە لایەن کۆمەڵ هەیە، چونکە ئەو هەموو چاودێرییەکی، کە سەرکردایەتی پێویستی پێ هەیە، ڕەچاوی کردوە بۆ کارکەران و، هەر کەسێکیش بەو شێوەیە بێت، پێویستە گوێڕایەڵی بکرێت، هەرکەسێکیش پابەندی گوێڕایەڵییەکەی بێت مافی چاودێری کردنی هەیە، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ أَطِيعُواْ اللّهَ وَأَطِيعُواْ الرَّسُولَ وَأُوْلِي الأَمْرِ مِنكُمْ﴾[٥١٨]. واتا: " بڕوادارینە گوێڕایەڵیی خوا و گوێڕایەڵیی پەیامبەر و ئەو کاربەدەستانە بکەن، کە لە خۆتانن".

پەیامبەر ﷺ دەفەرموێت: (من فارق الجماعة قدر شبر، فقد خلع رقبة الإسلام من عنقه)[٥١٩]. واتا: "کەسێك بە ئەندازەی بستێك لە کۆمەڵ جیا ببێتەوە، ئەوە ئیسلامی لە ملی خۆی لادایە".

**٥ – ئارامگری و بەرگە گرتنی سەختییەکان:** هەر کۆمەڵگەیەکی تازە بۆ پیادە کردنی پێڕۆیەکەی پێداویستی بە ئارامییەکی زۆر و، بەرگە گرتنی ئەوەی

---

[٥١٧] محمد صابر البرديسي: القيادة الإدارية في الإسلام، ص٢١٠.

[٥١٨] سورة النساء: الآية ٥٩.

[٥١٩] رواه البخاري ومسلم.

سەرکردە لە درز تێکەوتن و دژواری ڕووبەڕوی دەبێتەوە لە ئەنجامی ئەو گۆڕانکارییانەی، کە سەرکردە لە کۆمەڵگە دا دەینێتەوە، هەیە.

بۆ ئەوەی ئامانجەکان زەق بن و بهێنە دی و، پێڕۆکە پیادە بکرێت، دەبێت کەشێکی سروشتی بوونی هەبێت، ئەمەش بەدەست نایەت مەگەر لەگەڵ کاتێك بە تێکۆشان و ڕووبەڕوو بوونەوە و بەرگە گرتن دا ڕەت بێت.

خوای پاك و بڵند تاقی کردنەوەی بۆ سەرکردەکانی لە ڕووی مەشق و پەروەردەوە داناوە بۆ دڵسۆز کردنیان لە گوێڕایەڵی و پاك کردنەوەیان لە هەموو گومانێك، دوای ئەم تاقی کرنەوانە سەرکەوتنیان لە کار دا بەدەست دێت و، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿الم (١) أَحَسِبَ النَّاسُ أَن يُتْرَكُوا أَن يَقُولُوا آمَنَّا وَهُمْ لَا يُفْتَنُونَ (٢) وَلَقَدْ فَتَنَّا الَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ فَلَيَعْلَمَنَّ اللَّهُ الَّذِينَ صَدَقُوا وَلَيَعْلَمَنَّ الْكَاذِبِينَ﴾[٥٢٠] واتا: "ئەلیف لام میم(تا ئێستا تەنها خوا بەم پیتانە زانایە) {١}ئایا خەڵکی وا دەزانن ئەگەر بڵێن بڕوامان هێنا، وازیان لێ دەهێنرێت و تووشی نەهامەتی نابن {٢} هەڵبەت ئەوانی بەر لەوانمان تووشی نەهامەتی کرد، هەروەك خوا ڕاستگۆکان دەناسێت و درۆزنەکانیش دەناسێت"

قوتابخانەی پەیامبەر سەرکردایەتیی لەسەر نموونەییترین ئاست پەروەدە دەکات، کە لە گشت هەوەسێك و چەپەڵییەك دووری دەکات بۆ دڵسۆزیی دەروون بۆ خوای پەروەردەگەری جیهانیان، ئەم پەروەردەیەش لەگەڵ ئاراستەی قورئانی ڕێ دەکات: ﴿فَاصْبِرْ كَمَا صَبَرَ أُولُوا الْعَزْمِ مِنَ الرُّسُلِ وَلَا تَسْتَعْجِل لَّهُمْ﴾[٥٢١]. واتا: "جا ئارامگربە هەروەك وربەرزان(ألو العزم) لە پەیامبەران ئارامیان گرت و پەلەیان لێ مەکە".

کەواتە لەسەر سەرکردەکانە، کە پابەند بن بە ئارام گرتن و ڕازی بوون و بڕوا بوون بە سەرکەوتنی خوا

---

[٥٢٠] سورة العنكبوت: الآيات ١ و ٢ و ٣.

[٥٢١] سورة الأحقاف: الآية ٣٥.

ێ - **پشتگیری**: پشتگیریی سەرکردەی بڵند بۆ سەرکردایەتییە کارگێڕییەکان و، سەرکردایەتییەکانی تری خواروو، بەو پاڵپشتییە بنەڕەتییە گوزارشت دەکرێت، کە بۆ سەرکەوتنی ئەم سەرکردایەتییانە، دەستبەردار بوون لە ڕەخساندنیان دا، نییە.

سەرکردەی کارگێڕیی بڵند ئەو سەرکردایەتییانە دەستنیشان دەکات و بۆ سەرکردایەتییەکانی خواروو ئامادەیان دەکات، هەر ئەویش بۆ گرتنە دەستی بەرپرسیارییە سەرکردایەتییەکان ئامادەیان دەکات و، هەر ئەویش بۆ هەر یەکێکیان ئامانج و پسپۆڕی ئاواتەکانیان دیاری دەکات و، هەر ئەویش ئەم سەرکردایەتییانە بە دەسەڵاتی پێویست سەرپشك دەکات بۆ دەستبەکار بوون لەم پسپۆڕییانە و بەدەست هێنانی ئەم ئامانج و ئاواتانە.

لە ڕۆشنایی ئەمەوە، بۆ هیچ سەرکردەیەك نییە، ئەگەر لێهاتوویی لە سەرکردایەتی دا هەرچەندێکیش بێت، لە سەرکردایەتییەکەی سەرکەوتوو بێت مەگەر پشتگیریی لە سەرکردەی کارگێڕیی بڵندەوە هەبێت[٥٢٢]

پێداویستی سەرکردەی کارگێڕ بە پشتگیری و هاریکاریی سەرکردەی بڵند پێویست و گرنگە لە میانەی ئەو ماوەیەی، کە کردە تازەکەی سەرکردایەتی دەگرێتە دەست، وەك ئەوەی سەرکردەی کارگێڕ لە میانەی سەرکردایەتییەکەی بۆ هەر کۆمەڵێك لە کۆمەڵەکان ڕووبەڕوی زۆرترین ئاستەنگی و بەربەست دەبێتەوە، ئەوەشە کە بەندە بە پێداویست بوون بە هاریکاری و پشتگیری سەرکردەکەی سەروی لەم ماوە تەنگە دا و، سەرکردایەتی بۆ نابێت مەگەر بەم پشتگیرییەی سەرکردەکەی سەروی.

پشتگیری هەمیشە پاڵپشتییەکە لەو پاڵپشتی و پایە بنەڕەتییانەی، کە سەرکردایەتیی کارگێڕیی ئیسلامی لەسەر دامەزراوە.

ئەگەر پێڕۆی فەرمانڕەواییمان بە ڕێنموونیی ئیسلام وەرگرت و، بە پێوانە کردن بە سوونەتی خوای شکۆمەند و، دەستنیشان کردن و ئامادە کردنی بۆ ئەو

---

[٥٢٢] محمد صابر البرديسي: القيادة الإدارية في الإسلام، ص٢٢٢.

سەرکردە مەزنانە لە هەواڵبەران و پەیامبەران، دەبینین، کە پشتگیریی خوای شکۆمەند هەمیشە سونەتێکی چەسپاو بوە بۆ ئەم سەرکردانە لە لایەن خوای شکۆمەند[٥٢٣]

ئەمەش مانای نەرینیی سەرکردە و پەنا پێ گرتنی نییە، بەڵکو لەسەر سەرکردەیە، کە ئارام بگرێت و تێبکۆشێت و ئەوپەڕی تێکۆشان و وزە و دەسەڵاتەکانی وەربگرێت لە مامەڵەی لەگەڵ ئەو هەڵوێستانەی، کە ڕووبەڕووی دەبنەوە، ئەگەر کارێکی لا ئەستەم بوو، پەنا دەباتەبەر کەسی لێپرسراو بۆ پشتگیری و یارمەتی دانی.

بۆ ئێمە لە پەیامبەرەوە ﷺ سەرمەشقییەکی چاك هەیە، کە ئەو و هاوەڵانی هەوڵە مرۆییەکانی خۆیان بەگەڕ خست تا ئەوەی لە توانایان دا بوو لە ڕەنج دان، بە پیاو و ئافرەت و، لە هەموو بوارەکان، لە کاری جەستەیی و هزری و، لە بنیات نان و پلان دانان لەسەر ئەو مەودا دوورەی، کە مرۆڤ لە جیهانەکەی دا بەدەستی دەهێنێت، هەتا کاتێك زەوی بە ڕوویان دا تەنگ بوو، دوژمن لە سەروو و لە خوارویانەوە بۆیان هات و، دڵەکان گەیشتنە قورگ، سەرکەوتنی خواوەند لە ناوەندی کارەساتەکانەوە و یارمەتیی پەروەردەگەر لە ناو جەنگ دا هات: ﴿حَتَّى إِذَا اسْتَيْأَسَ الرُّسُلُ وَظَنُّواْ أَنَّهُمْ قَدْ كُذِبُواْ جَاءهُمْ نَصْرُنَا فَنُجِّيَ مَن نَّشَاء وَلاَ يُرَدُّ بَأْسُنَا عَنِ الْقَوْمِ الْمُجْرِمِينَ﴾[٥٢٤]. واتا: "تەنانەت پەیامبەران بێ ئومێد بوون و وایان گومان برد، کە ڕەنگە درۆ بکەن، سەرکەوتنمان هات، جا ئەوەی ویستمان ڕزگارمان کرد چەرمەسەریمان بۆ تاوانکەران گەڕانەوەی بۆ نییە"

پشگیری سونەتێك و پاڵپشتییەکی بنەڕەتیی سەرکردایەتییە لە ئیسلام، پەیامبەر ﷺ دەفەرموێت: (إني رسول الله، ولست أعصيه و هو ناصري)[٥٢٥]. واتا: (من پەیامبەری خوام و، لە یاخی بوانی نیم و، هەر ئەویش سەرم دەخات).

---

[٥٢٣] محمد صابر البرديسي: القيادة الإدارية في الإسلام، ص٢٢٣.

[٥٢٤] سورة يوسف: الآية ١١٠.

[٥٢٥] صحيح البخاري: جزء ٢، ص١٢٢.

هـ- **ئازادی:** ئیسلام هەمیشە گەورەترین یارمەتی بوە بۆ ئازادیی مرۆڤایەتی و شارستانییەتەکەی و، هەر ئەویشە ‌مۆمی زانست و زانینگەرایی داگیرساندوە و، هزری ڕاستی و ناوەڕۆکی ڕاستگۆیی بۆ ئازادی و دادگەری و یەکسانی پێشکەش بە مرۆڤایەتی کردوە و، مرۆڤی فێری خۆشەویستیی برا و پێکەوە ژیان کردوە.

ئازادی و هەستی خەڵکی بەوەی، کە بە توانستن لە دەستنیشان کردن، لەو فاکتەرانەن، کە ڕەنگە لێیانەوە گۆڕان ڕوەو چاکتریان لێ بەرهەم بێت، هەروەك ژیانی خەڵکی ئەوەی بەخۆیەوە بینیوە، کە بەندەکان هیچیان لێ بەرهەم نایەت، بەڵکو ئەوانە بێ هێزن بۆ فەرمانڕەوایی و پابەندن بە گوێڕایەڵیی سەرکردە و، هوتافی بۆ دەکەن و قایلی دەکەن و، بارمتەی ئاماژەکەین، بەڵام لەکاتی یەکەم تاقی کردنەوە دا بەجێی دێڵن و دەستبەرداری دەبن.

ئازادی ڕێگەیەکی بنەڕەتی و بەرهەم هێنان و کار و دەرباز بوونە لە کۆسپەکان و، کەسی هەڕەشە لێکراو لە ئازادییەکەی، ناتوانێت کارێکی چاك پێشکەش بکات و، ناتوانێت بگاتە سنوورێکی تەواو لە بەجێهێنانی ئەرك، چونکە لەدەستدەری ئازادی وا هەست دەکات، ژیانی هەڕەشە لێ کراوە و، لە دردۆنگی دا دەژی، بەرهەم هێنانیش لە دردۆنگی و ئاشوب دا نابێت.

ئازادیی کەسێتی و ئازادیی ڕا دەربڕین دوو بنەچەن لە بنیات نانی نەتەوە لە ڕوی کۆمەڵایەتی و ئابووری و سیاسی و، لە دابین کردنی ژیانی بەختەوەری و سەربەرزانە.

هەڵبەت ئیسلام لەسەر چەند بنەچەیەکی لێبوردەیی و جوان دامەزراوە، زۆری پێنەچوو، کە جێگیر بوو و ڕێنماییەکانی بۆ خەڵکی ڕوون بوەوە، دوای ئەوەی لەم سۆنگەیەوە بنەما بەرزەکانی بڕیار درا، کە بەرزترین و پاکترین بنەمان، یاسایەك پێی گەیشت بێت لە ئازادی و ئاین و باوەڕ، کەس ناچار ناکات ئاینی خۆی جێ بهێڵێت و مووسوڵمان بێت، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿لاَ إِكْرَاهَ فِي الدِّينِ قَد تَّبَيَّنَ

الرُّشْدُ مِنَ الْغَيِّ﴾[٥٢٦]. واتا: "زۆر لێکردن لە ئایین دا نییە و، ڕاستی لە گومڕایی دا ڕوون بوەتەوە".

سەرکردە مووسوڵمانەکانیش لەسەر ئەم بنەمایە ڕۆیشتوون، لە مامەڵەیان لەگەڵ خاوەن پەرتووکە ئاسمانییەکان، عەمری کوڕی عاس لە بەڵێن نامەکەی لەگەڵ کریستینییەکان دا، دوای ڕزگار کردنی میسر دەڵێت: "ئەمە ئەوەیە، کە عەمری کوڕی عاس بە خەڵکی میسری داوە لە دڵنیایی لە خۆیان و کەس و کاریان و ماڵیان و کڵێساکان و خاچەکانیان، شتێك ناچێتە سەریان و لێشیان کەم نابێتەوە".

لە بنەماکانی لێبووردەیی لە ئیسلام دا، ئازادیی گفتوگۆیی ئایینییە، بۆیەش خوای گەورە ئامۆژگاریی مووسوڵمانان دەکات، کە پابەند بن بە ئاوەزێکی ژیرانە لە گفتوگۆیان لەگەڵ خاوەن ئایینەکانی تر، ئەگەر مەبەستیان قایل کردن بێت و، خستنەڕوی بیانو بە بیانو و، بەڵگە بە بەڵگە، لەمە دا ئەوە دوویات دەبێتەوە، کە پەیامی ئیسلام گوتارێکە بۆ ئاوەز و بانگەشەی بیر کردنەوە دەکات و، لە قورئانی پیرۆز دا سەدان ئایەت هەن، کە باس لە ئاوەز دەکەن و دیوروژێنێت و هانی دەدات و، پایەی خودان ئاوەز و هزر بەرز دەکاتەوە و، قورئانی پیرۆز بە سپاردەوە داوا و ڕەخنە گرتنی نەیاران تۆمار دەکات، لە دوایی دا گفتوگۆ و هەڵوەشاندنەوەی ئەو ڕەخنانە یەك لە دوای یەك دەخاتە ڕوو، پاشان هەڵبژاردنەکە بۆ هەموو کەسێك بەجێ دەهێڵێت ﴿فَمَن شَاء فَلْيُؤْمِن وَمَن شَاء فَلْيَكْفُرْ﴾[٥٢٧]. واتا: "هەر کەسێکی بیەوێت باوەڕ دەهێنێت و، هەر کەسێکیشی بیەوێت بێ باوەڕ دەبێت".

ئیسلام ئاراستە و، بنەمای دانایانەی ڕاستەوخۆ لە شێوازی تەوەرە و بەرزەفتکارییەکان لەگەڵ براواداران و جارسەکانی تا ئاستێکی پێویست داناوە، بە جیاوازیی چینەکانیان و، لەسەر بنەمای ئەو مشتومڕەی، کە باشترین بێت، کە دەفەرموێت: ﴿ادْعُ إِلِى سَبِيلِ رَبِّكَ بِالْحِكْمَةِ وَالْمَوْعِظَةِ الْحَسَنَةِ وَجَادِلْهُم بِالَّتِي هِيَ

---

[٥٢٦] سورة البقرة: الآية ٢٥٦.

[٥٢٧] سورة الكهف: الآية ٢٩.

أَحْسَنُ﴾[528]. واتـا: "بـە دانـایی و ئامۆژگـاریی بـاش بـۆ ڕێگـەی پەروەردگـەرت بانگـەواز بکـە و بـەو شـێوەیەی باشـترینە مشـتومڕیان لەگـەڵ دا بکـە" و، دەفـەرموێت: ﴿وَلَـا تُجَـادِلُوا أَهْـلَ الْكِتَـابِ إِلَّـا بِـالَّتِي هِـيَ أَحْسَـنُ﴾[529]. واتـا: "مشتومڕی خـاوەن پەرتووکـەکان(ی ئاسمـانی) مەکـەن، مەگـەر بـەو شـێوەیەی باشترینە".

پیاوێك هاتە لای جێنشـین مـەئموون، کـە سـەرکردەی بـەرز بـوو لـە ولاتـی ئیسلامی، فەرمانی پێ کرد بە چاکە و، بەرگرتن لە خراپە، لە گوتەکانی دا ڕەقـی و توندیی پێوە دیار بوو، سەرکردەی ئیسلامیش بەوە وەڵامی دایـەوە: ئـەی پیـاو نەرم و نیان بە، چونکە خوای گەورە کەسێکی لە تۆ باشتری ناردە لای کەسێك لـە من خراپتر و فەرمانیشی پێ کرد بە نەرم و نیانی، هاڕوون و مووسا سڵاوی خوایان لەسەر بێت، نارد، کە لـە تـۆ باشـترن بـۆ لای فیرعـۆن، کـە لـە مـن خـراپترە و ئامۆژگاریی کردن بە فەرموودەی ﴿اذْهَبَا إِلَى فِرْعَوْنَ إِنَّهُ طَغَى (٤٣) فَقُولَا لَهُ قَوْلًا لَيِّنًا لَعَلَّهُ يَتَذَكَّرُ أَوْ يَخْشَى﴾[530]. واتە: " هەردووکتان(مووسا و هاڕوون) بڕۆنـە لای فیرعۆن، ئەو یاخی بوە {٤٣}بـە نـەرمی لەگـەڵی دا قسـە بکـەن بەشـکەم بـیر دەکاتەوە یا دەترسێت".

بەم لێبووردەییە و، ئازادییە بوو سەرکردەکانی مووسوڵمانان لە نەوەی عـەباس و ئەوانی تر ئەنجوومەنیان بۆ گفتوگۆ دانا، زانا گەلێکی زۆر لە لایان کۆ دەبـوەوە، کە وابەستەی هۆزە جیاجیا و تـەواوی ئایینـەکانی تـر بـوون، لـە کاروبارەکـان دا ڕکابەرییان دەکرد و، هاوسەنگییان لە نێوان ئایینەکان دا دەکرد، هەرکەس بەڵگەی بۆ بیانووی خۆی دەهێنایەوە و، ڕای خۆی بە ئازادی و ئاسوودەیی ڕوون دەکـردەوە و، سەرکردەکانی مووسوڵمانانیش هەر ئەوە نەبوو، کە بەرگەی ئەم گفتوگۆیانەیان دەگرت، بەڵکو لەسەر ئەمە هانی دەدان و خۆشیان بەشدارییان تێ دا دەکرد.

---

[528] سورة النحل: الآية ١٢٥.

[529] سورة العنكبوت: الآية ٤٦.

[530] سورة طه: الآيتان ٤٣- ٤٤.

# توێژبەندی سێیەم

## پێڕۆییەتیی سەرکردایەتیی ئیسلامی

**بەرایی**

هەڵبەت سەروەرمان عومەری کوڕی خەتاب خوا لێی ڕازی بێت، خودان چاو کراوەیی و هەستێکی بەرزی کارگێڕی، سەراپای بابەتی سەرکردایەتیی لە وتەیەکی دا پوخت کردوەتەوە: "ئەم کاروبارە چاك نابێت مەگەر بە نەرمی لە بەهێزی دا و، بەهێزیش لە نەرمی دا"[٥٣١]

لە یەکەم وتاری دا کاتێك جێنشینیی گرتە دەست گوتی: "خەڵکینە: سوێند بەخوا لە نێوتان دا کەسی بێ هێز لە لام بەهێزە هەتا مافەکەی بۆ وەردەگرمەوە و، کەسی بەهێزیش بێ هێزە لام هەتا مافەکەی لێ وەردەگرمەوە".

لەبەر ئەوەی سەرکردایەتی لە ئیسلام وا دەناسرێت، کە سەرکردایەتییەکی میانڕەوییە نەك تاکڕەویی ڕەها و، سستی بێ تواناش نییە و، لە هەموو کاتێکیش دیموکراتیی ڕەها نییە.

تێخوێندنەوە و تێبینییەکان لە ڕێکخراوە کارگێڕییە جیاجیاکان دا سەلماندویانە، کە کرداری کارگێڕی و مەودای کارایی و تەواویشی، بەگوێرەی گۆڕانی سەرکردە کارگێڕەکان، جیاوازە، لەگەڵ مانەوەی فاکتەرەکانی تری کاریگەر لە داینامیکییەتی ڕێکخراوە وەك خۆی. مانای وایە سەرباری ڕەخسانی یاسا و گەڵاڵە نامە و توانا مرۆیی و کەرەستەیە فەراهەمەکانی ڕێکخراوە، کەچی هەلی سەرکەوتنی ڕێکخراوە یا سەرنەکەوتنی بە شێوەیەکی تۆکمە بە هۆشیار کردنی ئەو سەرکردایەتییە کارگێڕەوە بەندە، کە سەرۆکایەتییەکەی وەردەگرێت، چەند ڕێکخراوەی گەشەدار دوای بێ سەرکردایەتی بوونیان یا لابردنی و، گرتنەوەی

---

[٥٣١] أحمد إبراهيم أبو سن: الإدارة في الإسلام، ص١٠١.

شوێنی لە لایەن کەسێکی تر، پەکیان کەوت، کە دووپاتی گرنگیی سەرکردایەتیی کارگێر دەکاتەوە.

سەرباری ئەوەی بەشێوەیەکی ئاسایی سەرکردەکان بە ئەدگار گەلێکی کەسێتییان دەگۆڕێن، وەك زیرەکی و هەڵپە و متمانە بە خۆ بوون و گیانی بەرزی تازە بوەوە و هێزی قایل کردن و دەستپێشخەری و ئەفراندن و فراوانیی ئەندێشە و بڕوا بوون بە ئامانج، کە هەموویان ئەدگاری پێویست و گرنگن، بەڵام دیاری کردنی ئەدگارەکان بە شێوەیەکی دیاری کراوی دامەزراو لەسەر تایبەتمەندی گەلێك، کە ئەرکە لە سەرجەم سەرکردەکان و لە هەر کات و شوێنێك و هەڵوێستێك بڕەخسێن هەروا بە ئاستەنگی ماوەتەوە، هەروەك ناتوانرێت سەرکردە لەسەر بنەمای ڕەخساندنی هەموو ئەو ئەدگارانە دەستنیشان بکرێت، کە پۆزشت بۆ گڵ دانەوەیان دەهێنرێتەوە، دەگمەنیشە هەمووی لە یەك کەس و بە ڕادەیەکی بەرز و یەکسان، کۆ ببێتەوە.

لە بەردەم ئەم ئاستەنگییە کردەنییانە، هزری کارگێریی هاوچەرخ پەنای بردەبەر دیاری کردنی هەندێك کارامەیی دەستکەوتوو و پێویست، کە پێویستە سەرکردەی کارگێر بۆ ئەوەی کۆڵەگەکانی سەرکردایەتیی بۆ بڕەخسێت، بەدەستیان بخات، ئەم کارامەییانەش تایبەتن بە ئاشنایەتیی سەرکردە بەو ژینگە سیاسی و کۆمەڵایەتییەی، کە لە سنوورەکەی دا کار دەکات، ئەمانیش:

١) **کارامەیی هزری یا سیاسی** و، بە ئاشنایەتیی ئەو کۆمەڵەش، کە لە سەرکردایەتییەکەی دا کار دەکات ئەویش

٢) **کارامەیی مرۆییە** و، سروشتی ئەو کارەی، کە تێی دا کار دەکات، ئەویش

٣) **کارامەیی هونەرییە** و، هەوڵ دەدەین، کە پێڕۆیەکی ئیسلامی لە سەرکردایەتی لە میانەی خستنەڕوی ئەم کارامەییانە ڕوون بکەینەوە[٥٣٢]

---

[٥٣٢] أحمد إبراهيم أبو سن: الإدارة في الإسلام، ص١٠٢.

أ- **کارامەیی سیاسی:** مەبەستمان لێی توانستە لە ڕوونیی ڕوانگەی سیاسی لای سەرکردەکان و، ئاشنایی ئەو ژینگە کۆمەڵایەتییەی، کە سەرکردەکە تێی دا کار دەکات و، ئەو سەرکردەی ڕا و کەسایەتییە کاریگەرانەی، کە تێی دا هەن، چۆنییەتیی قایل کردن و ڕاکێشانی بۆ بڕوا بوون بەو ئامانجەی لە پێناوی دا کار دەکات و، بەدەست خستنی متمانە و تایبەتمەندیی ئامانجەکەی، هەروەك مەبەست توانستیشە لەسەر سازاندنی ئەو ئاراستە و فشارە جیاجیایانەی، کە لە کۆمەڵگە دا بوونیان هەیە، هەروەك مەبەست لە کارامەیی سیاسی، مانای پلان دانان و ئامادە کردنە بە ئاگایی و بیر کردنەوە بۆ سەرخستنی پرۆژە و پلانە گشتییەکان لە ڕۆشنایی ئەو فەلسەفە و باوەڕانەی، کە کۆمەڵگە بڕوای پێیان هەیە.

هەڵبەت توانستی سیاسیی پەیامبەری ڕێزدار وەك سەرکردەیەکی کاروانی ئیسلام لە سەرەتای سەردەمەکەی لە پلان دانانی بۆ بانگەوازی ئیسلامی، دەرکەوت، لە کاتێك دا لە هەموو لایەکییەوە بە دوژمن دەورە درا بوون، باشترین نموونەش، کارامەیی پلان دانانی و ڕێکخستنەکەیەتی بۆ بانگەوازی ئیسلام لە مەککە هەتا مووسوڵمانەکانی لە ژینگەی قوڕەیشی دوژمنەوە دەر هێنا، بە کەمترین زیان و لە کۆمەڵگەی مەدینەش کاتێك برایەتیی دەست پێ کرد لە نێوان پشتیوان و کۆچکەران و، ئەنجام دانی ڕێکەوتن نامە و پەیمان نامەکان لەگەڵ نا مووسوڵمانان ئەو جوولەکانەی، لەگەڵ مووسوڵمانان لە مەدینە دا نیشتەجێ بوون.

سیاسەتیشی ڕووەو دڵ هۆگران جۆرێکی نایاب بوو لە کارامەیی سیاسی.

لە خێرەکانی دا بە ئەوانەی دەدا، کە دەیان ویست دڵیان هۆگر بێت، کە سی و یەك پیاو بوون لە گەورە پیاوانی عەرەب، هەروەك هۆگری کردن و بە هۆی ئەوان گەلیش هۆگر بوو و، بۆ ئەوەی هاندەر بێت بۆ ئیسلام بوونیان و، دەمارگیری هاندەر نەبێت، لەگەڵ لاوازیی نیازیان، کە لەگەڵ بێ بڕوایان دا بن دژی مووسوڵمانان و، لە نێویان دا تەنها خانەدان و گەورە زانا و وتارێژ و هۆنەر و بلیمەت هەبوون، سەفوانی کوڕی ئومەییە دەڵێت: پەیامبەری خوا ڕۆژی حونەین

کاتێك ڤین لەدڵترین کەس بوو لام، شتێکی پێدام، تا ئێستاش پێم دەبەخشێتەوە تەنانەت ئەم لە خۆشەویسترین کەسە لام، پەیامبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: (إني أعطي قوماً أتألف ظلعهم (ظلع هو العيب) و جزعهم) واتا: "من ئەو ماڵە بە کەسانێك دەبەخشم بۆئەوەی لە کەم و کوڕی و ترسیان هۆگریان بکەم"

هەروەك پەیامبەر ڕێزی لەو شاندە عەرەبانە دەگرت، کە دوای ڕزگار کردنی مەکە دەهاتنە ناو ئیسلام، لە نێویشیان هەبوو دە ڕۆژ میوانی دەبوو، وەك شاندی ئەبو قەیس و، لەنێویان هەبوو زێدەڕۆیی لە ڕێز لێنانی دا دەکرد وەك پادشاکانی یەمەن، بۆیەش ناویان نرا پادشا، چونکە هەر یەکێکیان دۆڵێکی بە هەموو ئەوەشی تێی دا بوو، هەبوو.

ئەوەی پشت ڕاستی کارامەیە سیاسییەکەی دەکاتەوە ئەو نەرمییە بوو، کە لە ڕۆژی حودەیبییە دا نواندی، بەوەی ڕازی بوو خۆی و هاوەڵانی تەنها سێ ڕۆژ بچنە ناو مەکە، چەکەکانیشیان لە کالانیان دا بێت[٥٢٣].

هەروەك ئاشتەوایی لەگەڵ سوهەیلی کوڕی عەمرۆ — برای عامری کوڕی لوئەی کرد —بانگی عەلیی کوڕی ئەبی تالیبی کرد فەرموی: "بنووسە بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان. سوهەیل گوتی: من ئاشنای ئەمە نیم، بەڵکو بنووسە بەناوت ئەی خواوەند. پەیامبەر ﷺ بە عەلیی فەرمو: بنووسە بەناوت ئەی خواوەند، ئەویش نووسی. پاشان پێی فەرموو: بنووسە: ئەمە ئەوەیە، کە موحەمەد پەیامبەری خوا و سوهەیلی کوڕی عەمرۆ لەسەری ڕێك کەوتوون. سوهەیل گوتی: ئەگەر گەواهیم بدا بویایە، کە تۆ پەیامبەری خوایت جەنگم لەگەڵت دا نەدەکرد، بەڵکو ناوی خۆت و باوکت بنووسە. پەیامبەری خواش ﷺ فەرموی: بنووسە: ئەمە ئەوەیە، کە موحەمەد کوڕی عەبدوڵلا و سوهەیلی کوڕی عەمرۆ لەسەری ڕێك کەوتوون و، پێك هاتن لە ڕاگرتنی جەنگ بۆ ماوەی دە ساڵ، خەڵکی تێی دا لە دڵنیایی دەبن، واز لە یەکتر دەهێنن، هەر کەسێك لە قورەیش بێ ڕێ پێدانی کاربەدەستەکەی هاتە لای موحەمەد، بۆیانی دەگێڕێتەوە و،

---

[٥٢٣] أحمد إبراهيم أبو سن: الإدارة في الأسلام، ص١٠٣.

ئەوەشی لە لایەن موحەمەدەوە هاتە ناو قورەیش بۆی ناگێردرێتەوە و، لە نێومـان دا ئاشتەواییەکی دڵپاکانە هەیە و، دزە کردن و قۆستنەوە نییە و، ئەوەی ئـارەزوی پەیمان بەستنی هەبێت لەگەڵ موحەمـەد ئـەوا دەیبەسـتێت و، ئەوەشـی ئـارەزوی هەبێ بچێتە ناو پەیمانی قورەیش و بەڵێنیان لەگەڵ دا ببەستێت، دەتوانێت"[٥٣٤]

هەنـدێك مووسـوڵمانان بـەم پـەیمان نامـە ڕازی نـەبوون دوای ئـەوەی بەسـەر دوژمنانیان دا بردیانەوە، بەڵام پەیامبەری خۆشەویست ﷺ ئارەزوی ڕشتنی خوێنی نەدەکرد، بۆیە ئەمەی لە نـەیارانی پەسـەند کـرد. لـە ئـەنجامی ئـەم ئاشـتەواییە مووسوڵمانان لەگەڵ هاوبەشدانەران لە قورەیش دا تێکـەڵ دەبـوون، لـە کاتێـك دا پێشـتر تێکـەڵ نـەدەبوون، هاوبەشـدانەران دەهـاتن بـۆ مەدینـە، هـەروەك مووسوڵمانانیش دەچوون بۆ مەککە و دەچوونە لای کەس و کار و دۆستان و هی تر لەوانەی ئامۆژگارییان دەکردن و، گوێیان لێ دەگرتن لە باری پەیامبەر و دەرئاسـا دیارەکانی و، خۆشیان زۆریان لەمانە بـینی، بەمـەش دەروونیـان بـۆ بـڕوا هێنـان کرایەوە بۆ ئیسلام پێش ڕزگـار کردنـی مەککـە و، ئیسـلام بـوون و، هـی تـریش هەوەسی ئیسلام بوونیان زیادی کرد، ئەوە بـوو لـە ڕۆژی ڕزگـار کـردن هـەمویان مووسوڵمان بوون و، عەرەبەکان لە نا قورەشییە دەشتەکییەکان لە ئیسلام بوونیان، چاوەڕوانی ئیسلام بوونی قورەیش بوون، کاتێکیش قورەیش ئیسـلام بـوو عـەرەبـە دەشتەکییەکانیش ئیسلام بوون.

هەموو ئەمانە بە هۆی ئەو کارامەییە سیاسییە مەزنە بوون، کە پەیامبـەر ﷺ وەك سەرکردەیەکی چاوکراوە پێی ڕازا بوەوە.

ب- **کارامەیی مرۆیی**: کارامەیی مرۆیی لای سەرکردە مانای توانستییەتی لە مامەڵـەی لەگـەڵ تـاك و کۆمەڵـەکان و، تـەدگارێکی پێویسـتە بـۆ ڕەفتـاری سـەرکردە لـە هـەر کردارێکـی پەیوەنـدیکاریی لەگـەڵ تـاك و کۆمەڵـەکان و، تێگەیشتنی ئاڵوگۆڕ کراو لە نێوان سەرکردە و کۆمەڵەکەی دا و، توانست لـە کـار لێ کردنیان پێویست دەکات، بـۆ ئـەوەی هەڵسـتن بـە بەدەسـت خسـتنی ئـەوەی

---

[٥٣٤] أحمد إبراهيم أبو سن: الإدارة في الإسلام، ص١٠٤.

لەسەریانە ڕووەو ڕێکخراوە و کۆمەڵ بە ڕاستگۆیی و، دەست پاکی و دڵسۆزی و خۆیەکلا کردنەوە.

کارامەیی مرۆیی سەرکردە لە ڕەفتار و بەجێهێنانی دا ڕووەو کۆمەڵە ڕەنگ دەداتەوە، بۆیەش ئەرکی سەرکردەیە لە ڕاست کارمەندەکانی دا، کە بەمانەی خوارەوە هەڵبستێت:

١) لە هەموو ئەو کاروبارانەی، کە دەیکات یا جێی دەهێڵێت، پێشەنگێکی چاکیان بێت.

٢) مامەڵەیان باش بکات و، بایەخ بە کاروبارەکانیان بدات و، لە مامەڵە کردنی دا دادگەر بێت.

٣) ڕاوێژیان پێ بکات و ڕێز لە ڕاکانیان بگرێت.

٤) مەشقیان پێ بکات لەسەر بەجێهێنانی سپاردەکە.

٥) متمانەی بە توانستیان هەبێت، کە هەندێك لە دەسترۆییەکانی پێیان بدات.

٦) لە بەجێهێنانی سپاردە چاودێرییان بکات و لێپرسینەوەیان لەگەڵ دا بکات.

١) **پێشەنگیی چاك:** لە گرنگترینی ئەرکەکانی سەرکردە ئەوەیە، کە پێشەنگێکی چاکی کۆمەڵ و تاکەکانی بێت، کە خۆی بەر لە کەسانی تر بە خۆگری و پابەند بوون، پابەند بکات، بەوەی کارەکەی دەیخوازێت لە ئارامگری و دەست پاکی و قوربانی دان و، گوتەکانی هاوتای ئەوە بێت، کە خوا داییەزاندوە، بە پابەد بوون بە فەرمایشتی خوای گەورە: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لِمَ تَقُولُونَ مَا لَا تَفْعَلُونَ (٢) كَبُرَ مَقْتًا عِندَ اللَّهِ أَن تَقُولُوا مَا لَا تَفْعَلُونَ﴾[٥٣٥]. واتا: "بڕوادارینە بۆ چی شتێك دەڵێن کردەوەی پێ ناکەن{٢} لای خوا خەشمێکی گەورەیە شتێك بڵێن کردەوەی پێ نەکەن"، ﴿لَقَدْ كَانَ لَكُمْ فِي رَسُولِ اللَّهِ أُسْوَةٌ حَسَنَةٌ لِّمَن كَانَ يَرْجُو اللَّهَ

---

[٥٣٥] سورة الصف: الآيتان ٢ و ٣.

وَالْيَوْمَ الْآخِرَ وَذَكَرَ اللَّهَ كَثِيرًا﴾[٥٣٦] واتا: "هەڵبەت بۆ ئێوە لە پەیامبەری خواوە سەرمەشقییەکی چاك هەیە بۆ هەرکەسێکی باوەڕی بە خوا و ڕۆژی دوایی هەبێت زۆر یادی خوا بکاتەوە".

پەیامبەر ﷺ پێشەنگێکی چاکی هەر سەرکردەیەکیشە، کە لە دوایەوە دێت، خوای گەورە باسی کردوە بە فەرمایشتی: ﴿وَإِنَّكَ لَعَلى خُلُقٍ عَظِيمٍ﴾[٥٣٧]. واتا: "بە ڕاستی تۆ لەسەرەوەی ئاکاری مەزنیت" و، فەرمایشتی: ﴿فَبِمَا رَحْمَةٍ مِّنَ اللّهِ لِنتَ لَهُمْ وَلَوْ كُنتَ فَظًّا غَلِيظَ الْقَلْبِ لاَنفَضُّواْ مِنْ حَوْلِكَ فَاعْفُ عَنْهُمْ وَاسْتَغْفِرْ لَهُمْ وَشَاوِرْهُمْ فِي الأَمْرِ فَإِذَا عَزَمْتَ فَتَوَكَّلْ عَلَى اللّهِ إِنَّ اللّهَ يُحِبُّ الْمُتَوَكِّلِينَ﴾[٥٣٨]. واتا: "بە هۆی میهری خوا نەرم بویت لەگەڵیان، ئەگەر تووڕە و دڵ ڕەق بایت لە دەورەت پەرتەیان دەکرد، لێیان ببورە و داوای لێخۆش بوونیان بۆ بکە و لە کاروبارەکانیش دا ڕاوێژیان پێ بکە، کاتێك بڕیارت لەسەر شتێك دا، پشت بە خوا ببەستە، هەڵبەت خوا پەناگیرانی خۆش دەوێت"

بانگەوازی پەیامبەران بانگەوازی چاکسازین و، چاکسازیش دەبێت پێشەنگێك بێت کەسانی تر چاوی لێ بکەن، ئەمەش نابێت مەگەر کردەوەی هاوتای وتەکانی بن. بەر لە پەیامبەریش خوای پاك و بڵند پەیامبەرانێکی بۆ بەندەکانی ناردوە، کە فەرمانیان بە چاکە پێ بکەن و لە خراپە دا بەریان لی بگرن و، بەر لەمانیش پابەند بن بە ڕاستگۆیی و دەست پاکی و دڵسۆزی و، سەرپێچیان نەکەن مەگەر لەوەی بەری لێ گیراوە[٥٣٩]

لەمەش دا نەتەوەکەی شوعەیب وابوون کاتێك گوتیان: ﴿قَالُواْ يَا شُعَيْبُ أَصَلاَتُكَ تَأْمُرُكَ أَن نَّتْرُكَ مَا يَعْبُدُ آبَاؤُنَا أَوْ أَن نَّفْعَلَ فِي أَمْوَالِنَا مَا نَشَاء إِنَّكَ لَأَنتَ الْحَلِيمُ الرَّشِيدُ٨٧قَالَ يَا قَوْمِ أَرَأَيْتُمْ إِن كُنتُ عَلَىَ بَيِّنَةٍ مِّن رَّبِّي وَرَزَقَنِي مِنْهُ رِزْقًا

---

[٥٣٦] سورة الأحزاب: الآية ٢١.

[٥٣٧] سورة القلم: الآية ٤.

[٥٣٨] سورة آل عمران: الآية ١٥٩.

[٥٣٩] أحمد إبراهيم أبو سن: الإدارة في الإسلام، ص١٠٥.

حَسَنًا وَمَا أُرِيدُ أَنْ أُخَالِفَكُمْ إِلَى مَا أَنْهَاكُمْ عَنْهُ إِنْ أُرِيدُ إِلاَّ الإِصْلاَحَ مَا اسْتَطَعْتُ وَمَا تَوْفِيقِي إِلاَّ بِاللّهِ عَلَيْهِ تَوَكَّلْتُ وَإِلَيْهِ أُنِيبُ﴾[٥٤٠]. واتا: "وتیان شوعەیب ئایا نوێژی تۆ فەرمانت پێ دەکات واز لەوە بهێنین، کە باپیرانمان دەیانپەرست یا بەو جۆرە کردەوە بە داراییمان بکەین، کە ویستمان لەسەرە؟ بەڕاستی تۆ نەرم و چەلەنگیت {٨٧} گوتی گەلەکەم ئایا ئەگەر بینیتان لەسەر ڕێگەی ڕاستی پەروەردەگارم بم و ڕۆزییەکی باشم پێ بدات و، نەمەوێت لەوەی بەرتان لێ دەگرم سەرپێچیتان بکەم، تەنها بە گوێرەی توانا چاکسازیم گەرەکە و سەرکەوتنم تەنها لە خواوەیە و پەنام بەو گرتوە و گەڕانەوەشم بۆ لای ئەوە".

پاشان لە دوایەوە جێنشینەکانی ڕاشیدین هاتن، خۆیان پابەندی ئەوە کرد، کە پەیامبەر ﷺ پابەندی بوو لە ئاکار و سادەیی و جێگیری. ئەمان خۆیان لە جەماوەری خەڵکی جیا نەدەکردەوە بەشتێك لە پۆشاك یا سوار یا خواردن و، ئەگەر یەکێکیان بچوو بوایە بۆ دانیشتنێك لەو جێگەیە دادەنیشت، کە دانیشتنەکە کۆتایی دەهات و، عومەر داوای لە والییەکانی دەکرد، کە سادە بن و ئاکاریان جوان بێت، دەیگوت: پیاوێکم دەوێت ئەگەر لە نێو نەتەوەیەك دا بوو و پێشەوایان نەبوو وەك پێشەوایان بێت و، ئەگەر پێشەوایان بوو وەك ئەوە وابێت، کە پیاوێکە لە نێویان، واتا هەردوو ئەدگاری شکۆداری و سادەیی تێ دا کۆ ببێتەوە.

لە عومەری کوڕی خەتاب خوا لێی ڕازی بێت دەگێڕنەوە، کە لە وتارێکی هەینی دا دواکەوت، بە پەلە هات پۆشاکێکی لەبەر دابوو بیست و یەك پینەی تێ دا بوو و کراسێکی لە ژێر دا بوو هێشتا وشك نەبوو بوەوە لە تەڕی، جا سەر کەوتە سەر سەکۆکە و گوتی: "ئەم کراسەم لە نێوەی گیر کردم، چاوەڕوانی بووم تا وشك بوەوە پاشان پێیەوە بێمە لاتان، لەبەر ئەوەی لەم کراسەم زیاتر نییە"

هەروەها دەگێڕنەوە، کە دیارییەکی لە شیرینی و فالوژ لە کارکەرێکی بەناوی عوتبەی کوڕی فەرقەد لە ئازەربایجان بۆ هات، جا لەو کەسەی پرسی، کە پێی دا ناردبوی: "ئایا هەموو خەڵکی ئەوێ ئەمە دەخۆن؟"، پیاوەکەش وەڵامی دایەوە:

---

[٥٤٠] سورة هود: الآيتان ٨٧- ٨٨.

نەخێر ئەی پێشەوای بڕواداران، ئەمە خواردنی خەڵکێکی تایبەتە. جا عومەر تەکانێکی دا و بە پیاوەکەی گوت: "دیارییەکەت هەڵگرەوە بیگەڕێنەوە بۆ خاوەنەکەی پێی بڵێ: لە خوا بترسە و مووسوڵمانان لەوەی لێی تێر دەبیت تێر بکە" دەشگێڕنەوە کوڕەکەی خۆی، عەبدوڵلای کوڕی عومەری بینی، پارچە گۆشتی دەخوارد، پێی گوت: "لەبەر ئەوەی کوڕی پێشەوای بڕوادارانیت گۆشت دەخۆیت و خەڵکیش لە نەداری دان؟ ئایا نان و شیر، نان و ڕۆن نییە". هەروەها جابری کوڕی عەبدوڵلا دەگێڕێتەوە دەڵێت: عومەر گۆشتێکی بە دەستمەوە بینی، لێی پرسیم: ئەمە چییە ئەی جابر؟ گوتم: ئەمە گۆشتە، ئارەزووم لێ کرد، بۆیە کڕیم. گوتی: "ئایا ئەوەی ئارەزووت لێی کرد دەیکڕیت؟ یا دەترسیت لە ڕۆژی زیندوو بوونەوە دا پێت بڵێن "خۆشییەکانی دونیاتان برد و لە زەتتان لێ وەرگرت"[٥٤١]

٢) **مامەڵەی چاك و دادگەری و میهرەبانی:** لەسەر سەرکردەیە، لە فەرمانڕەواییەتییەکەی دا میهرەبان و بەخشندە و دادگەر بێت، ئەگەر فەرمانڕەواییشی کرد، بایەخ بە کاروباری ژێر دەستەکەی بدات. ئەگەر هەڵەیان کرد ئامۆژگارییان بکات و هانیان بدات، کە باش بن و، بە چاکی وتوێژیان لەگەڵ دا بکات بۆ ئەوەی ڕازییان بکات یا بە ڕاکانیان ڕازی بێت، ئەم ئەدگارانەش بەڵکو زیاتر لەمانەش لە پەیامبەری خوا ﷺ و جێنشینەکانی ڕاشیدین دا ڕەخسا بوون.

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَاخْفِضْ جَنَاحَكَ لِمَنِ اتَّبَعَكَ مِنَ الْمُؤْمِنِينَ﴾[٥٤٢] واتا: "باڵت بۆ ئەو بڕوادارانەی شوێنکەوتەتن نەوی بکە"، دەشفەرموێت: ﴿ادْعُ إِلِى سَبِيلِ رَبِّكَ بِالْحِكْمَةِ وَالْمَوْعِظَةِ الْحَسَنَةِ وَجَادِلْهُم بِالَّتِي هِيَ أَحْسَنُ﴾[٥٤٣]. واتا: "بە دانایی و ئامۆژگاریی چاك بانگەوازی ڕێگای خواکەت بکە و بەو شێوەیەی باشترینە وتوێژیان لەگەڵ دا بکە".

---

[٥٤١] أحمد إبراهيم أبو سن: الإدارة في الإسلام، ص١٠٧.
[٥٤٢] سورة الشعراء: الآية ٢١٥.
[٥٤٣] سورة النحل: الآية ١٢٥.

هەروەك عومەر کارکەرەکەی ئەبو مووسای ئەشعەری ڕاسپارد پێی گوت: سەردانی نەخۆشی مووسوڵمانان بکە و، ئامادەی جەنازەکەیان ببە و، دەرگایان بەسەر دا بکەرەوە و خۆت بەشداری کاروباریان بکە و، وەك ئەوەی تۆ پیاوێکی لەمان بەڵام خوا بەرپرسیارییەکەی زیاتر کردویت، پێم گەیشتوە خۆت و کەس و کارت پۆشاك و خواردن و سوارتان وەکو ئەوەی موسوڵمانان نییە، عەبدوڵلا وەکو ئاژەڵێك مەبە بە دۆڵێکی سەوزایی دا بڕوات خەمی هیچی نەبێت تەنها تێر بوون و بە قەڵەویش بمرێت، ئەوەش بزانە ئەگەر سەردەستە لار بووەوە ژێردەستەکەشی لار دەبێتەوە، خراپترین کەسیش ئەوەیە لەگەڵ خەڵکی خراپ بێت و هەر ساغ بێت" عەلیش والیی خۆی بەسەر میسری ڕاسپارد گوتی:"لە هەمبەر خەڵکی دا دادگەر ببە تایبەت خزمان و خۆشەویستانت بە یەك چاو سەیریان بکە، ئەگەر وا نەکەیت ستەمت کردوە، هەر کەسێکیش ستەم لە بەندەکانی خوا بکات ئەویش دەبێتە نەیاری، کەسێکیش خوا ببێتە نەیاری بیانوی چی دەبێت، خوا لەگەڵی دا لە شەڕ دەبێت تا مافەکەی لێ وەردەگرێتەوە، با لە حەق دا باشترین کاروبارت نێوەندەکەیان بێت و، لە دادگەری دا بیگشتێنە و سەرجەمی لە ڕەزامەندیی ژێردەستە دا بێت، چاکە و خراپەی مەکە یەك، ئەمە ڕەنگە خەڵکی باش باشتر بکات و، خەڵکی خراپیش بۆ خراپتر پێ بگەیەنێت و، هەر یەکێکیان پابەند بکات بەوەی خۆی"[٥٤٤]

لە پەیامبەریشەوە ﷺ دەگێڕنەوە فەرمویەتی: (أرحم أمتي أبو بكر، وأشدهم في دين الله عمر. إن الله تعالى جعل الحق على لسان عمر وقلبه، وأصدقهم حياء عثمان وأقضاهم علي...). واتا: "میهرەبانترینی نەتەوەکەم ئەبوبەکرە و، ڕژدترینیشیان لە ئایینی خوا عومەرە. خوای بڵند حەقی خستوتە سەر زمان و دڵی عومەر و، ڕاسترینیان شەرمی عوسمانە و دادوەرترینیان عەلییە"، دەشگێڕنەوە، جارێك پەیامبەر ﷺ قسەی لەگەڵ عومەر دەکرد، فەرمووی: (والذي نفس محمد بيده، ما لقيت الشيطان قط سالكا فجا إلاّ سلك فجاً غير فجك). واتا: (سوێند

[٥٤٤] أحمد إبراهيم أبو سن: الإدارة في الإسلام، ص١٠٨.

بەو زاتەی گیانی موحەممەدی بە دەستە، هەرگیز شەیتان بەو ڕێگە دا نەچوە، کە تۆی پێ دا تێپەڕ بێت)

عومەر توندی خۆیی و هەستی خەڵکیی لە بارەوە دەزانی، بۆیە ڕوی لە خوا دەکرد بە ترسەوە دەیگوت: "پەروەردەگەرم مـن توندم نەرمم بکە، ئەی پەرەوەردەگەرم بێ هێزم بەهێزم بکە، ئەی پەروەردگەرم ڕەزیلم سەخیم بکە".

لە کۆتاییەکانی ڕۆژانی ژیانی دا بوو داوای لە خوا دەکرد و دەیگوت: "ئەی پەروەردەگەرم تەمەنم گەورە بوە و هێزم کەم بوە و ژێردەستەکانم پەرش بوینە، جا بۆ خۆتم بگێڕەوە با بە زیان نەچم و زێدەڕۆیش نەکەم، ئەی پەروەردەگەرم شەهادەتم پێ بدە لە پێناوی تۆ و، مردنم لە وڵاتی پەیامبەرەکەت بێت"

٣) **ڕاوێژ و بەشدار کردن:** ئەمەش ئەرکە لەسەر سەرکردە، کە ڕاوێژ بە کۆمەڵەکەی بکات، چونکە ئاوەزی مرۆڤ بە هەموو شتێك دا ناشکێت و، لەبەر ئەوەشی ڕای کۆمەڵ لە ڕای تاك باشترە، هەروەك ئەم بنەمایەکیشە لە بنەماکانی ئیسلام و گرتنەبەری ناچاری و سەپێنراوە.

هەڵبەت پەیامبەر ﷺ لە هەر کاروبارێك دا ڕاوێژی بە هاوەڵانی دەکرد، ئەگەر دابەزینێکی ڕاشکاوانەی لە لایەن خوای گەورەوە بۆ نەهات بوایە، ڕێزی لە ڕای تاك و کۆمەڵ دەگرت و پێیەوە پابەند دەبوو.

هەروەها سوور بوو لەسەر مەشق پێ کردنی ئەبو بەکر و عومەر و عوسمان و عەلی لە هێشتنەوەی بوار بۆ موسوڵمانان بۆ دەربڕینی ڕای خۆیان لە هەر کاروبارێکی گرنگ دا، بۆ نموونە ئەوەی لەسەر دەستی عومەر ڕوی دا، کاتێك موسوڵمانان وڵاتی ئێراقیان لە فەرمانداریی فارسەکان ئازاد کرد و زۆربەی خەڵکەکەی هاتنە ناو ئایینی خوا و، عومەر ڕای وابوو، کە زەوییە کشتوکاڵییەکەی لە نێو تێکۆشەران دا دابەش نەکات و، هەروەك چۆنە وا بەدەست خاوەنەکانیان دا بمێنێتەوە، پاشان باجە وەرگیراوەکان بۆ ماڵی دارایی بگێڕدرێتەوە و لە نێو سەرجەم خەڵکی دا دابەش بکرێت، هەریەکێکیان چارەنووسی سەپێنراو بێت.

پێشی وابوو، کە دابەش کردنی زەوی لە نێو تێکۆشەران دا یەکەم لە تێکۆشـان سڵیان دەکـات و، دووەم لـە دانەوێڵـەی زەوی کـەم دەکـات لەبـەر کـەم شـارەزایی تێکۆشەران بە کشتوکاڵ و، سێیەمیشیان لـە ئیسـلام دا چـینێك لـە دەرەبـەگ و قۆرخکەران درووست دەبن، هەروەك ئەمە کەسانی تر پـەلکێش دەکـات، ئەوانـەی خاوەنی موڵك نین بێ بەش بن و، نەوەکانی داهاتووش لە مافی ڕزقەکەیان بێ بەش دەبن.

چەند هاوەڵێکی بەرهەڵستیی ئەم ڕایەیان کرد و، هەرچەندە دەنگیان بەرز دەبوو و بەرهەڵستیان بۆی زیاتر دەبوو، بە هێمنی گوتی: "ئەمە تەنها ڕایەکمە، کە پـێم باشە"، کۆبوونەوەکە تەواو بوو بەبێ هیچ ڕێککەوتنێك.

لە کۆبوونەوەیەکی تر، عومەر بانگی دەسـتەیەك لـە پشـتیوان و کۆچـکەرانی کارزان و خاوەن ئەزموونی گەواهی بۆدراوان کرد، عومەر ترسا یەکێك مشـتومڕی ڕاکەی بکات بەو لێك دانەوەیەی پێشەوای بڕوادارانە جا دەستی کرد بە قسە:

"من بۆ ئەوە بانگم کردوون هاوبەشیم بکەن لەو سپاردەیەی، کە لـە کاروبـاری ئێوە دا هەڵم گرتوە، هەروەك من یەکێکم لـە ئێـوە و، ئێـوەش ئـەمڕۆ بڕیـار بـۆ ڕاستی بدەن، سەرپێچیم بکەن لە سەرپێچیم و، کۆك بن لەگـەڵم لـە کـۆك بـوونم، نامەوێ پەیڕەویی ئارەزووەکانم بکەن، ئەوەتا پەرتووکێکی خواتان لەگـەڵ دایـە بـە ڕاستی دەدوێت، سوێند بە خوا ئەگەر بمەوێت لە شتێکەوە بدوێم، نامەوێت مەگـەر بە حەق.

هەروەك جارێکیان حوزەیفەی کوڕی یەمان چوو بۆ لای، بینی خـەمبار و چـاو بە گریانە، پرسی چی بوە ئەی پێشـەوای بـڕواداران؟ عومـەریش وەڵامـی دایـەوە: "دەترسم هەڵەیـەك بکـەم کەسـیش لـە ئێـوە ڕەتـی نەکاتـەوە لەبـەر گـەورەیم" حوزەیفەش پێی گوت: سوێند بەخوا ئەگەر بینیمـانی لـە ڕاسـتی لات داوە، پێـت ڕاست دەکەینەوە".

جا عومەر دڵی خۆش بـوو و مژدەبـەخش بـوو و گـوتی: "سـتاییش بـۆ ئـەو خوایەی، کە هاوەڵانێکی بۆ داناوم ڕاستم دەکەنەوە، ئەگەر چەوتیم کرد".

بە خەڵکی دەگوت:

"ئەو ڕایەم مەڵێن، کە پێتان وایە کۆکە لەگەڵ هەوەسم و، ئەو ڕایەم بڵێن، کە پێتان وایە لەگەڵ ڕاستی دا کۆکە"[٥٤٥]

هەروەك عومەر بنەمای ڕاوێژ و بەشدار کردنی پیادە کردوە، نەك تەنها لەوەی پێویستی بە گوێگرتن بوو لە مووسوڵمانان، بەڵکو کۆمەڵ ئاگادار بوون بەسەر بڕیارەکان و هۆی وەرگرتنییانی بۆ لێك دەدانەوە، بۆ ئەوەی زانیارییان پێ هەبێت و گفتوگۆی لەبارەوە لەگەڵ دا بکەن، ئەگەر پشتگیرییان بکرد بوایە، ئەوا پەسەندی دەکرد، ئەگەر ڕای کۆمەڵ ڕایەکی تر بوایە پشتگیریی دەکرد و کاری بۆ جێبەجێ کردنی دەکرد، بۆیەش عومەر نزیك بوو لە کۆمەڵەکەی[٥٤٦]

ئەمانە ئەدگاری سەرکردەن نەك فەرمانڕەوایەکی دەسەڵاتخوازی و، ئەدگاری مامۆستایەکی گەورەی خاوەن کارامەییەکی تەواون، لە ئەنجام دانی دادگەری و دەرخستنی بۆ پەیڕەوانی و، وتوێژی لەگەڵیان، تا بە قایل بوون و ڕەزامەندیی دەروونی نەك تووڕە و خۆ دوورخستنەوە و فەرامۆش کردنەوە، پەیڕەویی بکەن. لەبەر ئەوە ئەم ئەدگارە سەرکردایەتییانە لە عومەر نامۆ نین، چونکە دەرچووی قوتابخانەی پەیامبەر ﷺ ئەو پێشەنگە چاکەی، کە لەسەر دەستی سەرجەم چاکی و ئاکارێکی پیرۆزی لێ فێر بوە، هەڵبەت عومەر بەچاوی خۆی و بەگوێیەکانی گوێی لێ بوە لە عەرەبێکی دەشتەکی، کە هێرشی دەکردە سەر پەیامبەری خوا ﷺ، لە کاتێك دا لە نێو هاوەڵانی دا بوو پێی دەگوت: پێم ببەخشە، ئەم ماڵە نە ماڵی تۆیە و نە باوکت. پەیامبەری بینی بەزەردەخەنەوە بە عەرەبەکەی گوت: "ڕاستت گوت، ئەمە ماڵی خوایە"عومەر بەم دیمەنە تووڕە بوو، بۆیە لە عەرەبەکە نزیك بوەوە بۆ ئەوەی پەلاماری بدات، بەڵام پەیامبەری خوا بە هێمنی پێی فەرموو: "لێی بگەڕێ عومەر، بۆ خاوەن ماف قسە هەیە"

---

[٥٤٥] أحمد إبراهيم أبو سن: الإدارة في الإسلام، ص١٠٩.

[٥٤٦] أحمد إبراهيم أبو سن: الإدارة في الإسلام، ص١١٠.

پەیامبەر ﷺ دەفەرموێت: (إن الله يرضى لكم ثلاثة: أن تعبدوه ولا تشركوا بە شيئاً، وأن تعتصموا بحبل الله جميعاً ولا تفرقوا، وأن تناصحوا من ولاه الله أمركم). واتا: (خوا لە سێ شت دا لێتان ڕازی دەبێت: کە بیپەرستن و هاوبەشیی بۆ دانەنێن و، خۆ بە پەتی خواوە بگرن و لێی جیا نەبنەوە و، ئامۆژگاریی ئەو کەسە بکەن، کە خوا کاروبارتانی داوەتە دەستی).

لێرە دا ڕاوێژ و بەشدار کردن لە کارگێری دا نە خۆشی و، نە ساختەیە لە ژێردستە و هاولاتییان، بەڵکو ڕاپەڕاندنی بەرپرسیارییە لە لایەن هاولاتییان لەگەڵ فەرمانڕەوا دەست لەنێو دەست و، خواست بە خواست و پەنا بە پەنا و، بە هەست کردنی هەر تاکێك بەوەی، کە مافی هەیە لە بەرهەڵستی بە ڕاستگۆیی و بڕواوە و، ڕاکەشی ڕێزدار و ڕێز لێگیراوە و، دڵنیاییشی پارێزراوە لە پەلامار و خراپە پێ کردن. بەمەش کۆمەڵگەی دڵی ئیسلام دروست بوو، بوێر لە ڕا دەرکردن و ڕازگر لەوەی دەیلێت و دەیکات[٥٤٧].

٤) **مەشق پێ کردن:** ئەمەش یەکێك لە پێویستییەکانی کارامەیی مرۆیی سەرکردەیە، لەبەر ئەوەی سونەتی پەرەسەندن لە هەر سەردەمێك دا، ئامادە کردنی کارکەرانی پێویستە، بۆ هەڵستان بە بەرپرسیارییان بە باشترین ڕوو. هەڵبەت پەیامبەری خوا ﷺ بڕوای بە ئامادە کردنی کارکەران لە سەرەتاکانی ولاتی ئیسلام دا، هەبوو، بە جۆرێك بۆ پڕ کردنەوەی پایەکانیان بە لێوەشاوەیی و توانست، ئامادەیان بکات، هەروەك دەستی کرد بە مەشق پێ کردنی شارەزایان و ناردنیان بۆ هەرێمەکان بۆ شارەزا کردنی خەڵکی بە ئایینەکەیان.

پەیامبەر ڕای وابوو، کە فراوان بوونی ناوچە ڕزگار کراوەکان پێویستی هەیە، کە هەندێك لە هاوەڵان فێری ساز کردنی دەبابە و مەنجەنیق بکات[٥٤٨]، واتە سازییە

---

[٥٤٧] أحمد إبراهيم أبو سن: الإدارة في الإسلام، ص١١١.

[٥٤٨] الضبور: جلود تغشى خشباً فيها رجال، وقالوا هي الدبابات تقرب للحصول لتنقب من تحتها. الواحدة ضبرة.

جەنگییەکان، هەروەك دوو لە هاوەڵانی بۆ یەمەن نارد بۆ فێر بوونیـان و، خـەڵکی تائیف یەکەمین بوون، کە مەنجەنیقیان هەڵدا.

ئەگەر یەکێك لە زیرەکـەکانی هاوبەشـدانەران بکەوتایەتـە دەسـتی پەیامبـەر زۆرجار دەیهێشتەوە، بۆ ئەوەی لە ژیانی دا سوودی بۆ ئیسلام هەبێت، ئەگەر خۆی دا بە دەستەوە.

ڕێگەی دەدا بە بـەکارهێنانی ئافرەتـان لـە جـەنگ و شـەڕەکانی دا، هـەروەك مەشقیان پێ دەکرا بۆ خزمەت کردنی برینـداران و گرتنـە دەسـتی پیـاوان لـەوەی دوگونجێ بۆیان، وەك خـواردن و ئـاوگێڕان و، هـان دانـی ئـەوەی پێداویسـتی پـێ هەبوایە، ئافرەتان لە حکومەتی پەیامبەر ﷺ بانگخواز و مامۆستا، چێشـتلێنەر، نەخۆشیار، ئاوگێڕ، بەرگدروو، هاندەر بوینە.

هەڵبـەت جێنشـینەکانیش بایـەخیان داوە بـە گەشـە پێـدانی زانیـاری لای کارگەرانیان لە ویلایەت و هەرێمەکان، هەروەك مەدینە لە ڕۆژگـاری عومـەر وەك قوتابخانەیەك بوو تێی دا دادوەر و کارگەر و سەرکردە و پێشـەوای لـێ دەردەچـوو، کەسێکی نەدەنارد بۆ هەرێمەکان مەگەر چەندین تاقی کردنەوەی بۆ بکردبوایـە و، زۆر بە کەمی لە هەمبەر خەڵکی دا هەڵەی کردوە. کـەعبی کـوڕی سـوار لـە لای عومەر دانیشت بوو ژنێك هات سـکالای لـە پیاوەکـەی کـرد بـە کـەعبی گـوت: دادوەری لە نێویان دا بکە. جا کە دادوەری کرد و چارەسەری کرد سـەری سـووڕما بە خەیاڵی دا نەدەهات ئەو بڕیارە بدات، بـە کـەعبی گـوت: بـڕۆ ببـە بـە دادوەر لەسەر بەسرە.

هەڵبەت وەرزەکانی حەجیش لە سەردەمی عومەر وەرزی کۆنگرەی مەشـق پـێ کردنی والی و کارگەران بوون لە هەرێمەکان، لەوێ دا ئەو شتانەیان تاوتوێ دەکرد، کە لە گرفتە کارگێڕییەکان دا دووچاری ببوونـەوە و، هـەر یـەکێکیان سـوودی لـە شارەزایی ئەوەی تر وەردەگرت. هەروەك ئەو پەیامـە درێژانـەی ، کـە ئەبویـەکر و عومەر و عوسمان و عەلی بۆ والییەکانیان دەنـارد، ئاراسـتەی کـارگێر و ڕێبـەری مەشقی لە کاروبارەکانی دادوەری و یەکسانی نێوان ژێردەستە و پەناگرەکان و باش

تەگبیر کردنی کاروباری مووسوڵمانان و، بانگ کردنی والییەکان بۆ لە خواترسی و میانڕەوی کردن و وەرنەگرتنی دیاری و، چارەسەر کردنی پێداویستیی خەڵکی و سەردان کردنی نەخۆشی تێ دا هەبوو.

٥) **پێ سپاردن:** کرداری پێ سپاردنیش هەندێك دەسترۆیییەکانی سەرکردە بۆ کارمەند و جێگر و یاریدەدەر، دەچێتە نێو قالبی کۆڵەگەکانی کارامەیی مرۆیی، لەبەر ئەوەی سەرکردە مرۆڤێکی توانست سنووردارە و، ناتوانێت بە هەموو شتێك هەڵستێت، دەبێت هەندێك لە دەسترۆیییەکانی بە کارگەرانی بسپێرێت، بۆ ئەوەی لەباتی ئەم کاروباری مووسوڵمانان ڕاپەڕێنن، ئەمە کاریگەرییەکی دیاری نەکراو دەکاتە سەر کارکەر لە پێ سپاردنی و، لە هەست کردنی بەوەی ئەگەر جێی متمانەی سەرکردەکەی نەبوایە ئەو کاروبارەی پێ نەدەسپارد، ئەمەش گیانی واتایی کارکەر بەرز دەکاتەوە، پاڵی دەنێت بۆ هەڵستان بە ڕاپەڕاندنی بەرپرسیاریی سپاردە لە باشترین شێوە و، لەسەر بە پاکی کارکردن ڕای دەهێنێت[٥٤٩].

پەیامبەر ﷺ زۆرێك لە بەرپرسیارییە کارگێڕییەکانی بە هاوەڵانی دەسپارد، هاوەڵانی بۆ گەیاندنی ئایین بە عەرەب و، وەرگرتنی خێر لێیان دەنارد، هەروەك لەگەڵ مەعازی کوڕی جەبەل کردی کاتێك بۆ یەمەن ناردی و، ئەگەر یەکێك لە سەرۆك خێڵەکان بچوو بوایە بۆ لای، کۆ کردنەوەی دەرامەت پێ دەسپارد و، فەرمانی پێ دەکرد مژدەی چاکە بە خەڵکی بدات و قورئانیان فێر بکات و لە ئایین شارەزایان بکات، ڕایسپارد، لە حەق دا لەگەڵ خەڵکی نەرم بێت و، لە ستەم دا لەگەڵیان توند بێت.

جێنشینەکانی ڕاشیدینیش لەسەر ئەم ڕێڕەوەی پەیامبەر ﷺ ڕێیان گرتەبەر لە پێ سپاردن. موحەمەدی کورد عەلی دەڵێت: ڕێگەی عومەر لە کارگێڕی دا ڕێگای ئەبوبەکر و هاوەڵەکەی پێشووی بوو، پێدانی ئازادی بە کارکەر لە کاروباری

---

[٥٤٩] أحمد إبراهيم أبو سن: الإدارة في الإسلام، ص١١٢.

ئاسایی، واتا ناوخۆیی و کۆت کردنی لە پرسە گشتییەکان و، چاودێری کردنی لە نهێنی و ئاشکرای[٥٥٠]

٦) **چاودێری و لێپێچینەوە:** ئەمەش کردەیەکی کارگێڕییە، پەیوەستە بە کارامەیی مرۆیی سەرکردە و، لە زنجیرە دا دوای پێ سپاردنی هەندێك لە دەستڕۆیییە کارگێڕییەکان لە لایەن سەرکردە بە والی و یاریدەدەرەکانی دێت.

سەرکردەی سەرکەوتوو پەتەکە بۆ والییەکانی جێ ناهێڵێت، بەڵکو چاودێرییان دەکات بۆ ئاسوودە بوون لە ساغیی ڕاپەڕاندن و پابەندییان بە ئامانجی نەخشە بۆ کێشراو، بەمەش بەرپرسیارییەکەی تەواو دەبێت.

عومەر خوا لێی ڕازی بێت بە هاوەڵانی دەگوت: "ئەگەر کەسێکم بەسەرتان دا بەکار هێنا، پێم باش بوو، پاشان فەرمانی داگەریم پێ دا، ئایا گەردنم ئازاد دەکەن؟ هاوەڵانی دەیانگوت: بەڵێ. ئەویش دەیگوت، نەخێر تا دەمڕوانییە کارەکەی، ئایا بەوەی فەرمانم پێ داوە کار دەکات یا نا" و دەڵێت: "هەر کارکەرێکم ستەم لە یەکێك بکات و ستەمەکەم پێ بگەیەنرێت و نەیگۆڕم ئەوا من ستەمەکەم کردوە"

ج- **کارامەیی هونەری:** مەبەست لە کارامەیی هونەریی سەرکردە، زانیاریی تایبەتە بە لقێك لە لقەکانی زانست و، توانست لە بەجێهێنانێکی باش لە سنووری پسپۆڕی و، ئاسانیی بەکارخستنی ئامرازە فەراهەمەکان لەم پسپۆڕییە. ئەو سەرکردەیەی یەکەی پسپۆڕییەکەی باش دەکات، دەبێتە پێشەنگی کۆمەڵ و، سەرچاوەیەك دەبێت بۆیان ئەگەر لە شتێك دا زانیارییان نەبوو، بەمەش متمانە و ڕێزیان لا دروست دەکات، جا سەرکردە داوا لێ کراو نییە بە هەڵستان بە هیچ کارێکی هونەری لە ناوەوەی پسپۆڕییەکەی، چونکە کارە کارگێڕییەکانی کاتێکی زۆری لێ دەبەن، بەڵام زانینگەرایی هونەری توانای پێ دەدات لە پلان دانانی کار و دابەش کردنی بەسەر کۆمەڵە دا، پاشان چاودێری کردنی کۆمەڵە، بۆ دڵنیا بوون لە جێبەجێ کردنی پلان و ئامانجی وێنا کراو، وەك ئەوەی پێویستە.

---

[٥٥٠] أحمد إبراهيم أبو سن: الإدارة في الإسلام، ص١١٣.

هەڵبەت پەیامبەری خـوا ﷺ نموونـەی بـەرزی هـاوەڵانی بـوو لـە توانسـت و کارامەیی هونەری و چاك ڕاپەڕاندن لە هەموو ئەو کاروبارانەی دەهاتنە پێشی. لـە بنیات نانی مزگەفتی مەدینە بە دەستی خۆی لەگەڵ هاوەڵانی دا کاری دەکـرد و، لە پێشەوەی سووپاکەی جەنگی دەکرد، تەنانەت برینداریش بوو و، ئاشـنای دابـی عەرەب و ڕەوشتیان بوو و توانستدار بوو لە بە تەنگەوە چوون و ئاخافتنی جوان لە گوزارشتەکانیان[551]

هەروەك عومەر کوڕی خەتاب زانا بوو بە دادوەری و، پەی دەبرد بە سروشـتی کاری دادوەری و ئەوەی پێویستە پەیڕەوی بکریـت لـە ڕێوشـوێنە دادوەرییـەکان ، گـەواهی ئەمـەش نووسـراوەکەیەتی، کـە لـە نووسـراوی ڕێوشـوێنی دادوەری بـۆ والییەکەی ئەبو مووسای ئەشعەری هاتوە.

هەروەك عەلیی کوڕی ئەبی تالیب تایبەتمەنـد بـوو لـە ئـایینزانی و هـەروەها دادوەر و، زاناش بوو لە شێوازی میرات بە شێوەیەکی تایبەت، هەتا دەگێڕێتـەوە، کە ژنێك هاتە لای پێی گوت: ئەی پێشەوای بڕواداران، ئایا ڕازی دەبیت برام بمرێت خزمەکانی هیچم پێنەدەن تەنها یەك درهەم، کە زۆریشن و، شەش سـەد درهـەمی بۆ جێهێشتوون؟ سەروەرمان عـەلی دەسـتبەجێ گـوتی: "دیـارە براکـەت مـرد و لەدوای دا دوو کچ و هاوسەرێك و داکێکی و دوازدە بران لەگەڵ تۆ؟" گوتی: بەڵێ. پێی گوت: "کەواتە بە تەواوی بەرکەوتەکەت لە میراتەکە گەیشتویت". کاتێکیش ئامادە بوان بەرکەوتی هەر تاکێکیان ئامار کرد بینیان، کە بەرکـەوتی خوشـکەکە درهەمێك بوو.

**خواستەکانی کارامەیی هونەری:** کارامەیی هونـەری سـەرکردە تایبەتـە بەم کاروبارانەی خوارەوە:

١) بڕوا بوون بە ئامانج و گەیاندنی بە کۆمەڵ.
٢) توانست لە پلان دانان و ڕێکخستن.
٣) پابەند بوون بە بەرپرسیاری و هەڵسوکەوتی باش.

---

[551] أحمد إبراهيم أبو سن: الإدارة في الإسلام، ص١١٤.

٤) پەرە پێدانی ڕێکخراوە و چاوکراوەیی.

وردەکاریی ئەم خواستانەش لەم لاپەڕانەی خوارەوە ڕوون دەکەینەوە:

١) **بڕوا بوون بە ئامانج و ڕوون کردنەوەی بۆ کۆمەڵ:** بڕوا بوون بە بنەما و، تێکۆشان لە پێناوی یەکەم کۆڵەگەکانی سەرکەوتنی سەرکردەی سەرکەوتوون، هەڵبەت سەرکردە مووسوڵمانەکان باشترین نموونەیان پێداوین لە بڕوا بوونیان بە ئامانج و کار کردن بۆ بەدەست هێنانی و خۆ ماندوو کردن لە پێناوی، چیرۆکی پەیامبەر ﷺ لەگەڵ ئەبی تالیبی مامیشی بەڵگەیەکی یەکلاکەرەوەیە لە هێزی بڕوا بوون بە ئامانج و مکوڕ بوون لەسەر بەدەست هێنانی.

ئەبو تالیبی مامی کاتێك هەڕەشەی لێ کرا لە لایەن قورەیش و بەڵێنی دابڕینیان لەگەڵ دا، پێی گوت: "ئاگات لە من و لە خۆشت بێت شتێکم بەسەر مەهێنە، کە بەرگەی نەگرم" جا پەیامبەری خواش ﷺ وەڵامی دایەوە: (والله يا عم، لو وضعوا الشمس في يميني والقمر في يساري على أن أترك هذا الأمر ما فعلت حتى يظهره الله أهلك دونه). واتا: (مامە سوێند بەخوا، گەر خۆر لە ڕاستەم و مانگیش لە چەپەم دابنێن، کە واز لەمە بهێنم واناکەم هەتا خوا سەرم دەخات).

بۆ فریودان و هەڕەش نەرمیی نەدەنواند، ئەوەتا عوتبە کوڕی ڕەبیعەی عەبەسی لە بەنی عەبد شەمسی کوڕی عەبد مەناف هاتە لای و پێی گوت: "ئەگەر تۆ بەوەی بۆی هاتویت دارایت مەبەستە، ئەوا بۆت کۆ دەکەینەوە هەتا لە هەموومان زیاترت دەبێت و، ئەگەر پادشایەتیت دەوێت دەتکەینە پادشا بەسەر خۆمان و، ئەگەر خانەدانیشت دەوێت گەورەت دەکەین هەتا هیچ شتێك بێ تۆ نەبڕێتەوە و، ئەگەر ئەمەی لاتە لە جنۆکەوە تووشی هاتویت و ناتوانیت لە دەروونت دا دەری بکەیت، داوای پزیشکت بۆ دەکەین و داراییت بۆ خەرج دەکەین تاوەکو چاکت دەکەینەوە، چونکە ڕەنگە جێی خۆی لەسەر پیاو جێ بهێڵێت تا چارە دەکرێت"، جا پەیامبەر ﷺ فەرموی: (تەواو بوویت ئەی ئەبا وەلید؟) گوتی: بەڵێ. فەرموی: (دە گوێم بۆ بگرە). سەرەتای سووڕەتی (فوصیلەت)ی بۆ خوێندەوە هەتا فەرمایشتی خوای گەورە: ﴿فَإِنْ أَعْرَضُوا فَقُلْ أَنذَرْتُكُمْ صَاعِقَةً مِّثْلَ

صَاعِقَةً عَادٍ وَثَمُود (١٣) إِذْ جَاءتْهُمُ الرُّسُلُ مِن بَيْنِ أَيْدِيهِمْ وَمِنْ خَلْفِهِمْ أَلَّا تَعْبُدُوا إِلَّا اللَّهَ قَالُوا لَوْ شَاء رَبُّنَا لَأَنزَلَ مَلَائِكَةً فَإِنَّا بِمَا أُرْسِلْتُمْ بِهِ كَافِرُونَ﴾[٥٥٢] واتا: "(جا) ئەگەر بەرهەڵستیان کردیت بڵێ بە سزایەکی سەخت وەکو سزای عاد و سەموود ئاگادارتان دەکەمەوە {١٣} کاتێك پەیامبەران لە هەموو لایەکەوە هاتنە لایان، کەوا جگە لە خوا نەپەرستن، دەیان گوت ئەگەر خوا بیویست بوایە، فریشتەی بۆ دادەبەزاندین، بۆیەش ئێمە بەوەی بۆی هاتوون بێ باوەڕین"

عوتبە بە گوێ لێ بوونی ئەم ئایەتانە کاریگەر بوو و، تکای لێ کرد بەس بێت، کە گەڕایەوە لای نەتەوەکەی و ئەوەی گوێی لێ بوو بۆی گێڕانەوە پێیان گوت: موحەمەد جادوی لێ کردویت[٥٥٣]

هێزی بڕوا بوونی پەیامبەر ﷺ لە مکوڕ بوون لەسەر پەیڕەو کردنی حەق بوو، وای لە مووسوڵمانان کرد، پابەند بن بە بانگەوازەکەی و فەرمانبەری فەرمانەکانی بن. لە جوانترین نموونەی بڕوا بوونیش بە ئامانج، گوتەی میقدادە بۆ ئەم، کاتێك پەیامبەر ﷺ جەنگی خستە بەردەم هاوەڵانی: "ئەی پەیامبەری خوا ئەمە بکە، کە خوا فەرمانی پێ کردویت و، ئەوەت پێ ناڵێین وەك ئەوەی بەنی ئیسرائیل گوتیان: ﴿فَاذْهَبْ أَنتَ وَرَبُّكَ فَقَاتِلا إِنَّا هَاهُنَا قَاعِدُونَ﴾. واتا: "دە خۆت و پەروەردگەرت بڕۆن و شەڕ بکەن ئێمەش وا لێرە دانیشتوین" بەڵکو دەڵێین خۆت و پەروەردەگەرت بڕۆن شەڕ بکەن ئێمەش لەگەڵ ئێوە لە شەڕکەرانین، سوێند بەوەی بە ڕاست تۆی ناردوە ئەگەر بمانبەیت بۆ "بەرکی خەماد" {شارێکە لە حەبەشە} لێت جیا نابینەوە هەتا دەیگەیتێ[٥٥٤]

هەروەك جێنشین ئەبو بەکریش دەبینین لە دامرکاندنەوەی ئاژاوەی هەڵگەڕاوەکان دوای کۆچی دوایی پەیامبەر ﷺ، هەمان هەڵوێستی هەبوە، سەرباری بەرهەڵستیی عومەر و هەندێك لە هاوەڵانی لەم دەستپێشخەرییە، جا بە

---

[٥٥٢] سورة فصلت: الآيتان ١٣ – ١٤.

[٥٥٣] أحمد إبراهيم أبو سن: الإدارة في الإسلام، ص١١٥.

[٥٥٤] ابن هشام: السيرة النبوية، ج٢، ص٢٦٦ وما بعدها.

هاوەڵانی گوت: "سوێند بەخوا ئەگەر ئەو بارە وشترەی، کە بە پەیامبەری خوایان دەدا بە منی نەدەن ئەوا جەنگیان لەگەڵ دا دەکەم"، عومەر گوتی: : ئەمە شتێك نییە، مەگەر خوا خستویەتییە دڵی ئەبو بەکر بۆ جەنگ بۆیەش زانیم، کە ئەم ڕاستە"

بڕوا بوون بە ئامانجیش لە لای کۆمەڵ تەواو نابێت، مەگەر بە ڕوون کردنەوەی ئەم ئامانجە و، گواستنەوەی بۆ سەرجەم ئاستەکانی کارکەران، مەرامەکانی بۆ ڕوون بکاتەوە و بۆ کردنی بە پێشەنگێك و ئامانجێك لەبەردەمیان. هەڵبەت جێنشینەکان هەوڵیان دا، ئامانجەکە ڕوون بکەنەوە و بە کۆمەڵی بگەیەنن لە ڕێگەی ئاخاوتنی ڕاستەوخۆ لەگەڵیان و، لە نووسراو و نامەکانیان بۆ والییەکانیان لە هەرێمەکان. دەشێت نموونەی ئەمەش ئەوە بێت، کە سەروەرمان عومەری کوڕی خەتاب لە سەرەتای سەردەمی جێنشینی دا پێی هەڵستا، کاتێك گوتارێکی درێژی بۆ خەڵکی دا، تێی دا ئامانج و شێوازی کار و بەرپرسیارییەکەی ڕووەو کۆمەڵگەی مووسوڵمانان و، ئەوەی لە کۆمەڵی دەخوازێت لە ئامۆژگاری و ڕاوێژ و، واز هێنان لە ستەم و ئەوەی خوا بەری لێ گردوە، دیاری کرد[٥٥٥]. عومەر گوتی: "زانیومە خەڵکی بیمیان لە توندیم کردوە و، لە زەبرم دەترسن و دەڵێن: پەیامبەری خوا لە نێومان دا بوو عومەر توند بوو، پاشان ئەبوبەکر والیمان بوو ئەو توند تر بوو، ئێستا کاروبارمانی وەرگرتوە دەبێت چۆن بێت؟ هەڵبەت ئەوەی ئەمە دەڵێت ڕاست دەکات، من یاریدەدەر و خزمەتکاری پەیامبەری خوا بووم و، ئەویش سڵاوی خوای لەسەر بێت کەس لە نەرمی و میهرەبانی دا پێی ناگات، هەروەك خوای گەورە دەفەرموێت ﴿بِالْمُؤْمِنِينَ رَؤُوفٌ رَّحِيمٌ﴾[٥٥٦]، من وەك شمشێرێکی هەڵکێشراو لە نێو دەستەکانی بووم، تا لە کێلانی دەنام یا بەری لێ دەگرتم، هەرگیزیش لە پەیامبەری خوا ﷺ لام نەداوە زۆر ستایش بۆ خوا هەتا فەرمانی خوای بە جێ گەیاند لێم ڕازی بوو و، زۆر شانازی بەمە دەکەم، پاشان ئەبوبەکر کاروباری موسوڵمانانی گرتە

---

[٥٥٥] أحمد إبراهيم أبو سن: الإدارة في الإسلام، ص١١٦.

[٥٥٦] سورة التوبة: الآية ١٢٨.

ئەستۆ، ئەویش لەوانە بوو، کە کەس لەسەرخۆیی و ڕێز و نەرمیی نکۆڵی ناکات، من یاریدەدەر و خزمەتکاری بووم و، توندیم تێکەڵی نەرمییەکەی ئەو بوە شمشێرێکی هەڵکێشاوی ئەویش بووم تا لە کێلانی دەنام بەری لێ دەگرتم، هەرگیز سەرپێچییم نەکرد زۆر ستایشی خوا دەکەم هەتا خوای شکۆمەند بۆ خۆی بردەوە ئەو لە من ڕازی بوو و، شانازی بەمە دەکەم".

پاشان خەڵکینە کاروباری ئێوەم گرتە ئەستۆ، بزانن ئەم توندییە لاواز بوە، بەلاّم بۆ خەڵکی ستەمکەر و دەستدرێژیکەر وەك خۆیەتی، بۆ خەڵکی بێ گرفت و ئایین و مەبەستدار بۆ هەر جۆرێکیان نەرمترینم و، هەرگیز ڕێگە نادەم کەسێك ستەم لە کەسێك بکات، یا دەستدرێژی بکات، ڕوومەتی دەخەمە سەر زەوی، تا بۆ حەق پەشیمان دەبێتەوە، دوایی ئەم توندییەشم بۆ خەڵکی لێبوردە و کەم دەرامەت ڕوومەتم دەخەمە سەر زەوی"[٥٥٧]

٢) **توانست لەسەر پلان دانان و ڕێکخستن:** توانست لەسەر پلان دانان و ڕێکخستن ئەو پێوەرەیە، کە سەرکردەی پێ لە یەکی تر جیا دەکرێتەوە و، ئەم توانستەش دەخوازێت، کە پلانەکان ڕوون بکرێنەوە و، سیاسەتەکان وێنا بکرێن و پسپۆرییەکان لە سنووری توانا مرۆیی و کەرەستەییە ڕەخساوەکانی سەرکردە دا بن.

هەڵبەت ئەزموونەکانی گەشە پێدانی هاوچەرخ بەڵگەن، کە زۆرێك لە پلان و پرۆژە گەشەییەکان بە هۆی نەگونجان یا ڕێ نەکردنی پلان و ڕێکخستن لەگەڵ توانستە مرۆییە ڕەخساوەکان و، ڕەخسانی توانا کەرەستەییەکان، کە تەواو کردنی پرۆژە گەشەییەکان لەکار دەخات یا کار تێی دا بەجارێك دەوەستێت، شکستیان هێناوە.

لە بەشەکانی پێشوو، لەسەر بابەتی پلان دانان و ڕێکخستن لە ولاّتی ئیسلامی ڕۆیشتوین و، پلان دانانی چاك و توانست لەسەر ئەو ڕێکخستنەی، کە لە سەردەمی پەیامبەر ﷺ و جێنشینەکانی ڕاشیدین دەرکەوتن، ڕوونمان کردەوە

---

[٥٥٧] أحمد إبراهيم أبو سن: الإدارة في الإسلام، ص١١٧.

٣) **پابەند بوون بە بەرپرسیاری:** لە گرنگترین تایبەتمەندییەکانی سەرکردە ئەوەیە، کە جیاواز و تایبەتمەندە لە هەمبەر دەورووبەر و تاکەکانی پیشەکەی لە نموونەی بڵندی و لە پێوەرەکان و سنووری وزەی. سەرکردە پیاوێکی ئازایە، لە بەرپرسیاری ڕا ناکات، بەڵکو هەوڵی هەڵگرتنی دەدات و ئاکامەکانی دەگرێتە ئەستۆ و، لە قوربانی دان و ئاریشەی هەرچەندیش بێت. و پابەند بوونیش بە بەرپرسیاری و هەڵ گرتنی دەخوازێت و، ئامادەباشیی تەواوی هەبێت بۆ گەڕان بە دوای ئەو گرفتانەی، کە ڕووبەڕوی کار دەبنەوە و، بوێری لە وەرگرتنی بڕیار و بەرگە گرتنی ئاکامەکانی.

پێداویستی زۆر بۆ سەرکردەی ڕێبەر کاتێك دەردەکەوێت، کە شتەکان توند دەبن بە کردەی نەهامەتی یا قەیران یا دۆخی نالەبار و، سەرکردەی هۆشیاریش ئەوەیە، کە لەژێر ئەم دۆخە کار دەکات و هەڵسوکەوتی باش و چەسپاو و چاونەترسی دەکات، لەم بارانەش چاوەڕوانی کارکەران بە سەرکردەوە پەیوەندیدار دەبێت و بە هەستەوە بەرەو ڕووی دەچن، لە چاوەڕوانیی چۆنییەتیی ئەوەی سەرکردە لە هەلۆێستەکە بە کەمترین زیان و قوربانیی کەرەستەیی و مرۆیی لێی ڕزگار بێت.

٤) **پەرە پێدانی ڕێکخراوە و چاوکراوەیی:** لە پێشەکیی کردە بنەڕەتییەکانی سەرکردە بزواندنی ڕێکخراوە بۆ پێشەوە و، ئەم کارەش ئەوە دەخوازێت، کە بەجۆرێك لەسەر خۆ نەبێت گرفت دروست بێت و بوارێك بۆ سستی نەهێڵێتەوە لە ئامانجەکان، بەڵکو دەبێت هەمیشە لە کار کردن دا بەردەوام بێت بۆ پەرە پێدانی ئەفراندن و داهێنان و، بەسەر کردنەوەی ڕەوشی کۆمەڵە و بیر کردنەوە لە چۆنییەتیی باش کردنی دۆخەکەی. هەڵبەت کارگێری لە سەردەمی پەیامبەر ﷺ و جێنشینەکانی ڕاشیدین دا سەرکردەی وای بەخۆیەوە بینی، کە ڕۆژیان لە خزمەت کردنی کۆمەڵگەکەیان دا دەبردە سەر و لەشەویش دا بۆ بەسەر کردنەوەی ڕەوشی ژێردەستەکانیان شەونخوونیان دەکرد.

پەرە پێدانی ڕێکخراوە و هاندانی بۆ پێشەوە لە سەرکردە دەخوازێ هەمیشە لە بیری دا ئایندەی لێ دیار بێت و، و شتێك ببینێت، کە کەسانی تر نایبینن بە تیژڕەوی بیر و تاقی کردنەوەی پێگەیشتوو و چاوکراوەییەکەی.

هەڵبەت سەروەرمان عومەر نموونەیەکی جوانی چاوکراوەیی بۆ سەرکردە پێداوین، کە هەمیشە کار دەکات بۆ هێشتنەوەی هەستی زیندوویی لای کارکەران و والییان بە ئامانجی ئیسلامی لە هەڵسوکەوتیان و ڕەفتارییان، پشت بە سستی نەبەستن و ژێردەستە فەرامۆش نەکەن، ئەویش بە بەسەر کردنەوەیان بەخودی خۆی و لە ڕێگەی چاوەکانی و، کە هەمیشە بیر کردنەوەیە لە چۆنییەتیی پەرە پێدانی کۆمەڵگەکەی. هەروەك ئاماژە بە عەمری کوڕی عاس دەکات لە بنیات نانی کەناڵێکی دانەوێڵە لە میسرەوە بۆ حیجاز و، چارە کردنێکی دانایانەی برسێتی و وشکەساڵی تا خەڵکی بە ساغی لێی دەرچواند، هەروەك ڕای وابوو، کە زەوییە ڕزگار کراوەکان بەسەر مووسوڵمانە ڕزگارکەرەکان دابەش نەکرێت و، بە سەرچاوەیەکی داهاتی چەسپاوی ماڵی دارایی مووسوڵمانان بمێنێتەوە و، دیوانی دارشت، بۆ یەکەم جار لە مێژووی ئیسلام، کاتێك هەستی بە پێداویستی کرد، کە دیوانی باج و دیوانی پەیامەکان(نامە) و دیوانی سەرباز کردنی دارشت[٥٥٨]

سەرکردایەتی مانانی بەڕێوەچوونی ئاسایی ڕۆژانە نییە، بەڵکو مانای ڕەنجی هۆشیارانەیە لە پەی بردنی تەواو و ورە تازە بوەوەی پەرە پێدان و چاکسازی، ئەم چەمکەش دووپات دەکاتەوە، کە لە پێشەکیی کردەی سەرکردەی کارگێر ئەوەیە، سەرکردەیەکی پەرە پێدان و تازە کردنەوە و چاکسازی بێت و، ڕێگەی تازە کردنەوە و چاکسازیش شتێکی ئاسان نییە، بەڵکو لە سەرکردە دەخوازێت، کە هەمیشە لە بیری باری کۆمەڵگەکەی دا بێت و، پلان دانانی لەبار لەگەڵ تواناکانی و، هزر کردن لە فراوان کردنی توانا کەرەستەییەکانی و ڕەخساندنی توانا مرۆییە مەشق پێ کراوەکان و، چاودێری کردنی بەدەست هێنانی و جێبەجێ کردن و، ڕازی کردنی کارکەران لەگەڵی بە پێویستی خستنەگەڕی توانای بەردەوام لەلایانەوە.

---

[٥٥٨] أحمد إبراهيم أبو سن: الإدارة في الإسلام، ص١١٨.

سەرکەوتنی سەرکردە لە کۆتایی دا پشت دەبەستێت بە توانستی لەوەی، کە هانی کۆمەڵەکەی بدات بۆ بەکارخستنی توانا ڕەخساوەکانی بۆ بەدەست هێنانی ئامانجی ویستراو.

**پوختە:** لە دوان لە سەرکردایەتیی کارگێری لە ئیسلام پوختی دەکەینەوە، کە بەو ئەدگارانەی خوارەوە جیا دەکرێتەوە:

١) لە شێواز دا سەرکردایەتییەکی میانڕەوە، ڕەچاوی ماف و ئەرکی تاك و کۆمەڵی مووسوڵمانان دەکات بە دادگەری و یەکسانی و، نە هەوەسی بۆ توندی دەچێت و نە نەرمی و نە دەسەلاتخوازی و زێدەڕەوی ناکات، هەروەك عومەر دەڵێت: "ئەمە چاك نابێت مەگەر بە نەرمی لە نابێ هێزی و بەهێزی لە ناتوند و تیژی"

٢) سەرکردایەتییەکی مرۆییە ڕێزی مرۆڤ دەپارێزێت و، لە هەر شتێکی پەیوەندیدار پێی بەشداری دەکات و، مامەڵەی باشی لەگەڵ دا دەکات، بە کار کردن بە ئایەتی پیرۆزی: ﴿وَاخْفِضْ جَنَاحَكَ لِمَنِ اتَّبَعَكَ مِنَ الْمُؤْمِنِينَ﴾[٥٥٩]. واتا: "باڵت بۆ ئەو بڕوادارانەی شوێنکەوتەتن نەوی بکە" و، ئایەتی ﴿وَشَاوِرْهُمْ فِي الأَمْرِ﴾[٥٦٠]. واتا: "لە کاروبارەکانیش دا ڕاوێژیان پێ بکە".

٣) سەرکردایەتییەکە وابەستەی کۆمەڵەیە، لە هیچ شتێك دا لێی جیا نابێتەوە، مەگەر گەوەر بوونی بەرپرسیاری بەسەر سەرکردە، هەروەك عومەر بە کارکەرەکەی ئەبو موسای ئەشعەری گوت: "..... خۆت بەشداری کاروباریان بکە، پیاوێکیت لەمان، تەنها ئەوە نەبێت، خوا بەرپرسیاریی زیاتر کردویت".

٤) سەرکردایەتییەکە بڕوای بە ئامانج هەیە و پابەند دەبێت پێی و، پەیڕەوانی قایل دەکات لە ڕێگەی پێشەنگییەکی چاکی سەرکردە و، مکوڕ بوون لەسەر ڕژدی وئارامگری و قوربانی دان لە لایەن خۆی لە پێناوی بەدەست هێنانی ئامانج،

---

[٥٥٩] سورة الشعراء: الآية ٢١٥.

[٥٦٠] سورة آل عمران: الآية ١٥٩.

بڕوانە تێکۆشانی پەیامبەر ﷺ و ئەبی بەکر لە بلاّو کردنەوەی بانگەواز و بەرەنگار بوونەوەی گومڕاکان.

٥) و سەرکردایەتییەکیشە، خاوەن کارامەییەکی سیاسییە بە وردی ڕەچاوی هەر هێزێکی کاریگەر لە ژینگەی دەورەدەری دەکات[٥٦١].

[٥٦١] أحمد إبراهيم أبو سن: الإدارة في الإسلام، ص١١٩.

# بەندی چارەم

# هەماهەنگی و پەیوەندیکاری لە سیستمی دانراوی و ئیسلام

**بەشی یەکەم:** هەماهەنگـــــی لە سیستمی دانراوی و ئیسلام دا.
**بەشی دوەم:** پەیوەندیکاری لە سیتسمی دانراوی و ئیسلام دا.

# بەشی یەکەم

# هەماهەنگی لە سیستمی دانراوی و ئیسلام دا

## توێژبەندی یەکەم

## پێناسەی هەماهەنگی

### یەکەم: لە سیستمە دانراوییەکان دا

هنری فایۆڵ پێناسەی هەماهەنگی دەکات بەوەی: "دەستەبەر کردنی تەبابیە لە نێو سەرجەم چالاکییەکان لە ڕێکخراوە دا، بە ڕێگەی بەڕێوەچوونی کار و بەدەست هێنانی سەرکەوتن"[٥٦٢]

دکتۆر سلیمان تەماوی پێناسەی هەماهەنگی دەکات بەوەی، کە سازانی نێوان چالاکییەکانی ئەو کۆمەڵەیە، کە کار بۆ بەدەست هێنانی مەبەستێکی هاوبەش و، هێنانە کایەی تەبایی نێوان تاکەکانی، دەکات، بەجۆرێك هەریەکێکیان ڕەنجی خۆی بۆ بەدەست هێنانی ئاواتە هاوبەشەکە دەخاتەگەڕ[٥٦٣]

دکتۆر موحەمەد سەعید عەبدول فەتاحیش پێناسەی کردوە بەوەی، فرمانێکە لە توانای دایە، وا لە کارگێڕ بکات، کە بتوانێت پەیکەرێك گەشە پێ بدات لە ڕەنجی کۆمەڵەیی و هاوبەشیی نێوان یاریدەدەر و کارمەندان و، بەدەست هێنانی یەکێتیی هەڵسوکەوت، بە ئاراستەی ئامانجێکی هاوبەش مسۆگەر بکات[٥٦٤]

---

[٥٦٢] هنری فایول: الإدارة الصناعية والعامة، ص١٢٨.

[٥٦٣] سليمان الطماوي: مبادئ الإدارة العامة، ص١٨٨.

[٥٦٤] محمد سعيد عبد الفتاح: الإدارة العامة، ص٢٧٩.

هەروەها دکتۆر ماجد حەلو هەماهەنگی پێناسە دەکات بەوەی، ئەو کۆششەیە، کە بۆ هاریکاریی بەشە جیاجیاکانی کارگێڕی و نەبوونی دژبەرییان لە پێناو بەدەست هێنانی ئامانجی هاوبەش، دەدرێت[٥٦٥]

لەمیانەی ئەم پێناسانەوەش دەتوانین ڕەگەزە دیارەکانی هەماهەنگی پوخت بکەین:

**ڕەگەزی یەکەم:** بەدەست هێنانی سازان لە نێوان چالاکییە جیاجیاکان لە ڕێکخراوەی کارگێڕی، یا هەوڵەکانی هەر کۆمەڵێك لە کۆمەڵەکانی ڕێکخراوە.

**ڕەگەزی دوەم:** هەماهەنگی ڕێگە لە ڕوودانی دژبەری لە نێوان بەشەکانی کاری کۆمەڵەیی دا، دەگرێت.

**ڕەگەزی سییەم:** هەماهەنگی بۆ بەدەست هێنانی ئامانجێکی هاوبەشی کۆمەڵە دەکرێت.

## دوەم: لە ئیسلام دا

ئایا لە ئیسلام دا پێناسەیەك بۆ هەماهەنگی هەیە؟ لە ڕاستی دا پێناسەیەك بۆ هەماهەنگی لە ئیسلام دا نابینین، بۆیەش هەوڵ دەدەین پێناسەیەك بۆ هەماهەنگی لە ئیسلام پوخت بکەین، لە میانەی پیادە کردارییەکانی کارگێڕی لە ئیسلام، بە نێو قۆناغەکانی وڵاتی ئیسلامی لە سەردەمە جیاجیاکان دا، بەر لەوەی ئەم پێناسەیەش بخەینەڕوو، نموونەیەك لە هەماهەنگی لە سەردەمی پەیامبەر ﷺ دەخەینە ڕوو لەگەڵ پشت بەستن بە نموونەیەکی بەرنامەکەی، پاشان دوای ئەمە دێینە سەر خستنەڕووی پێناسەی پێشنیار کراو.

کۆچی پەیامبەر ﷺ لە مەکەوە بۆ مەدینە سەرەتای دامەزراندنی وڵاتی ئیسلامی بوو، هەماهەنگیش ڕۆڵێکی گەورەی لە سەرخستنی ئەم کۆچە دا بینی، هەروەك پەیامبەر ﷺ کاری لە نێوان هاوەڵانی دا خوا لێیان ڕازی بێت دابەش کرد،

---

[٥٦٥] ماجد الحلو: علم الإدارة العامة، ص١٦٤.

ئەوەتا موسعەبی کوڕی عومەیری کوڕی هاشمی کوڕی عەبدول مەنافی لەگەڵ پیاوانی پەیمانی یەکەمی عەقەبە دا نارد و، فەرمانی پێ کرد، کە قورئانیان بۆ بخوێنێت و ئیسلامیان فێربکات و، لە ئایین دا شارەزایان بکات[٥٦٦] و، پەیمانی دوەمی عەقەبەی لەگەڵ هەفتا و سێ پیاو و دوو ژن دا بەست و، ڕێگەی بە مووسوڵمانان دا، کە کۆچ بۆ مەدینە بکەن بەر لەم، کاتێکیش ڕێگەی پێ درا بە کۆچ کردن، عەلیی خوا لێی ڕازی بێت لە جێگەی خۆی بەجێهێشت[٥٦٧]، ئەبوبەکریشی کردە هاوەڵی خۆی، عەبدوڵلای کوڕی ئەرقەمیشی بە کرێ گرت، کە هاوبەشدانەریش بوو، بۆ ڕێبەریان لە ڕێگە دا، عەبدوڵلای کوڕی ئەبوبەکریش هەڵستا بە گوێ گرتنی خەڵکی لە ڕۆژ دا و، پێگەیاندنیان لە ئەشکەوتی سەور لە ئێوارە دا، عامری کوڕی نوحەیرەی خولامی ئەبوبەکریش بە شوانێتیی مەڕەکانی بە دوای عەبدوڵلا دا دەڕۆیشت، بۆ ئەوەی شوێنەواری بسڕێتەوە و، ئەسمائی کچی ئەبوبەکریش هەڵستا بە ئامادە کردنی خواردنیان و پشتێنەکەیی کردە دوو لەت و، خواردنەکە بە یەکێکیانەوە هەڵواسی و بەدوەمیشیان لەتەکەی تری هەڵواسی، بۆیەش ناونرا خودان دوو پشتێنەکە[٥٦٨].

هەڵبەت پەیامبەری خوا ﷺ بنەمای هەماهەنگی و ڕێکخستنی پەیوەندیکارییەکانی لە وڵاتی ئیسلامی دا، دانا، ئەمەش هەر لە باش کردنی پەیوەندییەکانی نێوان تاکەکان کورت نەبوەوە، بەڵکو بە زۆر لەمە دوورتر گەیشت، هەروەك هەماهەنگیی ڕەفتاریی لە نێوان هۆزەکانی گەل دا دروست کرد و، ئەمەش یەکێتیی کۆمەڵایەتی و برایەتیی باوەڕیی لێ بەرهەم هات.

بەوجۆرە ڕێکخستنی کارگێڕیی ئیسلامی پاڵنانی واتایی باوەڕیی تاکەکان و هەماهەنگیی نێوانیانی دەست پێ کرد، پاشان بە شێوەیەکی پتەو بە ئامانجی باوەڕییەوەی پەیوەست کردن، کە سەرجەم ئاراستەی ئامانجێك کران، ئەویش ڕازی

---

[٥٦٦] ابن هشام: السيرة النبوية، الجزء الثاني، ص٢٩٦.
[٥٦٧] ابن هشام: السيرة النبوية، الجزء الثاني، ص٣٣٣.
[٥٦٨] ابن هشام: السيرة النبوية، الجزء الثاني، ص٢٩٦- ٣٣٦.

کردنی خوای شکۆمەند و، جێبەجێ کردنی فەرمانەکان و گوێڕایەڵیی پەیامبەرەکەی بوو، هەروەك ئەمیان براکەی پێش خۆی دەخست و، ئەویتر قوربانیی بە خۆی دەدا و، سێیەمیانیش قوربانیی بە ماڵ دەدا و، چارەمیان بە کارەکەی تێدەکۆشا و، سەرجەم لە ناوەوەی ئەم بنیاتە ڕێکخستنییە دەسازان و بۆ بەدەست هێنانی ئامانجەکە کۆششیان دەکرد.

ئێستاش دوای ئەم خستنە ڕوە کورتە دەتوانین پێناسەی ویستراو هەڵێنجێنین.

هەماهەنگی بەگوێرەی تێڕوانینی ئیسلامی: "سازانی نێوانی چالاکییە جیاجیاکانی کۆمەڵی ئیسلامییە بۆ بەدەست هێنانی یەك دەنگی و تەبایی نێوانیان، بە مەبەستی بەدەست هێنانی ئامانجێکی ڕەوا لە سایەی بەرزەفتکارییە ڕەواکان بە بەرزترین تەواوێتیی توانراو"

گومانیش لەوە دا نییە، کە هەماهەنگی گرنگییەکی گەورەی لە چارچێوەی کرداری کارگێڕیی سەرجەم ڕێکخراوە کارگێڕییەکان و، تەواوی ڕێکخراوە کۆمەڵەییە گشتییەکان و تایبەتەکان دا هەیە و، هەروا سەبارەت بە سەرجەم دەستگە کارگێڕییەکانی وڵاتیش[٥٦٩].

[٥٦٩] عبد الغني بسيوني عبد الله: أصول علم الإدارة العامة، ص٣١٠.

# توێژبەندی دووەم

## ئامانجەکانی هەماهەنگی

وەك لە پێشووش دا خستمانە ڕوو، کە ئامانجی گشتیی هەماهەنگی جەخت لەسەر بەدەست هێنانی سازان و تەبایی نێوان چالاکییە جیاجیاکانی ڕێکخراوەی کارگێڕی دەکاتەوە، بۆ بەدەست هێنانی ئامانجەکانی، بە بەرزترین تەواوێتیی توانراو، واتا بە کەمترین ڕەنجی توانراو و کەمترین تێچوونی دارایی توانراو و، خێراترین کات.

لە تەك ئەم ئامانجە گشتییانەش دا، چەندین ئامانجی لقی هەن دەتوانین لە ڕێگەی بەدەست هێنانی هەماهەنگییەکی کارا پێیان بگەین، ئەم ئامانجانەش بریتییە لەمانەی خوارەوە:

**١ - ڕێ گرتن لە دوو ڕایی لە پسپۆڕییەکان:** هەماهەنگی لەم بوارە دا ئامانجی کۆکردنەوەی هەوڵەکان و بەدەست هێنانی ڕێککەوتنە، بە مەبەستی بەدەست هێنانی ئامانجی هاوبەشی چەند یەکەیەکی کارگێڕی، کە لە هەمان مەیدان دا کار دەکەن، ئەمەش لە باری فرەیی ئەو یەکە کارگێڕییانەی، کە مەبەستیان بەدەست هێنانی هەمان ئامانجە بۆ گەیشتن پێی بە بەرزترین ڕادەی تونراوی تەواوێتی[٥٧٠]، هەروەك لە لایەکی ترەوە ئامانجی هەماهەنگی بۆ ڕێ گرتنە لە دووڕایی، لە باری پێك چوونی پێداویستییەکانی یەکە کارگێڕییەکان و هاوشێوەکانیان، کە سۆزداری بەم پێویستییە پێك چوانە دەکرێت لە ڕێگەی یەکێتیی ناوەندیی تایبەت لەم بوارە دا.

**٢ - دوورکەوتنەوە لە ناکۆکی لە کار دا:** ڕەنگە ناکۆکی یا بەرهەڵستی لە نێو هەوڵەکانی یەکە کارگێڕییە جیاجیاکان دا ڕوو بدات، بۆیەش هەماهەنگی

---

[٥٧٠] عبد الغني بسيوني عبد الله: أصول علم الإدارة العامة، ص٣١١.

هەڵدەستێت بە نەهێشتنی ئەم ناکۆکییانە لە پێناو بەدەست هێنانی بەرژەوەندیی گشتی.

ژمارەیەکی بێشوماری نموونە هەن لەسەر ناکۆکی لە نێوان یەکە کارگێڕییە گشتییەکان، بەس ئاماژە بە ناکۆکییە دیارەکانی نێوان دەستە و کارگێڕییە تایبەتەکان بە ڕێگە و دووریێژی و ئاو ئاوەڕۆ دەکەین.

دەبینین، کە ڕۆژانە ڕوودەدەن کاتێك وەزارەتی ئاوەدانکردنەوە بەنموونە بە کاری هەڵکەندن لە شەقامەکان دا هەڵدەستێت بۆ جێبەجێ کردنی پرۆژەکانی، دوای کۆتایی هاتنی کارەکە لەم شەقامە دا، قیرتاو دەکرێتەوە و دەگەڕێتەوە سەر دۆخی جارانی، زۆری پێ ناچێت، دەبینین بە نموونە شارەوانی سەرلەنوێ هەڵی دەکەنێتەوە، پاشان جارێکی تر پێویستی بە قیرتاو کردنەوەی شەقامەکە دەبێت، هەرواش سەبارەت بە کارگێڕییەکانی تر، کە لێیەوە بە فیڕۆدانی کات و هەوڵ و دارایی و نەبوونی هەماهەنگی لە نێوان ئەم کردارە فرانە دا دروست دەبێت، لە کاتێك دا، ئەمە لە کاتی هەماهەنگیی ئەم کارانە دا، شەقام یەك جار هەڵدەکەندرێت بە بەدەست هێنانی سەرجەم کارەکان، لە کارەبا و ئاو و دووریێژی و ئاوەڕۆ و تد... دوای ئەمە ڕێگەکەش بۆ شێوەی خۆی دەگەڕێتەوە بەشێوەیەکی کۆتایی[٥٧١].

٣ - **نەهێشتنی جیاوازی لە مامەڵە دا:** کاتێك جیاوازی و نا یەکسانی لە مامەڵە کردن دا بوونی دەبێت، لە نێوان هەندێك یەکەی کارگێڕیی هاوشان دا لە کار و هاوشێوە لە ڕەوش دا، ئەوا کردەی هەماهەنگی لەم سۆنگەیەوە جەخت لەسەر نەهێشتنی ئەم جیاوازییە و، بەدەست هێنانی مامەڵەیەکی یەکسان بۆ سەرجەم دەکاتەوە، مادام دۆخەکان هاوشێوەن.

---

[٥٧١] عبد الغني بسيوني عبد الله: أصول علم الإدارة العامة، ص٣١٢.

مەبەستیش لە مامەڵە لەم بوارە دا، پەیوەندیدارە بە دۆزی کار، وەك مەرجی دامەزراندن و مووچە و مۆڵەت و شێوەی تەمبێ کردن، جگە لەمانەش لەو پرسانەی، کە پەیوەندیدارن بە کارکەران لە یەکە کارگێڕییەکان[٥٧٢].

٤ - **ڕێ گرتن لە ڕکابەری:** زۆرجار ڕکابەریی نێوان یەکە کارگێڕییەکان لە پێناو دەستکەوتنی سەرچاوەیەك، ڕوو دەدات، کە بە نموونە خۆی لە کەرەستە سەرەتاییەکان یا لە هێزی مرۆیی، یا لە داراییە نەختینەییەکان یا لە دراوەکانی بێگانە دا، دەنوێنێت، هەماهەنگیش لەم بوارە دا ئامانجی کۆتایی هێنانە بەم ڕکابەرییە، لە ڕێگەی دیاری کردنی پێشینە لە دەستکەوتنی ئەم سەرچاوەیە یا ئەوەی تر، یا بە ڕوون کردنەوەی ڕێسا و ڕێوشوێنەکانی دابەش کردن بەسەر یەکە کێبڕکێکەرە ڕکابەرە جیاجیاکان دا.

---

[٥٧٢] عبد الغني بسيوني عبد الله: أصول علم الإدارة العامة، ص٣١٢- ٣١٣.

# توێژبەندی سێیەم

# دەسەڵاتی هەماهەنگی و ئامرازەکانی

## یەکەم: دەسەڵاتی هەماهەنگی

دەسەڵاتی هەماهەنگی بە گوێرەی سیستمی سیاسی و، ڕەوشی دەستووریی هەر وڵاتێك جیاوازە، هەروەك سیستمی پەرلەمانی جیاوازە لە دەسەڵاتی ڕێکخستن لە سیستمی سەرۆکایەتی و، لە سیستمی ئیسلامیش لەگەڵ هەردووکیان دا جیایە.

ئەمە لەوەی پەیوەندیدارە بە هەماهەنگی لە ئاستی دەستگەی کارگێڕیی وڵات بە گشتی، بەڵام لەسەر ئاستی ڕێکخراوە کارگێڕییەکان دا، ئەوا ئامراز گەلێکی جیاجیا بۆ بەدەست هێنانی هەماهەنگی لە ناوەوەی هەمان ڕێکخراوە دا و، لە نێوانی و لە نێوان ڕێکخراوەی تر دا هەیە. دەسەڵاتی هەماهەنگیی دەستگەی کارگێڕیی وڵاتیش لە سیستمی پەرلەمانی لە سەرۆکی ئەنجوومەنی وەزیران بە هاریکاریی ژمارەیەك لیژنەی تایبەت پێك دێت

لە سیستمی سەرۆکایەتیش، کردەی هەماهەنگی لە سەرۆك کۆمارەوە کورت دەبێتەوە، لەم بارەوە کۆمەڵێك دەستە و نووسینگەی پاشکۆی ئەم هاریکاریی دەکەن.

بەڵام سەبارەت بە سیستمی ئیسلامی، دەسەڵاتی هەماهەنگی بۆ جێنشینە، یا ئەوەی جێگریەتی لە وڵاتە نوێیەکان دا، ئەوەتا پەیامبەر ﷺ ڕۆژی بەدر و ڕۆژی ئوحود و ڕۆژی خەندەق ڕاوێژی بە هاوەڵەکانی کرد[٥٧٣]، ئێمەش پێمان وایە، کە ڕای ڕاوێژکاران پابەندکەری فەرمانڕەوا و دەستگە کارگێڕییەکەین، بەمەش ڕێکخستنی کارگێڕیی ئیسلامی بەسەر ئەو ڕێکخستە دانراوییە دا سەردەکەوێت، کە بۆ

---

[٥٧٣] محمد سليم العوا: في النظام السياسي للدولة الإسلامية، ص١٨٣.

دەسەڵاتی ڕاوێژکاری تەنها دەسەڵاتی پێشکەش کردن و ڕاسپاردە و ئامۆژگاری دادەنێت، کە ڕەنگە فەرامۆش بکرێت و هیچ بەهایەکی نەبێت

پێشمان وایە، کە ڕۆڵی ئەنجوومەنی ڕاوێژکاری لە بنیاتی ڕێکخستنی ئیسلامی، تەنها لە پێشکەش کردنی ڕاوێژ کورت نابێتەوە، بەڵکو لە هەمان کات دا ئەم ئەنجوومەنانە بە دەستگەیەکی چاودێریی گەلیش گوزارشت دەکرێن، کە پاڵپشتیی کارایی دەستگەی کارگێری لە بنیاتی ڕێکخستن دەکات، بۆ ئەوەی کارەکان بە چاکترین شێوە ئەنجام بدرێن.

## دووەم: ئامرازەکانی هەماهەنگی

سەرکەوتنی هەر ڕێکخراوێکی کارگێری لە بەدەست هێنانی ئامانجەکانی تا ڕادەیەکی زۆر، لەسەر مەودای سەرکەوتنی لە ڕاپەڕاندنی فرمانی هەماهەنگی دەوەستێت، جا لە ناوەوەی ڕێکخراوەکە خۆی، واتا لق و بەش و یەکەکانی بێت، یا لە نێوانی و لە نێوان ڕێکخراوێکی تر، کە بە پەیوەندیی جیاجیا پێیەوە بەندە.

ڕێکخراوەی کارگێری دەتوانێت فرمانی هەماهەنگی لە باشترین شێوە بە چەند ڕێگە و ئامرازێك بەدەست بهێنێت، یا لە ڕێگەی پیادە کردنی کردەی هەماهەنگی لە لایەن سەرکردەی کارگێری، یا لە ڕێگەی ئەنجوومەنە کارگێرییەکان، یا لە ڕێگەی لێژنە هەماهەنگییەکان، هەروەها دەکرێت بەشێك لە هەماهەنگی لە ڕێگەی بەستنی کۆ بوونەوەی خوولیی ئەندامانی ڕێکخراوە بەدەست بێت[٥٧٤].

أ - **ڕۆڵی سەرکردایەتیی کارگێری لە هەماهەنگی:** هەماهەنگی بە یەکێك لە کردە سەرەکییەکانی هەر سەرکردەیەکی کارگێر لە سەرجەم ئاستەکانی سەرکردایەتی گوزارشت دەکرێت، لە نێویان بڵند یا ناوەڕاست یا خوارەوە[٥٧٥].

ئەم کردانەش لە بەدەست هێنانی تێگەیشتن و تەبایی نێوان ئەندامانی ڕێکخراوە لە لایەك و، سازانی نێوان چالاکییە جیاجیاکان تێی دا بە لابردنی

---

[٥٧٤] عبد الغني بسيوني عبد الله: أصول علم الإدارة العامة، ص٣١٨.

[٥٧٥] عبد الغني بسيوني عبد الله: أصول علم الإدارة العامة، ص٣١٨.

ئاستەنگییەکان و زاڵ بوون بەسەر ئەو ئاستەنگییانەی، کە ئەم چالاکییانە دووچاریان دەبنەوە لە لایەکی تر، دیاری دەکرێت[٥٧٦].

لە ئاستی سەرکردایەتیی بڵندی ڕێکخراوەش، کە سەبارەت بە وەزارەت خۆی لە وەزیر دا دەبینێتەوە، یا جگە لەمانەش لە جۆرەکانی سەرکردایەتی، بەرپرسیارییەکی گەورە دەکەوێتە سەرشانی ئەو سەرکردایەتییە لە بەدەست هێنانی هەماهەنگی، وەك کردەیەکی بنەڕەتی دوای پلان دانان و، ڕێکخستن، لەڕاستیش دا کاری سەرکردایەتیی بڵند لە هەماهەنگی دا، ڕیشەکەی بۆ قۆناغی دانانی پلان و بەرنامە و دیاری کردنی قۆناغەکانی جێبەجێ کردن درێژ دەبێتەوە، چونکە ئەم قۆناغە دانانی بنەما و بنەچەکانی کرداری هەماهەنگی بەخۆیەوە دەبینێت و، لەسەر کارگێڕیی بڵندیشە، کە کار بۆ بەشدار کردنی ئەندامانی ڕێکخراوە و قایل کردنیان بکات بەو ئامانجانەی، کە دیاری دەکرێن، بۆ ئەوەی کارەکان وەك تیمێکی تێکەڵاو و تەواوکەر لە پێناو بەدەست هێنانی ئامانجەکان، ئەنجام بدرێن[٥٧٧].

سەرکردایەتییەکانی ناوەڕاست و خوارووش ڕۆڵی خۆیان هەیە لە کرداری هەماهەنگی، چونکە سەرکردایەتیی ناوەڕاست سەربەندی نێوان سەرکرادایەتیی بڵند و ئاستە کارگێڕییەکانی خواروە. سەرکردایەتیی خوارووش هەڵدەستێت بە سەرپەرشتیاری بەسەر کار و، هەماهەنگیی کردارەکانی جێبەجێ کردن، کە کارگەرە بچووك و فرمانبەرەکان لە ڕێکخراوەی کارگێڕی دەیانگرنە ئەستۆ.

ب - **هەماهەنگی لە ڕێگەی ئەنجوومەنەکان:** ئەنجوومەنەکان بە ئاستە جیاجیاکانیانەوە هەڵدەستن بە ڕۆڵێکی گرنگ لە بەدەست هێنانی کردەی هەماهەنگی و، ئەنجوومەنەکانیش ڕۆڵی خۆیان لە هەماهەنگی دەگێڕن، جا لەسەر ئاستی وڵات بێت، یا لەسەر ئاستی ڕێکخراوە کارگێڕییە گشتییەکان.

---

[٥٧٦] عبد الغني بسيوني عبد الله: أصول علم الإدارة العامة، ص٣١٨.

[٥٧٧] عبد الغني بسيوني عبد الله: أصول علم الإدارة العامة، ص٣١٩.

لە نموونەی ئەم ئەنجوومەنانەش، ئەنجوومەنی وەزیرانە، کە شان بە شانی دانانی سیاسەتی گشتیی وڵات کردەی هەماهەنگی لە نێوان وەزارەتە جیاجیاکان دا دەگرێتە ئەستۆ،.

لە سیستمی ئیسلامیش، ئەنجوومەنی ڕاوێژ، کردەی هەماهەنگی لە نێوان تەواوی کەرتەکانی وڵاتی ئیسلامی دەگرێتە ئەستۆ.

ج - **لیژنەکانی هەماهەنگی:** بە شێوەیەکی گشتی لیژنەکان بۆ سێ جۆری سەرەکی دابەش دەبن[٥٧٨]:

**جۆری یەکەم:** لیژنەی جێبەجێ کردن، دەسەڵاتی دەرکردنی بڕیاریان هەیە، وەك ئەنجوومەنی کارگێڕیی دەستە یا هاوبەشگە.

**جۆری دوەم:** لیژنەی تێخوێندنەوەکان ، تێخوێندنەوەی ئەو پرسانە دەگرێتە ئەستۆ، کە بۆی دەنێردرێت، پاشان ڕاسپاردەکانییان لەم پرسانە دا وەردەگرن.

**جۆری سییەم:** لیژنەی هەماهەنگییەکان هەڵدەستن بە کردەی هەماهەنگیی کار و هەوڵەکان لە نێوان ژمارەیەك بەش و، تێڕوانینی پرسە خودان ئەدگارە گشتییەکان دەکات، بەزۆریش لە ناوەوەی وەزارەتەکان پێك دێن، بەرچاوترین جۆرەکانی ئەم لیژنانە لیژنە وەزارییەکانن.

چ - **کۆبوونەوە خولییەکانی ئەندامانی ڕێکخراوەی کارگێڕی:** ئەم کۆبوونەوانە بریتین لەو دیدارە خولییانەی، کە ئەندامانی ڕێکخستن دیبەستن بۆ تاوتوێی پرسە خراوە ڕووەکان بۆ ڕەخساندنی هەل بۆ ئەندامان، بۆ خستنەڕوی ئەو بۆچوونانەی لە بارەی ئەم پرسانە هەیانە. ئەم کۆبوونەوانەش خۆی لەخۆی دا لە کاتی پشکدارییەکی گەورە لە بەدەست هێنانی هەماهەنگی لە ناوەوەی ڕێکخراوەی کارگێڕی دەکەونەوە، بەوەی لە باش کردنی پەیوەندیکاری دا بەدەستی

---

[٥٧٨] حسن أحمد توفيق: الإدارة العامة، القاهرة ١٩٧٩، ١٩٨٠، الهيئة العامة لشوون المطابع الأميرية، ص٣٥.

دەهێنێت و، خستنەڕووی چۆنیەتیی چارەسەریی گرفتەکان و، زاڵ بوون بەسەر ئەو ئاستەنگانەی، کە بێ سەرکەوتنی ئەم هەماهەنگییانە ڕوو دەدەن[٥٧٩]

ئەم کۆبوونەوانەش هەل بە سەرۆکی کارگێری دەبەخشن، بۆ ئەوەی سەرچاوەی گرفتەکان بدۆزێتەوە و، لە ڕێگەی ئەو تاوتوێ کردنانەی، کە لەم کۆبوونەوانە دا دەخولێتەوە، هەروەها هەلێکیش بە کارمەند دەدات، بۆ دەربڕینی ڕا و بۆچوونی خۆی لەبارەی چارەسەرییە کردارییەکان، بۆ تەواو کردنی پەیوەستی و، بەدەست هێنانی تەبایی و سازان لە نێوان بەشەکانی ڕێکخراوە و کارگێرییەکەی.

لەگەڵ ئەمەش دا ئەم کۆبوونەوانە ڕووبەڕوی ئاستەنگی گەلێك دەبنەوە، وەك پێشوازی لێ نەکردنی لە لایەن بەشێك لە بەڕێوەبەرەکان، لە ترسی ئاشکرا بوونی ڕوە کەموکورییەکان لە چالاکیی کارگێرییەکەیان و، لەو ڕەخنانەی ڕەنگە ڕووبەڕوویان ببێتەوە، یا نەبوونی ئارەزوو لە لای هەندێك بەڕێوەبەران لە تاوتوێی ئەو گرفتانەی، کە کارگێرییەکەیان لەگەڵ کارمەندەکانیان دا دووچاری دەبێتەوە، هەروەك ڕەنگە لە گفتوگۆ گەلێکی نەزۆك یا لە خستنە گرفتە بەشەکییەکان، کە گرنگییەکی وایان نییە، یا جگە لەمانەش لە کاربارەکان کاتی ئەم کۆبوونەوانە بە فیڕۆ بچن.[٥٨٠]

بەڵام دەکرێت سوود لەم کۆبوونەوانە ببینرێت بە ئامادە کردنێکی باش بۆی و، دەرباز بوون لەم کۆسپانەی، کە ڕووبەڕووی دەبنەوە، بۆ ئەوەی گفتوگۆکان لە دەرەوەی ئەو پرسانەی، کە پەیوەندیدارن بۆ ڕێکخراوەی کارگێری لە لایەك و، بۆ پشکداری کردنی لە بەدەست هێنانی هەماهەنگییەکی کارا لە نێوان یەکەکانی ڕێکخراوەکان و لقەکانی لە لایەکی تر بهێنێتەوە[٥٨١].

---

[٥٧٩] عبد الغني بسيوني عبد الله: أصول علم الإدارة العامة، ص٣٢٢.

[٥٨٠] محمد سعيد عبد الفتاح: الإدارة العامة، ص٢٨٩- ٢٩٠.

[٥٨١] عبد الغني بسيوني عبد الله: أصول علم الإدارة العامة، ص٣٢٢.

# بەشی دووەم

## پەیوەندیکاری لە سیستمی دانراوی و ئیسلام دا

پەیوەندیکاری سەبارەت بە ڕێکخراوەی کارگێری وەك دەستگەیەکی دەماری مرۆڤ گوزارشت دەکرێت، کە ئەگەر ئەم دەستگەیە ساغ بوو و فرمانەکانی لە تەواوترین شێوە دا ڕاپەڕاند، ئەوا مرۆڤێکی ڕێك و ساغە، بەڵام ئەگەر ئەم دەستگەیە لاواز بوو ، یا توشی نەخۆشی بوو، ئەوا ژیانی خاوەنەکەی لاواز دەبێت و دەشلەژێت.

هەمان شتیش سەبارەت بە ڕێکخراوەی کارگێری، ئەگەر سیستمێکی تۆکمە و پێکەوەبەندی لە سەرجەم جۆرەکانی پەیوەندیکاری دا هەبوو، بەوەی پەیوەندیکارییەکی باش دروست بکات، ئەوا چالاکیی کارگێریی ڕێکخراوە بە ڕێکی و گورجییەکی بەرز ڕووەو بەدەست هێنانی ئامانجەکانی بەڕێوە دەچێت، بەڵام ئەگەر سیستمی پەیوەندیکاری لە ڕێکخراوەی کارگێری لاواز بوو و، لە ڕاپەڕاندنی ڕۆڵە گرنگەکەی پەکی کەوت، ئەوا ئایندەی ڕێکخراوە لە دەستخستنی ئامانجە خواستراوەکانی دا شکست دەهێنێت[٥٨٢]

تێخوێندنەوەی ئەم بەشەش لە چار توێژبەند دا دەگرینە ئەستۆ:

**توێژبەندی یەکەم: مانای پەیوەندیکاری و گرنگییەکەی.**

**توێژبەندی دووەم: جۆرەکانی پەیوەندیکاری.**

**توێژبەندی سییەم: ئاستەنگەکانی پەیوەندیکاری.**

**توێژبەندی چارەم: پەیوەندیکاری لە ئیسلام دا.**

---

[٥٨٢] عبد الغني بسيوني عبد الله: أصول علم الإدارة العامة، ص٣٢٣.

# توێژبەندی یەکەم

## مانای پەیوەندیکاری و گرنگییەکەی

ئەم توێژبەندە لە دوو خواست دا دەخوێنین:
یەکەم: لە مانای پەیوەندیکاری و ڕەگەزەکانی.
دووەم: لە گرنگیی پەیوەندیکاری.

## خواستی یەکەم: مانای پەیوەندیکاری و ڕەگەزەکانی

### یەکەم: مانای پەیوەندیکاری

هەندێك پێیان وایە مەبەست لە پەیوەندیکاری: "ئەو کردارەیە، کە ئامانجدارە بۆ گواستنەوە و ئاڵوگۆڕی ئەو زانیارییانەی، کە لە سەر بنەمایانەوە بیرۆکەکان یەك دەخرێن و چەمکەکان دەسازێن و بڕیارەکان وەردەگیرێن"[583]

دکتۆر عەبدول فەتاح حەسەن مانای پەیوەندیکاری ڕوون دەکاتەوە بەوەی: "کردارێکی کارگێرییە گرنگی بە بەرهەمهێنان، یا ڕەخساندن و، کۆکردنەوەی ڕوونکراوە و زانیاریی پێویستە، بۆ بەردەوام بوونی کرداری کارگێری و گواستنەوەی، یا ئاڵوگۆڕ کردنی یا بڵاو کردنەوەی بەجۆرێك تاك یا کۆمەڵە بتوانێت کەسانی تر بە کاروبار یا هەواڵ یا زانیاریی تازە ئاگادار بکات، یا کاریگەری کردن لەسەر ڕەفتاری تاك و کۆمەڵەکان، یا گۆڕین یا هەموار کردنی ئەم ڕەفتارە یا ئاراستە کردنیان بە ڕووەك، ئەم کردارانەش بەزۆری لە شێوەی

---

[583] عبد الکریم درویش ولیلی تکلا: أصول علم الإدارة العامة، ص٤٦٤.

ئاڵوگۆڕی لە دوو لایەن دا دەبێت نەك یەك لایەن، بەمانای گواستنەوە یا پێدانی ڕوون کراوەکان یا زانیارییەکان بەکەسانی تر و بە پێچەوانەوە[٥٨٤]

دکتۆر ماجد حەلو پەیوەندیکاری پێناسە دەکات بەوەی: "ئاڵوگۆڕ کردنی بیرۆکەکانە بە مەبەستی بەدەست هێنانی ئامانجێکی هاوبەش"[٥٨٥]

دکتۆر ئەنوەر رسەلان پەیوەندیکاری پێناسە دەکات بەوەی: "ئاڵوگۆڕ کردنی بیرۆکە و ڕوون کراوە، بە مەبەستی بەدەست هێنانی ئامانجەکانی کاری کارگێری"[٥٨٦]

دکتۆر ئبراهیم شیحا پەیوەندیکاری پێناسە دەکات بەوەی: "گواستنەوە یا ئاڵوگۆڕ کردنی بیرۆکە یا زانیارییەکانە بۆ کەسانی ترو بەشداری کردنیان تێی دا لە پێناو گەیشتن بە یەکێتیی تێگەیشتن و بیر کردنەوە"[٥٨٧]

دکتۆر موحەمەد ڕەفعەت عەبدول وەهابیش پەیوەندیکاری پێناسە دەکات بەوەی: "کرداری گواستنەوە یا ئاڵ و گۆڕ کردنی زانیاری و بیرۆکەکانە، لە پێناو گەیشتن بە یەکێتیی تێگەیشتن و بیر کردنەوە"[٥٨٨]

دکتۆر عەبدول غەنی بەسیۆنی عەبدوڵلاش پەیوەندیکاری پێناسە دەکات بەوەی: "گەیاندنی زانیارییەکان یا ئاراستە کردنی ڕێنماییەکان یا ئاڵوگۆڕی بیرۆکە و ڕوون کراوەکانە، بەمەبەستی بەدەست هێنانی ئامانجەکانی ڕێکخراوەی کارگێڕی"[٥٨٩]

---

[٥٨٤] عبد الفتاح حسن: مبادئ الإدارة العامة، ص١٨٥

[٥٨٥] ماجد الحلو: علم الإدارة العامة، ص١٧٠.

[٥٨٦] أنور رسلان: الإدارة العامة، الكتاب الأول، ص٢٣٤.

[٥٨٧] إبراهيم عبد العزيز شيحا: أصول علم الإدارة العامة، ص٢٢٦.

[٥٨٨] محمد رفعت عبد الوهاب: الإدارة العامة، ص٢٨٦.

[٥٨٩] عبد الغني بسيوني عبد الله: أصول علم الإدارة العامة، ص٣٢٥.

## دوەم: ڕەگەزەکانی پەیوەندیکاری

دەتوانرێت ڕەگەزەکانی پەیوەندیکاری لە پێنج نیاری سەرەکی دا دیاری بکەین، ئەمانیش:

١ - **پەیوەندیکەر یا بنێر(پەیامنێر)**: ئەو لایەنەیە، کە هەڵدەستێت بە پەیوەندی کردن، یا بیرۆکەیەك یا زانیارییەك یا هەواڵێك دەنێرێت.

لەچارچێوەی کاری کارگێریش دا، دەکرێت پەیوەندیکەر ئەو سەرۆکە بێت، کە هەڵدەستێت بە دەرکردنی ڕێنمایی و ئاراستە کردن بۆ کارمەندانی، هەندێك جاریش دەکرێت پەیوەندیکەر کارمەند بێت بە مەبەستی گەیاندنی ئەو زانیارییانەی، کە لە لایەنی بە سەرۆك، دەشکرێت پەیوەندیکارییەکە لە فرمانبەرێکەوە بۆ فرمانبەرێکی تر دەربچێت لە هەمان ئاستی کارگێری، یا لە نێوان بەڕێوەبەری یەکێك لە کارگێرییەکان و بەڕێوەبەری کارگێرییەکی تر، بە مەبەستی ئاڵوگۆڕ کردنی بیرۆکە و زانیارییەکان دەربارەی بابەتێك[٥٩٠]

٢ - **پەیوەندی پێ کراو یا بۆ نێردراو(پەیام بۆ نێردراو)**: ئەمەش لایەنی دوەمی ئەو کرداری پەیوەندیکارییەیە، کە دەبێت لە نێوان دوو لایەن دا ئەنجام بدرێت و، دەشکرێت پەیوەندی پێ کراو تاکێك یا کۆمەڵەیەك بێت، لە پەیوەندیکاریی کارگێریش دا، دەکرێت پەیوەندی پێ کراو کارمەندێك بێت هەندێك جاریش سەرۆکی کارگێری، یا فرمانبەرێکی تری پەیوەندیکەر بێت، پەیوەندی پێ کراویش ئەوکەسەیە، کە پەیوەندیی ئاراستە دەکرێت، بۆ ئەوەی هەواڵەکە یا ڕوون کراوەکە یا زانیارییەکەی پێ بگات[٥٩١].

٣ - **ئامرازی پەیوەندی کردن**: ئەمەش ئەو ڕێگە یا شێوازەیە، کە لە ڕێگەیەوە زانیارییەکان دەگوازرێنەوە یا ئاڵوگۆڕ دەکرێن و، لە کاتی ئێستا دا ، وەك ئەنجامێکی پێشکەوتنی زانستی، ئامرازەکانی پەیوەندی کردن زۆر بوونە.

---

[٥٩٠] عبد الغني بسيوني عبد الله: أصول علم الإدارة العامة، ص٣٢٥.

[٥٩١] عبد الغني بسيوني عبد الله: أصول علم الإدارة العامة، ص٣٢٦.

ڕەنگە پەیوەندی کردن بە زارەکی بە چاو پێکەوتنی کەسەکی، یا بە ئاخاوتنی دووربێژی، یا لە کۆبوونەوە یا دیداری هاوبەش، یا لە ڕێگای بلاَو کردنەوەی دەنگی یا بینین دا ئەنجام بدرێت، دەکرێت پەیوەندیکاری نووسین بێت لە ڕێگەی ڕاپۆرت و یاداشت و فەرمان و ڕێنمایی نووسراو، هەروەها دەشکرێت لە ڕێگەی فیلمی سینمایی و پۆست وێنەی تۆمار کراو و، جگە لەمانەش بێت[٥٩٢]، لە ئامرازەکانی پەیوەندی کردنی پشت بەستوو بە کۆمپیوتەر.

٤ - **بابەتی پەیوەندی کردن:** ئەمەش ئەو ناوەڕۆکەیە، کە پەیوەندی و بابەتی گواستراوە یا ئالَ و گۆڕکراوی لە ڕێگەی پەیوەندی کردنی لێ پێك دێت.

٥ - **دەستکەوتی پەیوەندی کردن:** مەبەست لێی مەودای کارلێکی پەیوەندی پێ کراوە بە ناوەڕۆکی پەیوەندی کردن، یا ئەو کاریگەرییەی، کە زانیارییە گواستراوەکە دەیکاتە سەر پەیوەندی پێ کراو و، دەکرێت کاردانەوەکە هاوتا بێ لەگەلَ ئەو مەبەستەی، کە لە پێناویەوە پەیوەندی کراوە، دەشکرێت پێچەوانەی ئەم ئامانجە بێت.

## خواستی دوەم: گرنگیی پەیوەندیکاری

گرنگیی پەیوەندیکاری بۆ سەرجەم چالاکییەکانی ڕێکخراوەی کارگێری درێژ دەبێتەوە، پەیوەستیشی بە ڕەگەزەکانی تری کرداری کارگێڕی توندە[٥٩٣]

گرنگیی پەیوەندیکاری لە بەدەست هێنانی هەماهەنگی لە بواری پەیوەندییە لابەلاکان دەردەکەوێت، هەروەك کۆبوونەوە و دیدارەکان لەسەر داوای بەڕێوەبەرانی کارگێرییەکان و سەرۆك بەشەکان دەبێت، بۆ تاوتوێ کردنی چۆنیەتیی بەدەست هێنانی هەماهەنگی لە نێوان ئەو کارگێری و بەشانە.

پەیوەندیکارییەکانیش ڕۆلێکی گرنگ و سەرەکی دەگێڕن لەوەی پەیوەندیدارە بە فەرمانی ڕێکخستن، چونکە خودی تۆڕی پەیوەندیکارییەکان گوزارشتە لە ڕەگەزێکی

---

[٥٩٢] عبد الغني بسيوني عبد الله: أصول علم الإدارة العامة، ص٣٢٦.

[٥٩٣] عبد الكريم درويش وليلى تكلا: أصول علم الإدارة العامة، ص٤٤٩.

بنەڕەتی لە ڕێکخستنی ڕێکخراوەی کارگێڕی لە لایەك، هەروەك زیندویی ڕێکخستنی کارگێڕی و کاراییەکەی تا ڕادەیەکی زۆر دەوەستێتە سەر مەودای وردی و ئاسانیی سیستمی ئەو پەیوندیکارییەی، کە لە ناوەوەی دا بوونی هەیە لە لایەکی تر، چونکە وەرگرتنی بڕیاری پێکەر پشت بەو ڕوون کراوە و زانیارییانە دەبەستێت، کە پەیوەندیدارن بە گرفت و جێگرەوە خراوە ڕوەکان، ئەم زانیاری و ڕوون کراوانەش دەگەنە سەرکردایەتیی کارگێڕی لە ئاستە جیاجیاکانی کارگێڕی، لە ڕێگەی ئەو کەناڵە پەیوەندیکارییانەی، کە لە ڕێکخراوە دا بوونیان هەیە[٥٩٤]

هەروەها گرنگیی پەیوەندیکارییەکان لە هەڵستانی سەرکردایەتیی کارگێڕی بە کارەکانی و هەڵ گرتنی ئەو دەسەڵاتانەی، کە پێویستە سەرکردایەتیی کارگێڕی پێی بڕازێتەوە، دەردەکەوێت، بە جۆرێك وا لە پەیوەندیکارییەکان بکات، کە ئامرازێکی کارا بن لە گرتنە دەستی کارە سەرکردایەتییەکانی تری، ئەمەش، ئەگەر تۆڕێکی پەیوەندیکاریی بەربڵاو لە نێو بەشەکان و لقەکانی ڕێکخراوە و بەستنەوەی بە سەرکردایەتی دامەزرا، ئەوا پەیوەندیکارییەکی ئاسان و ڕێك لەگەڵ ڕێکخراوەکانی تر دروست دەبێت.

هەروەها پەیوەندیکارییەکان گوزارشتن لە ئامرازە پێداویستە بنەڕەتییەکان بۆ هەڵستانی سەرکردە بە چاودێری و سەرپەرشتیاری لەسەر سەرجەم کارگێڕییەکان و بەشەکانی ڕێکخراوە و، بەدواداچوونی جێبەجێ کردنی پلانی ڕێکخراوە و بڕیارەکانی.

---

[٥٩٤] عبد الغني بسيوني عبد الله: أصول علم الإدارة العامة، ص٣٢٨.

# توێژبەندی دووەم

# جۆرەکانی پەیوەندیکاری

ئەو پەیوەندیکارییانەی، کە ڕێکخراوە ئەنجامیان دەدات بۆ دوو جۆری سەرەکی دابەش دەبن:

**جۆری یەکەم:** پەیوەندیکارییەکانی ناوەوەی خودی ڕێکخراوە، واتا لە چارچێوەی قوچەکی کارگێریی ڕێکخراوە.

**جۆری دووەم:** پەیوەندیکارییە دەرەکییەکان لە نێوان ڕێکخراوەکە و ڕێکخراوە کارگێرییەکانی تر، یا وەزارەت و دەستە حکومییەکان، یا جگە لە مانەش لە ڕێکخستنەکان[٦٩٥]

## خواستی یەکەم: پەیوەندیکارییە ناوخۆییەکان

پەیوەندیکارییە ناوخۆییەکان بۆ دووبەش دابەش دەبن: پەیوەندیکارییە ڕەسمییەکان، لە چارچێوەی ئەو پەیوەندیکارییانەی، کە بە ڕەسمی دیاری کراون ئەنجام دەدرێت و، پەیوەندیکارییە نا ڕەسمییەکان، واتا لە دەرەوەی سنووری تۆڕی ڕەسمیی پەیوەندیکارییەکان پێك دێت.

## یەکەم: پەیوەندیکارییە ڕەسمییەکان

ئەو کەنالانەی پەیوەندی کردنن، کە پێشوەختە بە شێوەیەکی ڕەسمیی و پابەندکەر بۆ سەرجەم کارکەران لە ڕێکخراوەی کارگێری دیاری دەکرێن، بە ئاواتی پەیڕەوی کردنیان لەسەرجەم پەیوەندیکارییەکانیان لە میانەی بەشداری کردنیان لە ڕوە چالاکییە جیاجیاکانی کارگێری لە ناوەوەی ڕێکخراوە دا.

---

[٦٩٥] عبد الغني بسيوني عبد الله: أصول علم الإدارة العامة، ص٣٢٩.

دەکرێت پەیوەندیکاریی ڕەسمی بەشێوەی نووسراویش ئەنجام بدرێت، وەك ڕاپۆرتە نووسراوەکان و پەیامە نێردراوە ڕەسمییەکان، هەروەها دەکرێت بەشێوەیەکی زارەکیش بێت، هەروەك لەو کۆبوونەوە خولییانە دا ڕوو دەدات، کە بەڕێوەبەری کارگێرییە ناوەندییەکان یا کارگێرییە لقییەکان و بەشەکان لەگەڵ یاریدەدەرانیان لە هەفتەیەك دا جارێك بەلانی کەم بۆ دەستکەوتنی زانیارییەکان دەیبەستن. پەیوەندیکارییە ڕەسمییەکانیش سێ لقیان هەیە:

## أ – لقی یەکەم: پەیوەندیکارییە دابەزیوەکان

ئەوپەیوەندییانەن، کە لە بەرزترینەوە بۆ خوارووترین ئەنجام دەدرێت، واتا لە سەرکردایەتیی کارگێریی بڵندی ڕێکخراوەوە دەردەچێت بۆ ئاستە جیاجیاکانی کارگێڕی، جا خواروو بێت یا ناوەڕاست، یا لە سەرکردایەتییە کارگێرییە جیاجیاکانی کارگێڕیی ناوەڕاست دنێردرێت بۆ ئاستەکانی خوارووی کارگێڕی، هەروەك کارکەری جێبەجێکەر لە بنکەی قوچەك دا هەن.

ئەم پەیوەندیکارییانەش ئاراستە کردن و ڕێنمایی و فەرمانەکان و ڕوون کراوە پێویستەکان بۆ پلانەکانی ڕێکخراوە و بەرنامەکەی و، سیاسەتی ئەم پلان و بەرنامانە لەخۆ دەگرێت[٥٩٦]

ئەم پەیوەندیکارییانەش لە ڕێکخراوە کارگێرییە بچووك و قەبارە مام ناوەندەکان دا بە ڕوون و سانایی جیا دەکرێنەوە، بەڵام چەندین ئاستەنگیی پەیوەندیدار بە ڕێکخراوە کارگێرییە قەبەکان دەبینین، چونکە ئەم پەیوەندیکاریانەی، کە سەرکردایەتیی ڕێکخراوە پێی هەڵدەستێت، لەگەڵ ئاستەکانی خوارووی، بە چەندین ئاست تێپەڕ دەبن، پێش گەیشتنی بە پێگەی جێبەجێ کردن، ڕەنگە خراپ تێگەیشتنی لە ڕێنمایی و فەرمانە دابەزیوەکان

---

[٥٩٦] عبد الغني بسيوني عبد الله: أصول علم الإدارة العامة، ص٣٣١.

لەسەروەوە، ڕوو بدەن، بەهۆی تێپەڕ بوونی بەسەر ژمارەیەکی زۆر لە کارکەران لە ڕێکخراوە دا[٥٩٧].

## ب – لقی دوەم: پەیوەندیکارییە بەرزبوەوەکان

ئەم پەیوەندیکارییانە هەڵدەستن بە ئاگادار کردنی سەرۆکە کارگێڕییەکان بە زانیارییەکان و شارەزا کردنیان بە ڕوون کراوەکان و، ئاگاداربوونیان لەو گرفت و کۆسپانەی، کە جێبەجێ کردنی بەرنامەی ڕێکخراوە و بڕیارەکانی خوارووی دووچاریان دەبێتەوە.

بۆیەش پەیوەندیکارییە ژووربوەوەکان ئەو سەرچاوانە دەنوێنن، کە سەرکردایەتیی کارگێڕی زانیاری و ڕوون کراوەی پەیوەندیدار بە کاروباری ڕێکخراوە کارگێڕییەکانی دەست دەکەوێت، کە سەرکردایەتییەکەی دەگرنە ئەستۆ، کە پێیەوە سەرکردایەتی دەتوانێت بڕیارێکی پێکەری بنیات نراو لەسەر زانیارییە دروستەکان وەربگرێت.

ئەم پەیوەندیکارییانەش بە بەڵگەیەك لەسەر کرانەوەی سەرکردایەتی و بایەخ دانی بە کارکەرانی گوزارشت دەکرێت، لە ڕێگای گوێ گرتن لەوەی لە کارکەرانی ڕێکخراوەوە دێت لە پێشنیار و ڕاو سکاڵاکان، بە ئاواتی سوود وەرگرتن لە زانیارییە هاتوەکان لە ئاستەکانی جێبەجێ کردن، بۆ زاڵ بوون بەسەر گرفتەکانی جێبەجێ کردن و زیاد بوونی بەرهەم لە ڕێکخراوە دا[٥٩٨].

## ج – پەیوەندیکارییە لاوەکییەکان

مەبەست لێی ئەو پەیوەندیکارییە لاوەکییانەن، کە لە نێوان کارکەران لە یەك ئاستی کارگێڕی، یا لە ئاستە کارگێڕییە جیاجیاکان، کە پەیوەندیی دەسەڵاتی

---

[٥٩٧] حمدي أمين عبد الهادي: الإدارة العامة في الدول العربية، ص٣٠٦.

[٥٩٨] عبد الكريم درويش وليلى تكلا: أصول الإدارة العامة، ص٤٧٨.

سەرۆکایەتی لە هەمان ڕێکخراوە پێکیان نابەستێەوە، یا لە نێوانیان و نێوان کارکەران لە ڕێکخراوێکی کارگێری تر، ئەنجام دەدرێت[٥٩٩].

لە نموونەی ئەو پەیوەندیکاریانەی، کە لە چارچێوەی ئەم جۆرە دا دەبەسترێت: کۆبوونەوەی ئەنجوومەنی وەزیران، یا کۆبوونەوەی لێژنە وەزارییەکانە.

سەرباری گرنگیی زیاد بووی پەیوەندیکاریی لاوەکی، کەچی زۆر جار بەرچەندین کۆسپ دەکەون، کە وای لێ دەکات کارەکان بێ گەیشتن بە باشترین شێوە بەجێبهێنرێت، چونکە پسپۆڕییە جیاجیاکان لە ڕێکخراوە دا جۆری جیاواز لە هەواداری پێك دەهێنن، کە دەبنە هۆی پابەند بوون بە شێوە و درێژ کردنەوەی ڕێوشوێنەکان، ئەمیش دەبێتە هۆی ئەوەی ئەم جۆرەی پەیوەندیکاری تووشی سستییەکی توند ببێت[٦٠٠]

## دوەم: پەیوەندیکارییە نا ڕەسمییەکان

پەیوەندیکارییە نا ڕەسمیەکان لە دەرەوەی کەناڵەکانی تۆڕی پەیوەندیکارییە ڕەسمییەکانی ڕێکخراوەی کارگێری پێك دێت و، یارمەتیی دەستەبەر کردنی پەیوەندیکاری و گەشە پێدانی پەیوەندییە کەسێتییەکان لە نێوان ئەو فرمانبەرانە دا دەدات، کە وابەستەی هەمان کۆمەڵە ڕەسمییەکان، یا نا ڕەسمییەکانن، وەك کارگێرییەك لە کارگێرییەکان، یا بەشێك لە بەشەکان، یا سەندیکایەك لە سەندیکاکان، جگە لە کۆمەڵەی تریش، کە سەرچاوەی زانیاری دەنوێنن.

لەکاتی بوونی ناکۆکیی نێوان تاکەکان، یا لە نێوان کۆمەڵەکان، وەستانی لێشاوی زانیارییەکان ڕوو دەدات، هەروەك بەند و کۆسپە سەپێنراوەکانی سەر هێلی پەیوەندیکارییە ڕەسمییەکان، پشکداری لە دەستەبەر کردنی پەیوەندیکاریی

---

[٥٩٩] عبد الغني بسيوني عبد الله: أصول علم الإدارة العامة، ص٣٣٢.

[٦٠٠] أمين عبد الهادي: الإدارة العامة في الدول العربية، ص٣٠٨.

نا ڕەسمی دەکەن، چونکە ئەم بەندانە لە دەربڕینی ڕاستیی خواستەکانی ڕێکخستن، هێڵی پەیوەندیکارییەکان بەستوو و سست و نا نیان و نەدار دەکەن[٦٠١]

زۆرینەی پەیوەندیکارییە نا ڕەسمیەکان لە دەرەوەی ڕێکخستنی ڕەسمیی ڕێکخراوە ڕوو دەدەن، وەك چاوپێکەوتنی سەرۆکی ئەنجوومەنی کارگێریی یەکێك لە کارگێرییەکان بە هاوکارێکی لە ئاهەنگێک و، گفتوگۆ کردنیان لەبارەی کاروباری هاوبەشی دوو ڕێکخراوەکە، یا گواستنەوەی زانیاری لە بەڕێوەبەرێکەوە بۆ یەکی تر، لەکاتی بۆنەیەکی کۆمەڵایەتی دا.

هەروەك پەیوەندیکاری نا ڕەسمی لە ناوەوەی ڕێکخستنی ڕەسمیش ڕوو دەدات، بەڵام بێ پەیوەست بوونی بە کەناڵەکانی پەیوەندیکاریی ڕەسمی، وەك لە باری سکاڵا یا خواست یا ئەو زانیارییانەی، کە ڕاستەوخۆ بە وەزیر یا بەڕێوەبەری گشتی دەگەن، بێ ڕەت بوونی بە ئاستە ڕەسمیەکانی تر[٦٠٢]

هەروەك سەرۆکی کارگێری بە ئاواتی کاریگەری کردنە سەر ڕێکخراوە، پشت بە پەیوەندیکاریی نا ڕەسمی دەبەستێت لە ڕێگەی دروست کردنی پەیوەندی لەگەڵ ئەو کەسانەی، کە ناوەندە گرنگەکانی ڕێکخراوە دەگرن و، ئەوانەشی، تونستیان لە باربۆ کردنیان بە زانیاری لە گەیشتن بە وەرگرتنی بڕیاری پێکەر، هەیە.

## خواستی دوەم: پەیوەندیکارییە دەرەکییەکان

ئەم پەیوەندیکارییانە بریتین لەو پەیوەندیکارییانەی، کە لە نێوان ڕێکخراوەکی کارگێری و یەکی تر لە ڕێکخراوەکان ئەنجام دەدرێت، جا کارگێری بێت یا نا کارگێری، هەروەها ئەو پەیوندیکاریانەی، کە لە نێوان ڕێکخراوەی کارگێری و جەماوەر دروست دەبێت[٦٠٣]

---

[٦٠١] محمد سعيد عبد الفتاح: الإدارة العامة، ص٢٠٠.
[٦٠٢] عبد الكريم درويش وليلى تكلا: أصول الإدارة العامة، ص٤٧٩- ٤٨٠.
[٦٠٣] إبراهيم عبد العزيز شيحا: أصول الإدارة العامة، ص٢٣٢- ٢٣٣.

لەو پەیوەندیکارییە دەرەکییانە ئەوەیە، کە لەنێوان ڕێکخراوەی کارگێڕی و میری دا یا سەندیکاکان و جگە لەمانیش لە دەستەکان لە وڵات دا، ئەنجام دەدرێت، ڕەنگە پەیوەندیکاری لە نێوان ڕێکخراوەی کارگێڕی و دەسەڵاتی یاسادانانیش دا ڕوو بدات، هەروەك لە کاتی پێشکەش کردنی وەڵام یا پرسیار دا ڕوو دەدات، یا لە کاتی پێشکەش کردنی ڕوون کراوە و یا زانیاری لەبارەی پرسێك لە لایەن ڕێکخراوەی کارگێڕی بۆ حکومەت، یا هەڵستانی یەکێك لە وەزیرەکان بە پێشکەش کردنی ڕاپۆرت یا ڕوون کردنەوە بۆ ئەنجوومەنی نوێنەران[٦٠٤]

ڕێکخراوەی کارگێڕی پەیوەندیکاریی دەرەکیی لەگەڵ جەماوەریش دا هەیە، جا لە مامەڵە و پێشکەش کردنی خزمەتگوزاری بێت بۆی، یا لەڕێگەی ئاگادار کردنی جەماوەر بە ڕای گشتی، بە بنەماکانی ڕێکخراوە و ڕوەکانی چالاکی و ڕێبەری پەیوەندیدار بەم چالاکییە.

ڕێکخراوە لە پێناو بەدەست هێنانی ئەمە بلاۆك یا پاشکۆ یا ئامرازەکانی ڕاگەیاندنی گشتی لە کەناڵ و تەلەفزیۆن و ڕۆژنامە و، گۆڤارەکان بەکاردەهێنێت، دەشکرێت جەماوەر دەست پێشخەری ئەو پەیوەندیکارییانە بێت، لە ڕێگەی ئەو داوا و سکاڵا یا ئەو ڕا و پێشنیارانەی، کە پێشکەشی دەکەن، بۆ باش کردنی خزمەتگوزارییەکانی ڕێکخراوە[٦٠٥]

---

[٦٠٤] محمد رفعت عبد الوهاب: الإدارة العامة، ص٣٠١.

[٦٠٥] عبد الغني بسيوني عبد الله: أصول علم الإدارة العامة، ص٣٣٦.

# توێژبەندی سێیەم

# ئاستەنگەکانی پەیوەندیکاری

هەڵبەت پەیوەندیکاری دووچاری چەندین ئاستەنگی دەبێتەوە، کە پەیوەندیکاریی کارای نێوان پەیوەندیکەر و پەیوەندی پێ کراو ئاڵۆز دەکات، بوونی ئەم ئاستەنگییانەش بۆ چەندین هۆکاری زۆر دەگەڕێنەوە، کە دەتوانین لە مانەی خوارەوە دا کورتیان بکەینەوە:

## یەکەم: ئاستەنگیی زمان

جیاوازیی ڕادەی ڕووناکبیری و زانین دەبێتە هۆی تێنەگەیشتنی زاراوە و گوزارشتە ئاڵوگۆڕ کراوەکان لە نێو دوو لایەنەکە، چونکە هەر لایەنێك بە گوێرەی تێگەیشتنی خۆی لێکی دەداتەوە، هەروەك پەیوەندی کردنی دادوەر یا پارێزەر بەهاوتایەکی لە هەمان پیشە و بوار دا، بە ئاسانی دەبێت، بەهۆی بە کارهێنانی هەمان زمانی یاسایی، بەڵام وێنەکە لە کاتی پەیوەندی کردنیان بە کەسانی تر، دەگۆڕێت، هەروەك جیاوازیی ژینگە و ڕەوشی ناوخۆیی و داب و نەریت و بەهاکان لە خۆدەگرێت، ڕەنگە ببنە هۆکاری هێنانەکایەی ئاستەنگی لە بەدەست هێنانی پەیوەندیکارییەکی کارا دا.

ڕەنگیشە ئاستەنگی لە پەیوەندی کردن لە لایەن یەکێك لە لایەنەکانی پەیوەندی کردن دا بێت، هەروەك وا ڕوو دەدات ئاستەنگی لە لایەن پەیوەندیکەر یا بنێر بێت، کە پەیامەکەی بە ڕێگەیەکی شاراوەی نا ڕوون و شێوازێکی نا دیاری

کراو، دەنێرێت، کە پەیامەکە بە چاپێکی لێل و نا ڕوون دەنووسێت، بۆیەش پێویستە پەیامەکان بە گوزارشتی ورد دابڕێژرێت[٦٠٦]

ڕەنگە بۆنێردراو (پەیوەندی پێکراو) و لە ناوەڕۆکی نەگات، لەبەر نا ڕوونیی ماناکان لای، یا لەبەر تێنەگەیشتنی ئەو دەربڕین و وشە بەکارهاتوانە لە پەیامەکە دا.

گرفتی زمان بەشێوەیەکی تایبەتی لە پەیوەندیکارییە نووسراوەکان دا دەردەکەوێت، بەڵام پەیوەندیکارییە زارەکییەکان، دەرفەت تێی دا فەراهەمە، بۆ ڕوون کردنەوەی ماناکان و لێك دانەوەی مەبەستی وشەکان و گوزارشتی دەربڕینەکان، تەنانەت ڕاڤە کردنەوە و دووبارە پەیوەندی کردنەوەش[٦٠٧]

## دوەم: ئاستەنگییە دروست بوەکان لەبەر قەبەیی قەبارەی ڕێکخراوەی کارگێڕی

قەبارەی ڕێکخراوە کاریگەرییەکی گەورە لە سیستمی پەیوەندی کردنەکەی دەکات، بۆیە لە ڕێکخراوە بچووکەکان یا قەبارە ناوەنجییەکان ئاستەنگیی جێ باس لە دانانی سیستمێکی کارا بۆ پەیوەندیکارییەکان، نابینرێت.

بەڵام ئەوەی پەیوەندیدارە بە ڕێکخراوە خودان قەبارە قەبەکان، لە گەورەیی قەبارەی دەستگەی کارگێڕییەکەی بەرهەم دێت، کە ئاستە کارگێڕییەکان لە ناوەوەی دا فرەن و، کارگێڕییەکەی بەربلاوە و بەشەکانی لق گەلێکیان لێ دەبێتەوە، هەرواش هێڵەکانی پەیوەندی کردن لە ڕێکخراوەکان فراوانن و کەناڵە زۆرەکانیشی تێك ئاڵۆزن[٦٠٨]، هەروەها پەرش بوونی ڕێکخراوە لە سەرانسەری وڵات

---

[٦٠٦] ماجد الحلو: علم الإدارة العامة، ص١٧٢- ١٧٣.

[٦٠٧] محمد سعيد عبد الفتاح: الإدارة العامة، ص٣٠٢.

[٦٠٨] أنور رسلان: الإدارة العامة، الكتاب الأول، ص٢٣٦.

و، بوونی زۆرێك لە لقە دوورەكان لە ناوەندی ڕێكخراوە، دەبێتە هۆی هاتنە كایەی ئاستەنگی بۆ هەردوو فرمانی هەماهەنگی و پەیوەندیكاری[٦٠٩]

جێی تێبینییە، كە ڕێكخراوە كارگێڕییەكان لە بەكارهێنانی پێویستییەكانی پەیوندیكاریی خێرا، كە پێشكەوتنی زانستیی هاوچەرخ فەراهەمی كردوە، فراوان بوە، لە پەیوەندیكاریی بە وایەر و بێ وایەرەكان، ئامێرە وردەكان بۆ كۆگە كردنی زانیارییەكان و، هەڵستان بە كرداری ژمێركاری و جگە لەمانەش، پێداویستیەكانی كارگێڕیی نوێ، سەرباری ئەو ئامرازانە، چارەسەری گرفتی دووریی نێوان ناوەند و لقەكانی بە كۆتا نەهاتوە، چونكە جێگرەوەیەك بۆ چاوپێكەوتنە كەسەكییەكان و پەیوەندیكارییە ڕاستەوخۆكان نییە[٦١٠]

## سێیەم: ئاستەنگییە درووست بوەكان لە دەگمەنیی پەیوەندیكاری و زێدەڕۆیی كردن تێی دا

كەمیی پەیوەندیكاری و دەگمەنییان، مەترسی لەسەر بەڕێوەچوونی كاری كارگێڕیی ڕێكخراوە دروست دەكات، هەروەك زێدەڕۆیش لە پەیوەندیكارییەكان زیان دەگەیەنێت و دەبێتە هۆی بە فیڕۆدانی كات و ڕەنج، هەروەك ئەمەش دەبێتە هۆی نقووم بوونی دەستگەی كارگێڕیی ڕێكخراوە لە ون بوونی فەرمان و ڕێنماییەكان و ئەو ڕاپۆرتانەی، كە پاساویان نییە[٦١١]

بۆیە میانڕەوی باشترین ئامرازە بۆ زاڵ بوون بەسەر ئاستەنگییە دروست بوەكان لە كەمی یا زێدەڕۆیی لە پەیوەندیكارییەكان دا

---

[٦٠٩] عبد الغني بسيوني عبد الله: أصول علم الإدارة العامة، ص٣٣٨.

[٦١٠] عبد الغني بسيوني عبد الله: أصول علم الإدارة العامة، ص٣٣٩.

[٦١١] عبد الكريم درويش وليلى تكلا: أصول علم الإدارة العامة، ص٥٠٢.

## چارەم: ئاستەنگییە دەروونی و ڕەفتارییەکان

دروست بوونی ئاستەنگی دەروونی و ڕەفتاری بۆ چەندین هۆکار دەگەڕێتەوە، لە نێویان دابڕینی چینایەتیی نێوان کەرکەران، چونکە هەر چینێك بەلای کەنارگیری دەڕوات و، دروست کردنی جیاکەرەوە لە نێوانی و نێوان هی تر لە چینە کارگێڕییەکان و، بە تێپەڕ بوونی کاتیش ئەم دابڕینە کارگێڕییانە دەگۆڕێن بۆ جیاکەرەوەی دەروونی و ڕەفتاریی نێوان کارکەران لە ڕێکخراوە دا[٦١٢]

لە لایەکی تر، ئەم ئاستەنگییانە بۆ سەرۆکی کارگێری دەگەڕێنەوە، ئەگەر ئەم سەرۆکە زۆردار و تاکڕەو بوو و، لە پەیوەندیکارییەکانی کارمەندانی لەگەڵ خۆی دا تەنگ کردەوە و، دەرگەی گفتوگۆ کردنیان بە ڕوو دا داخات، ئەوا هەڵبەت هەست کردن بە دوور کەوتنەوەی نێوانی و نێوان کارمەندانی و، وازهێنانیان لە پەیوەندی کردن پێی، یا گواستنەوەی هەواڵ بۆی و بەتایبەتیش لە خراپەکان، یا لە ڕوون کردنەوەی ناوەڕۆکی ئەو فەرمان و ڕێنماییانەی، کە لێیەوە دەردەچن، دروست دەبێت.

گومانیش لەوە دا نییە، کە بەرپرسیاریی بنەڕەتی، دەکەوێتە سەر شانی سەرۆکی کارگێری لە نەهێشتنی ئەم تەگەرە دەروونی و ڕەفتارییانە، لە ڕێگەی گەشە پێدانی پەیوەندییە مرۆییەکانی نێوان سەرۆك و کارمەند لە کارگێڕییە جیاجیاکان و، لە خستنی دابڕێنەرە چینایەتییەکانی نێوان توێژی کارکەران لە هێنانەکایەی جیاکەرەوەی دەروونی[٦١٣]

---

[٦١٢] عبد الغني بسيوني عبد الله: أصول علم الإدارة العامة، ص٣٤١.

[٦١٣] عبد الغني بسيوني عبد الله: أصول علم الإدارة العامة، ص٣٤٢.

# توێژبەندی چارەم

## پەیوەندیکاری لە ئیسلام

ڕێکخستنی کارگێڕیی ئیسلامی بنیاتێکی ڕێکخستنی و پەیکەرێکی نموونەییە لە جۆرێکی تایبەت. ئەم بنیاتە ڕێکخستنییە چەندین فرمان لە خۆ دەگرێت، لە ناوەوەی چەندین ئاست دا ڕێك دەخرێن، وەك جێنشینی و وەزارەت و ویلایەت و سەرۆکی دیوان و نووسراوەکان، هەروەك شارەزا و ڕاوێژکارانیش لە خۆدەگرێت و، هەماهەنگی لەم ئاست و فرمانانەش بە هێڵی دەسەڵات و بەرپرسیاری ئەنجام دەدرێت و، کەناڵەکانی پەیوەندی کردنیش لە ناوەوەی ئەم بنیاتەی ڕێکخستن دا بوونی هەیە[٦١٤]

گومان لەوە دا نییە، کە پەیوەندیکاری گرنگییەکی گەورەی لە سیستمی ئیسلامی دا هەیە و، گرنگیی پەیوەندیکاریش لە تەواوی بوارەکانی کارگێڕیی ئیسلامی دا زەق بوەتەوە، لە ڕاستی دا ئەگەر جیاوازیش لە چۆنایەتیی پەیوەندیکارییەکانی نێوان سیستمی ئیسلامی و سیستمە دانراوییەکان دا هەبێت، بەڵام ئەم پەیوەندیکارییانە لە ئاستێکی بەرز دا بوونیان هەبوە و، ئەگەر ئەو ماوە کاتییەی، کەوا ئەم پەیوەندیکارییانەی تێ دا ئەنجام دەدرا بەهەند وەربگرین، بۆ نموونە نەك بۆ لە ئەمە دا کورت کردنەوەی، مووسوڵمانان لە ئاماژە کردنی گواستنەوەی ڕاپۆرت و هەواڵ، ئاگریان بەکارهێناوە، هەروەك عومەر خوا لێی ڕازی بێت بۆ معاویەی لە شام نوسی بۆ دانانی پاسەوان لەسەر تەپۆڵکەکان و دانانی ئاگردان بۆی و[٦١٥] و، شار و پایتەختەکان لە وشکایی و دەریایی دا بەکاریان هێناوە، هەروەك شەو و ڕۆژ ئاگر دەسووتا و، سوود لە دووکەڵ و کڵپەکەی، وەك ئاماژەیەك لە گواستنەوەی هەواڵ لە کاتی پێشڕەوی کردنی دوژمن، وەردەگیرا،

---

[٦١٤] فرناس عبد الباسط البنا: التنظيم بين الإدارة الإسلامية والإدارة العامة، ص١٠٦.

[٦١٥] البلاذري: فتوح البلدان، ص١٣٤.

هەروەك پەیامەكان لە ئەسەكەندەرییەوە بۆ سەبتە لە یەك شەو و، لە تەرابلووسەوە بۆ ئەسكەندەرییەش لە سێ كاتژمێر دا دەگەیشت، كە بەڵگەی خێرایی و كارایی گواستنەوەی هەواڵن[٦١٦]

پەیامبەر ﷺ لە بەكارهێنانی ڕێگە ڕەخساوەكانی پەیوەندیكاری لە سەردەمەكەی دا، دەستپێشخەریی كردوە، هەروەك پۆستەی بەكارهێناوە و ناردویەتی بۆ پادشا و سەرۆكەكان و بانگی كردوون بۆ ئیسلام و، لە ڕۆژگاری سەركردەی كارگێر عومەری كوڕی خەتاب خوا لێی ڕازی بێت، پەیوەندیكاری بە تەواوی شێوەكانییەوە ڕێگەی وێنە بۆ كێشراوی گرتوەتەبەر، پەیوەندی كردنی بە كارمەندانی بەردەوام بوو، بەتایبەتیش لەگەڵ والییەكەی لە شام، معاویەی كوڕی ئەبو سوفیان و، عومەر خوا لێی ڕازی بێت لە پەیوەندیی بەردەوام دا بوو لەگەڵ كارمەندانی لە ئێراق و میسر و، سەركردە سەربازییەكانی بە ڕێنمایی و ئاراستەی سەربازی بارێو دەكرد، كەواتە پەیوندیكاری لە سەردەمی پەیامبەر ﷺ بوونی هەبوە، بەڵام بەشێویەكی سادە و بەگوێرەی پێویستیی وڵاتی دروست بوو، بەڵام لە سەردەمی عومەریش دەبوایە چاوخشاندنەوەیەك بە كاروباری پەیوەندیكاری و ئامرازەكانی و ڕیزبەند كردنی بوو بە پێویستی، بە جۆرێك وڵات پەیوەندیی بە تەواوی فرمانبەران و دەستگەكەی بە شێوەیەكی كارا هەبێت، ئەم نیارەش بۆ سەردەمەكانی داهاتووی وڵاتی ئیسلامی ڕاكێش بێت.

پوختەی ئەوەی لە سۆنگەی هەماهەنگی و پەیوەندیكاری لە سیستمە دانراوییەكان دا گوترا، بە تەواوی سەبارەت بە سیستمی ئیسلامیش دروستە، چونكە ئیسلام بڕیاری بنەمای گرتنەبەری دەستكەوتنە زانستییەكانی لە چارچێوەیەكی فراوانی لەم سۆنگەوە داوە.

---

[٦١٦] توفيق اليوزبكي: دراسات في النظم العربية الإسلامية، جامعة الموصل، طبعة ثالثة، ١٩٨٨، ص١١٧.

# بەندی پێنجەم

## چاودێری بەسەر کارگێڕیی گشتی
## لە سیستمی دانراوی و ئیسلامی دا

چاودێری گوزارشتە لە یەکێك لە کردە بنەڕەتییەکانی سەرکردایەتیی کارگێری لە ڕێکخراوە کارگێرییەکان، چونکە لە ڕێگەیەوە سەرکردایەتی دەتوانێت ئامانجەکان بەدەست بهێنێت و پێوانەی ڕادەی گورجیی دەستگەی کارگێریی ڕێکخراوە لە بەکارهێنانی توانا مرۆیی و کەرەستەییە ڕەخساوەکان بکات و، ئاشنا بوونی ئەوەی تا چ مەودایەك هەوڵی یەکە کارگێرییە جیاجیاکان لە بەدەست هێنانی ئەم ئامانجانە دا هەماهەنگن.

هەروەها سەرکردایەتیی کارگێری بەهۆی چاودێری تواناداردەبێت، لە ئاشکرا کردنی، هەڵە و ڕووی لادانەکان و ئەو سەرپێچییانەی، کە لە کاتی جێبەجێ کردن دا ڕوو دەدەن، بۆ ئەوەی کار بکرێت بۆ ڕاست کردنەوەیان.[٦١٧]

خوێندنەوەی چاودێریش لەسەر کارگێڕیی گشتی لەم چار بەشەی خوارەوە دا دەگرینە ئەستۆ:

بەشی یەکەم: کرۆکی چاودێری.

بەشی دوەم: هەنگاو و شێوازەکانی چاودێری.

بەشی سێیەم: جۆرەکانی چاودێری.

بەشی چورەم: چاودێریی کارگێری لە ئیسلام دا.

---

[٦١٧] عبد الغني بسيوني عبد الله: أصول علم الإدارة العامة، ص٣٤٣.

# بەشی یەکەم

## کرۆکی چاودێری

چاودێری لە ڕوی زەمانەوانییەوە هاوتا بوون یا پێك چوونە. واتا چاودێری هەمیشە مانای پێویست بوونی هاوتایی و، گەڕانە بەدوای هاوتا بوونە[٦١٨]

هنری فایۆل پێی وایە، کە چاودێریی کارگێری: "لێکۆڵینەوەی ئەوەی هەموو شتێك هاوتای ئەو پلانەیە، کە دەستنیشان کراوە و، فەرمانەکانی، کە دراون و، ئەو بنەمایانەی، کە لەسەری وەستاون، بەمەبەستی ڕوون کردنەوەی هەڵە و لادانەکان بۆ ئەوەی بتوانرێت ڕاست بکرێنەوە و، جارێکی تر ڕوودانیان دوور بخرێتەوە"[٦١٩]

مارشال دیۆکیش چاودێری پێناسە دەکات بەوەی: " ئەو ئامرازەیە، کە پێیەوە سەرۆکایەتیی کارگێری دەتوانێت ئەوە دیاری بکات، کە ئایا ئامانجەکان بە تەواوێتی و لە کاتی دیاری کراو بەدەست هاتوون؟"[٦٢٠]

دکتۆر عەبدول غەنی بەسیۆنی عەبدولا پێی وایە، کە کرداری کارگێری سێ نیاری بنەڕەتی لە خۆ دەگرێت:

١ - دڵنیا بوونی دەسەڵاتی چاودێری لە دەستکەوتنی ئامانجەکانی ڕێکخراوەی کارگێری لە پلانی دانراو و، لێکۆڵینەوە لە مەودای تەواوێتی لە جێبەجێ کردن دا، واتا بەکارخستنی کەمترین کات و ڕەنج و دارایی توانراو.

٢ - ئاسوودەیی دروستیی هەڵسوکەوتە کارگێرییەکان لە ماوەی جێبەجێ کردن و، ئاشکرا بوونی ئەوەی ڕووی داوە لە هەڵە و لادانەکان و، ئاشنا بوونی هۆی ئەمانە، بۆ ئەوەی بتوانرێت لە ئاییندە دا لە ڕوودانیان دوور بکەوترێتەوە.

---

[٦١٨] دنيس ليفي: الوسيط في العلوم الإدارية، ص٩٦٣ وما يليها.

[٦١٩] هنري فايول: الإدارة الصناعية والعامة، ص١٢٣.

[٦٢٠] مارشال ديوك: وجلاديز أوجدن ولويس.كوينج: الإدارة العامة، ص٤٩٨.

٣ - لێکۆڵینەوە لە ڕەوایەتیی ئەو کارە کارگێڕیانەی، کە لە ماوەی جێبەجێ کردن دا تەواو بوونە و، هاوتاییان لەگەڵ یاسا و بڕیارەکانی جێبەجێ کردن، بۆ ئەوەی لە چارچێوەی ڕەواییەتیی تەواو ئامانجەکان بەدەست بێن و، پلانەکە بەدەست بێت.[621]

سەبارەت بە لایەنی چارچێوەی چاودێریش ئەوا جیاوازییەك لەم بابەتە لە لایەن شارەزایان دا هەیە، کە هەندێك لە شارەزایانی بەڕێوەبردنی گشتی چاودێری لە مانا تەنگەکەی دا کورت دەکەنەوە، واتا چاودێریی ناوخۆیی یا چاودێریی خودی کارگێڕی و، چاودێریی دەرەکی لە چارچێوەی توێژینەوە دەخە دەرەوە[622]، بەڵام بەشێکی زۆرتر هەن لە شارەزایانی بەڕێوەبردنی گشتی بەلای چارچێوەی چاودێری بە مانا فراوانەکەی دەچن، بۆ ئەوەی سەرجەم ئەو شێوانەی چاودێری بگرێتەوە، کە لەسەر چالاکییەکانی کارگێڕیی گشتی پیادە دەکرێن، جا ناوخۆیی — خوودی یا دەرەکی بن، لە لایەنە ڕەسمییەکان، کە یاسا دەسەڵاتی چاودێری بەسەریان دا سەرپشك کردوە.[623]

بەڵام وا باشە ئاماژەیەك بۆ بوونی چەندین وێنەی چاودێری بکرێت، کە بە سروشتی خۆی لە چارچێوەی تێخوێندنەوەی چاودێری دەردەچێت، ئەویش ئەو بارانەی چاودێرین، کە دەکەونە سەر یەکەیەك یا ڕێکخراوەك یا چالاکییەك، کە لە لایەنی ئەندامێتی لە ڕێکخراوەکانی بەڕێوەبردنی گشتی دانانرێت، هەروەها ئەو بارانەی، کە چاودێری لە لایەنی تایبەتەوە دەردەچێت بەسەر لایەنی تایبەتی تر، بەمجۆرەش لە چارچێوەی ئەو چاودێرییە دەردەچێت، کە بەڕێوەبردنی گشتی لەسەر چالاکیی تاکەکان بە مسۆگەر بوونی جێبەجێ کردنی یاسا پیادەیان دەکات، وەك چاودێری لەسەر نرخ و چاودێری لەسەر کێشان و، چاودێری لەسەر ڕەوشی کار لە

---

[621] عبد الغني بسيوني عبد الله: أصول علم الإدارة العامة، ص٣٤٨.
[622] محمد حسنين عبد العال: الإدارة العامة، دار النهضة العربية، القاهرة، ١٩٨١م، ص٢١٣.
[623] عبد الفتاح حسن: مبادئ الإدارة العامة، ص٢٧٩ و، مايليها و، عبدالكريم درويش وليلى تكلا: أصول الإدارة العامة، ص٥٠٥ ومايليها.

دەستگە تایبەتەکان و، چاودێری لەسەر دانی باج لە لایەن تاکەکان و، هەروەها چاودێریی دادگەی دەستووریی بڵند لە چارچێوەی تێخوێندنەوەی چاودێری یا چاودێریی دادگە پلە بەرزەکان لەسەر دادگەکانی خواروو.[٦٢٤]

گرنگیی چاودێری لە بواری پلان دانان دا دەردەکەوێت، کە چاودێریی جێبەجێ کردنی پلان و هەڵسەنگاندنی ئەنجامەکانی، بنەمایەکی سەرەکییە لە نێو ئەو بنەمایانەی، کە پلانی لەسەر دادەمەزرێت، هەروەك لە بواری ڕێکخستنی کارگێریش دا لە ئاشکرا کردنی خاڵە لاوازەکان لە پەیکەری ڕێکخستنی دەستگەی کارگێریی ڕێکخراوە و، مەودای ڕێککەوتنی ژمارەی کارکەران لەگەڵ قەبارەی چالاکیی هەر کارگێری و بەش و لقێك لە ڕێکخراوە، دەردەکەوێت.

چاودێری ڕۆڵی خۆی لە چارچێوەی پێ سپاردنی دەسەڵات بەو سەرۆکە کارگێرییەی، کە بەشێك لە پسپۆڕییەکانی بە هەندێك لە کارمەندانی دەسپێرێت، دەگێڕێت.

چاودێری پشکداری لە کرداری وەرگرتنی بڕیارە ساخەکان دا دەکات، چونکە پێیەوە سەرۆکە کارگێرییەکان دەتوانن زانیاریی ورد و دروست لەبارەی گرفتی دانراو بۆ خوێندنەوە وەربگرن، بۆ ئەوەی بڕیارێکی گونجاو بۆ چارەسەرکردنی دەربکەن، هەروەك چاودێری پشکداری لە کرداری هەماهەنگی دەکات بۆ پێ هەڵستانی بە ڕوون کردنەوەی ئەو ڕادەیەی، کە کرداری سازانی نێوانی هەوڵەکان پێی گەیشتوە و، مەودای کاراییی ئامرازەکانی هەماهەنگیی پیادە کراو و ئەو تەگەرانەی، کە دێنە پێش بێ بەدەست هێنانی هەماهەنگییەکی کارا لەنێو ئەو چالاکییە جیاجیایانەی، کە کارگێری و بەشەکانی ڕێکخراوەی کارگێری ڕایان دەپەڕێنن، هەروەك چاودێری وێنەیەکی ڕاستەقینەی تۆڕی پەیوەندیکاری، کە لە ڕێکخراوە دا بوونی هەیە دەدات و، ئەوانەش ئاشکرا دەکات، کە ڕوو دەدەن لە سەرپێچیی یاسایی یا هەڵەی هونەری، یا کەم و کوڕی لە ڕاپەڕاندن، یا کەمتەرخەمی کردن لە بەدەست هێنانی ئەوەی یارمەتیی سەرکردایەتیی ڕێکخراوە

---

[٦٢٤] عبد الغني بسيوني عبد الله: أصول علم الإدارة العامة، ص٣٤٨.

دەدات لە ڕووبەڕوو بوونەوەی سەرپێچی و هەڵەکان بە هەڵسەنگاندن و چاکسازی[٦٢٥]

بۆ ئەوەشی چاودێری سەرکەوتن و کارایی بەدەست بهێنێت، دەبێت ئەو کۆڵەگە بنەڕەتییانەی هەبێت، یەکەمیان: چاودێری لەگەڵ سروشتی چالاکی و ڕەوش و پێویستییەکانی کاری کارگێری بشێت، چونکە جیاوازیی گەورە لە نێوان سروشتی چالاکی هەر کارێکی کارگێری دا هەیە، هەروەك ئەو سیستمی چالاکییەی، کە بۆ وەزارەتی کشتوکاڵ دەگونجێت بۆ وەزارەتی دەرەوە سوودی نابێت[٦٢٦] و، دووەمیش: سیستمی چاودێری بە نیانی و توانای هەموار کردن و ڕاستکردنەوە لەگەڵ گۆڕانی دۆخی کار جیا دەکرێتەوە، سێیەمیان: کەمیی تێچوەکانی سیستمی چاودێری[٦٢٧] و، سانایی و ئاسانی و ڕوونی، بۆ ئەوەی بتوانرێت تێیان بگەیشترێت و بەدەم سەرجەم پێیوستییەکانەوە بچێت، پێویستە پیادەی چاودێری لە کاتێکی شیاو دا بکرێت، بۆ ئەوەی پەی ببرێت بە هەڵە و خەوشەکان و چاك کردنەوەیان بەر لە ڕوودانی سەرپێچییەکان و ڕوودانی لادانەکان، یا بەلانی کەم بەر لە کەلەکە بوونیان بگیرێت، هەروەك پێویستە چاودێری بەرهەمهێن بێت و، سەرکردایەتی کارگێریش تواناداد بکات لە چاك کردنەوەی هەڵەکان و هەڵسەنگاندنی ئەو لادانانەی، کە ئاسکرا دەبن و گرتنەبەری ڕێوشوێنی پێویست بۆ ڕاستکردنەوەی ڕەوشەکان[٦٢٨]

---

[٦٢٥] عبد الغني بسيوني عبد الله: أصول علم الإدارة العامة، ص٣٥٠.

[٦٢٦] عبد الغني بسيوني عبد الله: أصول علم الإدارة العامة، ص٣٥١.

[٦٢٧] حسن توفيق: الإدارة العامة، ص١٥٢.

[٦٢٨] عبد الغني بسيوني عبد الله: أصول علم الإدارة العامة، ص٣٥٢.

# بەشی دووەم

# قۆناغ و ڕێگەکانی چاودێری

لەم بەشە دا قۆناغەکانی چاودێری و ڕێگەکانی دەخوێنین، بۆیە ئەم بەشە بۆ دوو توێژبەند دابەش دەکەین:

**توێژبەندی یەکەم:** قۆناغەکانی چاودێری.

**توێژبەندی دوەم:** ڕێگەکانی چاودێری.

## توێژبەندی یەکەم

## قۆناغەکانی چاودێری

بۆ ئەوەی کرداری چاودێری بە سەرکەوتویی ئەنجام بدرێت، دەبێت ئەم هەنگاوە بنەڕەتییانەی خوارەوە بگیردرێتەبەر

١ - دانانی تێکرا گەلێك بۆ بەجێهێنان

٢ - هەڵسەنگاندنی ئەو کارانەی بە پێوانەی ئەم تێکڕایانە تەواو بونە.

٣ - ڕاست کردنەوەی هەڵەکان و هەڵسەنگاندنی لادانەکان.

لە خوارەوەش دا باسی هەر هەنگاوێك لەم هەنگاوانە دەگرینە ئەستۆ.

## یەکەم: دانانی تێکڕا گەلێك بۆ بەجێهێنان

مەبەست لەم تێکڕایانە ئەو پێوەرانەن، کە لەسەر بنەمایانەوە پێوانەی دەستکەوتەکانی کارکەران لە ڕێکخراوەی کارگێری دەکرێت[٦٢٩]، ئەم پێوەرانەش لە یەکە گەلێکی کاری دیاری کراو پێك دێن بۆ پێوانە کردنی چەندایەتیی کار و ئاستی و ئەو کاتەی، کە پێویستە بۆ ڕاپەڕاندنی[٦٣٠]

یەکەی کاریش کردارێکە یا بەشێکە لە کردار، دابەش کردن بۆ بەشی بچووکتر لە پیادە کردن دا لەژێر دۆخێکی ڕاپەڕاندنی خراپ، پەسەند ناکات.

زۆربەی جار یەکە گەلێك بۆ پێوانە کردنی کارە جیاجیاکان لە ناوەوەی ڕێکخراوەی کارگێری بۆ بوون بە تێکڕا گەلێکی هەڵسەنگاندنی بەجێهێنانی کارکەران، دیاری دەکرێن.

ئەم تێکڕایانەش لە ڕێکخراوەکی کارگێرییەوە بۆ یەکێکی تر جیاوازە بەگوێرەی چۆنایەتیی ئەو چالاکیەی، کە هەر ڕێکخراوەك بەگوێرەی ئامانجەکانی پیادەی دەکات، بۆیە تێکڕاکانی بەجێهێنان لە کۆمپانیایەکی بیناسازی و بەڵێندەرایەتی بە پێویستییەوە جیاوازە لەو تێکڕایانەی، کە لە دامەزراوەیەکی بەرهەمهێنانی پەلەوەر دادەنرێت، بە نموونە[٦٣١]

ئاستەنگییەکیش لە دانانی تێکڕا لە بواری بەڕێوەبردنی گشتی دا هەیە، بە هۆی جیاوازیی ئاسانیی لە دانانی تێکڕایی لە بەڕێوەبردنی کار دا، چونکە زۆرێك لە کارەکانی حکومەت پێوانە کردنی لە ڕووی چەندایەتی ئەستەمە، لەگەڵ ئەوەش دا هەوڵ گەلێك بۆ ملکەچ پێ کردنی ئەم کارانە بۆ پێوانە کردن هەیە، وەك ئەوەی لە ولایەتە یەکگرتوەکانی ئەمەریکا ڕووی دا، کە چەندین پێوانە بۆ تەواوێتیی بەجێهێنان لەسەر ئاستی شارەوانی و کارەکانی پۆلیس و ئاگر کوژێنەرەوە و فێر کردن و خزمەتگوزاریی نووسینگەیی و ئیشە گشتییەکان

---

[٦٢٩] عبد الغني بسيوني عبد الله: أصول علم الإدارة العامة، ص٣٥٣.

[٦٣٠] حسن توفيق: الإدارة العامة، ص١٥٣.

[٦٣١] عبد الغني بسيوني عبد الله: أصول علم الإدارة العامة، ص٣٥٤.

دانراوە، هەروەك پەیدا بوەك بە ناوی "سەنگی ڕاپەڕاندن" بوو بە هاوڕێی ئەم کارە کارگێڕییە حکومییانە، بۆ ڕوون کردنەوەی فرمانەکان و ڕوەکانی چالاکیی میری و تێچوەکانی هەر پرۆژەیەك[٦٣٢]

## دوەم: هەڵسەنگاندنی کارەکان

مەبەست لەمەش دا ئەوەیە، کە ئەو کار و چالاکییانەی بەدەست خراون بە تێکڕا دانراوەکانی بەجێهێنان، کە دیاری کراون بەراورد بکرێن، بۆ زانینی ئاستی بەدەست هاتنی کارەکان بەپێی چەندایەتی و چۆنایەتی و کات.

## سێیەم: ڕاست کردنەوەی هەڵەکان و هەڵسەنگاندنی لادانەکان

ئەم قۆناغە بە ئامانجی ڕاست کردنەوەی هەڵە و سەرپێچییەکان و، چارەسەر کردنی هۆکارەکانی ئەو کەموکوڕی و لادانانەی لە ڕاپەڕاندنی کارەکان دا لە قۆناغی پێشوو دا ئاشکرا بوونە و، دوای بەراورد پێ کردنیان بە تێکڕاکانی بەجێهێنان، دێت.

دەسەڵاتی تایبەت بە چاودێریش هەڵدەستێت بە دانانی ڕاپۆرتی تێروتەسەل، کە سێ قۆناغی وەرگیراو لە خۆدەگرێت بۆ بەدەست هێنانی چاودێری و، ڕوون کردنەوەی ئەو هەڵە و سەرپێچییانەی، کە لەمیانەی پیادە کردنی چاودێری دا ئاشکرا دەبن و، خوێندنەوە و زانینی هۆکارەکانی و شی کردنەوەی هاندەرەکانی و ڕوون کردنەوەی ئەو هۆکارانەی، کە یارمەتیی ڕوودانیان بوونە و، چارەسەر کردنی ئەو هۆکارانەی، کە بوونەتە هۆی ئەم هەڵانە و، چاك کردنەوەی ئەو خەوشانەی، کە بۆنەتە هۆی ڕوودانی لادانەکان[٦٣٣]

---

[٦٣٢] عبد الغني بسيوني عبد الله: أصول علم الإدارة العامة، ص٣٥٥.

[٦٣٣] عبد الغني بسيوني عبد الله: أصول علم الإدارة العامة، ص٣٥٦.

# توێژبەندی دووەم

# ڕێگەکانی چاودێری

ڕێگە و شێواز گەلێکی هەمەجۆر هەن بۆ پیادە کردنی چاودێری لە ناوەوەی ڕێکخراوە کارگێرییەکان، بەڵام ڕای شارەزایانی بەڕێوەبردنی گشتی دەربارەی دیاری کردنی ئەم ڕێگە یا شێوازانە، جیاوازە.

هەروەك هەیانە پێیان وایە، کە بریتیە لە پشکنینی کارگێری و ڕاپۆرتە کارگێری و سکاڵاکان[٦٣٤] و، هەشیانە لە ڕاپۆرت و هێلکاری و سەنگ و بەرزەفتکارییە ڕووتەکان دیاریی دەکەن[٦٣٥] و، هەشیانە پێیان وایە، کە تێبینی و پێشەنگیی چاك و تۆمار و ڕاپۆرت و دانانی سنوور و ڕێسا و فەرمان و ڕێوشوێنەکان و سەنگ و ڕەخنە و لۆمە و سیستم لە خۆ دەگرێت[٦٣٦]

دکتۆر عەبدول غەنی بەسیۆنی عەبدوللا پێی وایە، کە گرنگترین شێوازەکانی چاودێری، لە لایەك لە ڕاپۆرتە کارگێریەکان و، تێبینی و پشکنینیش لە لایەنی دووەم و، لە بەرزەفتکاریی سەنگ و دانانی سنوور بۆ مەزاختن لە لایەنی سێیەم، گرد دەبێتەوە[٦٣٧]

باشتر وایە بگوترێت، کە هەر ڕێکخراوێکی کارگێری بەو شێوازانە دەگیردرێتە بەر، کە لەگەڵ سروشتی چالاکیی و خواستەکانی دا دەگونجێت و لەگەڵ ڕێکخستنە کارگێرییەکەی دا دەسازێت.

---

[٦٣٤] إبراهيم درويش، الإدارة العامة في النظرية والممارسة، ص٥٩٣.

[٦٣٥] حمدي أمين عبد الهادي: نظرية الكفاية في الوظيفة العامة، ص٦٦٤.

[٦٣٦] محمد سعيد عبد الفتاح: الإدارة العامة، ص٣٠٨.

[٦٣٧] عبد الغني بسيوني عبد الله: أصول علم الإدارة العامة، ص٣٥٨.

# بەشی سێیەم

# جۆرەکانی چاودێری

بۆچوونەکانی شارەزایانی بەڕێوەبردنی گشتی دەربارەی پرسی دیاری کردنی جۆرەکانی چاودێریی گشتی جیاوازە، جۆرەکانی چاودێریش لەم سێ توێژبەندەی خوارەوە دا دەخوێنین

**توێژبەندی یەکەم:** چاودێریی سیاسی.
**توێژبەندی دوەم:** چاودێریی دادوەری.
**توێژبەندی سێیەم:** چاودێریی کارگێری.

## توێژبەندی یەکەم

## چاودێری سیاسی

مەبەست لە چاودێریی سیاسی ئەو چاودێرییەیە، کە گەل بەسەر ڕێکخراوە کارگێرییەکانی وڵات دا پیادەی دەکەن، بۆ دڵنیا بوونیان لە ڕێك بەڕێوەبردنی کەرتی گشتی و ئاشکرا کردنی ئەو هەڵە و لادانانەی، کە دەکەونەوە، بە ئاواتی ڕاست کردنەوەیان و، چاودێریی سیاسی لە ڕێگای ئەنجوومەنە هەڵبژێردراوەکانی نوێنەران، یا لە ڕێگەی پارت و ڕێکخستنە سیاسییەکان، یا لە ڕێگای کاریگەریی ڕای گشتی دا، پیادە دەکرێت[٦٣٨]

---

[٦٣٨] عبد الغني بسيوني عبد الله: أصول علم الإدارة العامة، ص٣٦٧.

## خواستی یەکەم: پێشکەش کردنی پرسیار و وەڵام

ئەنجوومەنی نوێنەران چەندین ئامرازی بۆ چاودێری لەسەر کارەکانی حکومەت و وەزارەتەکانی و ڕێکخراوە کارگێڕییە جیاجیاکانی دا هەیە، گرنگترینیان بریتییە لە پێشکەش کردنی پرسیار و وەڵام بۆ ئەندامانی حکومەت و، تاوتوێی بودجەی گشتی و پەسەند کردنی و، پێك هێنانی لیژنە بۆ لێکۆڵینەوە و دەنگ دان لەسەر متمانە بە حکومەت و، کێشانەوەی متمانە پێی یا بە هەر ئەندامێك لە ئەندامەکانی[٦٣٩]

## خواستی دوەم: چاودێریی پارت و ڕێکخستنە سیاسیەکان

پارتە سیاسیەکان لە سیستمی پەرلەمانی بە ڕۆڵێکی گرنگ لە چاودێری کردن بەسەر دەستە و ڕێکخراوەکانی دەستگەی کارگێڕیی وڵات هەڵدەستن، ئەم چاودێرییانەش لە لایەن ئەو پارت و ڕێکخستنە سیاسییە بەرهەڵستکارانە دا دەکرێت، کە ڕەخنە لە سیاسەتی حکومەت دەگرن و، ئەو کەم و کوڕییانەشی ئاشکرا دەکەن، کە لە جێبەجێ کردنی پرۆژەیەك لە پرۆژە گشتییەکان دا هەیە، یا ئەو هەڵە و خەوشانەی کە تێکەڵی ڕێکخستنی کارگێڕیی وەزارەتێك لە وەزارەتەکان یا کارگێڕییەك لە کارگێڕییەکان دەبن. بەزۆریش پارتە بەرهەڵستکارەکان بە ئامرازی جۆراوجۆر لە ڕێگەی ئەندامانی ئەم پارتە بەرهەڵستکارە، یا لە ڕێگەی ئەو ڕۆژنامانەی، کە دەریان دەکات یا لەو کۆبوونەوە و کۆنگرانەی، بۆ داوا کردنی ڕاست کردنەوەی ڕەوشەکان و چاکسازیی ئەم سەرپێچییانە دەیبەستن، بە پیادە کردنی چاودێرییەکەیان هەڵدەستن[٦٤٠]

---

[٦٣٩] عبد الغني بسيوني عبد الله: أصول علم الإدارة العامة، ص٣٦٧.

[٦٤٠] عبد الغني بسيوني عبد الله: أصول علم الإدارة العامة، ص٣٧٣.

## خواستی سێیەم: چاودێریی ڕای گشتی

مەبەست لە چاودێری ڕای گشتی، چاودێریی خودی هاولآتیانە بەسەر دەستگەی کارگێریی ولآت لە ڕێگەی بەشدار بوونی هاولآتییان خۆیان لە ئەنجوومەن و لیژنە کارگێرییەکان، یا لە بەشدار بوونیان لە مافە سیاسییەکان، یا لە ڕێگەی ئەو ڕۆلەی، کە کۆمەڵە خاوەن بەرژەوەندییەکان ، یا بە ئامرازە جیاجیاکانی بلآو کردنەوە، ڕایان دەپەڕێنن [٦٤١]

[٦٤١] عبد الغني بسيوني عبد الله: أصول علم الإدارة العامة، ص٣٧٣.

# توێژبەندی دووەم

## چاودێریی دادوەری

چاودێریی دادوەری لەسەر کارەکانی بەڕێوەبردنی گشتی بە توندترین جۆرەکانی چاودێریی کارا گوزارشت دەکرێت، بە سەرنج دانە ئەوەی، کە ویستی سەربەخۆیی و مسۆگەری هەیە و، لەبەر ناسرانی بە بێ لایەنی و بابەتییانە، گرتنە دەستی کردەی بەدەست هێنانی دادگەری و دادخوازی لە ڕێگەی دەرکردنی ئەو بڕیارانەی، کە هێزی کۆتا هێنان بە نیارەکانی هەیە. چاودێریی دادوەری لە سیستمی دادوەریی یەکگرتوو، لە ڕێگەی ئەو دادگە ئاساییانە دەبێت، کە تایبەتن بە سەرجەم ناکۆکییەکان لە نێویان تایبەتی و کارگێرییەکان، بۆیەش دادگە ئاساییەکان ئەمانەن، کە چاودێری لەسەر کارەکانی کارگێڕی لە وڵاتانی ئەم سیستمە دەگرنە ئەستۆ[٦٤٢]

لە وڵاتانی ئانکلوسکسونیە دا ڕێسایەکی کلاسیکی باوە، کە دەڵێت پادشا هەڵە ناکات، واتا مادەم حکومەت سەروەرە، ناکرێت دادگایی بکرێت مەگەر ڕەزامەندی لەسەر شێوەی ئەم جۆرە ڕێوشوێنە درا، بەڵام پەرەسەندنێك لە سۆنگەی ئەم ڕێسایەوە ڕوی دا، بۆیە حکومەتی ویلایەتە یەکگرتوەکانی ئەمەریکا ئەم جیاوکییەی لە دەست دا لە لایەنی پارێزراویی حکومەت لە دادگایی کردن و، یاسا گەلێك بۆ بوارەکان دیاری کران ، کە هاوڵاتی بتوانێت پێیەوە دادگایی حکومەت بکات لەکاتی ڕوودانی دەست درێژی لەسەر مافەکانی لە ئەنجامی کارەکانی کارگێڕی.

سەبارەت بە چاودێریی دادوەری لە سیستمی دادوەریی دوانەیش، ئەوا لە ڕێگەی ئەو دادوەرییە کارگێرییەوە دەبێت، کە پیادەی چاودێرییەکی کارا لەسەر

---

[٦٤٢] عبد الغني بسيوني عبد الله: أصول علم الإدارة العامة، ص٣٧٦.

کارەکانی کارگێڕیی گشتی دەکات بۆ بەدەست هێنانی بەرژەوەندیی گشتی و، پاراستنی ماف و ئازادیی تاکەکان دژی هەر هەڵەشەیی یا زیادەڕۆییەك لە سنووری دەسەڵاتی لایەنێکی کارگێڕی[٦٤٣]

---

[٦٤٣] عبد الغني بسيوني عبد الله: أصول علم الإدارة العامة، ص٣٧٨.

# توێژبەندی سێیەم

# چاودێریی کارگێڕی

مەبەست لە چاودێریی کارگێڕی ئەو چاودێرییە خۆدییەیە، کە دەستگەی کارگێڕیی ولاّت لەسەر خۆی دا پیادەی دەکات، واتا هەڵستانی کارگێڕیی گشتییە بە چاودێریی خۆی بە خۆی، جا ئەم چاودێرییە هەڵقوڵاّوی ناوەوەی ڕێکخراوە کارگێڕییەکە خۆی بێت، یا لە دەسەلاّتی ناوەندی تایبەت، واتا لە دەرەوەی ئەم ڕێکخراوە.

چاودێری لە ناوەوە، بریتییە لەو چاودێرییە سەرۆکایەتییەی، کە سەرۆکەکان بەسەر کارمەندەکانیان دا دەیکەن، جا چاودێری لەسەر کەسێتیی ئەم کارمەندانە بێت یا لەسەر کارەکانیان.

سەبارەت بە چاودێریی دەرەوەکیش یا ئەوەتا لە دەسەلاّتی کارگێڕیی ناوەندی و دەستگەی ناوەندی تایبەت دەبێت بەسەر ڕێکخراوە گشتییە کارگێڕییەکان لە لایەك و، یا لە لایەن دەسەلاّتی ناوەندییەوە بەسەر دەستە و یەکە کارگێڕییە نا ناوەندییەکانەوە دەبێت، جا ناوخۆیی بن یا هەرێمی.[٦٤٤]

## خواستی یەکەم: چاودێریی کارگێڕی لە ناوەخۆ دا

چاودێریی کارگێڕی لە ناوخۆ دا، یا چاودێریی سەرۆکایەتی لە سەرۆکەکانەوە بەسەر کارمەندان لە ناوەوەی قوچەکی فرمانیی ڕێکخراوەی کارگێڕی، بریتییە لە دوو جۆری سەرەکی، کە زۆرینەی شێوەکانی چاودێری دەگرنەوە: چاودێری بەسەر کەسان و، چاودێری بەسەر کارەکان[٦٤٥]

---

[٦٤٤] عبد الغني بسيوني عبد الله: أصول علم الإدارة العامة، ص٣٧٨.

[٦٤٥] بكر القباني: الرقابة الإدارية، طبعة أولى، دار النهضة العربية، القاهرة، ١٩٧٨م، ص٥٤ ومايليها.

لە لایەنی چاودێری، بەسەر کەسەکانەوە، دەسەڵاتی سەرۆکایەتی بەسەر کەسەکان مافی دەسەڵاتی کارگێری لە خۆدەگرێت لە پیادە کردنی دەسەڵاتی ڕێکخستن و تەمبێ کردن(پەروەردە) و دەسەڵاتی دەرکردنی ڕێنماییەکان[٦٤٦]

لە لایەنی چاودێری بەسەر کارەکانیش دا، ئەوا ئامانجی مسۆگەر کردنی ڕەواییەتی یا لوانی کارە کارگێڕییە دەرچوەکانە لە لایەنی کارمەندان، ئەمەش یا خۆی لە خۆی دا لە لایەن سەرۆکی کارگێڕییەوە دەبێت یا بە بنیات لەسەر تانە و سکاڵاکان، کە لە لایەن تاکەکانەوە بۆ سەرۆکە کارگێڕییەکان پێشکەش دەکرێن، ئەم چاودێرییانەش دوو بەشن:

بەشی یەکەم: چاودێریی هونەری و، چاودێریی کارگێری.

بەشی دوەم: چاودێریی پێشوەخت و، چاودێریی داهاتوو.

## بەشی یەکەم: چاودێریی هونەری و، چاودێریی کارگێری

دەکرێت چاودێری خودان سروشتێکی هونەری بێت، واتا لەسەر ئەو کارە پسپۆڕییانەی، کە چالاکیی ڕێکخراوەی کارگێری جیا دەکەتاوە ئەنجام بدرێت. هەروەك ناوەڕۆکی چاودێری لە وەزارەتی پەروەردە بە نموونە لە هەڵسەنگاندنی چالاکیی فێرکاریی دەستە فێرکارییەکان دیاری دەکرێت، ئەمەش لە ڕێگەی پشکنەرانی ڕەسمیی فێر کردن دەبێت لە تەواوی کەرەستە زانستییەکان، لە کاتێك دا چاودێریی کارگێری لەسەر بەڕێوەبردنی ئامرازەکان یا پێشکەش کردنی خزمەتگوزاری ئەنجام دەدرێت. کەواتە لە بەرانبەر ئەو چاودێرییە هونەرییەی لە وەزارەتی پەروەردەوە، کە ئامانجی هەڵسەنگاندنی بەجێهێنانە، چاودێریی کارگێری پشکنینی ژمێرەی دامەزراوە فێرکارییەکان یا شێوازەکانی لە کڕین و فرمانەکانی کارکەران تێی دا دەگرێتە ئەستۆ[٦٤٧]

---

[٦٤٦] بكر القباني: الرقابة الإدارية، طبعة أولى، دار النهضة العربية، القاهرة، ١٩٧٨م، ص٥٥ ومايليها.

[٦٤٧] عبد الغني بسيوني عبد الله: أصول علم الإدارة العامة، ص٣٨٢.

## بەشی دووەم: چاودێریی پێشوەخت و، چاودێریی داهاتوو

چاودێری هەیە پێش دەرکردنی بڕیارەکان ئەنجام دەدرێت و، ناودەبرێت بە چاودێریی پێشوەخت و، چاودێریش هەیە دوای ئەمە ئەنجام دەدرێت و ناویش دەبرێت بە چاودێریی داهاتوو. چاودێریی پێشوەختیش لەسەر پڕۆژە بڕیار پێش دەرچوونی ئەنجام دەدرێت، کە دۆسیە تایبەتەکانی بە پڕۆژە بڕیار لە لایەنی چاودێران لە ڕێکخراوەی کارگێری دەپشکنرێت، بەجۆرێك دەتوانن دوای ئاسوودە بوون ڕەزامەندی ڕابگەیەنن، لە درووستیی زانیارییەکان و، ساغیی بەڵگەنامە پەیوەندیدارەکان بە بڕیار، یا دەرخستنی نارەزامەندییان لەسەر پڕۆژە بڕیارەکە، بەڵام چاودێریی داهاتوو ئەوەیە، کە دوای دەرکردنی بڕیارەکان ڕوودەدات، بە ئامانجی پشکنینی ئەو بڕیارانە و گرتنەبەری ڕێوشوێنی شیاو[٦٤٨]

## خواستی دووەم: چاودێریی کارگێری لە دەرەوە دا

چاودێری بەسەر کارەکانی ڕێکخراوە کارگێرییەکان لە دەرەوە دا بۆ دوو لق پۆلێن دەبێت:

**لقی یەکەم:** چاودێریی دەسەلاتی ناوەندی بەسەر ڕێکخراوە و یەکە کارگێرییە نا ناوەندییەکان.

**لقی دووەم:** چاودێریی سەپێنراو بەسەر ڕێکخراوە کارگێرییەکان لە دەستگەی کارگێریی ناوەندیی تایبەت و سەربەخۆ، کە چالاکییەکانی بەسەر سەرجەم ڕێکخراوە کارگێرییە گشتییەکان لە وڵات دا، پیادە دەکات.

## لقی یەکەم: چاودێریی کارگێری

ئامانجی چاودێریی کارگێری، دڵنیا بوونی تەواوێتیی ڕێزگرتنی بنەمای ڕەوابیەتییە، سەبارەت بە سەرجەم کارە دەرچوەکان لە ڕێکخراوەی کارگێریی نا

---

[٦٤٨] محمد حسنين عبد العال: الإدارة العامة، ص٢١٦ ومايليها.

ناوەندی لە لایەك و، لە لایەکی تر کۆشش دەکات بۆ بەدەست هێنانی بەرژەوەندیی گشتی، کە خۆی لە خودی بەرژەوەندیی وڵات و بەرژەوەندیی دەستە نا ناوەندییەکان و بەرژەوەندیی هاوڵاتییان دەبینێتەوە.

چاودێریی کارگێری بریتییە لە چاودێری بەسەر ئەندامان لە لایەك و چاودێری بەسەر کارەکان لە لایەکی تر.

چاودێریی لەسەر ئەندامان مافی نوێنەر لە دامەزراندن و تەمبێ کردنی هەندێك هەڵسەران بە بەڕێوەبردنی ئەم ڕێکخراوە و دەستانە و، دەرکردنی ڕێنمایی و وەرگرتنی ڕاکانیان و، ئامادە بوونی دانشتنەکانی ئەم دەستانە و، ڕاگرتن یا هەڵوەشاندنەوەی ئەنجوومەنەکانی کارگێریی دەستە نا ناوەندییەکان، دەگرێتەوە[٦٤٩]

کردەی چاودێریی کارگێریش لەسەر ڕێکخراوە نا ناوەندییەکان تەنها لە چاودێری بەسەر ئەندامان لە کارەکان دا ناوەستێت، بەڵکو بۆ چاودێری بەسەر جێبەجێ کردنی ئەم کارانەش درێژ دەبێتەوە، لە ڕێگەی ئەو یارمەتییە دارایی و هونەری و کارگێرییانەی، کە دەسەڵاتی چاودێری لە ماوەی قۆناغی جێبەجێ کردن دا پێشکەشی دەکات[٦٥٠]

## لقی دووەم: چاودێریی دەستگەی ناوەندیی تایبەت

دەستگەیەکی کارگێریی ناوەندیی سەربەخۆ بەم چاودێرییە هەڵدەستێت، هەریەکێکیان تایبەت دەکرێت بە چاودێری بەسەر چالاکییەك لە چالاکییەکان سەبارەت بە سەرجەم ڕێکخراوە کارگێرییە گشتییەکان لە وڵات، ئەمەش بە یەکێك لە دیاردە پەرەسەندووەکان لە سیستمی چاودێریی کارگێری گوزارشت دەکرێت، هەروەك دەبینین زۆرینەی وڵاتانی جیهانی دەستگەیەکی ناوەندیی سەربەخۆیان بۆ چاودێری کردن بەسەر دەستە کارگێرییە گشتییەکان دامەزراندوە، کە شانبەشانی چاودێریی سەرۆکایەتی لە ناوەوەی ئەم ڕێکخراوانە ئەنجام دەدرێت.

---

[٦٤٩] بكر القباني: الرقابة الإدارية، ص٧٣ ومايليها.

[٦٥٠] عبد الغني بسيوني عبد الله: أصول علم الإدارة العامة، ص٣٨٦.

جێی تێبینییە، کە شێوەیەکی دیاری کراو بۆ ئەم چاودێرییە ناوەندییە نییە، بەڵکو هەر ولاتێك هەڵدەستێت بە دامەزراندنی دەستگەیەکی چاودێریی تایبەت، کە لەگەڵ دۆخ و ڕەوشی کارگێرییەکەی و، لەگەڵ سروشتی سیستمە سیاسییەکەی بە شێوەیەکی گشتی بلوێت[٦٥١]

ئەم دەستگە چاودێرییانە بە یەکەی کارگێریی جێبەجێ کردن گوزارشت ناکرێن، بەڵکو دەچنە چارچێوەی یەکە کارگێرییە یاریدەدەرە ڕاوێژکارییەکان، کە لە دواوەی کارەکەی دا، ئامانجی پێشکەش کردنی ڕاوێژ و ڕای هونەرییە، بۆ چاك کردنەوەی ئەو هەڵە و سەرپێچییانەی ئاشکرا دەبن و، ئەمەش هاوڕێی ڕوەکی ئەرینیی چاکسازییە، کە بوەتە تایبەتمەندییەکانی چاودێریی کارگێری نوێ[٦٥٢]

لەم ڕووەوە ویلایەتە یەکگرتوەکانی ئەمەریکا هەڵساوە بە دانانی ژمارەیەك لەم دەستگە و دەستە ناوەندییە تایبەتانە، لە نێویان خزمەتگوزاریی شارستانی و نووسینگەی بودجە و گارگێریی ناوەندیی کراوەکان.

دەستگەی ناوەندیی تایبەت لە هەندێك ولاتان دا بوونیان هەیە، وەك سیستمی ژمێریاری و ئەو سەرچاوانەی، کە لە شانشینی یەکگرتوو و هیند بوونیان هەیە.

---

[٦٥١] إبراهيم درويش: الإدارة العامة في النظرية والممارسة، ص٥٩٩ ومايليها.

[٦٥٢] عبد الغني بسيوني عبد الله: أصول علم الإدارة العامة، ص٣٨٧.

# بەشی چارەم

## چاودێریی کارگێڕی لە ئیسلام دا

### بەرایی

چاودێری یەکێکە لە پیکهاتەکانی کرداری کارگێڕی، هەروەك فرمانێکیشە لە فرمانەکانی کارگێڕی، بە ڕوە جیاجیاکانی چالاکیی کارگێڕی، لە پلان دانان و ڕێکخستن و سەرکردایەتی و وەرگرتنی بڕیار و جێبەجێ کردنی ئەم بڕیارانەوە بەندە، هەروەها کردارێکی بەدواداچوونی بەردەوامە، کە لە بنەڕەت دا ئامانجی دڵنیا بوونە لەوەی، کە کارە کارگێڕییەکان بە ئاراستەی ئامانجە نەخشە بۆ کێشراوەکان بەشێوەیەکی باش بەڕێوە بچێت، هەروەك ئامانجی ئاشکرا کردنی هەڵە و لادانەکانە، پاشان ڕاست کردنەوەی ئەم هەڵە و لادانانە، دوای دیاری کردنی بەرپرسیار لێی و لێپێچینەوەی بە شێوەیەکی یاسایی دادگەرانە.

دەشکرێت چاودێریی ناوخۆیی لە چارچێوەی دەسەڵاتی جێبەجێ کردن ببێت، لە کردارێك دا، کە کارکەران لە سەرجەم ئاستەکانی کارگێڕی پێی هەڵدەستن و تەنها لە کارگێڕیی بڵند دا، کورت نابێتەوە، بەڵکو چاودێری لە دەرەوە دا لە ڕێگەی دەستگە گەلێکی دامەزراو بۆ هەمان مەبەست، بەسەر دەستگەی جێبەجێ کردنەوە زاڵە.

چاودێری تاکە بەرپرسەکانی لە ڕاپەڕاندنی کاری جێبەجێ کردن دا ئامانجە. واتا تاکەکان ئاواتی چاودێرین، چونکە سەرنج دەداتە ڕاپەڕاندنی پەیامەکەیان و، هەڵەکانیان ئاشکرا دەکات و ڕێدەریان ڕاست دەکاتەوە و، ئاراستەیان دەکات بۆ ڕێگای ڕاست، بۆیەش پێداویستیی بە هەندێك لە دانایی و ژیری و خاراوی بە لایەنە دەروونی و مرۆییەکانی کارکەران دەبێت و، مەبەستی دادگەری لە هەڵسەنگاندنی بەجێهێنانی کاراکەران دەبێت و، زێدەڕۆیشی تێ دا نەکرێت، ببێتە هۆی نەرێنی بوونی کارکەران و کوشتنی پاڵنەر لە دەروونیان دا.

بنچـینەی فەلسـەفەی چـاودێریی کـارگێڕیش لـە ئیسـلام دا لـە چـەمکی بەرپرسیاریی تاك و سپاردە و دادگەری هەڵدەقوڵێت، هەروەك ئیسلام فـەرمان بـە تاکی کارکەر دەکات بە بەجێهێنانی سپاردە و، فرمانی سپاردە، هەروەك لە پێشوو دا ئاشنای فەرمایشتی خوای گەورەمان بوین: ﴿إِنَّ اللّهَ يَأْمُرُكُمْ أَن تُؤدُّواْ الأَمَانَاتِ إِلَى أَهْلِهَا وَإِذَا حَكَمْتُم بَيْنَ النَّاسِ أَن تَحْكُمُواْ بِالْعَدْلِ﴾[٦٥٣] واتـا: (هەڵبەتـە خـوا فەرمانتان پێ دەکات، کە سپاردەکان بـۆ خاوەنـەکانیان بگەڕێننـەوە و ئەگـەریش فەرمانڕەوایتان لە نێو خەڵکی دا کرد، ئەوا بە دادگەری فەرمانڕەوایی بکەن).

بەجێهێنانی سپاردە مووسوڵمانی کارکەر ناچار دەکات، کە لە کارەکەی دا لـە خوا بترسێت و، بەرلەوەی لێی بپێچرێتەوە لە خـۆی بپێچـێتەوە، هـەروەك خـواش چاودێریی کارەکانی دەکات، پەیامبەری بەڕێز ﷺ دەفەرموێت: (الأحسـان أن تعبـد الله كأنك تراه فإن لم تكن تراه فإنه يـراك). واتا: (چاکە ئەوەیە، کە خوا بپەرسـتیت وەك ئەوەی، کە دەیبینیت، خۆ گـەر نەشـیبینین، ئـەوا ئـەو دەتبینێـت). درود و سەلامی خوای لەسەر بێت دەشفەرموێت: (حاسبوا أنفسكم قبل أن تحاسبوا). واتە: ( بەر لەوەی لێتان بپێچرێتەوە لە خۆتان بپێچنەوە). خوای گـەورەش دەفـەرموێت: ﴿وَكُـلَّ إِنسَـانٍ أَلْزَمْنَـاهُ طَـآئِرَهُ فِـي عُنُقِـهِ وَنُخْـرِجُ لَـهُ يَـوْمَ الْقِيَامَـةِ كِتَابًـا يَلْقَـاهُ مَنشُورًا١٣اقْرَأْ كَتَابَكَ كَفَـى بِنَفْسِـكَ الْيَـوْمَ عَلَيْـكَ حَسِيبًا﴾[٦٥٤]. واتـا: "بـۆ هـەر مرۆڤێك سەرەنجامی بەستراوەتەوە(بەو کردەوەیانەی لە ژیـانی دا ئـەنجامی دەدات) بە ملوانکەیەك لە ملییەوە ئاڵاوە و لە ڕۆژی دوایی دا پـەڕاوێکی بـۆ دەردەکـەین دەیبینێت کراوەتەوە{١٣} (پێی دەگوترێت) سەرەنجامەکەت بخوێنەوە ئەمڕۆ خۆت بەسیت بەسەرخۆت لێپێچەرەوە بیت"

چاودێریی خود لە لایەن تاکی مووسوڵمان لە لادان دووری دەخاتەوە و، لە کارە کارگێڕییەکان دا بە فەرمانەکانی خوا و ئاینەکەی پابەندی دەکـات، ئەمـەش ئـەو ئاواتەیە، کە ئیسلام کۆششی بۆ دەکات. لەبـەر ئـەوەی مـرۆڤ مرۆڤـە و شـایەنی

---

[٦٥٣] سورة النساء: الآية ٥٨.

[٦٥٤] سورة الإسراء: الآيتان ١٣، ١٤.

هەڵەیە و، کۆمەڵگەش لەم کەسانە بێ بەش نییە، کە هەوەستی لادانیان هەیە لە حەق و، دەروون فەرماندەرە بە خراپە، بۆیەش ئیسلام سیستمێکی سیاسی و کۆمەڵایەتیی داناوە، کە ولاتی ئیسلامییە، بۆ گرتنە ئەستۆی بەدواداچوون و چاودێریی پابەند بوون بە ڕێباز و یاساکانی خوا، کە چاودێری بە بەرپرسیارییەکی کۆمەڵەیی داناوە، جا ئایا کۆمەڵەکە کارگێڕیی جێبەجێ کردن بێت یا تەواوی کۆمەڵگە یا دەستگەیەکی چاودێریی تر، بە کارکردن بە فەرمایشتی خوای گەورە: ﴿وَلْتَكُن مِّنكُمْ أُمَّةٌ يَدْعُونَ إِلَى الْخَيْرِ وَيَأْمُرُونَ بِالْمَعْرُوفِ وَيَنْهَوْنَ عَنِ الْمُنكَرِ وَأُوْلَـئِكَ هُمُ الْمُفْلِحُونَ﴾[٦٥٥]. واتا: "با لە ئێوە کۆمەڵێك پێك بێت بانگەشەی باشە بکەن و فەرمان بە چاکە بکەن و بەر لە خراپە بگرن و هەر ئەمانەیشن سەرفرازان"

هەروەك خوای پاك و بڵند ئاگاداریی موسوڵمانان دەکاتەوە لە ئاکامی بینینی بلاو بوونەوەی خراپە لە کۆمەڵگە بێ بەر لێ گرتنی، کە دەفەرموێت: ﴿لُعِنَ الَّذِينَ كَفَرُواْ مِن بَنِي إِسْرَائِيلَ عَلَى لِسَانِ دَاوُودَ وَعِيسَى ابْنِ مَرْيَمَ ذَلِكَ بِمَا عَصَوا وَّكَانُواْ يَعْتَدُونَ (٧٨) كَانُواْ لاَ يَتَنَاهَوْنَ عَن مُّنكَرٍ فَعَلُوهُ لَبِئْسَ مَا كَانُواْ يَفْعَلُونَ﴾[٦٥٦]. واتا: "نەفرەتیان لێ کراوە ئەوانەی لە نەوەی ئیسرائیل بێ بڕوابوون بە زووبانی داود و عیسای کوڕی مەریەم ئەمە بەوەی یاخی بوون و دەستدرێژیکەر بوون {٧٨} ئەمان لە خراپە دوور ناکەونەوە دەیکەن لەگەڵ ئەوەی خراپترینە ئەوەی دەیکەن"

ئیسلام ڕێسای تێروتەسەلی بۆ چاودێریی کارگێڕی دانەناوە، ئەو شێوازانەشی ئەرکە بۆ بەدەست هێنانی ئەم چاودێرییە پەیڕەوی بکرێن، دیاری نەکردوە، بەڵکو کارەکەی بۆ ئەزموون و ڕەوشی کۆمەڵایەتی و کارگێڕیی کۆمەڵگەی موسوڵمان جێهێشتوە و، لە پیادەی کردنی چاودێری لە سەردەمی پەیامبەر ﷺ و جێنشینەکانی ڕاشیدین دا خوا لێیان ڕازی بێت و، هەردوو سەردەمی ئەمەوی و عەباسی، دەستگەی چاودێری لەم جۆرانەی خوارەوە خولاوەتەوە:

---

[٦٥٥] سورة آل عمران: الآية ١٠٤.

[٦٥٦] سورة المائدة: الآيتان ٧٨، ٧٩.

١ - چاودێریی کارگێری، ئەویش ئەوەیە، کە دەستگەی جێبەجێ کردنی وڵات ئەنجامی دەدات.

٢ - چاودێریی کۆمەڵگە، کە چاودێریی گەلی پێ دەڵێن.

٣ - چاودێریی دادوەریی کارگێری.

## یەکەم: چاودێریی کارگێری

ئەو چاودێرییەیە، کە میری لەسەر دەستگە جیاجیاکانی دا پیادەی دەکات و، چاودێریی کارگێری لەسەردەمی پەیامبەر ﷺ دەستی پێ کرد، کە کارەکانی والییەکانی دەردەخست و، گوێی لەو هەواڵانە دەگرت، کە لەبارەیان بۆی دەگوازرایەوە، هەروەك عەلائی کوڕی حەزرەمی، کارکەریی لە بەحرەین لە کارخست، چونکە شاندی عەبدول قەیس سکاڵایان لێ کرد و، ئەبانی کوڕی سەئیدی کردە والی لەبڕی ئەم، لێپێچینەوەی لەسەر داهات و خەرجییەکان پێویست کرد بوو، هەروەك پیاوێکیشی بۆ کۆکردنەوەی خێر و بێر دا دامەزراند، کە گەڕایەوە لێپێچینەوەی لەگەڵ دا کرد، گوتی "ئەمە بۆ ئێوە و ئەمەش بۆ من" پەیامبەریش ﷺ فەرموی: "ما بال الرجل نستعمله علی العمال بما ولانا الله فیقول: هذا لکم و هذا أهدي لي" واتا: (بۆچی هەر یەك بۆ خۆی لە کار دا دایدەمەزرێنین لەوەی خوا پێی سپاردوین دەڵێت: ئەمە بۆ ئێوە و ئەمەش بۆ من، ئایا بۆچی لە ماڵی بابی و دایکی دانانیشێت با ببینێت دیاریی پێ دەدرێت یا نا؟). لەسەر ڕێچکەی ئەم جێنشینەکانیش مکوڕ بوون لە چاودێریی کارگەران.

**چاودێری لە لایەن عومەر خوا لێی ڕازی بێت:** پیادەی کردەنیی چاودێریی کارگێری لە سەردەمی عومەری کوڕی خەتاب خوا لێی ڕازی بێت، چەمکی گشتیی چاودێری و چۆنیەتیی پیادە کردنی بەشێوەیەك ڕوون دەکاتەوە، کە لوتکەی پەی بردنی کارگێڕییەکی ساغی بەرپرسیاریی فەرمانڕەوا و کارگێر لە چاودێری و بەدواداچوون دەنوێنێت، لە تێگەیشتنییەوە ئەوە تەواو بوە، کە چاودێری قۆناغێکی تەواوکاری باشی بەڕێوەبردنە و، بەرپرسارییی فەرمانڕەواش لە

باش دەستنیشان کردنی کارکەران و ئاراستە کردنیان و مەشق پێ کردنیان لە سەر کار بەتەنها تەواو نابێت، بەڵکو ئەمە پەل دەهاوێت بۆ بەدواداچوون و چاودێریی ورد[٦٥٧]، هەروەك بە هاوەڵانی دەگوت: "ئایا ئەگەر بینیتان کەسێکم بەسەرتانەوە دانا پێم وا بوو باشە، پاشان فەرمانم پێ دا بە دادگەری، ئایا ئەوەی لەسەرمە ئەنجامم داوە؟ گوتیان: بەڵێ. گوتی: نەخێر، هەتا دەڕوانمە کارەکەی، ئایا بەوەی فەرمانم پێ داوە کار دەکات یا نا".

زانیاریشی بەو کارگەر و ژێردەستانەی، کە لێی دوور بوون وەك زانیاریی ئەوە وا بوو، کە لە یەك جێگە و سەرین دا لەگەڵی نووست بێت، هەروەك لە هیچ هەرێمێك و هیچ شوێنێك کارکەر یا پێشەوای سووپایەکی نەبوو، مەگەر چاوێکی لەسەری بوو و لێی جودا نەدەبووەوە، ئەمەش لە نووسراوەکانی بۆ کارکەرانی دا دەبینێت، کە تەنانەت کارکەرانێك هەبوو لە نێویان تۆمەتبار دەکران، کە نزیکترین بەدی هاتوو و خۆشەویستترینیان بوو[٦٥٨]

**شێوازەکانی چاودێریی کارگێری:** عومەر کوڕی خەتاب خوا لێی ڕازی بێت شێوازی کاری بۆ والییەکان و، ئەو ڕێسایانەشی، کە لەسەری دەڕۆیشتن بۆ بوون بە بنەمایەك بۆ لێپێچینەوەیان لەدوایی دا دیاری دەکرد، ئەم ڕێسایانەش یا ئەوەتا لە شێوەیەکی تایبەت بە کارکەر دیاری دەکرد، ئەمەش بە "سەردەمی ویلایەت" ناسراوە، یا لە شێوەی کۆمەڵەییە، هەروەك لە کۆنگرەکانی والییان دەیکرد لە وەرزی حەج.

سەبارەت بە مەرجە تایبەتەکان، ئەوا عومەر لە سەردەمی ئەو ویلایەتەی، کە گەواهی دانی دەستەیەك لە کۆچکەران و پشتیوانانی لەخۆ دەگرت و، سەردەمی ویلایەت لە ڕێنمایی گەلێکی دیاری کراو پێك دەهات، کە: "کەس ستەم لە جەستە و لەماڵی ناکرێت و، پایەکەشی ناقۆزێتەوە بۆ سوود یا بەرژەوەندیی خۆی یا ئەوەی پەنای بۆ دەبات" هەروەها عومەر دەسەڵاتەکانی بۆ کارکەر دیاری

---

[٦٥٧] أحمد إبراهيم أبو سن: الإدارة في الإسلام، ص١٢٢.

[٦٥٨] أحمد إبراهيم أبو سن: الإدارة في الإسلام، ص١٢٣.

دەکرد پێشی دەگوت: "من نە بۆ خوێن ڕشتنی مووسوڵمانان و نە بۆ دەستدرێژیی سەر نامووسیان دامنەناون، بەڵکو بەکارتان دەهێنم بۆ ئەوەی لە نێویان دا نوێژ بکەیت دەرامەتیان لە نێو دا دابەش بکەیت و بە دادگەری فەرمانڕەواییان لەنێو دا بکەیت"

بۆ والییەکان چار شتی دەکردە مەرج: والی سواری کورتاندار لێ نەخوورێت و، جلی نەرم نەپۆشێت و، خواردنی گران بەها نەخوات، دەرگاش بە ڕووی پێداویستیی خەڵکی دا نەخات.

سەبارەت بە مەرجە گشتییەکانیش بۆ کاری والی، ڕوونترینیان وتاری کۆنگرەکانی حەج بوو، کە دیگوت: "ستەم مەکەن و من بۆ فەرمانڕەوایی و زۆرداریم نەناردوون، بەڵکو ناردوومن وەك پێشەوایانی ڕێنموون، کە پێتانەوە (ژێردەستەکانتان) ڕێنمایی بکرێن، کەواتە پارێزی لە موسوڵمانان بکەن لێیان مەدەن، کە پێیەوە سووکیان بکەن، دەرگە بە ڕووی پێداویستان دامەخەن، کە بەهێزیان بێ هێزیان بخوات و، زۆریان لێ مەکە بگاتە ڕادەی ستەم، لەگەڵیان دا شەڕ لەگەڵ دوژمن بکەن، ئەگەر زانیتان شەکەت بوونە واز بهێنن، چونکە ئەمە لە تێکۆشان دژی دوژمن باشترە"

" خەڵکینە من دەتانکەم بە گەواهیدەر بەسەر فەرمانڕەوای هەرێمەکان، سوێند بە خوا نایان نێرم، مەگەر بۆ شارەزا کردنی خەڵکی بە ئایینەکەیان و دەرامەتیان بەسەر دا دابەش بکەن و فەرمانڕەوایی لە نێوانیان دا بکەن، ئەوەشی گرفتی هەبوو لەسەری با بۆمی بەرز بکاتەوە".

لە بۆنەیەکی تریش عومەر وتاری دا و گوتی: " ئەی خەڵکینە، سوێند بەخوا کارگەرانم نانێرم بۆ لێدانی کەسایەتیتان و بردنی پارە و پوولتان، بەڵکو دەیاننێرم بۆتان فێری ئایینەکە و سونەتی پەیامبەرەکەتان بکەن و، دەسکەوتیان بەسەر دا دابەش بکەن و فەرمانڕەوایی لە نێوانیان دا بکەن، جا ئەوەی جگە لەمانەی کرد، بۆمی بەرز بکەنەوە، کە سوێند بەوەی گیانی منی بەدەستە تۆڵەی لێ دەستێنمەوە، چونکە پەیامبەری خوام بینی تۆڵەی لە خۆی وەرگرت جا لە

موسوڵمانان نەدەن، کە بێ ڕێزیان بکەن و، ڕێگرییان لێ مەکەن سووکیان مەکەن لەبەر چاوان ون بن". پیاوێکیش هەڵستایەوە و گوتی: ئەی پێشەوای بڕواداران، فلان کارکەری تۆ سەد قامچیی لێداوم، گوتی:"کێ لێی داویت؟ هەڵستە تۆڵەی لێ وەرگرەوە"، جا عەمری کوڕی عاس هەڵستایەوە و گوتی: "ئەی پێشەوای بڕواداران ئەگەر ئەمە بکەیت لەسەرت زیاد دەبێت و، دەبێتە سوونەتێك لە دوات دا دەگێردرێتە بەر" گوتی: " چۆن تۆڵە نەکەمەوە، کە پەیامبەری خوا ﷺ بینی تۆڵەی لە خۆی وەرگرت؟" عەمرۆ گوتی: "لێ بگەڕێ با ڕازیی بکەین" گوتی:" با کەسانی تر ڕازیی بکەن..."ئەوە بوو دوو سەد دیناری پێ دا، هەر قامچییەك بە دوو دینار"[٦٥٩]

دەتوانین چار شێوازی چاودێریش، کە سەروەرمان عومەر گرتویەتییەبەر پوخت بکەین و لەسەری کۆیینەوە ئەمانیش:

١) سیاسەتی دەرگەی کراوە سەبارەت بە والییەکان.
٢) کۆنگرەی گشتیی والیان لە وەرزی حەج.
٣) پشکنینی گشتی و ئاشکرایی لێکۆڵینەوە.
٤) ئەنجام دانی چاودێریی یەدەگی دارایی موسوڵمانان.

١) **سیاسەتی دەرگەی کراوە سەبارەت بە والییەکان:** عومەر مکوڕ بوو لەسەر ئەوەی، کە کارکەرانی دەرگە بەسەر خەڵکی خودان پێداویست بکەنەوە و، ئەگەریش لە بارەی یەکێکیانەوە پێی بگەیشت بوایە، کە ئەمە دەکات، فەرمانی بە سوتاندنی دەرگای خانوەکەی دەکرد.

کاتێك عومەر زانی، کە والیی حەمسی کوڕی عەبدوڵڵای کوڕی قرت خۆی لە خەڵکی دابڕیوە، نوێنەرێکی نارد و، فەرمانی پێ دا دار کۆبکاتەوە، کاتێك نوێنەرەکە گەیشتە حەمس، داری کۆ کردەوە و دەرگا بەرزەکەی سوتاند، جا خەڵکی چوونە لای والیەکە پێی بڵێن، ئەویش پێی گوتن: لێی بگەڕێن ئەو

---

[٦٥٩] سليمان طماوي: عمر بن الخطاب، ص٢٧٦.

نێردراوی پێشەوای بڕوادارانە. کاتێکیش لای عومەر ئامادە بوو، عومەر گوتی: سێ ڕۆژ لەلام بەندی بکەن، کە دوای سێ ڕۆژەکەش لای ئامادە بوو پێی گوت: کوڕی قرتی حەقەنی بۆ هوڕە(کە وشتر و مەڕی خێری لێ بوو) و، گوتی: ئەم وشترانە ئاو بدە. کاتێك هاتە هوڕە، دانەوێڵەی پێ داو و، گوتی: جلت داکەنە و خەریکی ئەمە بە، هەتا تەواو بوو، جا پێشەوای بڕواداران پێی گوت: ئەی کوڕی قرت: لە کەیەوە وایت؟ گوتی: داما (واتا ماوەیەکی زۆرە) پێشەوای بڕواداران. پێی گوت: "کەواتە بۆیە دەرگای بەرزت بەسەر خەڵکی و بێوەژن و هەتیوان دا دروست کردوە؟ بڕۆ بۆ سەر کاری خۆت دووبارەی نەکەیتەوە"[٦٦٠]

هەڵبەت سەروەرمان عومەر پەی بەوەش بردوە، کە دووریی والی لە ژێردەستەکەی وای لێ دەکات خۆی بە خەڵکی پیشان نەدات و، خۆشی بۆ خۆی ببات و کارە بنەڕەتییەکەی لە بیر بکات، کە زاڵ بوونە بەسەر پێداویستیی خەڵکی، بۆیەش توند بوو لەسەر سزا دانی والییەکانی لەم جۆرە و، دکتۆر تەماوی لە پەرتووکەکەی دا دەڵێت: عومەری کوڕی خەتاب و ڕەسەنێتیی سیاسەت و کارگێڕیی نوێ، لە سیاسەتی دەرگەی کراوە لەسەردەمی عومەر لەمانەی خوارەوە دایە:

"بلیمەتیی عومەر لە بواری کارگێڕی لەم پێگەیەوە دەردەکەوێت، کاتێك ئەم دەردە دەهێنینەوە، کە زۆرینەی کارگێڕییەکانی جیهانی شارستانی سکاڵای لێ دەکەن تا ئێستاش و، مەبەستیشمان لێی "بیرۆکراتی"یە. بیرۆکراتییەتیش لە مانای پیشەییەوە "دەسەڵاتی نووسینگە"یە. کە ڕێکخستنی وڵاتی نوێ پێویستی کرد بە دابەش کردنی فرمانە بنەڕەتییەکانی، لە فێر کردن و کشتوکاڵ و پیشەسازی و ئاسایش و بەرگری، بەسەر وەزارەت و دەستە و دەستگە گەلێکی گشتی بە کار کردن بە بنەمای پسپۆڕی و، بۆ ئەوەی هەموو ئەم دەستە و ڕێکخراوانە بە توانستر بن لە خزمەت کردنی هاوڵاتیان، بەڵام دوای تێپەڕبوونی کات ئەم ڕێکخراوانە لە ئامرازەوە بۆ ئاوات گۆڕان و، لەبڕی ئەوەشی ئامراز

---

[٦٦٠] أحمد إبراهيم أبو سن: الإدارة في الإسلام، ص١٢٥.

گەلێك بن بۆ خزمەت، بوونە دەستگە گەلێکی فەرمانڕەوایی، فەرمانڕەواکانیش لە خزمەتگەریی گەلەوە گۆڕان بۆ ڕێزی خواوەند و خەڵکی دەیانپەرستن لە ترسان یا لەبەر چاو تێبڕین. ڕەنگە پرسیار بکرێت: ئەگەر سیاسەتی دەرگەی کراوە، کە عومەر پەیڕەویی کردوە، بۆ ئەو کات دەگونجا، کە عومەر تێی دا ژیاوە، ئایا دەتوانرێت ئێستا پیادە بکرێت؟ گومان لەوە دا نییە، کە بنەمای دەرگەی کراوە بۆ پەرژەوەندیی فەرمانڕەوایی لەهەر کات و شوێنێك پێویستە و، زۆرینەی دەردەکانی فەرمانڕەوایی دەگەڕێنەوە بۆ دابڕانی فەرمانڕەوایان و نەگەیشتنی خەڵکی پێیان (بە هۆی بوونی پەردەیەکی خراپی جیاکەرەوە لەنێویان و لە نێو خەڵکی دا)، لێرە دا دروشمە هاوچەرخەکان بۆ پێویستیی گەڕانەوە بۆ گەل جارێکی تر بەرز کرایەوە و، بۆ دروست کردنی ئەنجوومەنی گەلیی جیاجیا، کە لە ئاستە جیاجیاکان دا لە شێوازی فەرمانڕەوایی و کارگێڕیی فەرمانڕەوایان بپێچێتەوە، بەڵکو ڕێباز گەلێکی توندڕۆی یەك لایەنە دروست بوون، کە داوای لەناوبردنی وڵات دەکات وەك دەسەڵاتێکی سیاسی و گواستنەوەی کاروبارەکە هەموی بۆ گەل. جا ئەگەر فەرمانڕەوایان پێداویستیان بە هەندێك کات هەبێت بۆ توێژینەوە و تێخوێندنەوە و وەرگرتنی بڕیار، ئەوا دەتوانرێت لە نێوان ئەمە و لە نێوان سیاسەتی دەرگەی کراوە دا سازانێك هەبێت، لە ڕێگەی دیاری کردنی کاتە زانراوەکان تێی دا فەرمانڕەوایان بۆ تێخوێندنەوە و سەرنج دان، لەسەر ئەوەی لایەنێکی زۆری لە کاتەکەی بۆ پەیوەندی کردن بەخەڵکی تەرخان بکات و، تێکەڵیان ببێت و، لە خودی ڕەوشەکانیان دا لەگەڵیان دا بژیت، ئەمەش تەنها ڕێگە چارەیە، کە نەمانی جیا بوونەوە لە نێوان گەل و فەرمانڕەوایان دا مسۆگەر دەکات، کە پێداویستیی فەرمانڕەوایی بۆ دەستگەی ڕاستەقینەی خزمەتگوزاریی گشتی دەگۆڕێت[٦٦١]

**٢) کۆنگرەی گشتیی والییەکان لە وەرزی حەج دا:** ئەمەش شێوازێکی ترە لە شێوازەکانی چاودێریی کارگێڕی، کە عومەری کوڕی خەتاب لەهەموو ساڵێك دا مکوڕ بوو لەسەری، هەڵبەت عومەر سوودی لەم بۆنەیە

---

[٦٦١] د. سليمان الطماوي: عمر بن الخطاب، ص١٠٥، ١٠٦.

بینیوە، بۆ ئەوەی خۆیشی هەڵوەستە لەسەر هەواڵی ئەو ژێردەستانەی بکات، کە لە مەدینە پێی نەدەگەیشتن، هەروەك داوای لە والیی هەرێمەکان دەکرد لە مەکە دا بە یەك بگەن و، لەویَ دا ڕووبەڕوو چاوی بە فەرمانڕەوا و فەرمانڕەوایی کراوان دەکەوت و، لە ساتەکانی سەفا دا گوێی لێیان دەگرت و، سەرجەمیانی لە نیگاری دونیا و ڕابواردنی دوور دەکردەوە، بۆیەش ئەم کۆنگرانە ڕاسترین و سەرکەوتووترینی کۆنگرە کارگێڕییەکانن.

وێڕای ڕوانینە سکاڵای ستەم لێ کراوان لە لایەن والی و کارکەران، کۆنگرە هەلێك بوو بۆ جێنشین و فراوان کردنی فەلسەفەی فەرمانڕەوایی و کارگێڕی لەسەر ئەندامانی و ڕاوێژکردن تێی دا و، هەلێك بوو بۆ دیداری یەکتریی والییەکان و، تاوتوێی گرفتە کارگێڕییەکان، کە تووشی دەهاتن و سوود بینین لە شارەزایی یەکتر لە چۆنیەتی چارەسەر کردن و زاڵ بوون بەسەریان دا.

هەڵبەت زانایانی بەڕێوەبردنی هاوچەرخیش هەستیان بە گرنگیی نموونەی وەك ئەم کۆنگرە ئاڵ و گۆڕییانە کردوە، کە هزری کارگێڕیی ئیسلامی پێشیان کەوتوە و، هەروەك جەختیان لەسەر پێویستی و کار کردن پێی وەك شێوازێکی مەشقیی سەرکەوتوو بۆ کارگێڕان کردۆتەوە، کە وایان لێ بکات بتوانن لەسەر بنەمای بیرکردنەوەی کۆمەڵەیی و سوود بینین لە شارەزایی یەکتر، چارەسەریی گرفتەکان بکەن.

٣) **پشکنینی گشتی و بە ئاشکرا لێکۆڵینەوە:** هەڵبەت سەروەرمان عومەر پەی برد بوو بەوەی، کە بەئاگا بێت لە کاروباری ژێردەستەکانی، لەکاتێك دا ئەو لە مەدینە نیشتەجێیە، نەخاسمە کاتێك وڵاتی مووسوڵمانان فراوان بوو، کە میسر و شام و فارسی گرتەوە، بۆیەش شێوازی پشکنینی لەسەر هەرێمەکانی وڵات دا کرد بوو بە شێوازێکی چاودێریی کارگێڕی، ئەمانەش لە سەردانە پشکنینییە دووبارە بوەوەکانی دا دەرکەوت، کە پێی هەلساوە بۆ شام، وەك ئەوەی موحەمەد کوڕی موسەلەمەی بە چاودێرێکی کارگێڕی یا پشکنەرێکی گشتی دامەزراند، کە دەینارد بۆ هەرێمە ڕزگار کراوەکان، بۆ لێکۆڵینەوە لە گرفتەکانی

خەڵکی و سکاڵایان لە والییەکان و ئاگادار کردنەوەی بە ئەنجامی لێکۆڵینەوەکان، بۆ وەرگرتنی بڕیارێك، کە پێی وابێ شیاوە.

هەروەك عومەری کوڕی خەتاب خوا لێی رازی بێت چار جار چوو بۆ شام بۆ ئاشکرا کردنی ڕەوشی کارکەرەکەی و گرنگیی بە بەشە خۆراك دەدا، کە ناونرا بوو بە زستانە و هاوینە، لەهەر دەورەیەك و، خەڵکیی لەسەر کەنارەکان بەکاردەهێنا، دەگێڕنەوە جارێك کارکەرانی بە کەشخەیی پێشوازییان لێ کرد، جا دابەزی و بەردی هەڵگرت و بەرد بارانی کردن و گوتی: "چەند خێرا لە ڕای خۆتان لاتان دا، ئاوا بەم جل و بەرگە پێشوازی دەکەن، لەوەتەی دوو ساڵە خۆتان تێر کردوە، سوێند بەخوا، ئەگەر واتان کرد بێت، بەکەسانێکی تر دەتان گۆڕم".

معاویەی کارکەریشی لەبەر کەژاوە گەورەکەی پۆزشتی بۆ هێنایە و پێی گوت: "من لە ولاتێم سیخوڕەکانی بەریان لێ ناگیرێت، بۆیە دەبێت بە شکۆی دەسەلات بتۆقێندرێن، جا ئەگەر فەرمانم پێ دەکەیت بەمە، ئەوا لەسەری بەردەوام دەبم، ئەگەریش بەرم لێ دەگریت وازی لێ دەهێنم"، جا نە فەرمانی پێ دا و ڕێگریشی لێ کرد.

هەروەها عومەر ڕۆژێك لە جابیەی حۆران لە شام دابەزی و وتاری بۆ خەڵکی دا و گوتی: ئەوەی خوا پێمی سپاردوە بە چاکی نابینم، مەگەر بە سێ شت: بە جێهێنانی سپاردە و، هەبوونی هێز و، فەرمان کردن بەوەی خوا دایبەزاندوە. ئەم داراییە بە چاك نازانم، مەگەر بە سێ شت، بە حەق وەربگیرێت و ببەخشرێت و لە پوچەل ببڕدرێت".

دەشێت عومەر هەستی بە دەستکەوتەکانی ئەم سەردانە بەسەرکردنەوەییانە کرد بێت لە سوود و باشیی بۆ مووسوڵمانان، ڕەنگیشە لە نیازی خۆی دا وای دانابێت، کە سەردانی هەرێمەکانی تری ئیسلامی بکات. بەڵام تەمەن ڕێگەی نەدا، لەهەمان ساڵ دا شەهید کرا.

بەڵام شێوازی تری پشکنین، کە عومەر گرتبوە بەر، لە ڕێگەی موحەمەدی کوڕی موسەلەمە بوو، کە ناردی بۆ لێکۆڵینەوە لە سکاڵای هاوڵاتییان و بە

ئەنجامەوە بۆی بگەڕێتەوە، یا ڕێدەر و ئاراستە گەلێکی بۆ دیاری بکات، کە ئیبن موسەلەمە هەڵبستێت بە جێبەجێ کردنیان، ئەم شێوازەش هاوشێوەی شێوازی چاودێریی کارگێرییە، کە وڵاتانی ئەسکەندەنافی لەکاتی ئێستا دا گرتویانەتە بەر، بەوەی ئەنجوومەنێکی یاسا دانان کارگێرێکی بەرپرسی لای خۆی دادەمەزرێنێت بە چاودێر لەسەر دەستگەی جێبەجێ کردن و، سکاڵای هاوڵاتیانی پێ بگات لەوەی تووشیان دەبێت، لە قۆستنەوەی کارگێری و، سستی جێبەجێ کردنی کاروبارەکانیان لە دەستگە و دامەزراوە خزمەتگوزارییەکانی وڵات، پاشان کار کردن بەوەی بەرژەوەندیی گشتی هاوڵاتییان بەدەست بهێنێت و کاروبارەکانیان بە خێرایی و پارێزکارانەی داواکاراو بەدەست بهێنێت[٦٦٢]

ئەو شێوازەی پشکنین، کە عومەر گرتبوە بەر لە چاودێریی کارگێری، ڕەگی سیستمی تێڕوانینی ئەو سکاڵایانە بوو، کە لە سەردەمی ئەمەوییەکان دا دامەزرا.

ئەوەشی موحەممەدی کوڕی موسەلەمە پێی هەڵسا لە لێکۆڵینەوەی ئاشکرای لەگەڵ سەئدی کوڕی ئەبی وەقاس، هەروەك خەڵکی ئێراق سکاڵایان لێ کرد بوو، لەگەڵ بوونی بڕوای عومەریش بە پاکیی سەعد، کە لە دە موژدە پێدراوەکەی بەهەشت بوو و ڕزگارکەری ئێراقیش بوو، بەڵام ئەو پێی وابوو، کە والی هەرچەندە شوێنەکەی مەزن بێت، تاکێك لەو تاکانەیە، کە بڕیاری دادگەی لەسەر دا جێبەجێ دەکرێت، هەروەك هەموو خەڵکی تریش لەسەریان جێبەجێ دەکرێت و، عومەر باوەڕیشی وا بوو، کە: "ناشێت تاك گەلێك بە هەژار کردنی گەلێ دەوڵەمەند بکرێن و، کۆمەڵەیەك بە بەدبەخت کردنی کۆمەڵەیەکی تر بەختەوەر بکرێت و، ڕەزامەندیی گشتی بۆ بەرژەوەندیی پێشەوایان بکرێت"، بۆیە عومەر موحەممەدی کوڕی موسەلەمەی نارد بۆ لێکۆڵینەوە لە سکاڵای خەڵکی ئێراق، موحەممەدی کوڕی موسەلەمەش پێبەپێ لە مزگەفت بۆ مزگەفت بەدواداچوونی سەعدی دەکرد و، بە ئاشکرا سەربردەیی لە خەڵکی دەپرسی، خەڵکیش وەڵامیان دەدایەوە، جگە

[٦٦٢] أحمد إبراهيم أبو سن: الإدارة في الإسلام، ص١٢٨.

لە چاکە نازانین، تا گەیشتە مزگەفتی بەنی عەبەس، ئیبن موسەلەمە گوتی"کەسێکم بۆ خوا دەوێت حەقێك بزانێت بیلێت" ئوسامەی کوڕی قەتادە گوتی: "خوایە گەواهی دەدەین، کە بە یەکسانی دابەش ناکات و، دادگەری لەگەڵ ژێردەستە دا ناکات و، لەگەڵ لەشکرەکانیش دا ناچێتە شەڕ" جا هەموویانی برد بۆ لای عومەر و هەواڵەکەی پێ دا.

هەروەك سەعدی لە کار خست لەبەر سکاڵای خەڵکی کووفە و هیچ ئەولاو ئەولای لێ وەرنەگرت، چونکە ئاواتی عومەر گەیاندنی کاری کەڵکدارە بە خەڵکی لە دەستی هەریەك لە کارکەرەکانی و، دەرگەی سکاڵا بۆ موسوڵمانان نەکەنەوە، باشترین سیاسەتیش لای ئەو گۆڕینی والیی پێ ئاسانتر بوو لە گۆڕینی ژێردەستە و، خوا لێی ڕازی بێت دەیگوت: "ساکارترین شت نەتەوەیەکی پێ باش بکرێت، پێشەوایەك جێگەی پێشەوایەکیان بگرێتەوە"[٦٦٣] و، خۆی ناچار کرد بوو بە پاکانە کردنی کارکەر لە گۆڕەپان تا پاکانەیی دەردەکەوت.

خەڵکی حەمسیش سکاڵایان لە کارکەرەکەیان سەعیدی کوڕی عامر کرد و داوایان لە عومەر کرد بیخات، چونکە هەتا ڕۆژ دەبێتە ناچێتە لای خەڵکی و، لە شەویش دا وەڵامی کەس ناداتەوە و، لە مانگێك دا ڕۆژێکی دەرناچێت، عومەریش وەك ڕەوشتی خۆی هەڵستا بە ئەنجام دانی لێکۆڵینەوە لەگەڵ کارکەرەکەی، تا دڵنیا بوو، کە کارکەرەکەی هەموو ڕۆژ هەویر دەشێلێت و دادەنیشێت تا هەوێن دەبێت، پاشان دەچێتە لای خەڵکی، بە شەویش هەمووی بۆ پەرستش دادەنێت، لە مانگێکیش دا یەك ڕۆژ دیاری دەکات بۆ جل شوشتن، ئەویش هەزار دیناری بۆ نارد بۆ خۆی، بەڵام هەڵستا بە دابەش کردنی بەسەر مووسوڵمانان.

٤) ڕێوشوێنی یەدەگی چاودێریی دارایی مووسوڵمانان: عومەر شێوازێکی نایابی لە چاودێری لەسەر والییەکان دا گرتبوەبەر، ئەویش شێوازی پاکانەی ئەستۆیە یا شێوازی ئەمەت لە کوێ بوو؟ پیشەشی بوو، کە دارایی کارکەرانی

---

[٦٦٣] أحمد إبراهيم أبو سن، الإدارة في الإسلام، ص١٢٩.

بنووسێت ئەگەر کردبوایە بە والی، بۆ ئەوەی ببێتە پێوەرێك بۆ لێپێچینەوەی ئەوەی ئەگەر بە شێوەیەکی نا سروشتی قەبە بوایە، ڕۆژێکیش بە لای تەلارێکی بەردین و جێچدار دا ڕەت بوو و گوتی: ئەمە هی کێیە؟ زانی هی کارکەرێکیتی لە بەحرەین، جا گوتی: "درهەمەکان نایانەوێت ملیان دەربچێت" و ماڵەکەی دابەش کرد و دەیگوت: "لەسەر هەر ناپاکێك دوو رازگرم هەیە: ئاو و قوڕ"

هەروەها دەستی بەسەر دارایی کارکەری لە میسڕ عەمری کوڕی عاس دا گرت، چونکە ناوی دەرکرد بە ژیانێکی خۆش و ئاژەڵانێك، کە بەر لە گرتنە ئەستۆی ویلایەتی میسڕ نەی بوو، جا عەمرۆ گوتی خاکی میسڕ بێستان و بازاڕگەیەکە، ئەویش بەشێکی بۆ پێداویستیی ژیانی خۆی دابڕیوە، بەڵام سەرباری ئەمەش داراییەکەی دابەش کرد، هەروەك دەستی بەسەر دارایی کارکەری لە بەهرەین ئەبو هوڕەیرەش دا گرت، چونکە دە هەزار یا دەڵێن بیست هەزاری کۆ کردوەتەوە و، ئەسپی زاوزێیان کردوە و، لە کارەکانی دا سەرکەوتوو بوە، جا عومەر پێی گوت، بڕوانە سەرمایە و بەشە خۆراکت و، ئەویتر لە ماڵی دارایی دا دابنێ[٦٦٤]

هەروەها لەوانەشی ماڵی دابەش کردن نوعمانی کوڕی عودەی کارکەری لە میشان و، نافعی کوڕی عەمرۆی خوزاعیی کارکەری لە مەکە و یەعلی کوڕی مینبەه کارکەری لە یەمەن و، سەعدی کوڕی ئەبی وەقاس کارکەری لە کووفە و خالیدی کوڕی وەلید کارکەری لە شام.

هەروك فەلسەفەی عومەر لە کاری والییەکان ئەوە بوو، کە والی لە خزمەتی خەڵکەکەی دا گلێ بداتەوە، بۆ کاری بازرگانی تەرخانگیر نەبێت، چونکە بازرگانی و وەبەرهێنانی دارایی ئیشی کارکەرانی وڵات نییە، بەڵکو تەنها ئەوەندەیان بەسە، کە لە ڕۆزیی ڕۆژانە دا پێویستییانە، لەم چاودێرییەش پێی وا بوو ڕاهێنانێکە لەسەر گوێڕایەڵی و واز هێنان لە خۆهەڵکێشان بەسەر ژێردەستە دا[٦٦٥]

---

[٦٦٤] أحمد إبراهيم أبو سن: الإدارة في الإسلام، ص١٣٠.

[٦٦٥] أحمد إبراهيم أبو سن: الإدارة في الإسلام، ص١٣١.

## دوەم چاودێریی کۆمەڵگە

هەڵبەت ئیسلام ڕێزی لە مرۆڤ ناوە و، کردویەتی بە تاکێکی بەشدار لە فەرمانڕەوایی وەك چاودێرێك لەسەری، کە خوای پاك و بڵند دەفەرموێت: ﴿كُنتُمْ خَيْرَ أُمَّةٍ أُخْرِجَتْ لِلنَّاسِ تَأْمُرُونَ بِالْمَعْرُوفِ وَتَنْهَوْنَ عَنِ الْمُنكَرِ وَتُؤْمِنُونَ بِاللَّهِ﴾[٦٦٦] واتا: "ئێوە باشترین کۆمەڵەن بۆ خەڵکی کەتوونەتەخۆ فەرمان بە چاکە دەکەن و بەر لە خراپە دەگرن و بڕوا بە خوا دەهێنن"

هەروەها دەفەرموێت: ﴿وَلْتَكُن مِّنكُمْ أُمَّةٌ يَدْعُونَ إِلَى الْخَيْرِ وَيَأْمُرُونَ بِالْمَعْرُوفِ وَيَنْهَوْنَ عَنِ الْمُنكَرِ وَأُوْلَـئِكَ هُمُ الْمُفْلِحُونَ﴾[٦٦٧] واتە:"با لە ئێوە کۆمەڵێك پێك بێت بانگەشەی باشە بکەن و فەرمان بە چاکە بکەن و بەر لە خراپە بگرن و هەر ئەمانەیشن سەرفرازان"

پەیامبەری خواش ﷺ دەفەرموێت خوا بە سێ شت لێتان ڕازی دەبێت: (أن تعبده ولا تشركوا به شيئا و، أن تعتصموا بحبل الله جميعا ولا تفرقوا و، أن تناصحوا من ولاه الله أمركم). واتا: (بیپەرستن و شتێك نەکەن بە هاوبەشی و، بە گشتی باپەندی پەتی خوا بن و لێی جیا نەبنەوە و، ئامۆژگاریی ئەوانە بکەن، کە خوا کاروبارتانی پێ داون).

ئەم ئایاتە ڕاشکاوانە و فەرمودە پیرۆزە بەرپرسیاریی تاکی مووسوڵمان لە کۆمەڵگەی ئیسلامی، کە تایبەتە بە فەرمان کردن بە چاکە و بەرگرتن لە خراپە و ئامۆژگاری کردنی فەرمانڕەوا، ڕوون دەکەنەوە، کە ئەمیش لە لایەن خوای گەورە لەسەر هەر مووسوڵمانێکی ڕاستگۆ ئەرکە و سەپێنراوە. ئەم ئامۆژگارییەش لە کاتی ئێستا دا بە چاودێریی گەل(هاوڵاتی) بەسەر فەرمانڕەوا و کاربەدەستانی ناو دەبرێت.

---

[٦٦٦] سورة آل عمران: الآية ١١٠.

[٦٦٧] سورة آل عمران: الآية ١٠٤.

هەڵبەت تاقی کردنەوە یا ئەزموونەکانی مرۆڤ ڕوونیان کردۆتەوە، کە لە دەروونی مرۆڤ لە دەسەڵات دا پیس تر یا خراپ تر نییە، نەخاسمە ئەگەر دەسەڵاتی ڕەها بێت، چەندین فەرمانڕەوا فەرمانڕەواییەکەی بە لە خۆگرتنی کۆڵەگەکانی سەرکردایەتییەکی چاك دەست پێ کردوە، لە سادەیی و دادگەری و ڕاوێژکاری و ئامۆژگاری، لایداوە و یاخی و زۆردار بوە و بە هەر ئامۆژگاری و ڕەخنەیەك پەست بوە، جا دەمەکان کپ کران و دەستگەی ئامۆژگاریی دەستووری و چاودێریی گەل لەکار کەوتن و، لەگەڵ موسوڵمانان دا پەردەیەك دروست بوو و، بە دیواربەندێکی خراپ و بەهێز خۆی داپۆشت لە خەڵك.

فەرمانڕەوایی ساغ خۆی بە مسۆگەری گەلێکی کارا دەور دەدات، کە ئاشکرا کردنی دەسبەجێی هەڵەکان دەگرێتەوە، و ڕاست کردنەوەی لادانەکان لەگەڵ ئاشکرا بوونی و پێش ئەوەی خراپە بلاّو ببێتەوە و، لەم مسۆگەرییانەش دیاری کردنی ماوەی فەرمانڕەواییانە بۆ لای گەل بۆ نوێ کردنەوەی پەیمان و، ملکەچی بوونی فەرمانڕەواییان و چاودێریان و، توانینی هاوڵاتیان لە ڕەخنە و لابردنیان لە کاتی پێویست.

هەڵبەت سیستمی ئیسلامی پەی بە گرنگیی ئەم مانایانە و، پێویستیی چاودێریی گەل بۆ ساغیی بەڕێوەچوونی کارگێڕیی بردوە، ئەوەتا جێنشینی یەکەم سەروەرمان ئەبوبەکری سدیق خوا لێی ڕازی بێت لە یەکەم وتاری بۆ موسوڵمانان دوای گرتنە ئەستۆی جێنشینی گوتی:"ئەی خەڵکینە لەمەو دوا: من بووم بە والیتان و، لە باشترینتان نیم، جا ئەگەر باش بووم هاریکاریم بکەن و، ئەگەر خراپ بووم بەرم لێ بگرن. ڕاستگۆیی سپاردەیە و، درۆش نا پاکییە، بێ هێزتان بەهێزە لام هەتا ئەگەر خوا ویستی مافەکەی بۆ دەگەڕێنمەوە و، بەهێزتان بێ هێزە لام هەتا ئەگەر خوا ویستی مافەکەی لێ وەردەگرمەوە. گوێڕالیم بکەن لەوەی گوێڕایەلیی خوا و پەیامبەرەکەیم کرد، ئەگەر یاخیش بووم لە خوا و پەیامبەرەکەی ئەوا گوێڕایەلیم لەسەرتان نییە"

پاشان عومەر خوا لێی ڕازی بێت لەسەر هەمان مەشق پەیڕەوی کرد، کە سەردەمەکەی خۆی کرد بە پیادەی کردەنیی ئەوەی، کە سوونەتی ئەبو بەکر بوو خوا لێی ڕازی بێت[٦٦٨]

بۆیە سیستمی ئیسلامی بە سیستمی بەهەڵستکاری و پارتە فرەییەکان ئاشنا نییە و جێشیان ناکاتەوە، کە هەڵەکانی فەرمانڕەوا لە وڵاتی هاوچەرخ دا ئاشکرا دەکەن، ئەرکی فەرمانڕەوای مووسوڵمانان لە پیادە کردنی سیستمی ئیسلامی وەك ئەوەی لە پەرتووکی خوا و سوونەتی پەیامبەرە بەڕێزەکەی هاتوە کورت بوەتەوە، بۆیەش جیاڕایی نێوان مووسوڵمانان بۆ پیادە کردن و ئامراز و، بۆ ئاوات و فەلسەفەی گشتیی فەرمانڕەوایی درێژ نابێتەوە. هەڵبەت ئیسلام مسۆگەریشی بۆ دڵنیا بوون لە ساغیی پیادە کردن داناوە، گرنگترینی، ئازادیی تاکی مووسوڵمان و کۆمەڵگەیە بە تەواوی لە ئاراستە کردن و ڕەخنە گرتن و، لەسەر فەرمانڕەوایە گوێ لەم ڕەخنانە بگرێت و بۆ شەقامی بگێڕێتەوە.

سەروەرمان عومەر جوانترین نموونەی لە پەسەند کردنی ڕەخنەی مووسوڵمانانی بۆ ئەنجام داوین، بەڵکو هانمان دەدات بۆ ئاراستە کردنی ئەم ڕەخنەیە بۆ جێنشین لە کەسێتییەکەی و ئەوانەی لە دوایی دێن لە والییانی مووسوڵمانان.

حوزەیفە دەڵێت: "چوومە لای پێشەوای بڕواداران عومەر و، بینیم، کە بێزار و خەفەتبار بوو، پێم گوت: چی بێزاری کردوی ئەی پێشەوای بڕواداران؟ گوتی: دەترسم بکەومە لادان، کەسیش لە ئێوە لەبەر گەورەیم بەرم لێ نەگرێت، حوزەیفەش گوتی: سوێند بەخوا ئەگەر بینیمان لە حەق لات داوە بەرت لێ دەگرین، جا عومەر گەش بوەوە و وتی: ستایش بۆ ئەو خوایەی، کە هاوەڵانێکی بۆ داناوم ڕاستم دەکەنەوە ئەگەر هەڵەیەکم کرد".

پیاوێك بە عومەری گوت: "ئەی عومەر لە خوا بترسە، زیاتریش لە ئەمە، پیاوێکیش لە نێو ئامادەبوان لێی هەلستایەوە و پێی گوت: بێ دەنگ، زیادت کرد

---

[٦٦٨] أحمد إبراهيم أبو سن: الإدارة في الإسلام، ص١٣٢.

بەسەر پێشەوای بڕواداران. عومەریش گوتی: لێی گەڕێ، باشتان تێ دا نییە گەر پێمان نەڵێن و، باشمان تێ دا نییە ئەگەر لێتانی پەسەند نەکەین"

جارێك لە یەمەنەوە کراس هات و عومەر کراس کراس بەسەر خەڵکی دا دابەش کرد، پاشان سەرکەوتە سەر دوانگە وتار بدات، گوتی: میهری خواتان لەسەر گوێم لێ بگرن. سەلمانیش لێی هەڵستایەوە و گوتی: وەلاهی گوێت بۆ ناگرین، وەلاهی گوێت بۆ ناگرین، عومەریش پێی گوت بۆچی باوکی عەبدولاّ؟ ئەویش گوتی: عومەر دونیات بۆ خۆت خۆش کردوە، کراس کراست بەسەر ئێمە دا دابەش کرد، کەچی خۆت بە دوو کراسەوە دەرکەوتویت، جا گوتی عەبدوڵلای کوڕی عومەر لە کوێیە؟ گوتی، ئەوەتا پێشەوای بڕواداران، گوتی یەکێك لەم دوو کراسە هی کێیە، کە لەبەرمە، گوتی هی منە، سەلمانیش گوتی، ئێستا دەڵێین گوێ دەگرین و گوێڕایەڵین.

ڕۆژێکیش وتاری بۆ خەڵکی دا وتی: "مارەیی ئافرەتان لە چل ئوقیە زیاتر مەکەن، ئەوەشی زیادی کرد زیادەکە بۆ ماڵی دارایی دێت"، جا ژنێك لە ڕیزی ئافرەتان هەڵسایەوە وتی: ئەمەت بۆ نییە. جا لێی پرسی: بۆچی؟ وتی: چونکە خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَآتَيْتُمْ إِحْدَاهُنَّ قِنطَارًا فَلاَ تَأْخُذُواْ مِنْهُ شَيْئًا أَتَأْخُذُونَهُ بُهْتَاناً وَإِثْماً مُّبِيناً﴾[٦٦٩] واتا: "لەو ماڵ و سامانەی پێتان داون نابێت لێیان وەگرنەوە ئایا لێیان دەسەننەوە بە بوختان و تاوانێکی گەورە"

جا ڕوی عومەر بزە گرتی و وتی: "ژنە پێکای و عومەر هەڵەی کرد".

نموونەش زۆرن، گوزارشتن لە پەسەند کردنی ڕەخنەی مووسوڵمانان لە لایەن عومەر بە دڵێکی بەخێرهێنان و دەروونێکی ڕەزامەند و، بەم جۆرە ڕەفتارەی، خەڵکیی فێر دەکرد، کە فەرمانڕەوا دەسەڵاتدارێکی زۆردار نییە و، مافێکیشی بۆ نییە، کە تاکێك لە تاکەکانی مووسوڵمانان بۆی نەبێت و، دەیویست فێریان بکات، کە مافی خۆیانە ڕەخنە بگرن و ئاماژە بکەن بەو جۆرەی دەیانەوێت لە بوێری، چونکە ئەوان بەرپرسیارییان پێ داوە — بەرپرسیاری فەرمانڕەوایی — دەیویست

---

[٦٦٩] سورة النساء: الآية ٢٠.

ئامادەیان بکات و بۆ ئەوەی فەرمانڕەوای ڕاستەقینەی خاوەن دەسەڵات و ڕا بن و، تاکێکن لەمان پابەندن بەوەی پێیان باشە.

گومان نییە، کە بوێریی موسوڵمانان نەدەگەیشتە ئەو مەودایە، ئەگەر ڕەفتاری فەرمانڕەوا ڕەفتارێکی خانەدانانە و شکۆمەندانە نەبوایە، کە یارمەتیدەر بوو لە پتەو کردنی چاودێریی گەل، نەك نەمانی[٦٧٠]

## سێیەم: چاودێریی دادوەریی کارگێری

١ - **ویلایەتی سکالاکان:** وێرای ئەو سیستمە ڕەسەنەی، کە بە پێی ڕێبازی ئیسلامی فەرمانڕەوایی لە نێو خەڵکی دا دەکات، لە وڵاتی ئیسلامی، شان بە شانی فرمانی دادوەری، دوو جۆر لە دادوەریی پسپۆڕ دروست بوون، کە: ویلایەتی سکالاکان و، لێپێچینەوەن.

هەڵبەت هۆکاری سەرەکیی دروست بوونی ویلایەتی سکالاکان، وەستاندنی دەستدرێژیی خودان پایە و وەچاخ زادە و فرمانەکان لەسەر کارکەران و خەڵکی بوو، بۆیە ئەم ویلایەتی سکالایانە نزیك و هاوشێوەیە بە سیستمی دادوەریی کارگێری، کە وڵاتانی هاوچەرخ کاری پێ دەکەن و، تایبەتیشە بە ڕوانینە سکالاکانی خەڵکی و بچووکە کارکەران لە لایەن گەورە پیاوانی وڵات و فەرمانڕەوایان.

شێخ موحەمەد ئەبو زەهرە پێناسەی ویلایەتی سکالاکانی کردوە بە وتەی: "ویلایەتی سکالاکان وەك سیستمی دادوەری و، ویلایەتی جەنگ و ویلایەتی لێپێچینەوە، بەشێکە لەوەی مەزنترین کاربەدەست دەیگرێتە ئەستۆ و، تێی دا جێگرێکی دادەنێت، لەو کەسەی، کە لێهاتوو و بە خەمە لە ڕاپەڕاندنی، ئەو کەسەشی کاروباری سکالاکان دەگرێتە ئەستۆ، بە تێڕوانەر ناو دەبرێت نەك دادوەر، بەڵام هەمان دەسەڵاتی دادوەریی و لە زۆرێك لە بارەکان دا هەمان دەسەڵاتی ڕێوشوێنەکانی هەیە، بەڵام کارەکەی دادوەرییەکی پوخت نییە، بەڵکو دادوەری و

---

[٦٧٠] أحمد إبراهيم أبو سن: الإدارة في الإسلام، ص١٣٤.

جێبەجێ کردنییە، کە چارەی کاروبارەکان دەکات بە جێبەجێ کردن یا بە ئاشتەوایی یا بە کارێکی باش بە گەڕاندنەوەی مافی خاوەن ماف، ئەویش هەندێك جار دادوەرییە و هەندێك جاریش جێبەجێ کردنی کارگێڕییە". [٦٧١]

هەڵبەت پەیامبەریش ﷺ بۆ سکاڵاکان بەم چەمکە هەڵستاوە. لە سونەتە دروستەکان دەگێڕنەوە، کە خالیدی کوڕی وەلید ئافرەتێکی لە تیرەی جەزیمە کوشت دوای ئەوەی خەڵکەکەی ملکەچیان ڕاگەیاند، جا پەیامبەر ﷺ نارەزایی ئەم کارەی کرد و ئەلیی کوڕی ئەبی تالبی ڕەزای خوای لێ بێت نارد بۆ ئەم خێڵە بۆ پێدانی خوێنبایی لە لایەن بکوژ بەو گوزارشتەی کوشتنەکە بە هەڵە کەوتۆتەوە، بە وتنی: (ئەی پەروەردگەرم من بەریم لەو کارەی خالید کردویەتی).

جێنشینەکانی ڕاشیدینیش خوا لێیان ڕازی بێت هەمان ڕێگەی پەیامبەریان ﷺ گرتە بەر لە سزادانی ستەمکەران لە وانەی لە ڕیزی والییان دا ڕوی دەدا و، عومەر خوا لێی ڕازی بێت توند و تیژ بوو لەگەڵ والییەکانی و، لە وەرزێکی حەج دا وتارێکی بۆ دان پێی گوتن: بۆ لێدانی ڕێزی خەڵکی نەمناردوون، سوێند بەخوا پێم بگاتەوە، کە کارکەرێکم لە ڕێزی خەڵکیی داوە جگە لە تۆڵەی لێ وەرناگرم.

ئەمەشی لەگەڵ عەمرۆی کوڕی عاس و ئەو کوڕەی کرد، کە لە یەکێك لە میسرییەکانیان دا بوو و، عەمرۆ تۆڵەی لێسەندرایەوە تەنها بەوەی سوکایەتیی بە یەکێك لە میسرییەکان کرد و، وتە بەناوبانگەکەی گوت: "خەڵکی دەکەن بە بەندە، کاتێك دایکیان بە ئازادی بویانن" [٦٧٢]

بەڵام هیچ یەك لە جێنشینەکانی ڕاشیدین بۆ بابەتی سکاڵاکان دانەنیشتوون، چونکە خەڵکی لەو سەردەمەی دڵی ئیسلام دا ئاراستەیان ڕووەو حەق بوو، ئامۆژگارییەکی توندی سکاڵا لێکراو دەکردرا، تەنها عەلی نەبێت خوا لێی ڕازی بێت، چونکە ئەو پێویستی بە تێڕوانینیان هەبو و، لە گوێ گرتن لە سکاڵاکان هیچ ڕۆژێکی تایبەت نەکردبوو بۆ ڕوانینە ڕەوشی سکاڵا لێکراوەکان و وردبوونەوە لە

---

[٦٧١] د. الطماوي: المرجع السابق ص٣٤٢- نقله من بحث لفضيلة الشيخ محمد أبو زهرة، بعنوان ولاية المظالم في الإسلام، القاهرة، ١٩٦٠م

[٦٧٢] أحمد إبراهيم أبو سن: الإدارة في الإسلام، ص١٣٥.

چیرۆکەکەیان، یەکەم کەسیش ئەمەی کرد عەبدول مەلیکی کوڕی مەڕوان بوو، بەلاّم ئەگەر لە شتێك دا گیر بوو بوایە بە شێوەیەك پێویستی بە فەرمان دان بوایە، بۆ ئیبن ئیدریسی ئەزەدیی دادوەری دەنارد، واتا ئیبن ئیدریس ئیشی لەسەر دەکرد و، عەبدول مەلیکیش فەرماندەر بوو، پاشان ستەمی والییەکان زیادی کرد و ستەمیان لە ڕەش و ڕووت دەکرد، تەنها لەوانە نەبێت، کە بە هێز و خاوەن فەرمان بوون، عومەری کوڕی عەبدول عەزیزیش یەکەم کەس بوو خۆی تەرخان کرد بۆ سکالاّکان و گەڕاندنەوەیان و، سکالاّی بەنی ئومەییەی لەسەر کەس و کاری ڕەت کردەوە، پاشان کۆمەڵێك لە جێنشینەکانی بەنی عەباس بۆی دانیشتن، یەکەم کەسیش بۆی دانیشت مەهدی بوو، پاشان هادی، پاشان ڕەشید، پاشان مەئموون، دوایینیشیان موهتەدی بوو بۆی دانیشت[٦٧٣]

ئەنجوومەنەکانی ڕوانەری سکالاّکان پێنج کۆمەڵەی جیاجیای لەخۆدەگرت، بەستنی دانیشتنەکان ڕێك نەدەخرا مەگەر بە ئامادە بوونیان:

١) پارێزەر و هاریکاران، هەروەك دەستنیشان دەکران تا بتوانن زاڵ بن بەسەر ئەوەی پەنا بۆ هێز یا توندی و ڕاکردن بە ڕووی دادەوە دەبات.

٢) دادوەر و دادگەران، پیشەیان ئاماژە کردن بوو بە ستەم لێ کراوان بە بەهێزترین ڕێگا بۆ گەڕاندنەوەی مافەکان بۆ خاوەنەکانیان و، ئاگادار بوونیان بەوەی لە نێو نەیاران دا بەڕێوە دەچێ.

٣) شارەزایانی ئاینی، دادوەری سکالاّکان لەوەی کێشەی بۆ دروست بوایە لە لایەنی ئایینییەوە بۆ ئەوانی دەگەڕاندەوە.

٤) نووسەران، هەڵدەستن بە تۆمار کردنی ئەوەی لە نێوان نەیاران دا ئەنجام دەدرێت و، سەلماندنی ئەوەی بۆیانە و لەسەریانە لە مافەکان.

٥) گەواهیدەران، پیشەیان گەواهیدانە لەسەر ئەوەی دادوەر دەری دەکات لەو بڕیارانەی پێچەوانەی حەق و ڕاستی نین.

---

[٦٧٣] الماوردي: الإحكام السلطانية، ص٧٣- ٨٩.

**پسپۆڕییەکانی ڕوانەری سکاڵاکان:** ماوەردی باسی پسپۆڕیی زۆری تێڕوانەری سکاڵاکانی کردوە، گرنگترینیان لە خوارەوە باس دەکەین[٦٧٤]:

١) ڕوانینە دەستدرێژیی والی و کاکەران لەسەر ژێردەستە، لەسەر ڕوانەری سکاڵاکانیشە، خودی خۆی بە ڕەوشی والییەکان دا بچێتەوە

٢) ڕوانینە کاروباری سەرانە ئەگەر زیادی لە باجەکان دا هەبوایە، دەڕوانێتە ئەوەی زیادیان لە ژێردەستە سەندوە، ئەگەر بۆ ماڵی دارایی بەرزی کرد بوایەوە فەرمانی پێ دەکردن بە گەڕاندنەوەی بۆ خاوەنەکەی و، ئەگەر بۆ خۆیان برد بوایە دەیگێڕایەوە بۆ خاوەنەکەی و سزاشی دەدان.

٣) پشکنینی باری نووسەرانی تۆمار ئەگەر لە سەلماندنی دارایی خەڵکی دا لایان بدابوایە، چونکە ئەوان ئەمینداری موسوڵمانان بوون.

٤) ڕوانینە سکاڵای فرمانبەران ئەگەر ڕۆزییان کەمی بکرد بوایە، یا درەنگ کەوتنی دانەوەی پێیان.

٥) جێبەجێ کردنی ئەوەی، دادوەر و لێپێچەرەوە لە جێبەجێ کردنی بڕیارەکان دا گیر دەبوون.

٦) ڕەچاو کردنی ئەنجام دانی پەرستگەرییەکان، وەك حەج و جەژن و جیهاد[٦٧٥]

لێرە دا لەسەر چەندین گرنگیی ئەم فرمانە هەڵوەستە دەکەین، ئەوەی بۆ خاوەنیەتی لە هێز و دەسەڵاتی گوتن لە سنووری ئەوپسپۆڕییانەی تا ڕادەیەکی زۆر لە پسپۆڕییەکانی دادوەری کارگێری هاوچەرخ دەچێت، ئەوەی، کە گرنگی بە بەدەنگەوە چوونی فرمانبەران لە والی و کارگەر و گەورە پیاوانی وڵات و خانەدانان و دەسەڵاتداران دەدات.[٦٧٦]

---

[٦٧٤] أحمد إبراهيم أبو سن: الإدارة في الإسلام، ص١٣٦.

[٦٧٥] الماوردي: الإحكام السلطانية، ص٧٣- ٨٩.

[٦٧٦] أحمد إبراهيم أبو سن: الإدارة في الإسلام، ص١٣٧.

# بەندی شەشەم

## نموونەی پڕاکتیکی
## سیستمی لێپێچینەوە لە ئیسلام دا

لێپێچینەوە یەکێکە لەو ویلایەتانەی، کە ئیسلام لەسەر فەرمان بە چاکە کردن و بەر لە خراپە گرتن دایناوە، ئەو بنەمایەی خوای پاك و بڵند بە ئەدگارێکی جیاکەرەوەی بڕوادارانی لە دەغەلەکان داناوە، هەروەك دەفەرموێت: ﴿وَالْمُؤْمِنُونَ وَالْمُؤْمِنَاتُ بَعْضُهُمْ أَوْلِيَاء بَعْضٍ يَأْمُرُونَ بِالْمَعْرُوفِ وَيَنْهَوْنَ عَنِ الْمُنكَرِ وَيُقِيمُونَ الصَّلاَةَ وَيُؤْتُونَ الزَّكَاةَ وَيُطِيعُونَ اللّهَ وَرَسُولَهُ أُوْلَـئِكَ سَيَرْحَمُهُمُ اللّهُ إِنَّ اللّهَ عَزِيزٌ حَكِيمٌ﴾[٦٧٧] واتا: "پیاوانی بڕوادار و ئافرەتانی بڕوادار پشتیوانی یەکترن، فەرمان بە چاکە دەکەن و بەر لە خراپە دەگرن و، نوێژ ئەنجام دەدەن و زەکات(لەو ماڵ و سامانەی خوا پێی داون) دەدەن و گوێڕایەلیی خوا و پەیامبەرەکەی دەکەن، جا ئەمانە خوا میهری بۆیان دەبێت بێگومان خوا شکۆمەند و دانایە".

لە لایەکی تر، کاری بە پێچەوانەی ئەمی کردوە بە ئەدگاری دەغەلەکان: ﴿الْمُنَافِقُونَ وَالْمُنَافِقَاتُ بَعْضُهُم مِّن بَعْضٍ يَأْمُرُونَ بِالْمُنكَرِ وَيَنْهَوْنَ عَنِ الْمَعْرُوفِ وَيَقْبِضُونَ أَيْدِيَهُمْ نَسُواْ اللّهَ فَنَسِيَهُمْ إِنَّ الْمُنَافِقِينَ هُمُ الْفَاسِقُونَ﴾[٦٧٨] واتا: "پیاوانی دەخەڵ و ئافرەتانی دەغەڵ (بە پشتیوانیی یەکتر) فەرمان بە خراپە دەکەن و بەر لە چاکە دەگرن و دەستیان دەگرنەوە(زەکات نادەن) خوا لە بیر دەکەن جا خواش لەبیریان دەکات هەڵبەتە دەخەڵەکان لە ئایین دەرچوون".

ئێمەش لەم بەندە دا، هەوڵ دەدەین تێخوێندنەوەی ئەم ویلایەتە و ئەوەی پەیوەندیدارە پێیەوە لە بەرپرسیاریی گەورە و تایبەتمەندییەکان و ئامانجەکانی

---

[٦٧٧] سورة التوبة: الآية ٧١.
[٦٧٨] سورة التوبة: الآية ٦٧.

سیاسەت بکەین، بۆ سەلماندنی ئەوەی، کە ڕێبازی ئیسلامی بە تەواوترین سیستمی کارگێڕی و باشترینی ئەو سیاسەتانەی، کە کاروباری گەلی لەهەر کات و شوێنێك پێ بەڕێوە دەبردرێت هاتوە، کە بەرژەوەندیی دونیایی و ڕۆژی دوایی خەڵك بەدەست دەهێنێت.

# بەشی یەکەم

# چەمکی لێپێچینەوە

## توێژبەندی یەکەم

## پێناسەی لێپێچینەوە

لێپێچینەوە لە زمان(ی عەرەبی) دا بە شکاندنەوەی (حاء)، ناوی چاوگی لێپێچینەوە لێدەپێچێتەوە دڵسۆزانە[٦٧٩] ناوێکە سەرچاوەی دوو مانا:

**مانای یەکەم:** پاداشت[٦٨٠]

**مانای دوەم:** نارەزایی، فلان لێپێچنەوەی لەسەر کرا، نارەزایی لە کارە قێزەونەکەی دا کرا[٦٨١]

ماناکەی لە ڕووی زاراوەییەوەش، بە چەند پێناسەیەك ناسێندراوە، لە نێویان پێناسەی ماوەردی و، پێناسەی ئیبن تەیمیە و، پێناسەی غەزالی و، پێناسەی ئیبن خەلدوون دێنینەوە، پاشان ئەو پێناسەیە دیاری دەکەین، کە پێمان وایە جێی پشت بەستنە.

---

[٦٧٩] ابن منظور: لسان العرب، جزء ١، ص٣٠٥

[٦٨٠] المصدر السابق

[٦٨١] الزبيدي: تاج العروس، جزء ١، ص ٣١٣.

## یەکەم: پێناسەی ماوروودی

ماوروودی لێپێچینەوە پێناسە دەکات بەوەی: "فەرمان بە چاکە کردن کاتێك دەرکەوت وازی لێ هێندراوە و، بەر لە خراپە گرتن کاتێك کردەوەی دەرکەوت"[٦٨٢]

لە میانەی ئەم پێناسەیەوە بۆمان دەردەکەوێت، کە بە ڕەهایی فەرمان بە چاکە و بەرگرتن لە خراپە، دەگرێتەوە، جا ڕاسپێردراو لە لایەن ولاتەوە بێت یا لە لایەن خۆیەخش، ئێمەش لەم سۆنگەیەوە پێناسەی لێپێچینەوە دەکەین بەو گوزارشتەی ویلایەتێکە لە ویلایەتە گشتییەکان، کە بریتیە لە دەسەلاتی ولات و سەروەرییەکەی، کەواتە هەندێك شتی دەرچوو لە پێناسەکەی هاتوەتە ناو پێناسەیەکەی، ئەمەش پێناسەکەی تێك داوە.

## دوەم: پێناسەی ئیبن تەیمییە

ئیبن تەیمییە لە ڕوون کردنەوەی پسپۆڕییەکانی لێپێچەرەوە دا کورتی هێناوە، کە دەڵێت: "لێپێچەرەوە بۆی هەیە لەو شتانە دا فەرمان بە چاکە بکات و بەر لە خراپە بگرێت، کە لە پسپۆڕیی والی و دادوەر و دیوانگەران و هی تر نین"[٦٨٣]

ئێمەش وای دەبینین ئەم پێناسەیە بیرۆکەیەکی ڕوونمان لەبارەی لێپێچینەوە پێ نادات، چونکە گوزارشتەکەی کورتە لەسەر هێنانەوەی پسپۆڕییەکانی لێپێچەرەوە، هەروەك ئەم پیسپۆڕییانەشی بە تەواوی باس نەکردوە.

## سێیەم: پێناسەی غەزالی

غەزالی لێپێچینەوە پێناسە دەکات بەوەی: "گوزارشتە لە ڕێ گرتن لەو شتانەی، کە مافی خوان لە پارێزگاری کردن لە نەکردنی خراپە"[٦٨٤]

---

[٦٨٢] الماوردي: الآحكام السلطانية، ص ٢٤٠.

[٦٨٣] ابن تيمية: الحسبة في الإسلام، ص ١٤.

ئەم پێناسەیەش لێپێچینەوە بە گوزارشتی ویلایەتێك لە ویلایەتەكان دیاری ناكات، بەڵكو بە گوزارشتێكی گشتگر كاری والیی لێپێچینەوە و خۆیەخش دەگرێتەوە، توێژینەوەكەمان یەكەم وەردەگرێت نەك دووەم، وێڕای ئەوەی لە فەرمان بە چاكە دا هاندەرێكە بۆ فەرمانبەر لە كردنی ئەوەی بۆ گونجاوە.

## چارەم: پێناسەی ئیبن خەلدون

ئیبن خەلدوون پێناسەی لێپێچینەوە دەكات بەوەی: "فرمانێكی ئاینییە، لە دەروازەی فەرمان بە چاكە و بەرگرتن لە خراپە"[685]

ئێمەش وای دەبینین، كە ئەم پێناسەیە سەراپایی و لێڵە.

## پێنجەم: پێناسەی موختار

لەمیانەی ئەم پێناسانەوە وای دەبینین، كە لێپێچینەوە ئەمەیە: "چاودێرییەكی كارگێریی ولاتە لە ڕێگەی والیی تایبەت لەسەر كردەوەی تاكەكان و هەڵسوكەوتیان، كە بە ڕشتەیەكی ئیسلامانە پێی هەڵدەستێت، بە فەرمان بە چاكە كردن و بەر گرتن لە خراپە بەگوێرەی بڕیارە ئایینییەكان بە مەبەستی بەدەست هێنانی كۆمەڵگەیەكی ئیسلامی بۆ گێڕانەوەی خەڵكی بۆ ئەوەی، كە بۆیان چاكە و دوورخستنەوەیان لەوەی زیانبارە بۆیان"

لەمیانەی ئەم پێناسەوەش، كە دەست نیشانمان كرد، دەتوانین مەبەست لە لێپێچینەوە و، لێپێچەرەوە و، لێپێچراوە دیاری بكەین.

هەروەك لێپێچینەوە چاودێرییەكی كارگێرییە، بە ڕاسپاردن لە لایەن ولاتی ئیسلامی، لەسەر كردەوەی تاكەكان و هەڵسوكەوتیان بۆ بۆیە كردنیان بە

---

[684] الغزالي: إحياء علوم الدين، جزء ٢، ص ٣٢٣.

[685] ابن خلدون: المقدمة، جزء ١، ص ١٨٨.

ڕشتەیەکی ئیسلامییانەی فەرمان بە چاکە کردن و بەر لە خراپە گرتن، بەگوێرەی بڕیارەکانی ئایینی ئیسلام.

لێپێچەرەوەش والییەکی تایبەتی دامەزراوە لە لایەن ولاتی ئیسلامی، هەڵدەستێت بە چاودێری کردنی کردەوەی تاکەکان و هەڵسوکەوتیان بۆ بۆیە کردنیان بە ڕشتەیەکی ئیسلامییانەی فەرمان بە چاکە کردن و بەر لە خراپە گرتن بەگوێرەی بڕیارەکانی ئایینی ئیسلام.

لێپێچراوەیش ئەو کەسەیە، کە والیی لێپێچینەوە چاودێریی کردەوەکانی دەکات بۆ بۆیە کردنی بە ڕشتەیەکی ئیسلامییانەی فەرمان بە چاکە کردن و بەر لە خراپە گرتن بەگوێرەی بڕیارەکانی ئایینی ئیسلام[٦٨٦]

[٦٨٦] عبد العزيز مرشد: نظام الحسبة في الإسلام، ص ١٦.

# تویژبەندی دووەم

## ڕەسەنێتیی مێژوویی لێپێچینەوە

لێپێچینەوە بەو لێك دانەوەیەی ویلایەتێکە لە ویلایەتە گشتییەکان لە سەردەمی پەیامبەر ﷺ و سەردەمی جێنشینەکانی ڕاشیدینەوە خوا لێیان ڕازی بێت بە شێوەیەکی دیار، مشتومڕ هەڵناگرێت، بوونی هەبوە، بەڵام وەك تەواوی ویلایەتەکان لە کاروبارە سەرەتاییەکانی دا سنووردار بوە، پاش ئەمە لە سەردەمەکانی عەباسی و فاتمییەکان فراوان بوە تا گەیشتۆتە ڕادەیەکی مەزن[٦٨٧]، بەڵام کەمێك لە توێژەران پێیان وایە، کە لێپێچینەوە وەرگیراوە.

ئێمەش دەمانەوێت ئاماژە بە وانە بکەین، کە ڕا گەلێکی لەبارەوە دەدەن، کە هەندێك دیمەنی ئەم ژیارە و ئەو بۆ ژیارێکی تر دەگەڕێننەوە، لێیەوە وەرگیراوە، یا لە بنەماکانی دا هەڵێنجراوە، یا شێوازەکانی گواستراوەتەوە، یا هەر ئامرازێکی تری گواستنەوەی گیان یا بنەما یا پیادە کردن، ئەمەش لە تێڕوانینی ئێمە بۆ ڕێسایەکی هەبوو و باو دەگەڕێتەوە، ئەگەر چاوێك بە ژیارە کۆنەکان دا بخشێنینەوە و، ناتوانرێت بگۆڕێت یا ئاڵوگۆڕ بکرێت، ئەم ڕێسایەش لەوە دا دەچەسپێت، کە کۆمەڵگە مرۆڤایەتییەکان لە هەر کوێیەك بێت، بەزۆری کاروباری هاوشێوەن، لە ڕێکخستنی یا لە بڕیار دانی دا گۆشەگیریی کردوە، چونکە لە پێداویستییە بنەڕەتییەکانی، یا لە پێویستییە ورەبەرزەکانی دا دروست بوە، زۆر ناڕۆین و دوور ناکەوینەوە، پێمان وایە لێپێچینەوە ژیانی شارستانی پێویستی کردوە و، پێویستییەکانی کۆمەڵگەی مرۆڤایەتی کردویەتی بە ئەرك، ئەمەش لە ئەنجامی سروشتی ئاوەدانکاریی مرۆڤایەتی..

---

[٦٨٧] عبد العزيز مرشد: نظام الحسبة في الإسلام، ص ٢٢.

پێمان وانییە سوود لەوە دا هەبێت بڵێین، کە لە گەلێکەوە بۆ گەلێکی تر، یا لە نەوە بۆ نەوە گوازراوەتەوە، چونکە ئەگەر نەگوازرێتەوە، ئەوا گەل بە پێویستی دەزانێت.[٦٨٨]

هەروەها وەرگرتنی ژیارەکان لە یەکتری تا ڕێژەیەك ڕاست نییە، مەگەر بە بەڵگەی دڵنیاکەرەوە. زۆرێك لە توێژەرانیش پەنایان بۆ ئەم بەڵگە بردوە، لەبەر چەندین هاندەر بۆ دەرەنجام هەڵێنجان و قورس کردن و سووك کردن.

لەوانەشی پێیان وایە، کە سیستمی لێپێچینەوە وەرگیراوە، دکتور حەسسان حەللاق[٦٨٩] و، دکتور نەقولا زیادە[٦٩٠] و، هی تریشن.

وەلاّمی ئەوانەش نادەینەوە، کە پێیان وایە لێپێچینەوەی ئیسلامی سوودی لە لێپێچینەوەی ڕۆم و یۆنانییەکان و، هی تر وەرگرتوە، زۆرتر لەمە پەیامبەر ﷺ سەئیدی کوڕی عاسی کردە والیی بازاڕی مەکە، دوای ڕزگارکردنی، لە ساڵی هەشتەمی کۆچی و، بەرلەوەی هیچ پەیوەندیکارییەك لەنێوان مووسوڵمانان و ڕۆمی دراوسێیان دا هەبێت، لەم بیانوەش ورەبەرزی دەکرێت لەسەر ئەوەی لێپێچینەوە لە ئیسلام دا، بە پشت بەستن بە پێداویستیی کۆمەڵگە و پێویستیەکانی دروست بوە، بیّ وەرگرتنی لە یەکی تر.

هەروەك دروستکەری هەردوو لێپێچینەوەکە بە تەواوی لێك جیان، کە ناونراوە بە "ئایدیل" یا "ئەگورانوموس"، کە فەرمانبەرێك بوو لە ڕووی بنەمای هەبوو و لە ڕووی پیادە کردن و لە ڕووی شێوازەکانی کار هیچ پاشخانێکی نەبوو.

لێپێچەری مووسوڵمان لە بنەمایەکی قورئانیی ئایینی دا، کە فەرمان بە چاکە کردن و بەر لە خراپە گرتنە سەری هەڵ داوە، پشت بەستوە بە بنەمای ڕیّ دراو و یاساغ و، پاداشت و سزا لە دونیا و ڕۆژی دوایی دا، جا ئەمە لە کویّ ئەو لە کویّ؟

---

[٦٨٨] ظافر القاسمي: نظام الحكم في الشريعة والتاريخ الإسلامي، الكتاب الثاني، ص ٦٠٩.

[٦٨٩] حسان حلاق: الإدارة المحلية الإسلامية، الدار الجامعية، ص ١٤.

[٦٩٠] نقولا زيادة: الحسبة والمحتسب في الإسلام، ص ٣١.

داهێنانی لێپێچینەوە پێداویستیی بە بلیمەتیی دەگمەن نییە، بەڵام دیاری کردنی بنەما و ڕێسا و سەرچاوە و پیادە کردنییەکانی، پێداویستیان بە بلیمەتیی دەگمەن هەیە، ئەمەش ئەگەری نییە لەو کۆمەڵگەیەی، کە ئسلام دایمەزراند، مەگەر بە پشت بەستن بە بڕیار و بنەماکانی[٦٩١]

زیاتر لەمەش، سپانیەکان دەستیان گرتبوو بە لێپێچینەوە لەو ناوچانەی، کە لە سایەی فەرمانڕەوایی ئیسلام دا بوو بوون، هەمان شتیش سەبارەت بە خاچ پەرستەکان، کە لێپێچینەوەیان بۆ وڵاتەکانیان گواستەوە، بۆچی سیستمی ئایدل یا ئەگورانوموسیان وەرنەگرت، بەڵکو سیستمی ئیسلامیان وەرگرت[٦٩٢]؟

وەڵامەکەشی لە تێڕوانینی ئێمە دا ئاشکرایە، چونکە مانەوەی ئەمیان چاکترینە.

---

[٦٩١] ظافر القاسمي: نظام الحكم في الشريعة والتاريخ الإسلامي، الكتاب الثاني، ص ٦١٥.

[٦٩٢] المصدر السابق، ص ٦١٦، و عبد العزيز مرشد: نظام الحسبة في الإسلام، ص ٢٢ وما يليها.

# توێژبەندی سێیەم

# سیستمی لێپێچینەوە

بڕیارەکانی لێپێچینەوە بۆ ڕێبازی ئیسلامی دەگەڕێتەوە، هەروەك ئەوەی لەگەڵ ڕێبازەکە دا گونجا فەرمانی پێ دەکرێت، ئەوەشی خراپ بوو ئەوا بەری لێ دەگیرێت و وریایی لێ دەکرێت[٦٩٣]

بەڵام ئەو شێوازانەی کە لێپێچەرەوەکان لە سەردەمە جیاجیاکان دا پەیڕەوییان کردوە، ئەستەمی و ئاسانیی بەگوێرەی گۆڕانی ژینگە و ڕەوشەکان جیاواز بوە، هەروەك ڕەنگە ویلایەتی لێپێچینەوە بازنەکەی لە سەردەمێك لە سەردەمێکی تر فراوانتر بێت.

لێپێچینەوە لە سەرەتا دا، کە دەستی پێکرد سنووردار بوو، هەروەك پەیامبەرﷺ [٦٩٤] لێپێچینەوەی دەگرتە ئەستۆ و دەیخستە ئەستۆی کەسانی تریش.

جێنشینەکانی ڕاشیدینیش خوا لێیان ڕازی بێت خۆیان پیادەیان کردوە، لەسەر بازاڕی مەدینە یا مەکەش کەسێك یا دوو کەسیان ڕادەسپارد[٦٩٥]، بەڵام دوای ئەوەی جێنشینی ئیسلامی فراوان بوو، خەڵکی وڵاتانی ڕزگار کراو ئیسلام بوون، پێویستی کرد پەرە بەم ویلایەتە بدرێت و زەمینەسازیی بۆ بکرێت.

لە لێپێچینەوە دا ئەوەی بە زانست و چاکی و خواپەرستی و دادپەروەری لەگەڵ هێز و شان و شکۆیی و، پێگەیەکی بەرز لە کۆمەڵگە دا ناوبانگی دەرکرد بوایە دادەمەزرا[٦٩٦]، هەروەك جێبەجێ کردنی ئەم کردەشی پێ دەسپێردرا و فرماندار کردنی ئەوەشی پێویستی بوایە لە هاریکاران.

---

[٦٩٣] الماوردي: الأحكام السلطانية، ص ٢٥٨.

[٦٩٤] صحيح مسلم بشرح النووي: جزء ٢، ص ١٠٩.

[٦٩٥] عبد العزيز مرشد: نظام الحسبة في الإسلام، ص ٢٩.

[٦٩٦] المقريزي: الخطط والآثار، جزء ١، ص ٤٦٣.

بازنەی لێپێچینەوە لە سەرەتای سەردەمی عەباسییەکان و لە خودی ئەبو جەعفەری مەنسوورِ دا فراوان بوو، تەبەری باسی ڕووداوەکانی ساڵی ١٥٧ی کۆچی دەکات، کە مەنسوورِ لێپێچینەوەی لە شاری بەغدا و بازارەکەی بە پیاوێك سپارد پێیان دەگوت ئەبو زەکەریا یەحیای کوڕی عەبدوڵلا، بەڵام لەبەر لەخشتە بردنی گشتی و سپڵەیی لێی تووڕە بوو و کوشتی[٦٩٧]

کاتێکیش بزوتنەوەی زەندیقەکان لەسەردەمی مەهدی دا سەریان هەڵ دا، عەبدول جەباری بە لێپێچەرەوە ناردە سەریان، مەهدیش کۆمەڵێکی کوشت و لە خاچی دان و، پەرتووکەکانیانی بە چەقوو پارچە کرد[٦٩٨]

لە وڵاتی عوسمانیش دا ویلایەتی لێپێچینەوە لە ویلایەتە تایبەتمەندەکان بوو، بەڵام لە دوا سەردەمی دا تەنها لە لایەنی شارستانی دا مایەوە، هەرواش مایەوە تاوەکو ناوەڕاستەکانی سەدەی سێیەمی کۆچی، پاشان لە هەندێك ویلایەتی عوسمانی بە ئەنجوومەنی بەڕێوەبەرایەتییەکان جێی گیراوە[٦٩٩]

بەڵام لە سەردەمی ئەیوبی و مەمالیکەکان دا ویلایەتی لێپێچینەوە سەربەخۆ بوو لە ویلایەتی تر و، والییەکەش فراوانترین هەژموونی فرمانبەرانی دەولەتی هەبوو و، لە کارەکانی دا گەیشتە ئەوەی چاودێریی بزاوتە تێکدەرانە و کەسە گومان لێکراوەکان بکات[٧٠٠]، والیی لێپێچینەوە لەم سەردەمە دا چالاکی گەلێکی گەورەی لە سەرجەم بوارەکان دا هەبوو، هەروەك بۆ گۆڕینی خراپەکان لە دەسەڵاتدارانەوە فەرمانیان بۆ دەردەچوو ئەوانیش جێبەجێیان دەکرد، ئەمەش بۆ مسۆگەریی هەژموونی وتە و شکۆیان لەسەر سەرجەم خراپەکاران و خەڵکی خراپ. نموونەیەك لەسەر ئەمە دەهێنینەوە لە دەرکردنی فەرمان بە قەدەغە کردنی ڕۆیشتنی خەڵکی بە تێکەڵیی پیاو و ئافرەت بۆ سەیرانگە و، هەڕەشەی سزا دان

---

[٦٩٧] الطبري: تاريخ الأمم والملوك، جزء ٩، ص ١٤٦

[٦٩٨] المصدر السابق، جزء٩، ص ٣٤٥.

[٦٩٩] عبد العزيز مرشد: نظام الحسبة في الإسلام، ص ١٧.

[٧٠٠] نقولا زيادة: دمشق في عصر المماليك، ص ١٧٠.

بەسەر ئەوەی سەرپێچیی ئەم ڕێنماییانە بکات، لەبەر ئەوەی لەو جۆرە سەیرانانە دا بێ ئابڕوویی و ڕووتی و بەڕەلایی ڕوو دەدات[٧٠١].

وەهاش باو بوە لێپێچەرەوە پێگەی ناوەندیی لە بازاڕ نزیك بوە، کە دەبوو بە خاڵی کۆبوونەوەی ئەو و یاریدەدەرانی و، لە بەردەم پێگەی دانیشتنی دا کۆسپێك هەبوو، سەرەکەی ڕاست دەکرا بە مەبەستی دانیشتن لەسەری، هەندێك کات بۆ ڕوانینە سکالاّی خەڵکی لەو ساختە یا زیانانەی تووشیان دەبوو دادەنیشت، بۆ وەرگرتنی ڕێوشوێنی پێویست لە هەمبەری دا و، زۆر جاریش بە تەرازوەکەوە، کە لە پشکنین دا بەکاری دەهێنا، لەگەڵ یەکێك لە یاریدەدەرەرانی دا بۆ بازاڕ دەچوو، جا بازرگان و خاوەن پیشەکان دەهەپەسان و لە هەر شتێکی ڕووبەڕووی خەڵکییان بکرد بوایە یا زیانیان بە مافەکانیان بگەیاند بوایە لێی دەپێچانەوە.

والیی لێپێچینەوە چاودێریی یاریدەدەرانی دەکرد ئەگەر ڕێکەوتبوایە کەسێك چاو پۆشیی ئەنجام دانی تاوانێکی کرد بێت پێچەوانەی لێپێچینەوە بوایە، وەك وەرگرتنی بەرتیل یا وەرگرتنی دیاری، ئەوا دەستبەرداری دەبوو.

شاکارەکانی یاریدەدەرانی لێپێچینەوە، کۆ کەرەوەی زانیاری بوون، ئەوانەی لە بازارەکان و ڕێگەکان دەسووڕانەوە و زانیارییان بۆ دەهێنایەوە بۆ ئەوەی بتوانێت بە وردی چاودێریی گوناهبار بکات، کاتێکیش گوناهبارێکیان بۆ دەهێنا دەیڕوانییە نیارەکەی، جار وابوو بە قامچی و هەندێك جاریش بە تۆبز لێی دەدا، ئەگەر پێویستی بکرد بوایە، کە بزڕێندرێت، سواری کەرێکیان دەکرد و جلێکی خراپی لەبەر دەکرا بۆ ترساندنی لە کارەکەی و، بۆ پیشاندانی خراپەکاران، کە واز لە خواردنی بە نا حەقی خەڵکی و ئازاردانیان بهێنن[٧٠٢]

---

[٧٠١] عبد العزيز مرشد: نظام الحسبة في الإسلام، ص ٤٣.

[٧٠٢] عبد العزيز مرشد: نظام الحسبة في الإسلام، ص ٥٠.

# توێژبەندی چارەم

## جیاوازیی نێوان ویلایەتی لێپێچینەوە و، ویلایەتی دادوەری و، ویلایەتی سکاڵاکان

### خواستی یەکەم: جیاوازیی نێوان ویلایەتی لێپێچینەوە ویلایەتی دادوەری

لە هەندێك ڕوو دا سازانێك لە نێوان ئەم دوو ویلایەتە دا هەیە و، جیاڕاییش لە ڕووی ترەوە هەیە، سازانەکەشیان لە دوو ڕوەوەیە:

**ڕووی یەکەم**: والیی لێپێچینەوە لە سێ جۆر سکاڵا دا، کە پەیوەندیدارن بە مافی خەڵکی دەستڕۆیی بۆ هەیە، ئەمانەی خوارەوەن:

أ  سکاڵای کەمیی سەنگ، یا سووکیی تەرازوو.

ب  سکاڵای ساختە کردن لە فرۆشراو یا بەها.

ج  سکاڵای دەستکەوتنەوەی وامی شایستە.

والیی لێپێچینەوە بۆی هەیە بڕوانێتە ئەم سێ نیارە، چونکە ئایین سەرپشکی کردوە بۆ لەناوبردنی خراپە ئەگەر دەرکەوت و، فەرمان بە چاکە بکات ئەگەر وازی لێ هێنرا بوو، گومانیش نیە ئەم جۆرە سکاڵایانە دەچنە چارچێوەی ویلایەتی دادوەری، کە دادوەر چارەسەری بۆ سکاڵاکە دادەنێت، گەر تایبەت بوو و، لێپێچەرەوەیش گوێ بۆ سکاڵاکە دەگرێت، گەر گشتی بوو، لە هەردوو گوێ گرتنەکەیشیان لە سکاڵای ئەم نیارە دا ڕێك دەکەون.

**ڕووی دوەم:** والیی لێپێچینەوە بۆی هەیە سکالاّ لەسەر کراو ناچار بکات بە گێڕانەوەی ئەو مافەی، کە لەسەریەتی، وەك ئەو کەسەی بە دادوەری یا بە بەڵگە دەسەلمێنرێت، کە قەرزی شایستەی لەسەرە، بەلاّم نایداتەوە، بەڵکو هەر ئەوڕۆ و سبەی پێ دەکات و تووشی شۆکی دەکات و نایداتەوە لەگەڵ ئەوەی دەتوانێت، جا وامدەر سکالاّ لەسەر نەیارەکەی لە لایەن والیی لێپێچینەوە دەکات، ئەو کاتە والیی لێپێچینەوەش بۆی هەیە وامدار ناچار بکات بە پاك کردنەوەی خۆی لەو مافە پێویستەی بە سۆزەوە[٧٠٣]

جیاڕاییشیان لە دوو جۆر دایە:

جۆری یەکەم: کورتیی لێپێچینەوە بەسەر دادوەری.

جۆری دوەم: زیـــادەی لێپێچینەوە بەسەر دادوەری.

## جۆری یەکەم: کورتیی لێپێچینەوە بەسەر دادوەری.

بۆ والیی لێپێچینەوە نییە بڕوانێتە ئەو سکالاّیانەی لە دەرەوەی سنووری خراپە دیارەکانە، وەك سکالاّی گرێ بەست و مامەڵەکان، هەروەك ویلایەتی لێپێچینەوە هەموو ئەوە ناگرێتەوە، کە پێشکەش دەکرێت، مەگەر مافی دان پێدانراو، یا ئەوەی بڕیاری پێ دەرچوە، بەلاّم سەبارەت بە مافە ناکۆکی لەسەرەکان، والیی لێپێچینەوە بۆی نییە تێڕوانینیان بکات.

وەك: کاتێك زەید سکالاّی لەسەر عەمرۆ نووسی، کە گوژمەیەکی لە پارەی لێ قەرز کردبوو، سکالاّ لەسەر کراو نکۆڵیی کرد، لێرە دا والیی لێپێچینەوە بۆی نییە بڕوانێتە سکالاّی لەم جۆرە، بەڵکو تەنها دەڕوانێتە ئەو پرسە ڕوون و بە پەلانەی، کە لێکۆڵینەوە و شێنەیی هەڵناگرێت، بەڵکو دادوەر تێی دەڕوانێت و تێڕوانەریەتی[٧٠٤].

---

[٧٠٣] عبد العزيز مرشد: نظام الحسبة في الإسلام، ص ٥٤.

[٧٠٤] الماوردي: الأحكام السلطانية، ص ٢٤٢.

## جۆری دووەم: زیادەی لێپێچینەوە بەسەر دادوەری.

والیی لێپێچینەوە دەڕوانێتە ڕەفتار و هەڵسوکەوتی خەڵکی، جا ئەگەر خراپەیەکی بینی هەڵدەستێت بە لەناوبردنی، ئەگەریش واز لە چاکەیەك هێنرا، ئەوا فەرمان بە کردنی دەکات، ئەمەش خۆی لە خۆی بێ سکاڵا نووسین.

نموونە: والیی لێپێچینەوە فەرمان دەدات بە لەناوبردنی ساختە کردن و ئەنجام دانی نوێژ و قەدەغەکردنی ئارایشتی ئافرەتان.

هەروەك ویلایەتی لێپێچینەوە بۆ پابەند بوونی خەڵکی بە کردنی چاکە و دوورکەوتنەوە لە خراپە دانراوە، بۆیە دەبێت والیی هێز و شکۆ و توندی بەکاربهێنێت و، نابێت لە دەرەوەی سنووری فرمانەکەی بێت، لە کاتێك دا دادوەر ناڕوانێتە هیچ دۆزێك، مەگەر بە ئامادە بوونی داواکار و، لەسەر بنەمای سکالاکەی دەڕوانێتە دۆزەکە، هەروەها دادوەری بۆئەنجام دانی دادگەری لە نێو خەڵکی دا دانراوە، ئەمەش مافێکە پێویستی بە شێنەیی و لەسەرخۆیی هەیە، دەرچوونی دادوەریش لەمە بە دەستدرێژی و دەرچوون لەوەی پێویستە و لەسەریەتی گوزارشت دەکرێت[٧٠٥]

## خواستی دووەم: جیاوازیی نێوان ویلایەتی لێپێچینەوە و ویلایەتی سکالاکان

ویلایەتی لێپێچینەوە و سکالاکان لە دوو ڕوو دا هاوڕان و لە دوو ڕووش دا جیاڕان

---

[٧٠٥] عبد العزيز مرشد: نظام الحسبة في الإسلام، ص ٥٥.

## ڕووە هاوڕاکان

**یەکەم:** هەردووکیان بۆ ترس و توندی دانراون و، هەریەك لە والیی لێپێچینەوە و والیی سکالاکان، دەبێت بەشێکی زۆر شکۆ و توندییان لەسەر خراپەکەر و یاخییان دا هەبێت.

**دووەم:** بۆ هەریەك لە والیی لێپێچینەوە و والیی سکالاکان هەیە، کە بەرهەڵستیی خراپە و دوژمنکاریی دیار بکەن، بەوەی هەستن بە ناڕەزایی دەربڕین و لەناوبردنی، ئەگەر چی هیچ کەسێکیش سکالای لەبەردەمیان نەبوو[٧٠٦]

## ڕووە جیاڕاکان

**یەکەم:** والیی لێپێچینەوە چارەسەریی نیارە ڕوونەکان دەگرێتە ئەستۆ، لەکاتێك دا ویلایەتی سکالاکان بۆ ڕوانینی ئەوەیە، کە دادوەرەکان ناتوانن چارەسەریان بکەن.

**وەك:** خۆبەدەستەوە نەدانی یەکێك لە دوو نەیارەکە بۆ بڕیاڕی یاسا لەبەر هێزی پێگەکەی، یا نەتوانینی دادوەران لە تێڕوانینی دۆزەکە لە ترسی خۆیان[٧٠٧].

**دووەم:** والیی سکالاکان دەڕوانێتە دۆسیە مەترسیدارەکان و، گوێش لە سکالا و ئەوەی بۆی هەیە لە ڕوون کردنەوە و بیانو دەگرێت، پاشان بڕیار دەردەکات و هەردوولاش پابەند دەبن پێی، بەڵام لێپێچەرەوە بۆی نیە بڕوانێتە ئەو دۆسیانەی، کە پێویستیان بە سەلماندن هەیە، یا نکۆڵی کردنی دێتە ناو[٧٠٨].

---

[٧٠٦] الماوردي: الأحكام السلطانية، ص ٢٤٢.

[٧٠٧] عبد العزيز مرشد: نظام الحسبة في الإسلام، ص ٥٦.

[٧٠٨] الماوردي: الأحكام السلطانية، ص ٢٤٢.

# بەشی دووەم

# پایەکانی لێپێچینەوە

تێخوێندنەوەی پایەکانی لێپێچینەوە لەم سێ توێژبەندەی خوارەوە دەگرینە ئەستۆ:

توێژبەندی یەکەم: لێپێچەرەوە.

توێژبەندی دوەم: لێپێچراوە.

توێژبەندی سێیەم: ئەوەی لە لێپێچینەوە دا ئەنجام دەدرێت.

# توێژبەندی یەکەم

## لێپێچەرەوە

لێپێچەرەوە ئەم مەرجانەی خوارەوەی لەسەرە:

١) **ئیسلام:** چونکە لێپێچینەوە ویلایەتە و، ویلایەتیش بۆ خوانەناس نییە بەسەر مووسوڵمان. خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَلَن يَجْعَلَ اللّهُ لِلْكَافِرِينَ عَلَى الْمُؤْمِنِينَ سَبِيلاً﴾[709] واتا: "خوا(هەرگیز) توانایەکی وا ناداتە بێ بڕوایان(بە ئایینی خوا و پەیامبەرەکەی) بەسەر مووسوڵمانان(سەربکەون و کۆتاییان پێ بهێنن)".

٢) **نێرینەیی:** بەشێك لە بیرمەندانی ئیسلامی هەن، کە ڕایان وایە نابێت ژن والیی لێپێچینەوە بێت، چونکە لێپێچینەوە ویلایەتێکە لە ویلایەتەکان، ژنیش هیچ شتێکی لێ ناگرێتە ئەستۆ لەبەر فەرمایشتی پەیامبەرﷺ ، کە دەفەرموێت: "لن يفلح قوم ولو أمرهم امرأة" واتا: (گەلێك ژن کاروباریان بگرێتە ئەستۆ سەرفراز نابن)[710]، لەبەر ئەوەشی ژن داوای لێ نەکراوە بچێتە کۆ بوونەوە و، تێکەڵی پیاوان ببێت[711].

بەشێکی تریش هەیە وای دەبینێت، کە بۆ ژن هەیە والیی لێپێچینەوە بێت و ئەوە بیر دەخەنەوە، کە هاوەڵە ژن سەمرای کچی نەحیکی ئەسەدی لە ڕۆژگاری پەیامبەر ﷺ لێپێچینەوەی لە مەکە گرتە ئەستۆ و، قامچییەکیشی هەبوو، کە پێیەوە بە توندی لە ساختەچییانی دەدا، هەروەها عومەری کوڕی

---

[709] سورة النساء: الآية ١٤١.

[710] صحيح البخاري، جزء ٩، ص٧٠.

[711] عبد العزيز مرشد: نظام الحسبة في الإسلام، ص ٦٢

خەتاب خوا لێی ڕازی بێت بازاڕی مەدینەی خستە ئەستۆی شیفای کچی ئەبی سولەیمان[٧١٢].

ماوەردی پێی وایە ناشێت ژن والییەتی بکات، لەکاتێك دا ئیبن جەریری تەبەری وەك پیاو دەیشیێنێت[٧١٣]، ئەبو حەنیفەش دەڵێت: دادوەریی دروستە کاتێك گەواهی دانی تێی دا دروست بێت، گەواهی دانیشی هەر کاتێك پێ دروستە، جگە لە سنوورەکان و تۆڵە[٧١٤]، بەڵام جەماوەری شارەزایانی مووسوڵمانان پێیان وایە بۆ ژن ناشێت ویلایەتی هەبێت هەر چۆنێك بێت.

٣) **ڕاسپاردن:** ڕانەسپێردراو فەرمان و بەرگریی ئاراستە ناکرێت، چونکە هەڵ سووڕاندنی خۆی پێ باش ناکرێت، چۆن بەڕێوەچواندنی کاروباری مووسوڵمانان لە بازاڕ و فرۆشراوەکان و کارەکانیان دەگرێتە ئەستۆ.

٤) **زانست بە بڕیارەکانی ئایین:** لەبەرئەوەی پێوانە کردنی باشی و قێزەونی ئەوەیە، کە لە ئایین دا هاتوە و، سەرچاوەیەکیش لەمە دا نییە مەگەر لە پەرتووکی خوا و سوننەتی هەواڵبەرەکەی ﷺ، نەزانیش بە بڕیارەکانی ئیسلام لە چاك کردنی هەر شتێك دا ڕێی لێ دەگرێت، ئەمەش لە تێڕوانینی ئایین دا قێزەونە و، مەترسییەکی مەزن و کارەساتێکی گەورەیە.

٥) **پاکڕۆیی:** واتە لە ڕاست دارایی خەڵکی دا پاك بێت ، دوور بکەوێتەوە لە وەرگرتنی دیارییەکانیان.

٦) **ئازادی:** لەبەر ئەوەی بەندە ئامادەیی گرتنە ئەستۆی ئەم پایە مەترسیدارەی نییە، لەبەر کەموکوڕیی کۆیلایەتی، کە لای گشت خەڵکی بە سووك سەیر دەکرێت، هەر چەندە ئەم مەرجە جێی بەهەند وەرگرتن نییە، چونکە کۆیلایەتی بە کردەنی نەماوە.

---

[٧١٢] ظافر القاسمي: نظام الحكم في الشريعة والتاريخ الإسلامي، الكتاب الثاني، ص ٢٥٠.
[٧١٣] الماوردي: أدب القاضي، جزء ١، ص ٦٢٥.
[٧١٤] ظافر القاسمي: نظام الحكم في الشريعة والتاريخ الإسلامي، الكتاب الثاني، ص ٢٥٠.

٧) **ڕا:** دەبێت لە ئایین دا خودان ڕای تۆکمە و هێز بێت، چونکە لێپێچینەوە لەسەر توندی لەگەڵ خێرایی لە داپڕین دا دادەمەزرێت، ئەمەش بە کەس ناکرێت، مەگەر خودان ڕایەکی پێکەر و ئاوەزێکی سەنگین و دووربین بێت.

٨) **خاراو بە خراپە دیارەکان:** واتە دەبێت زانا بێت بە خراپە دیارەکان، زانیاریی هەبێت بە شێوازەکانی دەرچوون و ڕێگاکانی خراپەیان و فێڵی ساختەچییان و ئاشنایەتی بە ئۆینەکانیان[٧١٥]

٩) **دادگەری:** هەندێك لە زانایان دەڵێن، مەرجە والیی لێپێچینەوە دادگەر بێت، لەمانیش ماوەردی و شافعی[٧١٦] و، ئەبو یەعلی فەرا لە حەنبەلییەکان[٧١٧]

بەڵام غەزالی و قورتبی دەڵێن مەرج نییە والیی لێپێچینەوە دادگەر بێت، بەڵکو دەشێت لێپێچینەوە بدرێتە لاڕێ[٧١٨].

١٠) **ڕەنج دان:** ئەبو سەعیدی ئەستەخری، لە شارەزایانی شافعییەکان، پێی وایە دەبێت والیی لێپێچینەوە ڕەنجدەر بێت لە بڕیارەکانی ئایین دا، بۆ ڕەنج دان بۆ ڕاکەی خۆی لە ڕووبەڕوو بوونەوەی ئەو ڕایانەی لەگەڵی دا جیاڕان[٧١٩]، هەندێکی تریش پێیان وایە ئەمە مەرج نییە، بەڵکو ئەوەندە بەسە بە خراپەکان و ئەو بڕیارانەی لەبارەیەوە هاتوون و، بەوەی خەڵکی کاروبار و ڕەوشەکانیان دا تووشی دەبن، ئاشنا بێت[٧٢٠].

١١) **ڕێگە دان لە پێشەواوە:** هەندێك زانا دەڵێن: مەرجە لێپێچەرەوە لە لێپێچینەوە دا لە لایەن پێشەوای مووسوڵمانان ڕێگەی پێدرا

---

[٧١٥] عبد العزيز مرشد: نظام الحسبة في الإسلام، ص ٦٤.

[٧١٦] الماوردي: الأحكام السلطانية، ص ٢٤١.

[٧١٧] الماوردي: الأحكام السلطانية، ص ٢٦٩.

[٧١٨] الغزالي: إحياء علوم الدين، جزء٤، ص٣٠٩.

[٧١٩] الماوردي: الأحكام السلطانية، ص ٢٤١.

[٧٢٠] الماوردي: الأحكام السلطانية، ص ٢٤١.

بێت، بۆیە فەرماندەر بە چاکە ناو نابردرێت بە والیی لێپێچینەوە مەگەر لە لایەن فەرمانڕەواوە پێ سپێردراو بێت، چونکە لێپێچینەوە دەسەڵات و ویلایەت و بڕیار دانە بەسەر بڕیار لەسەر دراو، کە پێویستە نەچەسپێندرێت مەگەر بە دەسەڵاتێکی دراو لە کاربەدەست، ئەم مانایەش بۆ خوانەناس نییە لەسەر مووسوڵمان بچەسپێنرێت[٧٢١]

هەندێکی تر دەڵێن: ئەمە مەرج نییە، بەڵکو بە بەڵگەی گشت ئایەت و فەرموودە هاتوەکان لەبارەی لێپێچینەوە بۆ هەرتاکێکی مووسڵمان هەیە لێپێچینەوە بکات و خراپە بگۆڕێت، کە بەڵگەن لەسەر ئەوەی هەرکەسێك خراپەیەکی بینی لێی بێ دەنگ بێت یاخی بوە و، پێویستیشە بە گشتی بەر لە یاخی بگیرێت لە هەر کوێیەك و، هەرچۆنێك بینرا، کەواتە تایبەت کردنی مەرجی ڕێگە دان و پێ سپاردن لە پێشەواوە بەڵگەی لەسەر نییە[٧٢٢].

ئێمەش پێمان وایە، کە ویلایەتی لێپێچینەوە ناچەسپێت، مەگەر بە پێ سپاردن لە پێشەواوە، بێ ئەم بەدەست نایەت، بەڵام ئامۆژگاری و ڕێبەری کردنی ئەو گۆڕانەی پێویستی بە هاندەر و ناچار کردن نییە، ئەوا لەسەر گشتی خەڵکی چەسپاوە، بەڵام ئەوەی پێویستی بە هێز و ناچار کردن و دەسەڵات و توندی هەیە، لەسەر هیچ کەسێك نەچەسپاوە، بەڵکو تایبەتە بە والیی لێپێچینەوە.

---

[٧٢١] الماوردي: الأحكام السلطانية، ص ٢٤١.

[٧٢٢] الغزالي: إحياء علوم الدين، جزء ٢، ص ٣٣١.

# توێژبەندی دووەم

## لێپێچراوە

ئەمەش ناڕەزایی لە کارە قێزەونەکەی کراوە، یا ئەو کەسەی فەرمان بە چاکە و بەرگرتن لە خراپەی ئاراستە بکرێت و، مەرجە مرۆڤ بێت، چونکە لێپێچینەوە لەسەر جگە لە ئادەمیزاد نییە، لەبەر ئەوەی لێپێچینەوە دامەزراوە لەسەر ناڕەزایی کردن لەوەی مافی خوایە، هەروەك ئەمەش نابێت مەگەر کردەوەکە سەبارەت بەو کەسەی ئەنجامی داوە خراپ بێت، ئەمەش تەنها لە ئادەمیزادەوە دەبێت، هەروەك کردەوەی ئاژەڵ بە چاکە و خراپە دانانرێت[٧٢٣].

مەرجیش نییە ڕاسپێردراو بێت، هەروەك ئەگەر مێرد منداڵێك مەی بخواتەوە ڕێگری لێ دەکرێت و لێپێچینەوەی لەگەڵ دا دەکرێت، گەر هاتوو پێش پێگەیشتنی بوو[٧٢٤]، ئەمەش بۆ پابەند کردنیەتی بە فەرمانەکانی خوا و دوور خستنەوەی لە قەدەغەکراوەکان، هەروەك خوا ئەرکی خستۆتە سەرمان، کە فەرمان بە نەوەکانمان بکەین بە نوێژ کردن، کاتێك گەیشتنە هەفت ساڵان و، لێیان بدەین لەسەری کاتێك گەیشتنە دە(ساڵ): "فەرمان بە نەوەکانتان بکەن بە نوێژ کردن، کە هەفت ساڵانن و لێیان بدەن، کە دە ساڵانن و، نێوانیان جیا بکەنەوە لە جێی نووستنان دا"[٧٢٥]

ئەگەر شێتیش ویستی زینا بکات، لەگەڵ ئەوەی هیچی لەسەر نییە، ڕێ گرتن لەم نابەجێییەوە و گرتنەبەری ئەوەی دەستەبەری ساغییەتی ئەرکە.

---

[٧٢٣] الغزالي: إحياء علوم الدين، جزء ٢، ص ٣٢٣.
[٧٢٤] الغزالي: إحياء علوم الدين، جزء ٢، ص ٣٢٣.
[٧٢٥] رواه أبو داود بإسناد حسن: رياض الصالحين، ص ١٤٠.

# توێژبەندی سێیەم

## ئەوەی لە لێپێچینەوە دا ئەنجام دەدرێت

خوێندنەوەی ئەم توێژبەندە لە دوو خواست دا دەگرینە ئەستۆ:
خواستی یەکەم: ئەوەی لە فەرمان بـە چاکـــە ئەنجام دەدرێت و بەشەکانی.
خواستی دووەم: ئەوەی لە بەرگرتن لە خراپە دائەنجام دەدرێت و بەشەکانی.

## خواستی یەکەم: ئەوەی لە فەرمان بە چاکـە دا ئەنجام دەدرێت و بەشەکانی

١ - ئەگەر لە مافەکانی خوای شکۆمەند بێت، ئەویش دوو بواری هەیە:

أ - **بواری گشتی**: ئەویش ئەوەیە، کە فەرمان بە چاکە ئاراستەی تەواوی کۆمەڵگە بکرێت و، لێپێچینەوەکەش چارەسەریی دیاردەیەکی کۆمەڵایەتی بکات.

نموونە: خەڵکی شارێك واز لە نوێژی هەینی بهێنن. جا لەم بارە دا ئەرکە لەسەر والیی لێپێچینەوە، کە فەرمان بە خەڵکی بکات بە ئەنجام دانی نوێژی هەینی و، لە لێپێچینەوەکەشی دا ئامرازەکانی ڕاگەیاندن، کە لە سەردەمەکەی دا بوونیان هەیە بەکاربهێنێت.

ب - **بواری تایبەت**: ئەویش ئەوەیە، کە لێپێچینەوەکە ئاراستەی بە تەنها تاکێك بکرێت، وەك ئەگەر بڵاوبوەوە، کە کەسێك بە واز هێنان لە نوێژ ناوبانگی دەرکرد، لێرە دا والی لەم بارەوە پرسیاری لێ دەکات و، گوێ لە وەڵامەکەی دەگرێت و ڕێوشوێنی شیاو دەگرێتەبەر[٧٢٦].

٢ - ئەگەر لە مافێك لە مافەکانی ئادەمیزاد بێت، ئەویش دوو بواری هەیە:

---

[٧٢٦] أبو يعلي: الأحكام السلطانية، ص ٢٧٢.

أ - **بواری گشتی:** ئەویش ئەوەیە، کە لێپێچینەوەکە بۆ پاراستنی مافێکی دیاری مووسوڵمانان بێت، نەك تویژێك یا کەسێك لەمان.

ب - **بواری تایبەت:** ئەویش ڕەچاو کردنی مافی بە تەنها ئادەمیزادێك بێت.

٣ - ئەگەر فەرمان بە چاکە لە مافێکی هاوبەش بێت، ئەویش مافی خوا لە لایەك و، مافی ئادەمیزادیش لەلایەکی تر.

**نموونە:** سوورِ بوونی نەپاراستنی پەیمان(عدە) لە ئافرەتان لەکاتی جیا بوونەوە لە مێردیان، جا بۆ لێپێچەرەوە هەیە فەرمانیان پێ بکات بە ئاگا بوون لە بڕیارەکانی پەیمان و، پاراستنی و تەمبێ کردنی هەریەکێکیان، ئەگەر سەرپێچیی کرد.

## خواستی دوەم: ئەوەی لە بەرگرتن لە خراپ(منکر) و بەشەکانی دا ئەنجام دەدرێت

١ - ئەوەی لە مافەکانی خوای گەورەیە، ئەویش سێ بارە:

أ – ئەوەی پەیوەندیدارە بە پەرستگەری، وەك وازهێنان شوشتنەوەی لەش پیسی.

ب – ئەوەی پەیوەندیدارە بە مامەڵەکردن بە خراپە، وەك فرۆشتنی بۆگەنییەکان.

ج – ئەوەی پەیوەندیدارە بە کارە قەدەغەکان ، وەك ئەوەی ڕێ لە خەڵکی بگیردرێت لە گومان بردن و تۆمەتبار کردن[٧٢٧].

٢ – ئەوەی لە مافەکانی ئادەمیزادە، نموونەی ئەمەش دەستدرێژیی مرۆڤ بەسەر دراوسێیەکەی یا ئافرەتەکەی.

٣ – ئەوەی لە نێو ئەم دوو مافە دا هاوبەشە: وەك ڕێ گرتن لە سەیر کردنی ماڵی خەڵکی و، کردنەوەی پەنجەرە بەسەر خانووی دراوسێ.[٧٢٨]

---

[٧٢٧] الماوردي: الأحكام السلطانية، ص ٢٤٩.

# بەشی سێیەم

# چۆنیەتیی لێپێچینەوە

**بەرایی**

لێپێچینەوە بە ویلایەت و پسپۆڕیی لەسەر فەرمان بە چاکە کردن و بەر لە خراپە گرتن دادەمەزرێت و بەڵگەکانیش گوزارشتن لەسەر ئەرك بوونیان لە پەرتووك و سوننەت و کۆدەنگی.

جا سەبارەت بە پەرتووك، ئەوا بە ڕاشکاوی لە پەرتووکە پیرۆزەکەی دا فەرمان دەکات: ﴿وَلْتَكُن مِّنكُمْ أُمَّةٌ يَدْعُونَ إِلَى الْخَيْرِ وَيَأْمُرُونَ بِالْمَعْرُوفِ وَيَنْهَوْنَ عَنِ الْمُنكَرِ وَأُولَـٰئِكَ هُمُ الْمُفْلِحُونَ﴾[٧٢٩] واتا: "با لە ئێوە کۆمەڵێك پێك بێت بانگەشەی باشە بکەن و فەرمان بە چاکە بکەن و بەر لە خراپە بگرن و هەر ئەمانەیشن سەرفرازان"، واتا با کۆمەڵێك هەبن لەم گەلە دا ئەمە ئەنجام بدەن[٧٣٠].

سەبارەت بە سونەت، ئەوا پەیامبەر ﷺ بەگوێرەی توانا فەرمانی بە لێپێچینەوە کردوە ، کە دەفەرموێت: (هەر یەکێك لە ئێوە خراپەیەکی بینی با بە دەستی بیگۆڕێت، ئەگەر نەیتوانی با بە زوبانی، ئەگەر نەیتوانی بە دڵی، ئەمەش لاوازترینی بڕوایە)[٧٣١]

سەبارەت بە کۆدەنگیش، ئەوا مووسوڵمانان کۆ دەنگن لەسەر ئەوەی، لەسەر هەر یەکێك لە توانستی دا هەبێت ئەرکە بیگۆڕێت و، زیان لەسەر خۆی و لەسەر مووسوڵمانان دوور بخاتەوە[٧٣٢].

---

٧٢٨ عبد العزيز مرشد: نظام الحسبة في الإسلام، ص ٩٤.

٧٢٩ سورة آل عمران: الآية ١٠٤.

٧٣٠ القرطبي: جزء ٤، ١٦٥.

٧٣١ صحيح مسلم بشرح النووي، جزء ٢، ص ٢٢.

٧٣٢ القرطبي: جزء ٤، ص٤٨.

لەبەر ئەوەی تاوتوێی لێپێچینەوە دەکەین، ئاوا باشە ڕێسا و بەرزەفتکاری و شێوەکانی لێپێچینەوە لەسەر تەواوی خەڵکی و، بە جیاوازیی ڕێگەکانی دەستکەوتی بژێوییان بخەینە ڕوو، جا لەمە دا فرمانبەری وڵات بن یا خاوەن پیشەی ئازاد بن.

بۆیە ئەم بەشە لە چار توێژبەند دا دەگرینە ئەستۆ:

## توێژبەندی یەکەم

## لێپێچینەوە لە پیشەوەر و پشەساز و بازرگان و کێڵگەوانان

### خواستی یەکەم: چۆنیەتیی لێپێچینەوە لە پیشەوەر و پیشەسازان و بازرگانان و کێڵگەوانان

لەبەر ئەوەی کارەکان جۆراوجۆر و فرەن، ئەوا نموونە بۆ هەر یەکێکیان دێنینەوە و، گرنگترینیان لەوەی، کە خەڵکی پێویستی پێ هەیە لە خواردن و پۆشاك و دەرمان و نیشتەجێ بوونیان، سەبارەت بەو خاوەن کارانەشی، کە خەڵکی لە خواردنیان دا پێویستیان پێیان دەبێت زۆرن، بەم نموونەی خوارەوە تەواویان دەکەین:

● **سەربڕەکان:** لێپێچەرەوە قەدەغەیان بکات لە سەربڕین لەبەر دەرگەی دوکانەکانیان، بۆ ئەوەی ڕێگەکە بە خوێن پیس نەبێت و، فەرمانیان پێ بکات بە بردنی گۆشتەکان بۆ ناوەوەی دوکانەکان نەك لە دەرەوە هەڵی بواسن و، ناچاریان بکات بە جیا کردنەوەی گۆشتی مەڕ لە گۆشتی بزن و، تێکەڵی

یەکتریان نەکات، ئەگەر ئاژەڵێکی نەخۆشیش هەبوو، قەدەخەی فرۆشتنی بکات لەگەڵ ئەو گۆستەی لە دوکانەکەی دا هەیە....تد[٧٣٣]

ئەو خاوەنکارانەشی، کە خەڵکی لە پۆشاك پێویستی پێیان هەیە ئەوا نموونەی خوارەوەیان لەبارەوە دەهێنینەوە:

● **بۆیەگەران:** والی قەدەغەیان بکات لە ساختە کردن، کە هەندێکیان پۆشاك بە خەنە بۆیە بکەن و، فەرمانیان پێ بکات، لەسەر پۆشاکی خەڵکی ناویان بە پێنووسی جاف بنووسن، بۆ ئەوەی لەگەڵ یەکتر نەگۆڕێن و، قەدەغەیان بکات لە خواردنی دارایی یەکتر بێ بەرانبەر.....تد[٧٣٤].

ئەو پیشەوەرانەشی، کە خەڵکی لە دەرمان پێویستی پێیان هەیە ئەوا نموونەی خوارەوەیان لەبارەوە دەهێنینەوە:

● **نووژداران(پزیشکان):** والیی لێپێچینەوە رێگە بە هیچ کەسێك نادات، کە پیادەی نووژداری بکات مەگەر بە باشی نەخۆشی و چارەسەرییان بزانێت، هەروەها والی پەیمانیان بە قیرات گەلێك لێ وەربگرێت و، نووژدارانی چاویش بە پەرتووکی حوسەینی کوڕی ئیسحاق تاقی بکاتەوە و، چاودێریی کلچیانی بڵاوبوەوە لەسەر شەقامەکان بکات، کە زۆریان نەزانن بە (زانستی) نووژداری...تد.[٧٣٥]

ئەو خاوەن کارانەشی، کە خەڵکی لە نیشتەجێ بوون دا پێویستی پێیان هەیە ئەوا نموونەی خوارەوەیان لەبارەوە دەهێنینەوە:

● **دەڵاڵەکانی خانووبەرە:** والی فەرمانیان پێ بکات، کە ئەوەی ڕاگیراوە یا بارمتەیە، یا ئەو کەسە خاوەنی نییە، کە لە دەستیەتی، ناچاریان بکات

---

[٧٣٣] عبد العزيز مرشد: نظام الحسبة في الإسلام، ص ١١٨، ١١٩.

[٧٣٤] عبد العزيز مرشد: نظام الحسبة في الإسلام، ص ١٢٣.

[٧٣٥] عبد العزيز مرشد: نظام الحسبة في الإسلام،، ص ١٢٦.

پێوەی پابەند بن، هەروەك نافرۆشرێتە مێردمندالْ یا هەتیو مەگەر بە ڕێگەدانی بەخێوكەرەكەی و، ناچاریان بكات، كە شتێك لە فرۆشەر نەبێت وەری نەگرن[٧٣٦]

## خواستی دوەم: چۆنیەتیی لێپێچینەوە لە بازرگانان

لەم بارەوە ئەم نموونەی خوارەوە دێنینەوە:

• **بۆرسەچی**: لەسەر والیی لێپێچینەوەیە، كە بازاریان بەسەر بكاتەوە و، باریدەدەرانی لە لایان دا بلاّو بكاتەوە، ئەگەر بینرا كەسێك گومان لێكراوە یا كارێك دەكات لە بۆرسەچییاتی دا لەگەلْ ئاین دا ناشێت، سەرزەنشت بكرێت و، قەدەغەیان بكات لە فرۆشتنی ئالْتوونی بێ گەرد بە تێكەلْ كراو، تێكەلْ كراویش بە شێوەی ئەو، لەبەر نەزانین بە بڕی زێڕ تێیان دا، پاشانیش پێك نەچووان، هەروەها سەرپەرشتیی سەنگەكان و ڕێگەكانی كێشانیان بكات[٧٣٧].

## خواستی سێیەم: چۆنیەتیی لێپێچینەوە لە كێلْگەوانان

والیی لێپێچینەوە هەلْدەستێت بە قەدەغە كردنیان لە چاندنی دارە یاساغ كراوەكان، وەك بەنگەمەنی بە هەموو جۆرەكانی و، ئەو كەرەستانەی لێی بەرهەم دێن، كە بێ هۆشكەرن، وەك خشخاش و، ئەوەی دەجوورێت وەك قات(دارێكە)، فەرمانیان پێ بكات بە ساختە نەكردن لە خستنەڕووی چێندراوەكانیان كاتێك بۆ بازاڕی ڕاپێچ دەكەن....تد[٧٣٨].

---

[٧٣٦] عبد العزيز مرشد: نظام الحسبة في الإسلام، ص ٢١٧.

[٧٣٧] عبد العزيز مرشد: نظام الحسبة في الإسلام، ص١٣١.

[٧٣٨] عبد العزيز مرشد: نظام الحسبة في الإسلام، ص١٣٣.

# توێژبەندی دووەم

## چۆنیەتیی لێپێچینەوە لە فرمانبەرانی وڵات

ئەرکی والیی لێپێچینەوەیە چاودێری بەسەر دانیشتنەکانی دادوەر و فەرمانڕەوایان بکات و، قەدەغەیان بکات لە دانیشتن لە مزگەوتەکان، چونکە ڕەنگە لەش پیس و خوێندار(سووڕی مانگانەی ئافرەتان) و خاوەن پەرتووکەکان(جوولەکە و کریستینییەکان) و شێت و، ئەوانەی خۆ لە گلاّوی ناپارێزن بێنە ناوی، مزگەوتیش پیس بکەن و ڕایەخەکەی گلاّو بکەن، سەرباری ئەوەی ڕەنگە دوو نەیارەکە دەنگیان بەرز بکەنەوە و ژاوەژاوی ناپۆرای خەڵکی لە دانیشتنەکانی دادوەر[٧٣٩].

هەر کاتێك والیی لێپێچینەوە بینی دادوەر لە نەیارەکان تووڕە بوو یا جونی بە یەکێکیان دا یا لە قسەکانی دا پەنگی خواردەوە هێوری دەکاتەوە، ئەگەر دادوەر فرمانبەر گەلێکی هەبوو، ئەوا ئەرکە ئاکاری جوانیان هەبێت، هەروەك ئەرکە دادوەر لە ناوەڕاستی شار دابنیشێت بۆ ئەوەی خەڵکی لە سەردان کردنی دا ماندوو نەبن[٧٤٠].

لە چۆنیەتیی لێپێچینەوە لەسەر فرمانبەرانی وڵات، مەبەست لێی لەمە دا کورت کردنەوەی نییە، بەڵکو ویست لێی دا پێدانی وێنە و نموویەکە و، ئەوەی لەبارەی ئەوانە دەگوترێت، لە فرمانبەرانی تری جگە لەمانیش دەگوترێت، هەروەك لەسەر والیی لێپێچینەوەیە، کە چاودێرییان بکات لە کارەکان و فەرمانیان پێ بکات لە پاکی کارکردن و بەرژەوەندیی گشتی مووسوڵمانانیان گەرەك بێت.

---

[٧٣٩] عبد العزيز مرشد: نظام الحسبة في الإسلام، ص١٣٥.

[٧٤٠] عبد العزيز مرشد: نظام الحسبة في الإسلام، ص١٣٦.

ـەر کەسێکیشی بینی لە ڕاپەڕاندنی کارەکەی دا دوا دەکەوێت یا لە ئەر ـەکانی دا کەمتەرخەمە، نارەزایی لە ڕاست دا دەردەبڕێت، بۆ ئەوەی ببێتە پەند ـبۆ هاوشێوەکانی

ئەگەر فرمانبەریش لە فرمانەکەی دا کەم و کوڕیی هەبوو، نا ڕەزایی لە ڕاست دا ـەردەبڕێت، جا ئەگەر گوێڕایەلیی کرد، ئەوا گرفتێك نییە، ئەگەر نا داوا لە کارـدەست دەکرێت تەمبێی بکات و ئەگەر پێویستیشی کرد لە فرمانەکەی دا بیخات، هەروەك فرمانبەرێك بەرتیل یا دیاری وەربگرێت بە مەبەست گەلێکی پەیوـندیدار بە فرمانەکەی، یا بەرپرس بوو پایەکەی بۆ پارێزگاری کردن لە تاوان کەر بقۆزێتەوە.[741]

---

[741] عبد العزيز مرشد: نظام الحسبة في الإسلام، ص ١٣٩.

# توێژبەندی سێیەم

## چۆنیەتیی لێپێچینەوە لەسەر پیاوماقوولان و چینی ناوەڕاست و چەوساوان

والیی لێپێچینەوە ئەنجوومەنەکانی پێشەوایان و والییەکان بەسەر دەکاتەوە و، فەرمانیان پێ دەکات بە چاکە و بەریان لێ دەگرێت لە خراپە و، ئامۆژگرییان دەکات و بە ئاگایان دەهێنێت و فەرمانیان پێ دەکات لەسەر ژێر دەستە دا بەسۆز بن و چاك بن بۆیان.

قەدەغەی پارێزەران دەکات لە بریکارێتی، مەگەر بۆ پێداویستی زۆر گرنگ، وەك ژنێك هەبێت پابەندیماڵەکەی خۆی بێت و تێکەڵی پیاوان نەبێت و، نەشچێتە بازاڕ، یا مێر منداڵێك یا ئامادە نەبوەك یا پیاوێك زۆریی کارەکانی ڕێگەی ئامادەبوونی دانیشتنی دادوەری نادەن، لەم کاتە دا فەرمانڕەوا کەسێك بە بریکاریان دادەنێت، کە بە دادگەر و جێگیری(لە دینداری) ناسراو بێت[٧٤٢].

هەروەها والی لێپێچینەوە هەڵدەستێت بە ڕوانینە کاروباری ئامۆژگەران و، هیچ یەکێکیان نەتوانن ئامۆژگەری بکەن، مەگەر بە دینداری و چاکی و زانەر بە بڕیارەکانی قورئان ناوبانگی دەرکردبێت[٧٤٣].

ئەگەر والیی لێپێچینەوە گوێ بیستی ژنێکی سوزانی یا گۆرانی بێژ بوو، لە یاخی بوونەکەی دا پەشیمانی دەکاتەوە، ئەگەر دووبارەی کردەوە سەرزەنشتی دەکات و لە وڵات دووری دەخاتەوە، هەروەها قەدەغەی بارهەڵگران دەکات لە بارکردنی زیاتر لە وزەی ئاژەڵان و، فەرمان بەو ئاوهێنەرانەی ئاو لە ڕووبارەوە دەهێنن، بچنە ناو ڕووبار تا دوور دەکەونەوە لە کەنار و شوێنی پیس بن، لە جێگەیەك دا ئاو نەهێنن، کە ئاژەڵ ئاوی تێ دا دەخواتەوە[٧٤٤] هی تریش.

---

[٧٤٢] عبد الرحمن بن نصر الشيرازي: نهاية الرتبة في طلب الحسبة، القاهرة، ١٩٤٦م، ص ١١٥.
[٧٤٣] عبد العزيز مرشد: نظام الحسبة في الإسلام، ص ١٤٢.
[٧٤٤] عبد الرحمن بن نصر الشيرازي: نهاية الرتبة في طلب الحسبة، ص ١١.

# توێژبەندی چارەم

## چۆنیەتیی لێپێچینەوە لە خراپەکانی بازاڕ و ڕێگە و کەرتە گشتییەکان

لەبەر ئەوەی والیی لێپێچینەوە ناتوانێت چاودێریی هەموو خاوەن پیشەیەك لە هەر بازاڕێك دا بکات، دەشێت بۆ هەر خاوەن پیشەیەك چاودێرێك دابنێت، کە ناودەبرێت بە زانیار، هەڵدەستێت بە گەیاندنی هەواڵیان بە والی و ئەوەی دەیهێنن بۆ بازار لە کالاّ و، ئەو نرخەی، کە دایدەنێن هی تریش[745]

والی قەدەخەی هەر شتێك دەکات، کە ئازار و زیانی بۆ مووسوڵمان هەبێت، وەك قەدەغە کردنی سولاوکە دەرچوەکان لە دیوار لەو ئاوەی بە هۆی باران و شتی تر بەسەری ڕەتبوان دەکەوێت، هەروەها قەدەغە کردنی ئاوەڕۆی زبلی دەرچوو لە مالاّن بۆ ناوەڕاستی ڕێگە.

هەروەها والیی لێپێچینەوە بەسەر گەرماوەکان دا دەسووڕێتەوە و، دەڕوانێتە مەودای پیادە کردنی ڕێنماییەکانی پاکژی لە لایەن بەرپرسان و، قەدەغەی نەخۆشە گوێزەرەوەکان دەکات لە چوونە ناو گەرماوەکان[746] و، وێرای نیار گەلێکی تریش.

---

[745] عبد الرحمن بن نصر الشيرازي: نهاية الرتبة في طلب الحسبة، ص ١٢.

[746] عبد الرحمن بن نصر الشيرازي: نهاية الرتبة في طلب الحسبة، ص١٤.

# بەشی چارەم

# سزا سەرپشککراوەکانی والیی لێپێچینەوە

والیی لێپێچینەوە دەبێت لەتەك چاودێری و ئاراستە کردنی و ئامۆژگارییەکانی دا، سزادەر و تەمبێکەریش بێت، بەڵام دەسترۆییەکانی والیی لێپێچینەوە سنووردارن لە تەمبێ کردن و سزادان دا، کە ویلایەتی لێپێچینەوەی توانای سەپاندنی سزای ئایینیی بۆ هیچ بارێك لە بارەکان و بۆ هەر تاوانێك لە تاوانەکان پێ نادات، بۆیەش لەسەرمانە لەم بەشە دا تاوتوێی سزا سەرپشککراوەکان بۆ والیی لێپێچینەوە بکەین.

خوێندنەوەی ئەم بەشەش لەم سێ توێژبەندەی خوارەوە دا دەگرینە ئەستۆ:

# توێژبەندی یەکەم

## پێناسەی سەرزەنشت کردن و بەڵگەکانی ڕەواییەتیی

### خواستی یەکەم: پێناسەی سەرزەنشت کردن

سەرزەنشت کردن لە زمانەوە ڕەت کردنەوە و قەدەخە کردنە، ماناکەشی تەمبێ کردنە و، بۆ سەرخستن و یارمەتی دان بەکاردێت و، بۆ مەزن کردن و شکۆدار کردن دەوترێت، سزاش بە سەرزەنشتی ناودەبرێت، چونکە خۆی لە خۆی دا هانی تاوانبار دەدات و، لە ئەنجام دانی تاوان یا گەڕانەوە بۆ ئەنجام دانی پەشیمانی دەکاتەوە

لە زاراوەش دا سەرزەنشت کردن سزایەکی دیاری نەکراوە و، لە هەر یاخی بوونێك دا ڕەوایە، سنوور و کەفارەتی تێ دا نییە[٧٤٧].

### خواستی دوەم: بەڵگەکانی ڕەواییەتیی سەرزەنشت کردن

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَاللاَّتِي تَخَافُونَ نُشُوزَهُنَّ فَعِظُوهُنَّ وَاهْجُرُوهُنَّ فِي الْمَضَاجِعِ وَاضْرِبُوهُنَّ فَإِنْ أَطَعْنَكُمْ فَلاَ تَبْغُواْ عَلَيْهِنَّ سَبِيلاً إِنَّ اللّهَ كَانَ عَلِيًّا كَبِيرًا﴾[٧٤٨] واتە: "(سەبارەت بە) ئەو (ژن)انەشی دەترسن لە سنوور دەربچن ئامۆژگارییان بکەن و (ئەگەر سوودی نەبوو) لە جێگە دا پشتیان تێ بکەن و (ئەگەر سوودی نەبوو) لێیان بدەن( بەبێ زیان گەیاندنێك یا لە ڕووی دا دیار بێت)، جا ئەگەر گوێڕایەڵییان کردن، ئەوا زێدەڕەوی مەکەن بێگومان خوا بڵند و گەورەیە".

ئێمەش پێمان وایە کە خوای شکۆمەند ڕێی داوە بە هاوسەر ئامۆژگاریی خێزانەکەی بکات و بیترسێنێت لە ڕووبەڕوو بوونەوەی ئاکامی لادانەکەی لە دونیا

---

[٧٤٧] عبد العزيز مرشد: نظام الحسبة في الإسلام، ص ١٥٢.

[٧٤٨] سورة النسـاء: الآيـة ٣٤.

و ڕۆژی دوایی دا بیترسێنێت، جا ئەگەر گوێڕایەڵیی کرد گرفتێك نییە، ئەگەر نا با وێڵی بکات، کاتێکیش سوودی نەبوو بۆی هەیە بە لێدانی سووك لێی بدات، ئامۆژگاری و وێڵ کردن و لێدان لە چارچێوەی سەرزەنشت کردنن.

خوای گەورە دەشفەرموێت: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ لاَ تَقْتُلُواْ الصَّيْدَ وَأَنتُمْ حُرُمٌ وَمَن قَتَلَهُ مِنكُم مُّتَعَمِّدًا فَجَزَاء مِّثْلُ مَا قَتَلَ مِنَ النَّعَمِ يَحْكُمُ بِهِ ذَوَا عَدْلٍ مِّنكُمْ هَدْيًا بَالِغَ الْكَعْبَةِ أَوْ كَفَّارَةٌ طَعَامُ مَسَاكِينَ أَو عَدْلُ ذَلِكَ صِيَامًا لِّيَذُوقَ وَبَالَ أَمْرِهِ عَفَا اللّهُ عَمَّا سَلَف وَمَنْ عَادَ فَيَنتَقِمُ اللّهُ مِنْهُ وَاللّهُ عَزِيزٌ ذُو انْتِقَامٍ﴾[٧٤٩] واتا: "بڕوادارینە (کاتێك) لە (ئیحرام) دان نێچیر مەکوژن، ئەوەشی بە دەستی ئەنقەست نێچیر(گیاندارێکی کێوی یا دڕندە) بکوژێت، ئەوا با بە گەواهیی دوو دادگەر(بە قورسایی ئاژەڵەکە) بکات بە دیاری بۆ کابە، یا هێندەی نرخی نێچیرەکە خواردن بە هەژاران بدات، وەك سزایەك بیچێژێت خوا لە (کوشتنی ئەو نێچیرانەی) لە پێشوو (لە کاتی ئیحرام دا بەرلەوەی یاساخ بکرێت) خۆش بوە، هەرکەسێك (دوای یاساخ کردن) دووبارەی بکاتەوە خوا تۆڵەی لێ دەسەنێتەوە، خوا بەدەسەڵات و تۆڵەسێنەرە"، ئەمەش لە تەمبێ کردنی پێ بژاردنی داراییە، کە جۆرێکە لە جۆرەکانی سەرزەنشت کردن.

پەیامبەریش ﷺدەفەرموێت: ( لايجلد فوق عشرة أسواط إلاّ في حد من حدود الله)[٧٥٠] واتا: (لە سەرووی دە قامچی نادرێت، مەگەر لە سنوورێك لە سنوورەکانی خوا).

پەیامبەری خواش ﷺ ڕێی داوە بە سەرزەنشت کردن ئەگەر سنوورەکەی لە دە قامچی و کەمتر بوو.

لە فەرموودەی سالم لە ئیبن عومەرەوە ڕەزای خوایان لەسەر بێت هاتوە: "لە سەردەمی پەیامبەری خوا ﷺ ئەگەر خواردنێکیان لە گۆترە بفرۆشت بوایە لە شوێنەکەی تا بگوێزێت، خۆیان لێ بەدور دەگرت".[٧٥١]

---

[٧٤٩] سورة المائدة: الآية ٩٥.

[٧٥٠] منتقى الأخبار بشرح نيل الأوطار: جزء ٧، ص ١٥٨.

ئەم سەرزەنشت کردنەش بۆ کەسێکە خواردنێك بەر لە دەستکەوتنی بفرۆشێت و، جگە لە فەرموودە گەلێکی تریش لە فەرموودەکان. نەتەوەی ئیسلامیش کۆدەنگن لەسەر ڕەوابیەتیی سەرزەنشت کردن و، لەوەتەی سەردەمی پەیامبەرەوە ﷺ کاری پیٚ کراوە[٧٥٢].

[٧٥١] صحيح مسلم بشرح النووي: جزء ١٠، ص ١٧٠.
[٧٥٢] عبد العزيز مرشد: نظام الحسبة في الإسلام، ص ١٥٣.

# توێژبەندی دووەم

## جۆرەکانی سەرزەنشت کردن

سزا سەرزەنشت کردنییەکان بۆ چەند جۆرێك پۆلێن دەبن، ئەمانەن:

١) **کوشتن:** سەرزەنشت کردن بۆ پیسترین تاوانەکان و مەزنترین زیانەکانە بە بەرژەوەندییەکانی کۆمەڵگە و، سوننەت و ژیریش بەڵگەی ڕەواییەتین[٧٥٣]

٢) **لێدان:** ڕەسەنییەتی لە ڕەواییەتیی سەرزەنشت کردنی، پەرتووك و سوننەت و کۆدەنگییە[٧٥٤]

٣) **دوورخستنەوە:** ئەویش نامۆ کردن و دوورخستنەوەیەتی لە زەویی نیشتمان و، ڕەسەنێتیی ڕەواییەتیی سەرزەنشت کردنی ئەوەیە، کە پەیامبەر ﷺ لە سەرزەنشت کردنی نامەردان دا دووری دەخستنەوە[٧٥٥]

٤) **گرتن:** ڕەسەنێتییەکەی لە ڕەواییەتیی سەرزەنشت کردنی، سوننەت و کۆدەنگییە[٧٥٦].

٥) **هەڵواسین:** ئەویش هەڵواسینی گوناهبارە بە زیندوویی و بەڵگەی شیانی سەرزەنشت کردنیشی ئەوەیە، کە لە پەیامبەرەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە: پیاوێك بە ناپەسەند ناوی دەرکرد بوو لە چیا دا هەڵی واسی[٧٥٧].

٦) **پێ بژاردنی دارایی:** بەڵگەی شیانی سەرزەنشت کردنی پەرتووك و سوننەتە[٧٥٨]

---

[٧٥٣] عبد العزيز مرشد: نظام الحسبة في الإسلام، ص ١٥٤.
[٧٥٤] عبد العزيز مرشد: نظام الحسبة في الإسلام، ص١٥٥.
[٧٥٥] صحيح مسلم بشرح النووي: جزء ١٤، ص ١٦٢.
[٧٥٦] عبد العزيز مرشد: نظام الحسبة في الإسلام، ص١٥٦.
[٧٥٧] الماوردي: الأحكام السلطانية، ص ٢٣٩.
[٧٥٨] عبد العزيز مرشد: نظام الحسبة في الإسلام، ص١٥٧.

٧) **لە فرمان خستن:** ئەویش بێ بەش کردنی کەسێکە لە فرمانەکەی، بەمجۆرەش بێ بەش کردنی لەو مووچەیەی پێی دەدرا، ئەمە لە کاتێك ئەگەر زانرا، کە لە دەسترۆییەکانی کارەکەی دا نا پاکیی کرد، وەك وەرگرتنی بەرتیل و شتی تر، عومەر خوا لێی ڕازی بێت پێی گەیشت، کەوا هەندێك لە جێگرانی هۆنراوەیان بەسەر مەی دا گوتوە، ئەویش لای دان[٧٥٩]

٨) **هەڕەشە لێ کردن و ترساندن:** ئەمەش کاربەدەست بەڵێن بدات لە ڕووبەڕوو کردنی سزایەکی توند بەو کەسەی خراپەکەی دووبارە دەربکەوێتەوە، لەمەش دا عومەری کوڕی خەتاب خوا لێی ڕازی بێت بە هۆنەرانی ڕاگەیاند بوو، کە هەر یەکێکیان بە ژنێك دا هەڵ بدات، هەر لێی دەدات[٧٦٠]

٩) **وێڵ کردن:** ئەویش دابڕاینی سەرزەنشت کراو و قەدەخە کردنییەتی لە پەیوەندی پێ کردنی یا مامەڵە کردن لەگەڵی بە هەر جۆرێك یا ڕێگەك لە ڕێگەکان و، سەرزەنشت کردنیشی بە پەرتووك و سوننەت ڕەوایە.

١٠) **ناوزڕاندن:** ئەویش بانگ کردنیەتی بە تاوانبار و ئاشکرا کردنی گوناهەکەی و ڕوون کردنەوەی بۆ خەڵکی بۆ ناسینی و وریا بوون لێی، هەروەك عومەری کوڕی خەتاب ڕەزای خوای لەسەر بێت ئەمەی کرد، کە فەرمانی دا بە ڕوو ڕەش کردنی گەواهیدەری درۆزن و پشتاوپشت سوار کردنی سوارێك، چونکە لەبەر درۆ ڕووی ڕەش بوە ڕەشییەکەش ڕووی ڕەشتر کرا و، لەبەر ئەوەشی قسەی وەراوگێڕ کرد سوار بوونیشی وەراوگێڕ کرا[٧٦١]

١١) **سەرکۆنە کردن:** ئەویش تەریق کردنەوەی گوناهبارە لە کارەکەی بە تەشەر و پەلار لێدان[٧٦٢]

---

[٧٥٩] ابن تيمية: السياسة الشرعية، مطبعة دار الجهاد، ١٣٨١هـ، ص١٠٥.

[٧٦٠] أبو فرج الأصفهاني: الأغاني، جزء ٤، ص٣٥٦.

[٧٦١] عبد العزيز مرشد: نظام الحسبة في الإسلام، ص١٥٩.

[٧٦٢] عبد العزيز مرشد: نظام الحسبة في الإسلام، ص١٦٠.

١٢) **گلەیی:** ئەویش لۆمە کردنی گوناهبارە لە کارەکەی بە نەرمی و ڕووخۆشی، خوای گەورە گلەیی لە پەیامبەر ﷺکردوە نموونەی ئەمەش: ﴿عَبَسَ وَتَوَلَّى (١) أَن جَاءَهُ الْأَعْمَى (٢) وَمَا يُدْرِيكَ لَعَلَّهُ يَزَّكَّى (٣) أَوْ يَذَّكَّرُ فَتَنفَعَهُ الذِّكْرَى﴾[٧٦٣]

واتا: "ڕووی گرژ کرد پشتی تێ کرد {١} کە نابیناکە هاتەلای {٢} تۆ ناشزانیت ڕەنگە (بیەوێت) بەرەو پاکی بچێت {٣} یا یاد (مان)بکاتەوە و یاد کردنەوەکەی کەڵکی پێ بگەیەنێت"

١٣) **ئامۆژگاری:** ئەویش بەر گرتنە لە خراپەکەر لە کارەکەی بە ئامۆژگاری و ترساندن لە ئازاری خوای گەورە و، پەرتووک و سوونەتیش لە سەرزەنشت کردنی بەڵگەی ڕەواییەتیین، سەبارەت بە پەرتووک، فەرمایشتی خوای گەورەیە: ﴿وَاللاَّتِي تَخَافُونَ نُشُوزَهُنَّ﴾[٧٦٤] واتە: "(سەبارەت بە) ئەو (ژن)انەشی دەترسن لە سنوور دەربچن"، سەبارەت بە سوونەتیش لە عائشەوە ڕەزای خوای لەسەر بێت دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: "بە پەیامبەر ﷺم گوت، چیتە لە سەفیەی وا و وا، هەندێك گێڕەرەوەش دەڵێن واتا کورتە، فەرمووی، وشەیەکت گوت ئەگەر بەر ئاوی دەریا بکەوێت بۆگەنی دەکات"[٧٦٥]

١٤) **خۆ لێ لادان:** ئەویش ڕوو وەرگێڕانە لە قسەکەر یا هاتوو، یا پێشوازی کردنی بە شێوەیەکی سارد، بەهۆی کردنی کارێك، کە ئازاری داوە[٧٦٦].

١٥) **پێ گوتن:** ئەویش هەواڵ دانی گوناهبارە بەوەی، کە ئەوەی ئەنجامی داوە کەسێك پێی گوتوە، وەك دادوەر، یا والیی لێپێچینەوە یا پیاوێکی چاك پێی بڵێت: زانیومە واو وات کردوە، یا ئەمەی بۆ دەنووسێت[٧٦٧]

---

[٧٦٣] سورة عبس، الآيات ١ — ٤.

[٧٦٤] سورة النساء: الآية ٣٤.

[٧٦٥] رياض الصالحين: ص ٤٩٦.

[٧٦٦] عبد العزيز مرشد: نظام الحسبة في الإسلام، ص١٦٢.

[٧٦٧] عبد العزيز مرشد: نظام الحسبة في الإسلام، ص١٦٣.

# توێژبەندی سێیەم

## هەڵسەنگاندنی سەرزەنشت کردن و دەسترۆییەکانی والیی لێپێچینەوە لە سەرزەنشت کردن

شارەزایان لە پرسی هەڵسەنگاندنی سەرزەنشت کردن و، ئایا دەگاتە سنووری سزا، جیاڕان، جەماوەری زانایان دەڵێن: سەرزەنشت کردن ناگاتە ئاستی سنووری سزا و، بەڵگەیان فەرموودەی پەیامبەرە ﷺ: (هەر کەسێك لە دەرەوەی سزای سنوورەکان سزا بدات، دەستدرێژیی کردوە) بۆ ئەمەش حەنیفە و شافعی ڕایان وایە و، ڕایەکی باوی ڕێبازی ئەحمەدیشە، پاشان لە هەڵسەنگاندنی دا جیاڕاییان کرد[٧٦٨]

والیی لێپێچینەوە بۆی هەیە لە لێپێچینەوە دا لێدان و، دوورخستنەوە و، گرتن و، پێ بژاردن و، هەڵواسین و، وێڵ کردن و، ناو زڕاندن و، سەرکۆنە کردن و، هەڕەشە لێکردن و، ترساندن و، گلەیی و، ئامادە کردنی تاوانبار لە دانیشتنێکی و، خۆ لێ لادان و پێگوتن، بەکار بهێنێت.

والیی لێپێچینەوە ئەم دوانەی دواییان بەکار ناهێنێت، مەگەر لە ڕاست کەسێك، کە بە جێگیری(دینداری) و ئاکاری جوان ناسراو بێت و، پێشینەی تری لەبارەوە نەزانیبێت.

هەروەها والیی لێپێچینەوە مافی ئەوەی نییە سەرزەنشت کراو بکوژێت، چونکە سەرزەنش کردن لە ئیسلام دا تەنها بۆ تەمبێ کردنە، ئەگەر واش بێت نابێت سزاکەی لەناوبەر بێت.

هەروەها والیی لێپێچینەوە بۆی نییە پێشەوایەك لە فەرمانڕەواییەکەی، یا وەزیرەك لە وزارەتەکەی، یا فرمانبەرێك لە فرمانەکەی بخات، چونکە ئەمە دەبێتە

---

[٧٦٨] عبد العزيز مرشد: نظام الحسبة في الإسلام، ص١٦٣.

هۆی پشێوی و شلەژانی دەستگەی کارگێڕیی ولآت و، لەبەر ئەوەشی فرماندار کردن یا خستن بۆ کاربەدەستە، یا ئەوەی لە ئەمە دا جێگریەتی، هەروەك زۆرجار ئەوەی پەیوەندیدارە بە دادگەری پێداویستیی بە دادگایی و ڕوون کردنەوە هەیە.

سەبارەت بەو تاوانانەشی وەك خواردنەوە و دزی و زینا و جنێو دان، کە ئیسلام سزا گەلێکی بۆ داناون، تێڕوانین و لێکۆڵینەوە لەگەڵ بکەرەکەی لە پسپۆڕیی دادوەرە، ئەگەر لەسەر یەکێك لە تاوانبارەکان بە لێدانی لە مەی دا، یا بڕینی لە دزی، یا بەردباران کردنی یا لێدانی لە زینا، یا لێدان لە جنێو دان دا، جێبەجێ کردنی والیی لێپێچینەوە دەیگرێتە ئەستۆ.[٧٦٩]

به پشتیوانیی خوا کۆتایی هات.

---

[٧٦٩] عبد الرحمن بن نصر الشيرازي: نهاية الرتبة في طلب الحسبة، ص ١٠٩.

# ناوەڕۆك

# الإدارة الإسلامية

## دراسة مقارنة

## بين النظم الاسلامية والوضعية الحديثة

دكتور فوزي كمال ادهم


نوسینگەی تەفسیر

هەولێر - شەقامی دادگا - ژێر ئوتێلی شیرین پالاس

ت: 2230908 - 2221695- 2518138

موبایل: 07504605122 - 07701387291

www.al-tafseer.com

E-mail: tafseeroffice@yahoo.com

altafseer@hotmail.com